# کەسایەتی ئافرەتی موسوڵمان

## وەك چۆن ئیسلام بە پێی قورئان و فەرموودە دایڕشتووە


نووسینی
دکتور محمد علي الهاشمي

وەرگێڕانی
سندس علي عباس

پێداچوونەوەی
مامۆستا سید احمد سید عبدالوهاب بەرزنجی





دار المعرفة
بەیرووت

کتێبخانەی نارین
هەولێر

# کەسایەتی ئافرەتی موسوڵمان

## وەك چۆن ئیسلام بە پێی قورئان وفەرموودە دایڕشتووە


نووسینی

دکتور محمد علي الهاشمي

وەرگێڕانی

سندس علي عباس

پێداچوونەوەی

مامۆستا سید احمد سید عبدالوهاب بەرزنجی





دار المعرفة

بەیرووت

کتێبخانەی نارین

هەولێر




ناوی کتێب : **کەسایەتی ئافرەتی موسڵمان**

**وەك چۆن ئیسلام بە پێی قورئان وفەرموودە دایڕشتووە**

نووسیـــــنی : **دکتور محمد علی الهاشمی**

وەرگێـڕانی : **سندس علی عباس**

پێداچوونەوەی: **مامۆستا سید احمد سید عبدالوهاب بەرزنجی**

دیزایـــــن : **چاپخانەی گوڵ** (نورالدین عبدالله)

بڵاوکـــــــار: **کتێبخانەی نارین - هەولێر- ٨٥٠٠**

ژمارەی سپاردن (٨٦٠) ساڵی ٢٠٠٧ی پێدراوە

## پێشەکی چاپی یەکەم (دانەر)

الحمد لله حمدا كثيرِا طيبا مباركا فيه، كما ينبغي لجلال وجهه وعظيم سلطانه، والصلاة والسلام على سيدنا محمد، أشرف الأنبياء والمرسلين، ومن أرسله الله حياة للعرب ورحمة للعالمين.

أما بعد، یەکێ لە شیرنترین ئاواتەکانم کە ماوەیەکی زۆربوو لە هزر و ئەندێشەمدا دەخولایەوە ئەوەبوو پەرتووکێك دەرکەم لەسەر ئافرەتی موسڵمان، بەڵام بۆ هێنانەدی ئەم ئاواتە هۆکارەکانم بۆ نەدەرەخسا" گرفت و سەرقاڵیەکانی ژیان خەریکی کردبووم، بەڵام دڵم هەر پەیوەست بوو و حەزێکی توندم هەبوو بۆ دەرکردنی ئەم پەرتووکە کە کەسایەتی ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو و ڕۆشنبیر بە پەیڕەوی ئاینەکەی، هۆشیار بە ڕێنمایی خودا، ملکەچی فەرمانەکانیەتی، لە سنوورەکانی دەوەستێ و نایبەزێنێ.

ساڵ تێپەڕی و ڕۆچوبووم لە کاروبار و سەرقاڵی و هەموو کات زیاتر پەیوەست دەبووم بەم بابەتە و بایەخی زیاترم دەدا و زیاتر سووربووم لەسەر دەرکردنی ئەم پەرتووکە، بەهۆی ئەو گرنگیەی هەیبوو لە دەروونمدا، دەمزانی بە گەیشتن پێی ئەنجامێکی باش و بەرهەمێکی سوودبەخش دەدات کە ژیانی ئافرەتی موسڵمان ڕووناك بکاتەوە و کەسایەتیەکەی نیشان بدات وەك چۆن الله دەیەوێت وا بێت، ئەو پلەوپایە بەرزەی پێ بناسێنێ کە خوا پێی گەیاندووە.

ساڵانێك بە سەرقاڵی بەم پەرتووکە و سووربوون لەسەری مامەوە تا خودا ڕێزی لێنام و یارمەتی دام لەسەر دەرکردنی لە ساڵی ١٤١٥هـ/١٩٩٤م.

سەرچاوەی گرنگی دانم بە دەرخستنی کەسایەتی ئافرەتی موسڵمان ئەوەبوو کە تێبینیم دەکرد لە ژیانی ئافرەتی ئەو سەردەمە لە دژەکردار و زیادەڕۆیی کردن، زیادەڕۆیی لەلایەنێك و کەمتەرخەمی لەلایەنێکیتر" وەك ئەوە ئافرەتی وا دەبینی کە موسڵمانە و خۆپارێزە و چاکە، پەرستشەکان ئەنجام دەدات، کەچی کەمتەرخەمی دەکات لە دەستگرتن بە هۆکارەکانی پاك و خاوێنی دەم و ددان و جەستەی، گوێ نادات بەو بۆنە ناخۆشەی دەردەچێت لە دەم و جەستەی. یان دەیبینی گرنگی دەدات بە تەندروستی و پاك و خاوێنی جەستەی، کەچی گرنگی نادات بە

پەرستشەکان و هەڵسان بە کاروبارەکانی ئاینەکەی. یا دەیبینی تەواو یەکلابۆتەوە بۆ پەرستنی خوا، کەچی وێنایەکی ڕاستی هەڵنەگرتووە لە تێڕوانینی گشتی ئیسلام بۆ گەردون و ژیان و ئادەمیزاد. یا دەیبینی لە ئافرەتە دیندارەکانە، بەڵام لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا زمانی خۆی ناگرێت لە باسکردنی پاشملە و قسە هێنان و بردن. یا دەیبینی دیندار و ڕۆشنبیرە، بەڵام کەم و کورتی هەیە لە ڕەفتاری لەگەڵ دراوسێ و هاورێکانی. یا دەیبینی ڕەفتاری لەگەڵ بێگانە باشە، بەڵام مافی هاوسەرەکەی فەرامۆش کردووە، بە گرنگی نازانێت کە هاوسەرێکی چاك بێت بەرامبەر بە مێردەکەی. باشترین و نوێترین جوانکاری بەکاردێنێ لەناو کۆمەڵی ئافرەتان، کەچی بایەخدان بە شێوە و دیمەنی فەرامۆش دەکات لە بەرامبەر هاوسەرەکەی. یا دەیبینی گرنگی دەدات بە هاوسەرەکەی، بەڵام پشتگیری ناکات لە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکی و هانی نادات لەسەر خێر و تەقوا و کاری چاکە. یا دەیبینی هەڵدەستێ بە مافەکانی هاوسەرەکەی، کەچی کەمتەرخەم و بێ ئاگایە لە پەروەردەکردنی منداڵەکانی و ئاڕاستەکردنیان و پێکهێنان و پتەوکردنی کەسایەتیان و چاودێری کردنیان و بایەخدان بە هەستە دەروونییەکانیان و بیروهۆش و ددانەکانیان، وەبەوەی دەوری داون لە ژینگە و کاریگەریەکانی، وەلە کەشی زوقم و زاڵ. یا دەیبینی بەهەموو ئەو شتانە هەڵدەستێ، بەڵام کەمتەرخەمە لە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی. یا دەیبینی ئەم پەیوەندییە دەگەیەنێ، کەچی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان فەرامۆش دەکات و زیاتر بایەخ بە کاروباری تایبەتی خۆی دەدات و گرنگی نادات بە کاروباری موسڵمانان.

یا دەیبینی گرنگی دەدات بە کاروباری تایبەتی و گشتی، کەچی زۆر بەردەوامبوون لەسەر خوێندنەوە و زیادکردنی زانست و زانیاری پشتگوێ دەخات. یا دەیبینی ڕۆچووە لە خوێندنەوە و زیادکردنی زانست و زانیاری، بەڵام کاروباری ماڵ و مێردی فەرامۆشکردووە. جا جێگای سەرسوڕمانە کە ئەو هەموو دژەکردارانە یا هەندێکی دەربکەون لەوانەی بە نەوەی تێگەیشتوو و ڕۆشنبیر هەژماردەکرێن لەو ئافرەتە موسڵمانانەی کە تێراوبوون لە سەرچاوەی ڕۆشنبیری ئیسلامی، توێشویەکی باشیان لێدەستکەوتووە!! هۆکاری ئەم دژەکردارانە بێ ئاگایی و هەندێ جاریش گوێ نەدانە، یا تێنەگەیشتنە لە بۆچوونی هاوسەنگی کە تێڕوانینی گشتی ئیسلامی

لەسەر دامەزراوە بۆ ئادەمیزاد و ژیان و گەردون، بە جۆرێك بۆ هەموو شتێك لەم ژیانە مافی خۆی دراوەتێ، هیچ لایەنیك لەسەر حیسابی لایەنێکیتر فەرامۆش نەکراوە.

ئەوەی دەقە ڕاستەکان بخوێنێتەوە کە لە قورئان و فەرموودە هاتووە و ڕەفتاری هەرە نمونەیی ڕوون دەکاتەوە، کە پێویستە لەسەر ئافرەتی موسڵمان دەستی پێوەبگرێت لە پەیوەندیەکەی لەگەڵ پەروەردگاری، لە دروستکردنی خۆی، لە پەیوەندیەکانیتری لەگەڵ نزیك و دوور، لە هەڵس و کەوتی کۆمەڵایەتی بە گشتی، سەرسام دەبیت لە زۆر و فەری ئەم دەقانە و لەخۆگرتنیان بۆ هەموو ورد و درشتێك لە ژیانی ئافرەت، نیشانە و وێنەی ڕێنمایکارە بۆ ژیانێکی پێگەیشتوو و هاوسەنگ و پتەو، بۆ خاوەنەکەی مسۆگەری بەختەوەری و سەرکەوتن و بردنەوەی دەداتێ لە دونیا، وە پاداشت و بردنەوەی هەرە گەورەش لە ڕۆژی دوایی.

وەسامگرتی بووم لەوەی بینیم لە دواکەوتنی ئافرەتی موسڵمانی ئەو سەردەمە لەو ئاستە بەرزە ڕۆشنەی الله بۆی داناوە ببێت، کەچی لەنێوان ئەو و گەیشتن بەو ئاستە بەرزە تەنها ئەوەیە گرنگی بدات بە ناسینی کەسایەتی ڕەسەنی خۆی کە دەقەکانی قورئان و فەرمووودە دایانڕشتووە، کە ئافرەتێکی بەرز و بڵند و جیاواز بە هەست و بیروبۆچوون و ڕەفتار و مامەڵەکانی لێدروستکردووە، ئەمەش وایکردوە ئاینێکی لێدروست ببێت کە پێویست بکات زۆر بە توندی دەستی پێوە بگیرێت.

گەیشتنی ئافرەت بەم ئاستە بەرزە کارێکە یەکجار گرنگە لە ژیانی ئادەمیزاد بە گشتی، بەهۆی ئەو کاریگەریە گەورەی کە ئافرەت هەیەتی لە پەروەردەکردنی نەوەکان، دروستکردنی پاڵەوانان، چاندنی بەها بەرزەکان، جێگیرکردنی بنەماکان، ڕازاندنەوەی ژیان بە خۆشەویستی و دڵسۆزی و میهرەبانی و جوانی، پڕکردنی ماڵەکان بە ئاسایش و حەسانەوە و هێمنی و ڕازی بوون و سەقامگیری.

ئافرەتی موسڵمان تاکە ئافرەتە ئامادە بێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو هەموو شتانە لە جیهانی ئافرەتی ماندوو و شەکەت لە ماندوێتی فەلسەفەی مادیەتی ئەم سەردەمە، لە ئاستەنگەکانی

ژیانی نەفامی کە باڵی کێشابوو بەسەر کۆمەڵگا بێ ئاگاکان لە ڕێنمایی خودا، ئەمەش بە ناسینی خۆی دەبێت، بە چوونی بەرەو پێکهاتە خودیەکانی خۆی و سەرچاوە فیکرییە بێگەردەکانی، هەروا پوختە کردنی کەسایەتی خۆی پوختە کردنێکی ڕەسەن کە خودا و پێغەمبەرەکەی پێی ڕازییە بۆی و بەهۆیەوە لە ئافرەتانی جیهان جیای کردونەتەوە.

بۆ دەرخستنی هەموو ئەمانە هەڵسام بە کۆکردنەوەی دەقە ڕاستەکان لە قورئان و لەو فەرموودانەی باس لە دروستکردن و پێکهێنانی کەسایەتی ئافرەت دەکەن، وە پۆلێنکردنی بەگوێرەی بەشەکان و بابەتەکانیان، بەم شێوەیە پیلانێکی تەواوم بۆ ڕێککەوت بۆ گەڕان بەدوای کاروبارە تایبەتی و گشتییەکانی ئافرەت بەم شێوەیەی خوارەوە:

١ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ پەروەردگاری.

٢ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ خودی خۆی.

٣ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ دایك و باوکی.

٤ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ هاوسەرەکەی.

٥ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ منداڵەکانی.

٦ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ بوك و زاواکانی.

٧ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ خزم و دۆستانی.

٨ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ دراوسێکانی.

٩ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ خوشك و دەستە خوشکانی.

١٠ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ کۆمەڵگاکەی.

لە میانەی لێکۆڵینەوە و تێگەیشتنم لەو دەقانە، ڕاستیەکی گەورەم بۆ دەرکەوت زۆرجار بە بێ ئاگایی بەلایدا دەڕۆین، ئەویش ئەوەیە کە میهری خوا بە ئافرەتی موسڵمان زۆر گەورەیە، کاتێ بەهۆی ئیسلام دەری هێنا لە لاوازی و بێتوانایی و گومڕایی و سەرشۆڕی و زیندەبەچاڵ کردن و

ناچارکردنی بە شوێن کەوتنی پیاو بەشێوەیەکی ڕەها، بەرزی کردەوە بۆ لوتکەی مێیانە شیرین و ئازیز و ڕیزدار و پارێزڕاو و بەخشراو لە ماندووبوون کارکردن و هەوڵدان لە پێناو پەیداکردنی خەرجی ڕۆژانە و پاروی ژیان، هەرچەندە دەوڵەمەندیش بێت، ئیسلام وایکردووە ئافرەت ماڵی تەنها بۆ خۆی بێت ئەگەر خاوەن ماڵ بێت، یەکسانە لەگەڵ پیاو لە ڕیز و پلەوپایەی ئادەمیزادانە و ئەرکە شەرعیەکان بەگشتی، مافی هەیە و ئەرك و واجبیشی لەسەر شانە، وەك چۆن پیاو مافی هەیە و ئەرك و واجبی سەر شانی هەیە، وە ئافرەت و پیاو لە بەرامبەر الله یەکسانن لە پاداشت و سزا. فەزڵی ئیسلام لەسەر ئافرەت تەنها ئەوە نییە لە دواکەوتوویی و سەرشۆری و گومڕایی گواستیەوە بەرەو بەرزی پێشکەوتن و سەربەرزی و ئاسایش و ڕووسوری، بەڵکو گرنگیەکی زۆری داوە بە دروستکردنی کەسایەتیەکەی دروستکردنێکی تەواو و گشتگیر بۆ هەموو لایەنێك لەلایەنەکانی کەسایەتیە تاك و خێزانی و کۆمەڵایەتیەکەی، بەجۆرێك بووە مرۆڤێکی بەرز کە شایستەی جێنشینی بێت لەسەر زەوی.

ئایا چۆن ئیسلام ئەو کەسایەتیەی دروستکرد؟ چۆن لەم دروستکردنەدا گەیشتە ئەو پلە بەرزەی کە هیچ ئافرەتێك لە مێژوودا بێجگە لەناو ئەم ئاینەدا پێی‌نەگەیشتووە؟ خوێنەر وەڵامی ئەو پرسیارانەی لە لاپەرەکانی داهاتوو دەستدەکەوێت. لە خودا دەپاڕێمەوە ئەم کارەم لێ‌وەرگرێت، تەنها بۆ ڕەزامەندی ڕووخساری پاکی بێت و سوودبەخش بێت و بیکاتە مایەی ڕووناکی بۆم لە ژیانمدا، توێشوم بێت لەپاش مردنم، تکاکارم بێت لە ڕۆژی لێپرسینەوە، داواکارم هەرچی ڕاست و پێکان و تەواوە، بیخاتە هەست و دڵم، دوورم خات لە پەورووکەوتنی (کبوة) بیر، مەبەستی خراپ، لاری پێنوس، ناڕاستی وشە، لاوازی بەڵگە، قسەی بێ‌سود و زیاد.

الرياض ٢٠/ ٧/١٤١٤

٢ / ١٩٩٤/١

الدكتور محمد علي الهاشمي

## پێشەکی وەرگێڕ

پاش سوپاس و ستایشی خودا لەسەر بەخششە لەدوانەهاتووەکانی بەتایبەتی لەسەر بەخششی ئیسلام و باوەڕ و عەقڵ، درووود و سڵاوناردن بۆ سەر گیانی مامۆستا و چاوساغی هەموو مرۆڤایەتی، چرای ڕۆشنی ڕێگای باوەڕداران، درووود و سڵاو بۆ هاوەڵانی ڕێزدار و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی...

بە پشتیوانی خودا دەستم دایە وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە بەهادار و پڕ لە سوودە لە عەرەبییەوە بۆ کوردی، هەرچەندە ئەم پەرتووکە لە قەبارە گەورەیە و دەمزانی ئەزیەت و ئاستەنگی زۆرم دێتە ڕێ و کات و تەندروستیەکی باشی دەوێت، بەڵام بە پشتیوانی خوا پاشان یارمەتی برا و خوشکانی موسڵمانم و ڕێنمایی و ئاڕاستەکانیان توانیم زاڵبم بەسەر هەرچی ئاستەنگ و بەرگر هەنە، ئەگەر کات و تەندروستی و لاوێتی و چالاکی و هەوڵەکان بۆ خوا و بۆ خزمەتی ئاینی خوا نەبێت هەر نەبێ باشترە! ئەگەر هەشبێ هەر بە نەبوو ئەژمار دەکرێ!

ئەوەی جێی ئاماژە پێکردنە لەم پەرتووکەدا ڕەچاوی ئەوەم کردووە کە تا لە توانام دابووە بە کورتی بە کوردیم کردووە، هەندێ ئایەت و فەرموودە زۆر دوبارە بونەتەوە، من تەنها ئاماژەم پێکردووە و دوبارەکەم نەنوسیوەتەوە، هەندێ بڕگە و ڕستە و ڕوداو کە لەگەڵ واقعی ئێمە نەدەگونجا،نەمنوسیوەتەوە...، ئەمانەش هەمووی لە پێناو بەرژەوەندی گشتی بووە و بە ڕاوێژ و پرس و ڕا بووە نەك سەربەخۆ و یەك لایەنانە، لە خوا داواکارم چاوپۆشی بکات لە هەرچی هەڵە و کەم و کورتی هەیە..

ئێمە زۆر چاك دەزانین و زۆریش دەیڵێینەوە: ئافرەت نیوەی کۆمەڵە، ئایا هەموو ئافرەتێك نیوەی کۆمەڵە؟ ئافرەتی وا هەیە کۆمەڵێك بنیات دەنێ" چونکە توانیویەتی ڕێگای خۆی لە ژیان دەست نیشان بکات. ئافرەتیش هەیە کۆمەڵێك دەروخێنێ و بەرەو گەندەڵیو گومڕاییان دەبات بەهۆی لارەڕێ بوونی.

بەڵێ کاتێك ئافرەت نیوەی کۆمەڵە کە بزانێ چۆن لە ژیانیدا شەرعی خوا و پێغەمبەر ﷺ بەرجەستە دەکات و هەموو لایەنێکی ژیانی تایبەتی و گشتی بە شەرعی خوا و ڕێنماییەکانی ئیسلام ئاوەدان دەکاتەوە و تەواودەکات...

ئنجا ئایا پیادەکردنی شەرعی خوا لە ژیاندا دەبێ چۆن بێ؟ چۆن ئافرەت دەتوانێ خوا پاشان خۆی و دەوروبەری ڕازی بکات و لەگەڵیان بە ئاسوودەیی بژیێ؟ چۆن ئافرەت دەتوانێ بەجۆرێك بژیێ کە نەك بایەکی سارد بەڵکو ڕەشەباش کاری تێنەکات و ڕەگی باوەڕی نەلەقێنێ و کەسایەتی لەکەدار نەکات و بەرچاوی لێڵ نەکات؟ لەبەرچی و چ کەم و کوڕیەك هەیە لە ئافرەت کە بە هۆیەوە پیاو یا کەسانیتر بتوانێ ستەمی لێ بکات و مافی زەوت بکات؟ ئایا دەبێ ئەرکی ئافرەت و پیشەی لە ژیاندا چی بێت؟ چۆن ئافرەت دەتوانێ لە ژیان و لە دواڕۆژیشا بەختەوەر بێت، لە ناخی دڵیەوە هەست بە کەمی و نزمی نەکات؟ ئەمانە و چەندین پرسیاریتر وەڵامەکەی لەم پەرتووکەدایە، کە بەڕاستی تەنها بەمەبەستی دەستکەوتنی ڕەزامەندی خوا وەرمگێڕاوە، تاوەکوو هاوڕەگەزانم لەوانەی زمانی عەرەبی تێناگەن لێی بێبەش نەبن و بەهرەمەند بن و بۆ ئەوەی ئافرەتان سودی لێ ببینن و بەهۆیەوە دوبارە کەسایەتیان دابڕێژنەوە بە شێوەیەکی تۆکمە و بەهێز کە بەرگەی شەپۆڵە گەندەڵیەکان و دونیای سەرنج ڕاکێشەر بگرێت و لە ڕێی ڕاست لارنەکاتەوە، وە ببێتە مایەی بە خۆداچوونەوەی و بیرێکی بکەوێتە سەر چارەنوس و دواڕۆژی و کۆکردنەوەی توێشو بۆ گەشتی دووری قیامەت و ڕۆژانی سەختی و بێکەسی و بێ ماڵ و سامان...، هەرواش بۆ ئەوەی بکەوێتەخۆ لە چاککردنی دەروونی خۆی و ماڵ و مناڵ و دەوروبەری و گونجاندنی لەگەڵ شەرع و بەرنامەی کۆتایی خوای گەورە، و تێبگات ژیان واتا چی؟ بۆچی؟ لەبەرچی؟ تاوەکو لەسەر نەخشەیەکی ورد و تۆکمە بچێتە ناو وردەکاریەکانی ژیان، چرایەك بێت بۆ خۆی و بۆ دەوروبەر، دەستێك بێت بە هانای کوێر و سەرلێشێواوان بێت، مەرهەمێك بێت بۆ ئازاری برینداران، پزیشکێك بێت چارەی نەخۆشان بکات، بازویەك بێت قەڵای ڕەوشت و بەها بەرزەکان بنیات بنێ....، بەڵێ ئەم پەرتوکە بۆ ڕۆشن کردنەوەی دیدی ئافرەتی موسڵمان هاتە دونیاوە، بەو ئومێدەم ئەنجامی خۆی پێکابێ و لە وەرگێڕانیدا سەرکەوتوو بووبم و خوای گەورە بە دڵسۆزیەوە لێمی وەرگرێت و لە تەرازوی چاکەکانمی دابنێ.

بەو هیوایەم هەر خوشكێك زۆر بەوردی بیخوێنێتەوە و لە ژیانیدا پیادەی بكات تا سەركەوتوو و سەرفراز بێت لە هەموو بوارەكانی ژیانی دونیا، لە دواڕۆژیشا ڕوو سپی و بەختەوەربێت و لەگەڵ ئافرەتانی سەربەرز و تێكۆشەری هاوشێوەی خاتوو خەدیجە و عائشە و ئاسیا و.... هیتر زیندووبكرێتەوە.

لە ناخی دڵمەوە و زۆر بەدڵسۆزی و زەلیلیەوە داوا لە خودا دەكەم كە دانەری ئەم پەرتووكە و وەرگێڕەكەی و ئەوەی پێیدا دەچێتەوە و ئەوەی بە كەمترین شت یارمەتی دەدات نقوومی ڕەحمەت و فەڕ و پیرۆزی و بەزەیی و سۆز و لێبوردەیی و چاودێری خۆی بكات و بەبێ حیساب، وە زۆر بەسانایی پردی صراط ببڕێ و بگاتە ڕەزامەندی خوا و پلەوپایەی بەرز و مەزن. ئامین..ئامین..ئامین وە صلی الله علی سیدنا محمد وعلی اله وصحبه اجمعین.

وەرگێڕ: سندس علی عباس

٢٥/ذي القعدة/١٤٢

٢٠٠٥/١٢/٢٦

## ١ ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ پەروەردگاری

**باوەڕدار و هۆشیارە**

لە دیارترین ئەو شتانەی ئافرەتی موسڵمانی پێ دەناسرێتەوە باوەڕی قووڵیەتی بە الله، دڵنیابوونیەتی لەوەی هەرچی ڕوودەدات لەم گەردونە و هەرچی دێتە سەر خەڵك لە چارەنوس هەمووی بە قەزا و قەدەری خودایە، هەرچی دوچاری مرۆڤیش بێتەوە ئەوا قەدەریەتی و بەهەڵە نەیپێکاوە، وە ئەوەی دوچاری نابێت و هەڵەی دەکات بۆ ئەوە نەبووە بیپێکێ، ئەوەی پێویستە لەسەر مرۆڤ لەم ژیانەدا تەنها ئەوەیە هەوڵبدات بۆ ڕێگای خێر و دەستبگرێت بە هۆکارەکانی کردەوەی چاك لە دین و دونیای بەڕاستی و دروستی پشت بەخوا ببەستێ و کاروباری خۆی بداتە دەست الله و دڵنیا بێت لەوەی هەردەم پێویستی بە یارمەتی و پشتیوانی و ئاڕاستەکردن و ڕەزامەندی خودایە.

چیرۆکی هاجەر کاتێ ابراهیم (علیه السلام) لە مەککە جێی هێشت لە تەنیشت (دوحە) لەسەر خاکی زمزم، کە لەو کاتە لە مەککە هیچ کەسێك نەبوو، ئاوی لێ نەبوو، بێجگە لە اسماعیلی شیرەخۆر کەسیتری لێ نەبوو، جوانترین نمونە دەخاتە بەردەستی ئافرەتی موسڵمان لەسەر قووڵی باوەڕبوون بە الله، ڕاستی پشت بەستن پێی" کاتێك هاجەر بەشێوەیەکی خۆڕاگر و متمانە و هێمنی و ئارامیەوە بە ابراهیمی وت: (ئایا خودا فەرمانی بەوە پێکردووی ئەی ابراهیم؟) فەرمووی: بەڵێ، لەو کاتەدا وەڵامی هاجەر کە پڕبوو لە ڕەزامەندی و قەناعەت و مژدەبەخشی و ئارامیەوە ئەوەبوو: (کەواتە خودا وێڵمان ناکات)رواه البخاري.

بەڕاستی هەڵوێستێکی یەکجار سەخت بوو: پیاوێك خێزانەکەی و منالە شیرەخۆرەکەی لە خاکێکی وشك جێ بێڵێ، کە نە ئاو نە مرۆڤ نە ڕووەکی تیدا نییە، پاشان بگەڕێتەوە بە ئاڕاستەی وڵاتی دووری شام و هیچیان بۆ جێ نەهێڵێ تەنها هەندێ قەسپ و ئاو نەبێت!! ئەگەر ئەو باوەڕە قووڵە نەبوایە کە دەروون و دڵی هاجەر پڕبوو لێی، ئەگەر ڕاستی پشت بەستنی بەخوا نەبوایە کە ناخ و هەست و هۆشی پڕکردبوو نەیدەتوانی بەرگەی قورسی ئەم هەڵوێستە بگرێت و هەر لە یەکەم

ساتدا دادەڕووخا و نەدەبوویە ئەو ئافرەتە هەمیشە زیندووە کە حاجیانی ماڵی خوا لە نیوە شەو و ساتەکانی ڕۆژ و لەو کاتانەی تێراودەبن لە ئاوی زەمزمی بێگەرد یادی بکەنەوە، هەرچەندە بێن و بچن لە صفا و مەڕوە، وەکو هاتووچۆ کردنەکەی ئەم لەو ڕۆژە دژوارەدا.

ئەم ڕابوونە باوەڕیە بەرهەمی سەیری لێکەوتەوە لە ژیانی پیاو و ئافرەتی موسڵمان. ویژدانەکانی بە ئاگاهێنا، هەستەکانی خرۆشاند، دڵەکانی هۆشیار کردەوە لەوەی خودا چاودێر و بینەری هەموو شاراوە و نهێنییەکانە و لەگەڵ ئادەمیزادە لەهەر کوێ بێت. هەروا چیرۆکی ئەو کچەی لە پەرتوکی (صفة الصفوة ووفيات الأعيان) هاتووە باشترین بەڵگەیە لەسەر بێداری ویژدان و لە خواترسان لەکاتی نهێنی و ئاشکرا، کە ابن الجوزي لە پەرتووکەکەی (أحكام النساء ص٤٤١,٤٤٢)بۆمانی هێناوە، دەڵێ: ((لە عبدالله بن زيد بن أسلم لە باوکی لە باپیری، دەڵێ: شەوێکیان من لەگەڵ عمر بن الخطاب بووم، کە شەوانە لەناو مدینە دەگەڕا تا لە کاروباری خەڵك ئاگاداربێ، ماندووبوو، لە نیوە شەودابوو پشتی دایە لای دیوارێك، لەو کاتەدا گوێبیستی ژنێك بووین بە کچەکەی دەوت: کچەکەم هەڵسە هەندێ ئاو تێکەڵی ئەو شیرە بکە، کچەکە دەڵێ: دایە نەتزانیوە ئەمڕۆ ئەمیر المؤمنین چ بڕیارێکی داوە؟ وتی کچەکەم چی؟ وتی: فەرمانیکرد بانگەوازبکرێت لەناو خەڵکیدا بەوەی نابێت ئاو لەگەڵ شیر تێکەڵ بکرێت، دایکەکە وتی: کچم هەڵسە ئاو لە شیرەکە بکە، تۆ لە شوێنێکی عمر ناتبینێ، کچەکە بە دایکی وت: هەرگیز واناکەم لەناو خەڵکی بە گوێی بکەم و بە تەنیاش سەرپێچی بکەم! عومەریش وا گوێبیستی ئەم دەمەقاڵێیە، وتی: ئەی ئەسلەم، بڕۆ ئەو شوێنە و بزانە ئەو کچەی ئەو قسەیە دەکات کێیە و ئەوەشی دەڵێ ئاو لە شیرەکە بکە کێیە، وەئایا پیاویان هەیە؟ وتی: هاتمە شوێنەکە، بینیم ئەوەی قسەکەی کرد کچێکە شوی نییە، ئەوەیتریش دایکیەتی، هیچ پیاویشیان نییە، ئنجا هاتمەوە لای عمر و هەواڵەکەم پێیڕاگەیاند، ئەمیش بانگی کوڕەکانی کرد و کۆیکردنەوە، وتی: کەسێکتان تێدایە پێویستی بە ژنهێنان بێت؟ وە ئەگەر باوکتان توانای ژنهێنانی مابوایە نەیدەهێشت کەسیتر پێشی بکەوێت بۆ خواستنی ئەو کچە، عبدالله وتی: من ژنم هەیە، عبدالرحمان وتی: منیش ژنم هەیە، عاصم وتی: من بێ ژنم و ژنم بۆ بێنە، ئنجا ناردی بە دوای کچەکە و لە عاصمی مارەکرد، ئەو ئافرەتە لە عاصم کچێکی بوو، ئەو کچەش عمر بن عبدالعزيزی بوو)).

ئەمەیە بێداری ویژدان کە ئیسلام ڕیشەی داکوتاوە لە دەروونی ئەم ئافرەتە موسڵمانە، کە بەم شێوەیە لە خوا دەترسێ و لەسەر ڕێی ڕاستە لەکاتی نهێنی و ئاشکرا، لەناو خەڵك و بەتەنیا" چونکە دڵنیایە خودا هەموو کات لەگەڵیدایە دەبیسێ و دەبینێ، ئەمە بەڕاستی باوەڕی ڕاستەقینەیە، ئەمە بەرهەمی گرانبەهایە خاوەنەکەی بەرزدەکاتەوە بۆ پلەی (الاحسان)، ئەوەبوو خودا پاداشتی خێرای دایەوە و ڕیزی لێنا بەم مارەبڕینە پیرۆزە و پاشانیش لە نەوەی ئەم پێنجەمین خەلیفەی ڕاشیدین هاتە دونیا کە عمر بن عبدالعزیز بوو.

بیروباوەڕی ئافرەتی موسڵمان پاك و بێگەرد و خاوێنە، هیچ پیسیەکی نەفامی لەکەداری ناکات، هیچ تاریکاییەکی بیدعە و ئەفسانە بێگەردی و ڕوونیەکەی لێڵ ناکات، تارمایی خەیاڵ بەرز ڕوانینی ناکوژێنێتەوە. بەڵێ، ئەمە بیروباوەڕێکە دامەزراوە لەسەر باوەڕبوون بە خوای تاك و تەنیا و بەرز و بێنیاز، بەتوانا لەسەر هەموو شتێك، جڵەوی هەموو کاروبارێکیشی لە دەستدایە، گەڕانەوەی هەموو فەرمان و کارێکیش هەر بۆ لای ئەوە: ﴿ قُل مَن بِيدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلاَ يُجَارُ عَلَيهِ إن كُنتُم تَعلَمُونَ. سَيَقُولُونَ لِلَه، قُل فَأَنَى تُسحَرُونَ. واتا: ئەی محمد بڵێ کێیە موڵکی بەرفراوان و گەورەی بەدەستە و کە هەر ئەو بە تەنگەوە دێت و دروستکراوان دەپارێزێت و کەسیش نییە بەتەنگ کەسێك بێت یا بیپارێزێت ئەگەر خودا بیەوێت سزای بدات، ئەگەر ئێوە بزانن؟ ئەو کاتە دەڵێن: تەنها بۆ خودایە ئەو شتانە، تۆش بڵێ: دەی چۆن دەخەڵەتێن و بەتاکی ناگرن وەك بڵێی جادوتان لێکراوە؟!﴾ المؤمنون: ٨٨، ٨٩.

ئەم باوەڕە قووڵ و ڕوون و بێگەردە زیاتر کەسایەتی ئافرەتی موسڵمان بەهێز دەکات و وا دەکات ژیان لەسەر شێوەی ڕاستەقینەیی خۆی ببینێت کە خانووی بەڵاو تاقیکردنەوەیە، ئەنجامەککەی لە ڕۆژێك دەردەکەوێت کە بێگومان دێت و لە پێشمانە: ﴿قُلِ اللَهُ يُحيِيكُم ثُمَّ يُمِيتُكُم ثُمَّ يَجمَعُكُم إلَى يَومَ القِيَامَةَ لاَ رَيبَ فِيهِ وَلَكِنَّ أكثَرَ النَّاسِ لاَ يَعلَمُون. واتا: ئەی محمد بڵێ: خودا زیندوتان دەکاتەوە پاشان دەتانمرێنی پاشان کۆتان دەکاتەوە بۆ ڕۆژی قیامەت (هەڵسانەوە) هیچ گومانی تێدانییە بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن﴾ الجاثية: ٢٦.

﴿أَفَحَسِبتُم أَنَّمَا خَلَقنَاكُم عَبَثًا وَأَنَّكُم إِلَينَا لاَ تُرجَعُون. واتا: وا گومان دەبەن ئێوەمان بە گاڵتە و بێمەبەست دروستکردووە، وە ئێوە بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوە؟!﴾ المؤمنون: ١١٥.

﴿تَبارَكَ الَّذي بِيَدِهِ المُلكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدير، الَّذي خَلَقَ المَوتَ والحَيَاةَ لِيَبلُوَكُم أَيُّكُم أَحسَنُ عَمَلاً وَهُوَ العَزِيزُ الغَفُور. واتا: بەرزی و فەڕو پیرۆزی بۆ ئەو خوایەی کە فەرمانکردن و قەدەغەکردن بە دەستی ئەوە و بەسەر هەموو شتێك توانادارە، ئەو خودایەی مردن و ژیانی دروستکردووە و لەسەرتانی سەپاندووە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامتان کردەوەکانتان باشترە، هەر خۆی بەرز و بەڕێز و لێبوردەیە﴾ الملك: ١،٢.

لەو ڕۆژەدا ئادەمیزاد پاداشتی کردەوەکانی وەردەگرێت، چاکە بە چاکە، خراپەش بە خراپە، بێ ئەوەی یەك تۆسقاڵ ستەمی لێبکرێت:

﴿اليَومَ تُجزَى كُلُّ نَفسٍ بِمَا كَسَبَت لاَ ظُلمَ اليَومَ إِنَّ اللهَ سَرِيعُ الحِسَاب. واتا: ئەمڕۆ هەموو کەسێك پاداشتی کردەوەکانی وەردەگرێت، ئەمڕۆ ستەم کردن نییە، لێپرسینەوە و حیسابی خوای گەورە زۆر خێرایە﴾ غافر: ١٧.

لەو ڕۆژە لێپرسینەوە لەوپەڕی وردەکاری دەبێت چ بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەکە چ لە دژی بێت:

﴿فَمَن يَعمَل مِثقَالَ ذَرَّةٍ خَيرا يَرَهُ، وَمَن يَعمَل مِثقَالَ ذَرَّةٍ شَرا يَرَهُ. واتا: هەرکەسێ یەك تۆسقاڵ چاکە بکات پاداشتەکەی دەبینێتەوە، وە هەر کەسێك یەك تۆسقاڵ خراپە بکات سزاکەی دەبینێتەوە﴾ الزلزلة: ٧،٨.

تەنانەت لەو ڕۆژەدا بچوکترین شت لە خودا ناشاردرێتەوە:

﴿وَنَضَعُ المَوَازِينَ القِسطَ لِيَومِ القِيَامَةِ فَلاَ تُظلَمُ نَفسٌ شَيئًا وَإِن كَانَ مِثقَالَ حَبَّةٍ مِن خَردَلٍ أَتَينَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِين. واتا: لە ڕۆژی قیامەت تەرازوی دادپەروەری دادەنرێ بۆ لێپرسینەوەی خەڵك، هیچ کەسێك ستەمی لێناکرێت، ئەگەر بە ڕادەی کێشی بچوکترین شتێك بێت دەیهێنین و پاداشت

و سزای لەسەر وەردەگرێت و تەنها ئێمە بەسین بۆلێپرسینەوە و حیسابکردنی بەندەکان﴾ الأنبياء: ٤٧.

بێگومان کاتێ ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری تێگەیشتوو لە واتای ئەم ئایەتانە وردەبێتەوە و بەچاوی دانایی ئەم ڕۆژە سەختە دێنێتە بەرچاوی، ئەو کاتە وەکو ملکەچ و تەوبەکار و سوپاسگوزارێك بەرەو پیلی خودا دەچێت، بۆ ئەو ڕۆژە ئەوەندەی لە توانا دابێت لە کردەوەی چاك ئامادە دەکات.

**پەروەردگاری دەپەرستێ**

پێویستە ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ بە چوست و چالاکی ڕووبکاتە پەرستنی خوا" چونکە دەزانێ داوای لێکراوە هەڵسێ بە ئەنجامدانی ئەو کردەوە شەرعیانەی خودا لەسەر پیاو و ئافرەتی موسڵمانی فەرزکردووە، لێرەدا ئەم فەرزەکانی ئیسلام و ئەرکەکانی بەباشترین شێوە بەجێدەگەیەنێ، هەرگیز مۆڵەت وەرگرتن و بەهەند نەزانین و کەمتەرخەمی تێداناکرێت.

**هەر پێنج نوێژە فەرزەکانی ئەنجام دەدات**

ئافرەتی موسڵمان هەر پێنج نوێژی لەکاتی خۆی ئەنجام دەدات، کاروباری ماڵ و ئەرکی دایکایەتی و مێردەکەی لە کردنی نوێژ لەکاتی خۆی سەرقاڵ و بێ ئاگای ناکەن؛ چونکە نوێژ کۆڵەگەی ئاینە، هەرکەسێك نوێژەکانی دامەزراو بێت ئاینیشی دامەزراو دەبێت، هەر کەسێکیش نوێژەکانی فەرامۆش بکات و وازی لێبێنێت ئەوا ئاینی ڕووخاندووە. (إحياء علوم الدين: ١٤٧/١)، نوێژ باشترینی کردەوەکانە، عبدالله بن مسعود ﷺ وتی: پرسیم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کام کردەوە باشترین کردەوەیە؟ فەرمووی: ((نوێژ لە کاتی خۆی))، وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: ((چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك)) وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: ((تێکۆشان لە ڕێی خوادا)) متفق عليه.

چونکە نوێژ پەیوەندییە لە نێوان بەندە و پەروەردگارەکەی، ئەو سەرچاوە بەفەڕەیە کە ئادەمیزاد لێیەوە هێز و خۆڕاگری و بەزەیی و ڕەزامەندی وەدەست دێنێ، بەهۆیەوە هەرچی گوناه

هەیە خاوێن دەبێتەوە: ابو هریرە(ﷺ) وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرمووو: ((ئایا ئەگەر ڕووبارێك لەبەر دەرگای ماڵەکانتان بێت و ڕۆژانە پێنج جار خۆتانی لێبشۆن، هیچ پیسیەکی پێوە دەمێنێت؟)) وتیان: نەخێر، هیچ پیسیەکی پێوە نامێنێت، فەرمووی:((دەی ئەمە وەك پێنج نوێژەکە وایە، خودا گوناهەکانی پێدەسڕێتەوە)) متفق علیه.

نوێژ میهر و ڕەحمەتە لەلایەن خوداوە بۆ بەندەکانی، ڕۆژانە پێنج جار دەچنە ژێر سێبەری، تیایدا ستایش و سوپاسی خوا دەکەن و تەسبیحات و پاك و بێگەردی بۆ خوا بڕیاردەدەن، داوای یارمەتی لێدەکەن، تکای ڕەحمەت و ڕێنمایی و لێخۆشبوونی لێدەکەن. لێرەوە نوێژ دەبێتە خاوێنکەرەوە بۆ نوێژخوێنان، خودا بەهۆیەوە گوناهەکانیان دەسڕێتەوە، تاوان و کەم و کورتیەکانیان دەپۆشێ.

عثمان بن عفان ﷺ وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو دەیفەرمووو: ((هەر مرۆڤێکی موسڵمان ئامادەی نوێژێکی فەرز بێت و بەجوانی دەستنوێژ بگرێت، خشوع و دڵ ئامادەیی و چەمینەوەی باش و جوان بێت، مسۆگەر دەبێتە هۆی سڕینەوەی ئەو گوناهانەی پێش ئەو نوێژە کردوویەتی، ئەگەر گوناهی گەورەی نەکردبێ، بەم شێوەیە بۆ هەموو ڕۆژگاری موسڵمان ئەو ڕەحمەتە بەردەوامە )) صحیح مسلم ١١٢/٣.

فەرمووودە و شوێنەوار و ڕووداوەکان لەسەر گەورەیی نوێژ و گرنگیەکەی و خێر و بەرەکەتی لەسەر نوێژخوێنان زۆر و بەفەڕە، هەموویان جەخت لەسەر خێرە زۆر و گشتگیرەکەی دەکەنەوە کە نوێژخوێنان دەستیان دەکەوێت هەر کاتێك بە ملکەچی و دڵ ئامادەیی لەبەردەستی خودا بوەستن.

### ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ دەبێت لە مزگەوت ئەگەر بۆی ڕەخسا

ئیسلام چاوپۆشی کردووە لە ئافرەت کە ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ بێت لە مزگەوت، لە هەمان کاتدا ڕێگایداوە دەرچێ بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، جاران ئافرەت بەڕاستی دەرچووە و لە پشتی پێغەمبەر ﷺ نوێژی کردووە: خاتوو عائشە دایکی باوەڕداران (رضي الله عنها) دەڵێ: ((پێغەمبەرﷺ کە نوێژی بەیانی دەکرد، چەند ئافرەتێك لە دواوەی نوێژیان دەکرد و بە

جلەکانیان خۆیان دەمامك و شەتك دابوو، پاشان دەگەڕانەوەماڵەوە و کەس نەیدەناسینەوە)) فتح الباری ١/٤٨٢.

هەروا عائشە (رضي الله عنها) دەڵێ: ((ئافرەتانی باوەڕدار لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ئامادەی نوێژی بەیانی دەبوون و، لەناو جلەکانیان خۆیان لوول دەدا، پاش تەواوکردنی نوێژ دەگەڕانەوە ماڵەوە و کەس نەیدەناسینەوە لەبەر تاریکی )) متفق علیه.

پێغەمبەر ﷺ نوێژی کورت دەکردەوە کاتێ گوێی لە گریانی منداڵێك دەبوو" چونکە دەیزانی دایکەکە دڵی بە منداڵەکەی سەرقاڵ دەبێت، کە دەفەرمووێ: ((من دەمەوێ بچمە ناو نوێژ، نیازم وایە درێژی بکەمەوە، کە گوێم لە گریانی منداڵێك دەبێت، نوێژەکەم کورت دەکەمەوە" چونکە دەزانم دایکەکەی چەندە بە گریانی منداڵەکەی سەرقاڵ و شڵەژاو دەبێت )) متفق علیه.

ڕەحمەتی خودا بۆ ئافرەت زۆر گەورەیە کاتێ لەسەری پێویست نەکرد ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ بێت لە مزگەوت بۆ پێنج نوێژە فەرزەکە، وەئەگەر ناچاری بکردایە، ئەوا زۆر لەسەری سەخت دەبوو، ئەرکی سەرشانی قورستر دەبوو، نەیدەتوانی هەموویان لەکاتی خۆی لە مزگەوت بکات، وەك زۆر لە پیاوان ناتوانن بەردەوامبن لەسەر ئەنجامدانی پێنج نوێژە فەرزەکە لە مزگەوت، ناچاردەبن لە شوێنی کارەکانیان نوێژیان بکەن، یان لە ماڵەکانیان، لە زۆربەی کاتدا" ئەمەش لەبەرئەوەیە ئافرەت بەهۆی ئەرکی ماڵەوە و سەرقاڵیە جۆربەجۆرەکانی لە کاروباری ماڵ و مێرد و منداڵ ناتوانێ ڕۆژانە پێنج جار ماڵەکەی جێ بێڵێ، بەڵکو مەحاڵە بتوانێ بەو هەموو کارە هەڵسێ. لە تەنها ناچارکردنی پیاوان بۆ پێویستبوونی ئەنجامدانی نوێژەکان لە مزگەوتەکان جیا لە ئافرەتان حیکمەت و مەبەستی بەرز روون دەبێتەوە، هەروا لەوەی کە نوێژی ئافرەت لە ماڵەکەی خێرتر و باشترە لە نوێژی لە مزگەوت، بەمە ئافرەتی سەرپشك کردووە لە هەڵبژاردنی هەر کامێکیان، ئەگەر حەزبکات لە ماڵەوە نوێژ دەکات، ئەگەریش حەزبکات دەردەچێ و لە مزگەوت نوێژ دەکات و، بۆ مێردەکەی نییە قەدەغەی دەرچوونی بکات ئەگەر مۆڵەتی لێ وەرگرت، وەك خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ: ((ئافرەتان قەدەغە مەککەن لە چوونە مزگەوت، وە ماڵەکانیان باشتر و چاکترە بۆیان)) رواه ابو داود ١/٢٢١.

هەروا دەفەرمووێ: ((ئەگەر یەکێکتان خێزانەکەی مۆڵەتی چوونە مزگەوتی وەرگرت با قەدەغەی نەکات)) فتح الباری ٢/٣٥١. صحیح مسلم ٤/١٦١.

پیاوان ملکەچی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، ڕێگایان دەدا بە ئافرەتان دەرچن بۆ مزگەوت، هەرچەندە ئەگەر ئەم دەرچوونە پێچەوانەی هەوەس و ئارەزوویان بووایە" عبدالله بن عمر ﷺ وتی: ((خێزانی عمر ﷺ ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵی بەیانی و خەوتنان (عیشا) دەبوو لە مزگەوت. پێی وترا: بۆچی دەردەچی بۆ مزگەوت کە دەشزانی عمر حەزی لە دەرچوونت نییە و غیرە دەکات؟ وتی: باشە چی بەرگری دەکات لەوەی قەدەغەم بکات؟ وتی: فەرمانەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە دەفەرمووێ: ((بەندەکانی خودا (ئافرەتان) قەدەغە مەککەن لە مزگەوتانی خودا)) ((لا تمنعوا إماء الله مساجد الله)) فتح الباري ٢/٣٨٢.

لە بەرامبەر ئەم مۆڵەتدانە بۆ ئافرەتان تا بچنە مزگەوت و، قەدەغەیان نەکەن، مزگەوتەکان هاتنی ئافرەتانیان بەخۆوە دەدی لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەو سەردەمەش هەرکاتێك بۆی بڕەخسایە دەهات و نوێژی ئەنجامدەدا و ئامادەی بانگەوازی خێر دەبوو و گوێبیستی ئامۆژگاری دەبوو و، بەشداری ژیانی گشتی موسڵمانانی دەکرد، ئەمەش لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە نوێژی بەکۆمەڵ فەرمانی پێکرا لەژیانی موسڵمانان. جاران موسڵمانان ڕووەو بیت المقدس نوێژیان دەکرد پێش ئەوەی ڕووگەیان بگوێزرێتەوە ڕووەو کەعبەی ڕیزدار، کاتێ فەرمانی ڕووکردنە کەعبە دابەزی، ڕووی نوێژخوێنان لە ئافرەتان و پیاوان بە ئاڕاستەی وڵاتی شام بوو، لەو کاتە هەموو ڕوویانکردە کەعبە، بەمەش پێویستی کرد ئافرەتان بچنە شوێنی پیاوان و، پیاوانیش بچنە شوێنی ئافرەتان. متفق علیە.

مزگەوت ئەو کاتە و ئێستاش بنکەی دەرچوونی تیشك و ڕووناکی و ڕێنماییە بۆ موسڵمانان چ ئافرەت چ پیاو" لە پانتاییە بێگەردەکەی پەرستش ئەنجامدەدرێت، لە بڵندگۆیدا ئامۆژگاری و ڕێنمایی و ئاڕاستەکردن پەخش دەکرێت، ئافرەتی موسڵمانیش هەر لە بەرەبەیانی هاتنی ئیسلامەوە بەشداری و ئامادەیی تێدابووە.

ئەو دەقە ڕاستانەی جەخت لەسەر ئەم بەشداریکردن و ئامادەبوونە دەکەنـەوە زۆرن و بـاس لـە ئامادەبوونی ئافرەت دەکەن لە نوێژی هەینی، نوێژی خۆرگیران، نوێـژی دوو جەژنـە، هـاتن بـەرەو پیلی بانگی: (الصلاة جامعة).

لە صەحیحی موسلم هاتووەوە کە ام هشام بنت حارثة بن النعمان وتی: ((من (ق والقرآن المجید)م - مەبەستی سورەتی (ق)ە- تەنها لە زمانی پێغەمبەر ﷺ وەرگرتـووە و ئەزبـەرکردووە، هـەموو هەینییەك لەسەر مینبەر دەیخوێند کاتێ وتاری بۆ خەڵك بخوێندایەوە))صحیح مسلم ١٦٢/٦.

ڕێنماییەکانی پێغەمبەر هاتن سەبارەت بە جوان خۆئامادەکردن بـۆ نوێـژی هـەینی بـە هانـدان لەسەر پاك و خاوێنی و خۆشوشتن بۆ پیـاوان و ئافرەتـان: وەك دەفـەرمووێ: ((هەرکەسـێ هاتـە نوێژی هەینی با خۆی بشوات)) فتح الباری ٣٥٧/٢.

بخاری لە ئەسمائی کچی ابوبکر ﵄ دەگێڕێتەوە: وتوویەتی: ((لـە نوێـژی خـۆرگیران پێغەمبـەر ﷺ وتاری بۆ خوێندینەوە و باسی دژواری و بەڵاکانی ناو گۆڕی کرد کە مرۆڤ دوچاری دەبێتـەوە، کاتێ ئەمەی باسکرد موسڵمانان بوو بە گریـان و غەڵبـە غـەڵبیان، بـووە هـۆی ئـەوەی کۆتـایی وتارەکە نەبیسم!کاتێ خەڵکەکە بێ دەنگبوون لـە پیـاوێکی نزیکـی خـۆمم پرسـی: خـودا فـەڕ و پیرۆزیت تێخا، ئایا پێغەمبەر ﷺ لە دوا قسەی چی فەرمووو؟ وتـی: فـەرمووی: ((سروشـم بـۆ هاتووەوە کە ئێوە دوچاری فتنە و سەختی دەبن لەناو گۆڕەکان نزیك لە فتنـەی دەجـال ...)) فـتح الباری ٢٣٦/٢، ٢٣٧.

ئەسمائی کچی ابوبکر ﵄ دەڵێ: (( لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ خۆرگیرا...، منیش پێویستی خۆمم جێبەجێکرد، پاشان هاتمە مزگەوت و بینـیم پێغەمبـەر ﷺ وەسـتاوە، منـیش لەگـەڵی وەستام، وەستانەکەی زۆر درێژکردەوە، هێندەی نەمابوو دانیشم، پاشان بیرم بۆ لای ئـافرەتی لاواز دەچێت و لە دڵی خۆما دەڵێم: ئەوە لە من بێتواناترە، ئیتر خۆڕاگر دەبم و دەوەستم. ئنجـا چـووە چەمینەوە، پاشان سەری بەرزکردەوە، زۆر بە وەستاوی مایەوە، هەتا پیاو هـەبوو خـەیاڵی دەبـرد ڕکوعی نەبردووە، پاشان سەلامی دایەوە و خۆریش لـە ئاسمـان بـەردرا، ئنجـا وتـاری بـۆ خـەڵك

خوێندەوە و، سوپاس و ستایشی خوایکرد، پاشان فەرمووی: أما بعد ...)) فتح البـاری ٥٢٩/٢. صحیح مسلم ٢١٢/٦.

ئافرەتی موسڵمان لەسەردەمی زێرینی پێغەمبەرایـەتی ڕۆشـنبیربوو بـە کاروبـاری ئاینەکـەی، بایەخی دەدا بەفێربوونی هەموو ئەو ڕووداوانـەی ڕوویـان دەدا لەسـەر گۆڕەپـانی گشتی کـە بـۆ موسڵمان بایەخداربوو لە دونیا و دوارۆژیدا، کاتێك گوێبیـستی بـانگی (نوێـژ بەکۆمەڵـە) دەبـوو لەناو خەڵکی جاڕی دەدا، خێرا ڕادەپەڕی بۆ مزگەوت تـا هەرچـی لـە بڵنـدگۆی پێغەمبـەر ﷺ دەردەچێ لە ڕێنمایی گوێبیستی بێت" فاطمـة بنـت قـیس کـە یـەکێ بـوو لـە ئافرەتـە کۆچـبەرە پێشینەکان، وتی: ((لە نێو خەڵکی بانگی نوێژ بەکۆمەڵە درا، منیش یەکێ بووم لەوانەی ڕاپـەڕین بۆ مزگەوت، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژم کرد، من لە ڕیزی پێشەوەی ئافرەتان بووم، کـە دەکاتـە ڕیزی پاش ڕیزی پیاوان ))صحیح مسلم ٨٤/١٨.

لەم دەقە ڕاستانەی ڕابووردین دەرکەوت ئافرەتی موسڵمان لـە بۆنـە جۆرێوجۆرەکـان مزگـەوتی پڕکردبوو، ئەم چوونە مزگەوتەش ببوویە شتێکی ئاسایی و باو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ.

پێغەمبـەر ﷺ ڕەوشـی ئـافرەتی لەبەرچـاوبوو ئامـادەی نوێـژی بەکۆمـەڵ دەبـوو و بـەزەیی دەهاتەوە پێی، لەو کاتەی گوێبیـستی گریـانی منداڵێـك دەبـوو نوێـژی کـورت دەکـردەوە نـەبادا دایکەکەی مێشکی پێـوەی سـەرقاڵ بێـت وەك پێـشتر لـە فـەرمووودە باسـان کـرد. جارێکیـان پێغەمبەر ﷺ- نوێژی خەوتنان (عیشا)ی دواخست، تا عمر بانگیکرد و وتی: هەرچی ئافرەت و منداڵە هەموویان نوستوون، ئنجا پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ نوێژ و فەرمووی: ((سوێند بەخوا لـە ئێوە زیاتر کەسیتر لەسەر ڕووی ئەم زەمینە چاوەڕوانی ئەم نوێژە ناکات )) فتح البـاری ٣٤٧/٢. صحیح مسلم ١٣٧/٥.

دەقی ڕاستی زۆر هاتووە کە بـاس لـە ڕێکخـستنی پێغەمبـەر ﷺ دەکـات بـۆ کاروبـاری ئافرەتـان لـە نوێـژی بەکۆمـەڵ، وەك دەفـەرمووێ: (( باشـترین ڕیـز ڕیـزی پێـشەوەی پیاوانـە، خراپترینیان کۆتاییەکەیەتی. باشترین ڕیزی ئافرەتان ڕیزی دواوەیە، خراپترینیان ڕیـزی پێـشەوەیانە )) صحیح مسلم ١٥٩/٤.

بوخاری دەگێڕێتەوە لە هند بنت الحارثة کە دەڵێ: أم سلمة هاوسەری پێغەمبەر ﷺ پێی وتم: ((ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە نوێژی فەرز سەلامیان دەدایەوە، یەکسەر هەڵدەستان و دەڕۆیشتنەوە، وەپێغەمبەر ﷺ و پیاوانی نوێژخوێن دەمانەوە تا خوا بیویستایە، ئنجا کاتێ پێغەمبەر ﷺ هەڵسابووایە پیاوەکانیش هەڵدەستان )) فتح الباری ٣٤٩/٢.

بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە لە سهل بن سعد الساعدی، وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ بەپیاوانی فەرمووە: ((بۆچی دەتانبینم لە نوێژا زۆر چەپڵە لێدەدەن؟! ئەوەی لە نوێژا شتێکی تێبینیکرد با سبحان الله بکات" چونکە کاتێ سبحان الله دەکات من هۆشدار دەبمەوە بۆ لای، بەڵکو چەپڵە لێدان بۆ ئافرەتانە )) متفق علیه. شرح السنه ٢٧٣/٣.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەی ئەو ئافرەتانە زیادی دەکرد، هەتا وای لێهات لە سەردەمی عباسیەکاندا پانتایی مزگەوتیان پڕکردبوو، بەم جۆرە پیاوان ناچار دەبوون لە دوای ئافرەتانەوە نوێژبکەن، ئەمەش فەتوایەك بوو لەلایەن ئیمامی مالك دەرچوو، وەك چۆن لە پەرتووکی (المدونة الکبری: ١٠٦/١) دا هاتووە: ابن القاسم دەڵێ: لە مالکم پرسی سەبارەت بە کۆمەڵێك دێنە مزگەوت و دەبینن پانتایی مزگەوت پڕبووە لە ئافرەت، مزگەوتیش پڕە لە پیاو، پیاوان بە نوێژی ئیمام لە دواوەی ئافرەتانەوە نوێژ دەکەن؟ مالك وتی: نوێژیان تەواوە و نایگێڕنەوە.

نابێ دەرچوونی ئافرەتی موسڵمان بۆ نوێژکردن لە مزگەوت ببێتە مایەی سەرهەڵدانی فتنە و خراپەکاری" چونکە بەپێی ڕێنماییەکانی ئیسلام نوێژ مایەی پاك ڕاگرتنی ڕەفتار و کاروبار و بۆنە ئاینییەکانە لە کۆمەڵگە. ئەگەر بەهۆی دەرچوونی ئافرەت بۆ مزگەوت مەترسی سەرهەڵدانی فیتنە و خراپەکاری کرا بەهەر هۆکارێك لە هۆکارەکان، ئەو کاتە نوێژکردنی لە ماڵەوە زۆر باشترو پێویستترە، هەر ئەمەشە لەم فەرموودەیە تیشکی خراوەتە سەر: ((لا تمنعوا نساءکم المساجد وبیوتهن خیر لهن)) پێشتر ڕاڤەکراوە.

وا دەردەکەوێ هەندێ لە پیاوان لە بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و خراپەکاری دەترسان، ئیتر ئەمەی دەکردە پاساو قەدەغەی ئافرەتەکەی دەکرد لە دەرچوون بۆ مزگەوت. لێرەدا ڕێنمایی پێغەمبەرایەتی هات و دەرچوونی ئافرەتی بۆ مزگەوت و ئامادەبوونی لە نوێژی کۆمەڵ ماوە نا

ماوه بە شتێکی گرنگ دانا کە دەست بەرداربوونی لێنییە، فەرمووودەیتر هات سووربوونی پێغەمبەر ﷺ دوپاتکردەوە لەسەر ئامادەبوونی ئافرەت لە دیمەنی خێر و بانگەوازی موسڵمانان لە مزگەوتەکان. مجاهد لە ابن عمر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ژنان لە دەرچوون بۆ مزگەوت لەکاتی شەوا قەدەغە مەککەن)) کوڕێکی ابن عمر لەو کاتەدا دەڵێ: قەدەغەی دەرچوونیان نەکەین و لەکاتێکدا بیکەن بە گەندەڵی و خراپەکاریلوتی: ابن عمریش خۆی لێ تورە دەکات و دەڵێ: من دەڵێم: پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووە، تۆش دەڵێی قەدەغەیان دەکەین !! صحیح مسلم ٤/١٦٢،١٦١.

بلالی کوڕی عبدالله کوڕی عمر لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((قەدەغەی ئافرەتان مەککەن لە وەرگرتنی پشکی خۆیان لە مزگەوت ئەگەر مۆڵەتیان لێتان وەرگرت)) بلالی کوڕی عبدالله دەڵێ: سوێند بەخوا قەدەغەیان دەکەین، عبدالله لە وەڵاما دەڵێ: من دەڵێم پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووە، تۆش دەڵێی: سوێند بەخوا قەدەغەیان دەکەین!! صحیح مسلم ٤/١٦٣،١٦٢.

لەگەڵ ئەم فەرموودانە: (( لا تمنعوا نساءكم المساجد إذا استأذنَّكم إليها)) صحيح مسلم ٤/١٦١. وە ((لا تمنعوا إماءالله مساجد الله)) فتح الباري ٢/٣٨٢. صحيح مسلم ٤/١٦١. وە ((إذا استأذنكم نساؤكم إلى المسجد فأذنوا لهن)) صحيح مسلم ٤/١٦١. پێشتر ڕاڤەکراون و لە دەوری یەك مەبەست دەخولێنەوە.

ئامادەبوونی ئافرەتی موسڵمان بۆ نوێژی بەکۆمەڵ شتێکی مۆڵەت پێدراوە و خێرێکی زۆری تێدایە، بەڵام بەستراوە بەچەند مەرجێك، گرنگترینیان ئەوەیە کە ئافرەت نابێ خۆی بۆنخۆش بکات و زینە و جوانکاری بەکاربێنێ، زينب الثقفية لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: ((ئەی کۆمەڵی ئافرەتان ئەگەر یەکێك لە ئێوە ئامادەی نوێژی خەوتنان بوو با لەم شەوەدا خۆی بۆنخۆش نەکات)) صحیح مسلم ٤/١٦١.

فەرموودەی زۆر هەنە لەسەر قەدەغەکردنی ئافرەت لە بۆنخۆشکردنی خۆی کاتی دەرچوونی بۆ مزگەوت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ بە ئافرەتان: ((ئەگەر یەکێك لە ئێوە هاتە مزگەوت با خۆی بۆنخۆش نەکات)) صحیح مسلم ١٦١/٤ هەروا دەفەرمووێ: ((هەر ئافرەتێك خۆی بۆنخۆش بکات با لەگەڵ ئێمەدا ئامادەی نوێژی خەوتنان نەبێت)) صحیح مسلم ١٦٣/٤.

## ئافرەتی موسڵمان ئامادەی نوێژی دوو جەژنە دەبێت

ئیسلام ڕێزی لە ئافرەت ناوە، وەکو پیاو ئەرکی پەرستنی پەروەردگاری پێ سپاردووە، هانی داوە بۆ ئامادەبوونی لە بۆنە گشتیەکان لە جەژنی ڕەمەزان و قوربان، تا ئامادەی بیستنی خێر و بانگەوازی موسڵمانان بێت. ئەم ڕیزلێنانە لە چەندین فەرموودەی صەحیحی بوخاری و موسلما هاتووە، تیایاندا پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکردووە هەموو ئافرەتان دەرچن بۆ بینینی ئەم دیمەنانە، لەو ئافرەتانەی هەرزەکارن، ئافرەتی نێو کەژاوە، ئافرەتی ماڵەوە، کچانی شوو نەکردوو، تەنانەت ئافرەتی بێنوێژیش فەرمانی دەرچوونیان پێکراوە، بەڵام ئەوان بەشداری نوێژکردن ناکەن، تا ئامادەی خێر و بانگەوازی موسڵمانان بن.

گرنگی دانی پێغەمبەر ﷺ بە دەرچوونی ئافرەتان بۆ نوێژی دوو جەژنە گەیشتە ئەو ڕادەیەی فەرمان بکات بەو ئافرەتەی زیاتر لە جلێکی هەیە بیدات بە خوشکەکەی تا لەبەری بکات. ئەمەش هاندانە بۆ ئامادەبوون لە نوێژی جەژن بۆ هەموو ئافرەتان، وە ئامۆژگاری کردنە لەسەر یەکسانی و بەیەکەوە ژیان و هاریکاری لەسەر خێر و تەقوا و چاکە.

أم عطیة دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردووین هەرچی ئافرەتی هەرزەکارە و ئافرەتی ناو کەژاوەیە، دەرکەین بۆ نوێژی دوو جەژنە، بەڵام بۆ ئافرەتی بێنوێژ فەرمانیکرد لە دووری نوێژخوێنان بوەستن)) صحیح مسلم ١٧٩/٦، ١٧٨.

هەروا أم عطیة دەڵێ: ((ئێمە و کچی ماڵەوە وکچی شونەکردوو فەرمانمان پێدەکرا بە دەرچوون لە دوو جەژنەکە، وتی: ئافرەتی بێنوێژیش دەردەچوون، بەڵام لە پشت خەڵکی دەبوون و لەگەڵ خەڵکی الله اکبریان دەکرد)) صحیح مسلم ١٧٩/٦.

هەروا أم عطية دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ‌کردین بە دەرکردنی هەرچی کچی هەرزەکار و بێنوێژ و کچانی ناو کەژاوە هەنە بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان و قوربان، هەرچی بێنوێژەکانن نوێژ ناکەن، بەڵام ئامادەی خێر و بانگەوازی موسڵمانان دەبن، وتم: ئەی نێردراوی خوا، هەمانە جلی داپۆشەری نییە، فەرمووی: با خوشکەکەی لە جلی خۆی لەبەری بکات)) صحیح مسلم ٦/١٨٠.

لە صحیحی بوخاری، محمد بن سلام بۆمان دەگێڕێتەوە: عبد الوهاب پێی ڕاگەیاندووین لە ئەیوبەوە لە حفصة کچی سیرین دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ((ئێمە کچانی هەرزەکارمان قەدەغەدەکرد لە دەرچوون بۆ نوێژی دوو جەژنە. جا ئافرەتێك هاتە شارەکەمان و لە کۆشکی (بنی خلف) دابەزی، باسی خوشکی خۆی دەکرد، مێردی خوشکی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دوازدە جەنگی بینیووە، خوشکەکەشی لە شەش جەنگا لەگەڵیدابووە، وتی: ئێمە چارەسەری برینداران و چاودێری نەخۆشمان دەکرد، جا خوشکم لە پێغەمبەر ﷺ ی پرسیارکرد: ئایا ئەگەر کەسێکمان جلی داپۆشەری نەبوو هیچ گوناهی دەگات ئەگەر دەرنەچێ؟فەرمووی: ((با دەستە خوشکەکەی لە جلی خۆی لەبەری بکات و ئامادەی خێر و بانگەوازی موسڵمانان بێت)) حفصة وتی: کاتێ أم عطیة هات چوومە لای و لێم پرسی: ئایا گوێت لە پێغەمبەر ﷺ بووە؟ وتی: باوکم بەقوربانی بێت، بەڵێ ـ جا هەرچەندە ناوی پێغەمبەری ﷺ ببردایە دەیوت باوکم بەقوربانی بێت ـ گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ((با کچانی هەرزەکاری ناو کەژاوە، یان کچانی هەرزەکار و کچانی ناو کەژاوە و بێنوێژ دەرچن، تا ئامادەی خێر و بانگەوازی موسڵمانان بن، با بێنوێژان دوورەپەرێزی مزگەوت بوەستن)) حفصة وتی: پێم وت: ئایا بێنوێژیش دەرچێ؟ وتی: بەڵێ، بۆچی نا، ئایا بێنوێژ لە حەجا ناچێتە عەرەفە، ئامادەی فلانە شوێن و فیسارە شوێن نابێت؟)) فتح الباری ٢/٤٦٩.

ئەم فەرموودە ڕاستانە بەڵگەی ڕۆشنن لەسەر گرنگیدانی پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆشنبیرکردنی هۆش و هەستی ئافرەتی موسڵمان، بۆیە فەرمانی بە دەرچوونی سەرجەم ئافرەتان کرد تەنانەت بێنوێژیش لەگەڵ ئەوەی بێنوێژ لە نوێژکردن بەخشراوەو دروست نییە بچێتە مزگەوت،

بانگەوازەکەی سەرجەم ئافرەتانی گرتەوە، بایەخدانێکی پێغەمبەر ﷺ بوو لەسەر بەشداریکردنیان لەم دوو بۆنە گەورەیە، تا ئامادەی بینینی دیمەنی خێر و بانگەوازی موسڵمانان بن، لەگەڵ الله اکبر و دوعای وان ئەوانیش الله اکبر و پاڕانەوە بکەن، تا لەگەڵ کێشە و ناڵەی موسڵمانان بژین کە لە بڵندگۆی مزگەوت لەکاتی وتاری جەژن باس دەکرێت.

پێغەمبەر ﷺ زۆر بەتەنگ ڕۆشنبیرکردنی ئافرەت و ڕێنماییکردن و بەشداری پێکردنی بوو لە ئەرکی دروستکردنی کۆمەڵگەی موسڵمان، ئەوەتا مسلم و بوخاری لە ابن حزم دەگێرنەوە، وتوویەتی: عطاء لە جابر بن عبدالله دەگێڕێتەوە، وتی: گوێم لە جابر بوو دەیوت: ((پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان هەڵسا و نوێژیکرد، سەرەتا نوێژیکرد پێش وتاردان، پاشان وتاری بۆ خەڵك خوێندەوە. کە لە وتارەکە تەواوبوو لەسەر مینبەر دابەزی و هاتە لای ئافرەتان و ئامۆژگاری کردن و پاڵی بەدەستی بلال دابوو، بلالیش جلەکەی ڕاخستبوو، ئافرەتان خێر و صەدەقەیان دەکردە ناوی. بە عطام وت: زەکاتی سەرفیترە بوو؟ وتی: نەخێر، بەڵکو تەنها خێر و صەدەقە بوو لەو ڕۆژە کردیان، ئەنگوستیلەی گەورە و گرانبەهایان دەکردە ناو جلەکەی بلال. بە عطام وت: ئایا واجبە لەسەر پێشەوای ئەمرۆ کە لە وتار بوویەوە بچێتە لای ئافرەتان و ئامۆژگاریان بکات؟ وتی: سوێند دەخۆم کە ئەمە واجبە لەسەریان، نازانم لەبەر چی واناکەن؟ ))
فتح الباری ٢/٤٦٦ ومسلم ٦/١٧٤.

هەروا مسلم و بخاری لە ابن طاوس، لە ابن عباس رضي الله عنه دەڵێ: ((نوێژی جەژنی ڕەمەزانم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و لەگەڵ ابوبکر و عمر و عثمان بینیووە، هەموویان نوێژیان پێش وتار ئەنجامداوە، پاشان وتاریان خوێندۆتەوە. وتی: پێغەمبەر ﷺ دابەزی وەك ئێستا لەبەر چاومە فەرمانیدەکرد بە پیاوەکان لەبەردەمی دانیشن، پاشان لە پیاوان لایدەدا و دەهاتە سەر ئافرەتان، بلالیشی لەگەڵ بوو، ئنجا ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أن لاَ يُشرِكنَ بِاللهِ شَيئًا . . .﴾ ئەم ئایەتەی خوێندەوە تا تەواویکرد، پاشان فەرمووی: ئێوە لەسەر ئەم پەیمانەن؟ تەنها یەك ئافرەت وتی: ـ کە بێجگە لەم کەسیتر وەڵامی نەدایەوە ـ بەڵێ

ئەی پێغەمبەری خوا ـ ئەو کاتە نەیانزانی ئەو ئافرەتە کێیە ـ[1] وتی: صەدەقەکانیاندا، بلالیش جلەکەی ڕاخست، پاشان وتی: دەی وەرن صەدەقەکانتان بێنن دایکم و باوکم بە قوربانتان بێت، ئنجا ئافرەتەکان دەستیانکرد بە فڕێدانی ئەموستیلەی قەبەی دەستیان بۆ ناو جلەکەی بیلال)) فتح الباری ٢/٤٦٦ ومسلم ٦/١٧١.

بێگومان یادخستنەوەی پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت بۆ ئافرەتان و ئامۆژگاری کردنیان و صدقە وەرگرتن لێیان و جەختکردن لەسەر بەردەوامبوون و سووربوونیان لەسەر پەیمان (البیعە)، داواکاری و ئەرکێکە بۆیان بۆ هەڵسان بە کاروباری ئەم ئاینە، پاڵنەریانە بۆ گۆڕەپانی کردەوەی چاك. ئەمانە هەمووی دەگەرێتەوە بۆ بانگکردنیان بۆ نوێژی بەکۆمەڵ لە دوو جەژنە“ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی نوێژی بەکۆمەڵ لە ژیانی تاك و کۆمەڵ لە کۆمەڵگەی ئیسلامی.

هەرچەندە ئیسلام ئافرەتی ناچارنەکردووە بۆ ئامادەبوون لە نوێژی بەکۆمەڵ لە مزگەوت، بەڵام لە هەمان کاتدا بەباشی داناوە کۆمەڵێك ئافرەت لە شوێنێك کۆببنەوە و نوێژی فەرزیان بە کۆمەڵ بکەن، پێشنوێژ لە نێوانیاندا بوەستێ و پێشیان نەکەوێت، بانگ و قامەتیشیان لەسەر پێویست نییە: ئەمەیە کە دایکی باوەڕداران أم سلمە کردوویەتی کاتێ پێش نوێژی کردووە بۆ ئافرەتان[1].

### نوێژە سووننەتە ڕاتبەکانی و سوننەتەکانی تری ئەنجام دەدات

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو تەنها بەوە ناوەستێ پێنج نوێژە فەرزەکە ئەنجامبدات، نوێژە ڕاتبەکانیش دەکات، سوننەتەکانیتریش ئەنجام دەدات هەر کاتێ دەرفەت و توانای هەبێت، وەك نوێژی چێشتەنگاو، سوننەتی پاش مەغریب، شەونوێژ“ چونکە پەرستشە سوننەتەکان بەندە لە پەروەردگاری نزیك دەکاتەوە و، دەچێتە ژێر باڵی خۆشەویستی و ڕەزامەندییەکەی، دەیکاتە بەندەیەکی چاك و گوێڕایەڵ و براوە. وەك لەم فەرموودە قدسیەدا هاتووە دەفەرموێ: ((بەردەوام بەندەم لێم نزیك دەبێتەوە بە ئەنجامدانی پەرستشە سوننەتەکان تا خۆشیم دەوێت،

---

[1] ابن حجر لە فتح الباري ٢/٤٦٨ پێ کەوتۆتەوە کە ئەو ئافرەتە أسماء بنت يزيد بن السكن کە ناسراوە بە وتار بێژی ئافرەتان، و ئافرەتێکی بوێر بووە.

[1] سەیری أحكام النساء لابن الجوزي بکە: ١٨٦، ٢٠٤ ط. بيروت. سەیری المغني لابن قدامة ٢/٢٠٢ ط.الرياض بکە.

## بەجوانی نوێژەکانی ئەنجام دەدات

ئافرەتی موسڵمانی تەقوادار جەخت لەسەر جوان ئەنجامدانی نوێژەکانی دەکاتـەوە، بەشـێوەیەك پڕبێت لە ئامادەیی دڵ، خشوعی ئەندامەکان، وردبوونەوە لە واتای ئـەو ئایەتانـەی دەیـانخوێنێ و ئەو تەسبیحات و پاڕانەوانەی لە دەمت دەردەچێ، بۆیە دەروونی نوێژخوێن پڕدەبێت لـە ملکەچـی بۆ خوا، دڵیشی لێدەدات بە ڕێنمایی خوا و سوپاسگوزاری و بەندایـەتی بـۆی، کاتـێ خـەیاڵێکی شەیتانی بۆ هات تا لەو ئامادەبوونی دڵ و بێگەردی هزرە لایبدات، خێرا پەنا دەباتەبەر دەرکردنی بە وردبوونەوە لە وتەی الله و تەسبیحات و سوپاس و ستایش.

ئافرەتی موسڵمان یەکسەر دوای نوێژ ناچێتە سەر کاری ناوماڵ و سـەرقاڵیەکانی ژیـان، بـەڵکو ٣جار استغفر الله دەکات، پاشان ئەو نزایە دەکات کە پێغەمبەر ﷺ کردوویـەتی: ((اللـهم انـت السلام ومنك الـسلام تبارکـت یـا ذا الجلال والإکـرام)) صـحیح مـسلم ٥/٨٩،٩٠ ، پاشـان ئـەو ویردانەی پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژ خوێندوویەتی ، دەیخوێنێ گرنگترینیان ئەوەیە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموورویەتی: ((هەر کەسێ پاش هەموو نوێژێك ٣٣ جار سبحان الله، ٣٣ جـار الحمـد لله، ٣٣ جار الله اکبر بکات، کە دەکاتە ٩٩، لە جاری سەد بڵێ: لا اله الا الله وحده لا شریك لـە، لـه الملك وله الحمد وهو علی کل شيء قدیر، خودا لە گوناهی خۆش دەبێت، ئەگەر وەکو کـەفی سـەر دەریاش وابێ)) صحیح مسلم ٥/٩٥.

پاشان بە پاڕانەوەیەکی قووڵی ناو دڵ داوا لە خوا دەکات کاروبـاری لـە دونیـا و دوارۆژدا چـاك بکات، بەخششە دیار و شاراوەکانی بەسەردا ببارێنـێ، ڕاسـتەڕێی و ڕێنمـایی پـێ ببەخـشێ لـە کارەکانیدا.

بەم شێوەیە ئافرەتی موسڵمان پێویستە لە نوێژ دەربچێت، کە دەروونـی خـاوێن بۆتـەوە، دڵـی ملکەچبووە، گیانی بێگەرد و پاك کردۆتەوە، هەموو بوونی پڕکـردووە لـە وزەیـەکی گیـانی، کـە کۆمەکی دەکات لە بەرەنگاری بوونەوەی سەختیەکانی ژیان و خەمی ماڵ و دایکایـەتی، لـە ژێـر چاودێری و پاراستنی خودای خۆی دەڕوات، ناترسێ کاتێك دوچاری ناخۆشیەك دەبێتەوە، وە ئەگەر توشی خێر و خۆشی هات دەوروبـەری لـە خۆشـیەکەی خـۆی بەشـداری پێدەکـات، ئەمـە کـاری ئافرەتی نوێژکاری ڕاستگۆی دڵ زیندووە: ﴿إِنَّ الإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًـا، إذا مَـسَّهُ الـشَّرُّ جَزُوعًـا، وَإِذَا

مَسَّهُ الخَيرُ مَنُوعَا، إلاَّ المُصَلِّين، الَّذِينَ هُم عَلَى صَلاَتِهِم دَائِمُونَ، والَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِم حَقٌ لِلسَّائِلِ وَالَمحرُوم. واتا: ئادەمیزاد کە دروستکراوە زۆر بێزار و دەستگرە بە دونیا، کاتێك دوچاری ناخۆشیەك دەبیت زۆر بە هەڵپە هەڵپ و خەفەتبارە، کاتێکیش خێرو خۆشیەکی توش دەبێت دەیگرێتەوە لە دەوروبەر و ئەوانەی شایستەن بەو خێرە، تەنها نوێژخوێنان نەبن، ئەوانەی بەردەوام نوێژەکانیان دەکەن، ئەوانەی لە ماڵەکانیان مافی دیاری کراویان هەیە، بۆ سوالکەر و بۆ ئەوەی هەژارە و داوا ناکات﴾ المعارج: ١٩ ـ ٢٥ .

**زەکاتی ماڵی خوا لە ماڵەکەی دەردەکات**

ئافرەتی موسڵمان زەکات لە ماڵەکەی دەردەکات، ئەگەر خاوەنی وەها ماڵ وداراییەك بوو کە زەکاتی تێدا واجب دەبوو، هەموو ساڵێك بە وردی ماڵەکەی دەژمێرا و ئەوەندەی زەکاتی لێبکەوێت زۆر بە دەستپاکی و بە وردی وەکوو فەرزێك دەری دەکات" چونکە زەکات پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام، دروست نییە ساردی و تەمبەڵی و مۆڵەت وەرگرتن بکرێ لە دەرکردنی لە هەموو ساڵێکدا، هەرچەندە یەکجار زۆریش بێت. وە هەرگیز بە مێشك و دڵی ئافرەتی موسڵمانی تەقواداری ڕۆشنبیر نایەت ڕابکات لە دەرکردنی زەکات ئەگەر شتێکی کەمیش بێت لەو ماڵەی زەکاتی لێدەکەوێت.

چونکە زەکات فەریزەیەکی ماڵی پەرستشی دیاریکراوە، خودا لەسەر هەموو موسڵمانێکی فەرزکردووە کاتێ ماڵەکەی بگاتە ڕادەی (نصاب) زەکات، چ ئافرەت بێ چ پیاو، وە ئەوەی زەکات نەدات و نکۆڵی لە فەرزیەتی و واجب بوونی بکات ئەوا بە هەڵگەڕاوە و کوفرێکی ئاشکرا دەژمێردرێت، دەبێ کوشتاری لەگەڵدا بکرێ و خوێنی حەڵاڵ دەکرێ، تا ئەو کاتەی بە تەواوی دەیدات وەك چۆن ئەحکامەکانی ئاین روونیانکردۆتەوە، ئەوەتا هەڵوێستی ابوبکری صدیق ﷺ بەرامبەر بە کۆمەڵی هەڵگەڕاوەکان (اهل الردە) ئەوانەی ڕازی نەبوون زەکات بدەن، چەند وشەیەکی زیندون هەموو کات بە گوێی زەمانە دەزرنگێتەوە: ((سوێند بەخوا جەنگ و شەڕ دەکەم لەگەڵ ئەوانەی جیاوازی دەکەن لە نێوان نوێژ و زەکاتدا)) صحیح مسلم ٢٠٧/١.

ئەم وشە زیندووانە بانگەواز بۆ گەورەیی ئەم ئاینە دەکەن، کە ئاین و دونیا بەیەکەوە گرێ دەدات، پەردە لادەدات لەسەر تێگەیشتنی قوولّی ابوبکرﷺ بۆ سروشتی ئەم دینە تەواو و تەواوکارە، تۆکمەکردنی پەیوەندی نێوان بیروباوەڕ و وێژدان و جێبەجێکاری کرداری بۆ پێویستیەکانی" چونکە ئایەتەکانی قورئان یەك لەدوای یەك هاتوون و نوێژ و زەکات بەیەکەوە گرێدەدەن لە دروستکردنی کۆشکی باوەڕ لە دەروونی باوەڕداران بەم ئاینە: ﴿الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤتُونَ الزَّكَاةَ. واتا: ئەوانەی نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن﴾ المائدە: ٥٥. وە ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ...﴾ البقرة: ٤٣. وە ﴿وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ البقرة: ٢٧٧ وە ئایەتیتر لەم بارەوە زۆرن و هەموویان جەخت لەسەر فەرزیەتی نوێژ و زەکات دەکەنەوە...

لە ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری تەقوادار ناشاردرێتەوە کە ئەو ئیسلامەی مافی سەربەخۆیی و ئازادی لە ماڵەکەی پێداوە و هیچ ئەرکێکی خەرجی نەخستۆتە ئەستۆی، بەڵکو خەرجی لە ئەستۆی پیاودایە، لە بەرامبەردا خودا زەکاتی فەرزکردووە لەسەر ئافرەت وەکو پیاو، کە مافێکی ئاشکرا و دیاری هەژارانە لەلای دەوڵەمەندان" هیچ ئافرەتێك خۆی نادزێتەوە لە دەرکردنی زەکات و بەخشینی لە خەرجیە شەرعیەکان بە پاساوی ئەوەی ئەو ئافرەتە و هەر لە بنەڕەتدا ئەرکی خەرجی لە ئەستۆی ئەودا نییە، مەگەر ئافرەتێك بێت کەم و کورتی لە تێگەیشتنی بەرامبەر بەم ئاینە هەبێت، یا گەندەڵیەك لە بیروباوەڕی هەبێت، یا درزێك لە کەسایەتیەکەی هەبێت. یا بە ڕواڵەت ئافرەتێکی دیندارە، بەڵام بێ ئاگا و نەزانە، گۆشکراوە بە خۆشویستنی ماڵ و دەست پێوەگرتنی، هەر بە خەیاڵی نایەت زەکات لە ماڵی دەرکات، لەگەڵ ئەوەی بەڕۆژوو دەبێت و نوێژ دەکات و حەجیش دەکات و، لەوانەیە هەندێ جار کەمێك لە ماڵە زۆرەکەی بکاتە خێر. ئەو جۆرانە لەو ئافرەتانە نین کە خودا دەیەوێت و پێیان ڕازییە.

### مانگی رەمەزان بەڕۆژوو دەبێت و شەوەکەشی زیندوو دەکاتەوە

ئافرەتی موسڵمان مانگی رەمەزان بەڕۆژوو دەبێت، بە دەروونێکی گۆشکراو و بە باوەڕبوون بەم فەرموودەیە: ((هەر کەسێ مانگی رەمەزان بەڕۆژوو بێت بە باوەڕ و بە ئومێدی پاداشتی خوایی مسۆگەر خودا لە گوناهی پێشووی خۆش دەبێت)) متفق علیە. شرح السنە ٢١٧/٦. وە خۆی

دەرازێنێتەوە بە ڕەوشتی ئافرەتی بەڕۆژووی چاو و ئەندام پارێزراو لە هەر سەرپێچیەك كە زیان بە ڕۆژووەكەی بگەیەنێ، یان لە پاداشتەكەی كەم بكاتەوە. وە ئەم فەرمووودەیە جێبەجێ دەكات: ((ئەگەر یەكێكتان بەڕۆژووبوون با قسەی ناشیرین نەڵێت و هەراو ئاژاوە نەنێتەوە، وە ئەگەر یەكێك جنێوی پێبدات یان شەڕی لەگەڵكرد با بڵێ: من بەڕۆژووم)) متفق علیه. ریاض الصالحین: ٥٧. هەروا دەفەرمووێ: ((هەر كەسێ كاتێ بەڕۆژووبوو و واز نەهێنێ لە وتەی ناڕاست و كارپێكردنی ئەوا خودا هیچ پێویستی بەوە نییە واز لە خواردن و خواردنەوە بێنێت)) فتح الباری ١١٦/٤ .

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر لە مانگی ڕەمەزانا هەست دەكات لە ژێر سێبەری مانگێكدایە وەك هەموو مانگێك نییە، تیایدا كردەوە چاكەكان چەند قات دەبێتەوە، دەرگاكانی خێر والاّ دەكرێن، ڕۆژووەكەش تەنها بۆ خودایە و هەر خۆی پاداشتی لەسەر دەداتەوە، بێگومان پاداشتی خودایەكی دەوڵەمەندی بەخشندە زۆر لەوە گەورەتر و گشتگیرترە كە بتوانرا باسبكرێ، یان خەیاڵ دەركی بكات" وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەموو كردەوەیەكی ئادەمیزاد چەند هێند دەبێتەوە، چاكەیەك بە دە چاكەیە تا دەگاتە حەوت سەد هێند. خودا دەفەرمووێ: تەنها ڕۆژوو نەبێت، بۆ منە و من خۆم پاداشتی لەسەر دەدەمەوە، واز لە حەز و خواردنەوەی دێنێ بۆ من. ڕۆژووەوان دوو خۆشی بۆ هەیە: خۆشیەك كاتێ بەربانگ دەكاتەوە، خۆشیەكیش كاتێ بەدیداری خوا دەگات. وە بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژووەوان خۆشترە لەلای خوا لە بۆنی میسك)) متفق علیه. شرح السنه ٢٢١/٦.

لێرەوە پێویستە لەسەر ئافرەتی موسڵمانی بێداری خۆپارێز هاوسەنگیەك دروست بكات لە ڕەمەزان لە نێوان كاروباری ماڵەوە و نێوان قۆزتنەوەی كاتە پیرۆزەكانی مانگی ڕەمەزان لە پەرستش و ملكەچی و نزیكبوونەوە لە خوا" بۆیە كاروباری ماڵ و شەونخونی خێزانی بێ ئاگای ناكەن لە ئەنجامدانی نوێژە فەرزەكان لە كاتی خۆی و، كردنی نوێژە سوننەتەكان و، خوێندنی قورئان و، هەڵسانەوەی شەو و شەو نوێژ و پاڕانەوە، لەكاتێك دەزانێ خودا چی ئامادەكردووە لە پاداشتی زۆر و لێبوردنی فراوان بۆ ئەوانەی شەوانی ڕەمەزان زیندوو دەكەنەوە، پێغەمبەر ﷺ

دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ بە باوەڕەوە و بە ئومێدی پاداشتی خوایی شەوانی ڕەمەزان هەڵسێتەوە و زیندووی بکاتەوە خودا لە گوناهی پێشووی دەبورێت)) متفق علیه. شرح السنه ١١٦/٤.

عائشه (رضي الله عنها) وتی: (( پێغەمبەر ﷺ لە دە شەو و ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزان زۆر زیاتر خۆی ماندوو دەکرد وەك لە کاتەکانیتر)) صحیح مسلم ٧٠/٨. هەروا عائشه (رضي الله عنها) وتی: (( پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان بهاتایە شەوی هەموو زیندوو دەکردەوە و، کەس و کاری بەئاگا دەهێنا و، خۆی ماندوو دەکرد و خۆی گورج و گۆڵ دەکرد)) متفق علیه. شرح السنه ٣٨٩/٦. هەروا فەرمانی دەکرد ﷺ بەدوای شەوی قەدرا بگەڕێن و خەڵکی هاندەدا بۆ زیندووکردنەوەی کە دەفەرمووێ: ((بەدوای شەوی قەدر بگەڕێن لە دەی کۆتایی ڕەمەزان)) متفق علیه. شرح السنه ٣٨٠/٦. وە دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ بە باوەڕ و بە ئومێدی پاداشتی خوایی شەوی قەدر زیندوو بکاتەوە خودا لە گوناهی پێشووی دەبورێت)) متفق علیه. شرح السنه ٣٧٩/٦.

ئەم مانگە پیرۆزە مانگی تەنها پەرستشە، شیاوی ئافرەتی موسڵمان نییە شەوەکەی بە شتی پوچ و یاری و شەونخونی بێسوود بباتەسەر تا دەگاتە پارشێو، ئەو کاتەش خەو بەری چاوی ئەندامانی خێزانەکەی گرتووە و ئەمیش دێت چەند پاڕوویەکیان بۆ ئامادە دەکات تا بیخۆن، پاشان دەگەڕێنەوە ناو جێگاکانیان خێرا دەکەونەوە ناو خەوێکی قووڵ، لەوانەیە هەتا هەڵنەستن بۆ نوێژی بەیانیش.

بەڵکو ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری سورە لەسەر ئەوەی خۆی و ئەندامانی خێزانەکەی ژیانێکی ئیسلامیانە ببەنە سەر لە مانگی ڕەمەزان، کاردەکات لەسەر ڕێکخستنی ژیان، بە جۆرێك هەموو ئەندامانی خێزانەکەی پاش گەڕانەوە لە نوێژی تەڕاویح زوو دەخەون" چونکە دەبێ پاش چەند کاتژمێرێکی کەم هەڵسن بۆ شەونوێژ و پەرستش و پارشێوکردن" پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((پارشێو بکەنەوە، چونکە لە پارشێو کردنەوەدا فەڕ و پیرۆزی هەیە)) متفق علیه. شرح السنه ٢٥١/٦.

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو یارمەتی هەموو ئەندامانی خێزانەکەی دەدات بۆ پارشێوکردن، وەکو ملکەچبوونێك بۆ فەرمانی پێغەمبەر ﷺ و وەدەستهێنانی فەڕ و پیرۆزیەکەی، هەروا پارشێو هەڵسان و شەونوێژکردنمان دەخاتەوە یاد، چالاك بوونی دەروون و دڵی تیایە بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ، وێڕای ئەمانە جەستە بەهێز دەبێت بۆ ڕۆژووگرتن، هەر ئەمەش بوو پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی دەداو هاوەڵانی لەسەر ڕادەهێنا" زیدی کوڕی ثابت دەڵێ: ((لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پارشێومان کردەوە، پاشان هەڵساین بۆ نوێژ. وترا: ماوەی نێوان نوێژ و پارشێو چەندبوو؟ وتی: ٥٠ ئایەت)) متفق علیه. شرح السنه ٢٥٣/٦.

بێگومان ئافرەتی موسڵمان پاداشتی زۆری دەبێت لەلایەن خواوە کاتێ دەبێتە مایەی دەستکەوتنی ئەو هەموو خێرە بۆ خێزانەکەی، خودا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ إِنَّا لاَ نُضِيعُ أجرَ مَن أَحسَنَ عَمَلاً. واتا: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و بەردەوام کردەوەی چاکیان کردووە ئەوا ئێمە پاداشتی چاکەکاران وێڵ ناکەین﴾ الکهف:٣٠.

## ڕۆژووی سوننەت دەگرێ

ئافرەتی موسڵمانی تەقوادار وێڕای گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان ڕۆژووی سوننەتیش دەگرێ، ئەگەر زۆر سەخت نەبوو لەسەری، وەك ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە، ڕۆژی نۆیەم و دەیەمی محرم" چونکە ئەم ڕۆژانە و هیتریش لە کردەوەی چاکە و دەبنە هۆی سڕینەوەی گوناهەکان، ابی قتادە رضي الله عنه وتی: لە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارکرا سەبارەت بە گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە؟ فەرمووی: ((گوناهی ساڵی پێشوو و پاشی خۆی دەسڕێتەوە)) صحیح مسلم ٥١/٨.

ابن عباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر خوا ﷺ ڕۆژی عاشوڕا بەڕۆژوو بووە و فەرمانیشی بە گرتنی ئەم ڕۆژە کردووە )) صحیح مسلم ١٢/٨.

ابن عباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر خودا بۆ ساڵی داهاتوو تەمەنی پێدام ڕۆژی نۆی عاشوڕاش بەڕۆژوو دەبم)) صحیح مسلم ١٣/٨. وە لەبارەی گەورەیی بەڕۆژوو بوونی شەشی شەوال دەفەرمووێ: ((هەر کەسێ ڕەمەزان بەڕۆژوو بێ، پاشان دوای

رەمەزان شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بگرێت وەك ئەوەیە هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بووە)) صحیح مسلم ٥٦/٨. هەروا لەبارەی گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێك" ابو هریرە ﷺ دەڵێ: ((خۆشەویستم ﷺ بە سێ شت فەرمانی پێکردووم: گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێك، کردنی دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو، کردنی نوێژی وتر پێش خەوتن)) فتح الباری ٢٢٦/٤. صحیح مسلم ٢٣٤/٥.

ابي الدرداء ﷺ وتی: ((خۆشەویستم ﷺ بە سێ شت فەرمانی پێکردووم، تا لە ژیان ماوم وازیان لێناهێنم: گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێك و، کردنی نوێژی چێشتەنگا و، نەخەوم تا نوێژی وتر دەکەم )) صحیح مسلم ٢٣٥/٥.

عبداللە بن عمرو بن العاص ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێك وەك ڕۆژوو گرتنی تەواوی ساڵەکە وایە)) متفق علیە. شرح السنە ٣٦٢/٦.

دەقی فەرموودە هاتووە ئەم سێ ڕۆژە بە سیانزە و چواردە و پانزە دەست نیشان دەکات، کە پێیان دەوترا ڕۆژە سپیەکان، لە بەرامبەردا دەقی فەرموودەمان هەیە کە ئەم سێ ڕۆژە دیاری ناکات: لە معاذة العدویة وتی: لە خاتوو عائشة پرسیارم کردووە، ئایا پێغەمبەر ﷺ لە هەموو مانگێك سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بووە؟ وتی: بەڵێ، وتم: لە چ ڕۆژێکی مانگ بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی: گوێی نەدەدا بەوەی لە کوێی مانگەکە بەڕۆژوو دەبێت، واتا لەهەر ڕۆژێك بوایە بەڕۆژوو دەبوو)) صحیح مسلم ٤٨/٨.

### حەجی ماڵی خوا دەکات

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر ڕێنمایی قورئانی لەبەرچاوە بەحەجکردن بۆ ماڵی خوا هەر کاتێك لە توانای دابوو، هەر کاتێکیش هۆکارەکانی حەجکردنی بۆ ڕەخسا، ئەوا پێش گەشتەکە هەوڵی فێربوونی ئەحکامەکانی حەج دەدات زۆر بە وردی و ڕێك و پێکی، تا بە تێگەیشتن و ڕۆشنبیری و داناییەوە کارەکانی حەج ئەنجام بدات، ئەو کاتە حەجەکەی ڕاست و شەرعی دەبێت و بارتەقای جیهاد و تێکۆشانی پیاوان دەبێت، وەك خاتوو عائشە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی

ئێمه تێکۆشان و جەنگ نەکەین لەگەڵ ئێوەدا؟ فەرموویەتی: ((باشترین و جوانترین جیهادی ئێوە حەجە، حەجێکی سوننەت)) عائشه وتی: ئیتر وازم لە حەجکردن نەهێناوە لەوەتەی ئەمەم بیستووە.

## عومرە دەکات

وەك چۆن حەج فەرزکراوە لەسەر ئافرەتی موسڵمان، عومرەشی لەسەر واجبە هەر کاتێك بواری بۆ ڕەخسا، بەتایبەتی عومرەیەك لە مانگی ڕەمەزان" چونکە پاداشتی حەجێکی هەیە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ: بخاری له ابن عباس ﷺ دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە حەجەکەی خۆی گەڕایەوە بە دایکی سنانی ئەنصاری فەرمووو: ((چی لە حەجکردن قەدەغەت دەکات؟)) وتی: باوکی فلان ـ مەبەستی مێردەکەیەتی ـ دوو حوشتری هەبوو، لەسەر یەکێکیان حەجیکرد، ئەوەیتریش ئاوی زەویەکەمان دەدات. فەرمووی: ((کە ڕەمەزان هات عومرەیەکی تێدا بکە" چونکە عومرەیەك لە ڕەمەزان بارتەقای حەجێکە)) لە گێرانەوەیەکیتری ابن عباس، دەفەرمووێ: (( عومرەیەك لە ڕەمەزان بارتەقای حەجێکە لەگەڵ من )) فتح الباری ٤/٧٢.

## گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاریەتی

ئافرەتی موسڵمانی هۆشیار لەبیری ناچێت ئەرکی واجبە شەرعیەکانی پێسپێردراوە کە خودا شان بە شانی پیاو فەرمانی پێکردووە، هیچ جیاوازیەك لە نێوانیاندا نییە، مەگەر لەوەی تایبەتمەندی ئافرەتە جیا لە پیاو، ئەگینا پیاو و ئافرەت لە بەرپرسیارەتیدا یەکسانن لەبەرامبەر الله، وەك دەفەرمووێ: ﴿ إنَّ المُسلِمينَ وَالمُسلِمَاتِ وَالمُؤمِنِينَ وَالمُؤمِنَاتِ وَالقَانِتِينَ وَالقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابراتِ وَالخَاشِعِينَ وَالخَاشِعَاتِ وَالمُتَصَدِّقِينَ وَالمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالحَافِظِينَ فُرُوجَهُم وَالحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللهَ كَثِيرا والذَّاكِراتِ أَعَدَّ اللهُ لَهُم مَغفِرَةً وَأجرِا عَظِيمًا. واتا: پیاوانی موسڵمان و ئافرەتانی موسڵمان و پیاوانی باوەڕدار و ئافرەتانی باوەڕدار و پیاوانی هەیشە گوێڕایەڵ و ئافرەتانی هەمیشە گوێڕایەڵ و .....ئەو پیاو و ئافرەتانەی زۆر یادی خوا دەکەنەوە، خودا لێبوردەیی و پاداشتێکی مەزنی بۆ ئامادەکردوون﴾ الأحزاب: ٣٥.

هەروا دەفەرموووێ: ﴿مَن عَمِلَ صَالِحًا مِن ذَكَرٍ أو أُنثَى وَهُوَ مُؤمِنٌ فَلَنُحيِيَنَّه حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجزِيَنَّهُم أجرَهُم بِأحسَنِ مَا كَانُوا يَعمَلُونَ. واتا: هەرکەسێ کردەوەی چاك بکات چ پیاو بێت چ ئافرەت بە مەرجێك باوەڕدار بێت ئەوا ژیانێکی خۆشی پێ دەبەخشین لە دونیادا و بە جوانترین شێوە پاداشتی کردەوەکانیان دەدەینەوە﴾ النحل: ٩٧.

وە ﴿فَاستَجَابَ لَهُم رَبُّهُم أنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنكُم مِن ذَكَرٍ أو أُنثَى.... واتا: پەروەردگاریان وەڵامی پاڕانەوەکەیانی دایەوە کە من کردەوەی هیچ کرێکارێك لە ئێوە وێڵ ناکەم چ پیاو بێت چ ئافرەت......﴾ ال عمران: ١٩٥.

هەر کاتێ ڕستەی (یا أیها الناس) لە قورئان یا لە فەرموودە بێت، ئەوا پیاو و ئافرەت دەگرێتەوە، وەك مسلم لە ام سلمە دایکی باوەڕداران دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: گوێم لە خەڵکی بوو باسی حەوزیان دەکرد، بەڵام ئەم باسەم لە پێغەمبەر ﷺ نەبیستبوو، ڕۆژێکیان لەو کاتەی کەنیزەکەکەم قژی دادەهێنام، گوێم لێبوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((ئەی خەڵکینە)). بە کەنیزەکەکەم وت: جارا ڕاوەستە. کەنیزەکە وتی: بانگی پیاوانی کرد و، بانگی ئافرەتانی نەکردووە، وتم: منیش خەڵکێکم لەو خەڵکە. جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من پێش ئێوە دەچمە سەر حەوز تا بۆ ئێوەی ئامادە بکەم. ئێوەش بۆلای من دێن، جا کەسێکتان بەو شێوەیە نەگات پێم، کە دوور بخرێتەوە لێم وەك چۆن حوشتری وێڵ دوور دەخرێتەوە، منیش دەڵێم: ئەمە لەبەرچی؟ پێم دەڵێن: تۆ نازانی ئەوانە لە دوای تۆ چیانکردووە و داهێناوە، منیش دەڵێم: تیاچن)) صحیح مسلم ١٥/٥٦. لە گێرانەوەیەکیتری مسلم: ((منیش دەڵێم: تیاچوون بۆ ئەوانەی پاش من ئاینیان شێواندووە و گۆڕیویانە)) صحیح مسلم ١٥/٥٤.

ئافرەت و پیاو یەکسانن بەرامبەر الله لە پەیڕەوکردنی فەرمانەکانی و دوور کەوتنەوە لە نەهیەکانی. لێرەوە ئافرەتی موسڵمان هەرچی خودا فەرمانی پێبکات دەیکات، ئەوەی فەرمانی نەکردنی پێکردووە نایکات، باوەڕی وایە لەبارەی هەرچی لە ژیانیدا کردوویەتی پرسیاری لێ دەکرێت، چاکە بە چاکە، خراپە بە خراپە" بۆیە لە سنووری خوا دەوەستێ و نایبەزێنێ، ناخزێتە

ناو حەرام، بەڵکو هەموو کات بڕیاری خوا و پێغەمبەرەکەی پەیڕەو دەکات و، لە سەرجەم ئەو کاروبارانەی لە ژیانیدا بەرەو ڕووی دەبێتەوە دەگەڕێتەوە سەر حوکمی خوا و پێغەمبەر.

لە مێژووی ئافرەتی موسڵمان هەڵوێستی مەردانە هەیە، کە حوکمی خودایان لەبەرچاویان داناوە و لێیان لانەداوە و پەنایان بەر حوکمیتر و شتیتر نەبردووە:

ئیمام احمد و ابو داود دەگێرنەوە و، ابن کثیریش لە سەرەتای سورەتی المجادلە باسیکردوو، لە خولة بنت ثعلبة و مێردەکەی أوس بن الصامت، خەولە دەڵێ: سوێند بەخوا سەرەتای سورەتی مجادلە لەسەر من و اوس بن الصامت دابەزیووە. خەولە وتی: من لەلای اوس بووم، پیاوێکی بەساڵاچووبوو و ڕەفتاری خراپ ببوو، وتی: ڕۆژێك هاتەوەماڵەوە و منیش لەسەر شتێك پێداچوونەوەم لەگەڵدا کرد، ئەویش توڕەبوو و وتی: تۆ بۆ من وەك پشتی دایکمی، وتی: پاشان دەرچووە دەرەوە و کاتژمێرێك لەناو یانەی کەس و کاری دانیشت، دوایی هاتەوە لام و داوای سەرجێیی لێکردم، خەولە وتی: وتم: نەخێر، بەو کەسەی گیانی خەولەی بەدەستە، هەرگیز لەگەڵم کۆنابیتەوە پاش ئەوەی ئەو قسەیەت وت تا خودا و پێغەمبەرەکەی دادپەروەری دەکەن لە نێوانماندا، خولە وتی: ئنجا ویستی بەزۆر بمگرێ و کاری خۆی بکات، بەڵام من نەمهێشت وەك چۆن ئافرەتێك دەتوانێ زاڵ بێ بەسەر بەساڵاچوویەکی لاواز، لە خۆمیم دوورخستەوە، خەولە وتی: پاشان چوومە لای یەکێ لە دراوسێکانم، جلێکم لێیان خواست، پاشان چوومە دەر تا هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ و لەبەردەستی دانیشتم، ڕووداوەکەم بۆی گێرایەوە، زۆر سکاڵای ڕەفتارە خراپەکانیم لەلاکرد، خەولە وتی: پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: ((ئەی خەولە ئامۆزات پیاوێکی بە ساڵاچووە، لەخوا بترسە سەبارەت بەو)) خەولە وتی: سوێند بەخوا هێشتا لەلای پێغەمبەر ﷺ بووم قورئان لەبارەم دابەزی، پێغەمبەر ﷺ حاڵەتی سروش هاتنی بەسەرداهات، کە ئەم بارەی لەسەر لاچوو، پێی وتم: ((ئەی خەولە خوا لەبارەی تۆ و مێردەکەت قورئانی دابەزاند)) پاشان بۆمی خوێندەوە: ﴿قَد سَمِعَ اللهُ قولَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوجِهَا وَتَشتَكِي إِلَى اللهِ وَاللهُ يَسمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللهَ سَمِيعٌ بَصِير﴾ تا ﴿وَلِلكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ المجادلة: ١ـ ٤. خەولە وتی: ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بڕۆ پێی بڵێ با کۆیلەیەك ئازاد بکات)) خەولە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا نیەتی

کۆیلەیەك ئازاد بکات، فەرمووی: ((با دوو مانگ لە دوای یەك بەڕۆژوو بێت)) خەولە دەڵێ: وتم: سوێند بەخوا پیاوێکی بەساڵاچووە و توانای ڕۆژووگرتنی نییە، وتی: ((با شەست هەژار تێربکات لە شەست صاع خورما)) خەولە دەڵێ: وتم: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەی نییە، خەولە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ئێمە یارمەتی دەدەین بە (فەرەقێك لە خورما) ـ نزیکەی شەست کیلۆیە ـ)) خەولە وتی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا منیش بە فەرەقێکیتر یارمەتی دەدەم، فەرمووی: ((ئەنجامت پێکاو کارێکی باشت کرد، بڕۆ لە جیاتی ئەو صدەقەکە بدە، پاشان ڕاتدەسپێرم کە لەگەل ئامۆزات باش بیت)) خەولە دەڵێ: منیش وامکرد.تفسیر ابن کثیر ٤٥٩/٣ المجادلة.

خەولە نەیتوانی تەنانەت یەك کاتژمێریش لەگەڵ مێردی بژی پاش ئەوەی وشەی (ظیهار) ی بەدەمدا هات کە واتای تەڵاقی دەگەیاند لەسەردەمی نەفامیدا، تا دەچێتە لای پێغەمبەر ﷺ بۆ زانینی بڕیاری خوا لەبارەی خۆی و مێردەکەی، هەر بۆ ئەم مەبەستەش جلێکی شایستە لە دراوسێکانی دەخوازێ.

بۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە ئەو ئافرەتە مەزنە ڕیزو گەورەیی و پلەوپایەیەکی بەرزی هەبێت لە دەروونی ئەو هاوەڵانەی لە سەردەمی ئەودا بوون، لە سەرووی هەموویانەوە عمر کوڕی خەتتاب ، ڕۆژێکیان خەولە دەگاتە عمر، لەو کاتە لە مزگەوت دەردەچێ و (جاڕوودی) خزمەتکاریشی لەگەڵدایە، عمر کە ئەمیری باوەڕدارانە، سەلام لە خەولە دەکات، خەولەش پێی دەڵێ: بەبیرم دێ جاران لە بازاری عکاظ پێیان دەوتی عومەرۆکە، گۆچانەکەت لە دەستدا بوو و شوانی مەڕ و ماڵاتت دەکرد، جا لەخوا بترسە سەبارەت بەوانەی لەژێر دەستتن، بشزانە هەر کەسێ لە هەڕەشەی خودا و ڕۆژی دوایی بترسێ دووری بۆ نزیك دەبێتەوە، هەر کەسێ لە مردن ترسا لە دابڕانیش دەترسێ. لەو کاتە جاڕوود دەڵێ: زۆر زیادەڕۆییت کرد لەسەر ئەمیری باوەڕداران ئەی ئافرەت. عومەریش وتی: وازی لێبێنە، نازانی!: ئەمە خەولەیە کە خودا لە سەرووی ئاسمانەکانەوە گوێی بۆ قسەکانی گرتووە، سوێند بەخوا عومەر ڕەواترە تا گوێی بۆ بگرێ.

له ڕاڤەی ابن کثیر هاتووە، پیاوێك کە گەرم و گوڕی و گوێ شلکردنی عمر دەبینێ بۆ ئەم ئافرەتە، بە عمر دەڵێ: پیاوانی قورەیشت لەسەر ئەم پیرەژنە ڕاگرتووە! عمر دەڵێ: تیاچیت، تۆ دەزانی ئەوە کێیە؟ وتی: نەخێر، وتی: ئەمە ئافرەتێکە خودا لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە گوێی بۆ سکاڵاکەی گرتووە، ئەمە (خولة بنت ثعلبة)یە، سوێند بەخوا ئەگەر بە ویستی خۆی تا شەویش بمێنێتەوە و نەڕوات، من پشتی تێناکەم تا پێویستی خۆی جێبەجێ دەکات، مەگەر کاتی نوێژ بێت و بچم بۆ نوێژکردن، پاشان دەگەڕێمەوە لای تا پێویستی جێبەجێ دەکات.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری تێگەیشتوو، هەموو کات وتەی خوای لەبەرچاوە: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤمِنٍ وَلاَ مُؤمِنَةٍ إذَا قَضَى اللهُ وَرَسُولُهُ أمرا أن يَكُونَ لَهُمُ الخِيَرَةُ مِن أمرِهِم وَمَن يَعصِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَد ضَلَّ ضَلاَلاً مُبِينًا. واتا: هیچ پیاوێکی باوەڕدار و ئافرەتێکی باوەڕدار کاتێ خودا و پێغەمبەرەکەی بڕیارێکیاندا لەسەر شتێك، بۆیان نییە سەرپشکی تیابکەن، وە هەر کەسێ سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات ئەوا بە ئاشکرا گومڕا بووە و سەر لێشێوایە﴾ الأحزاب: ٣٦.

گوێڕایەڵی کردنی خوا و پێغەمبەرەکەی لە سەرووی ئارەزووی دڵ و دەروونە، لە سەرووی ئاواتەکان و ڕابواردن و خۆشیەکانی ژیانە، لە سەرووی خواست و ویستی مرۆڤە. ئەوەتا زینب کچی جحش پێش ئەوەی ببێتە دایکی باوەڕداران، پێغەمبەر ﷺ داوای لێ دەکات ڕازی بێت بە شووکردن بە زیدی کوڕی حارثة کە جاران کۆیلە بوو پاشان پێغەمبەر ﷺ کردبوویە کوڕی خۆی، ئەمەش بۆ دوو مەبەست و حیکمەتی جیاواز بوون.

یەکەم: هێنانەدی یەکسانی تەواو لە نێوان خەڵك، کە ئافرەتێکی جوانی قورەیشی، گەورەی نەوەکانی عبد شمس، کچە مامی پێغەمبەر ﷺ، لە کۆیلەیەك مارە بکرێت. کە ئەو کاتە کۆیلە چینی نزمتربوون لە گەورەکان، بەڵکو جیاوازی چینایەتی لە نێوان گەورە و کۆیلەکانیان هێندە قووڵ و پتەوبوو مەگەر کردارێکی ڕاستەقینە لە پێغەمبەری خوا ﷺ تێکی بشکێنێ، کە بە ئاشکرا لەناو خەڵکی ڕایبگەیەنێ و کۆمەڵی موسڵمانانیش بیکەنە دەستوور و پەیڕەوی بکەن، تا

بەم شێوەیە ئەم جیاوازیانە نەمێنێ و، کەس لەسەر کەس بەرزتر نەبێ مەگەر بە تەقوا و لە خواترسان بێت.

دووەم: پووچەڵ کردنەوەی باوی بە کوڕکردن (التبنی)، کە زۆر باو و بڵاوبوو لە سەردەمی نەفامی، ئەمەش بە مارەکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ زینب کە هاوسەری زەیدی بە کوڕکراوی بوو پاش ئەوەی تەڵاقی دابوو، تا بەڵگەیەکی کرداری پێشکەش بکات لەسەر ئەوەی ئەگەر بەڕاستی کوڕی بووایە نەدەبووا ئەم مارەبڕینەی زینب لە پێغەمبەر ﷺ بە بڕیاری خوا بووایە و لە قورئان دابەزیبووایە.

دەست نیشانکردنی زینب، کچە مامی پێغەمبەر ﷺ بۆ جێبەجێکردنی ئەم دوو دەستورە کرداریە لە چوارچێوەی ماڵی پێغەمبەرایەتی، بۆ ئەوەبوو تا خەڵکی بە دەروونێکی ڕازی و ملکەچ گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بن. ئەگەر لەبەر ئەم بەرژەوەندییە گشتیەش نەبووایە هەرگیز پێغەمبەر ﷺ پاڵی نەدەنا بە زینب تا ببێتە خێزانی زەید لە کاتێکا زەینەب ڕازی نەبوو بەم مارەبڕینە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، مێردی پێ ناکەم و هەرگیز پێی ڕازی نابم، من گەورەی نەوەکانی عبد شەمسم، پێغەمبەریش ﷺ بە هێمنی و متمانە و سوور بوونەوە دەفەرمووێ: ((بەڵکو دەبێ شووی پێبکەی. لە کاتی ئەم گفتوگۆیەدا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤمِنٍ وَلاَ مُؤمِنَةٍ........فَقَد ضَلَّ ضَلاَلاً مُبِينًا﴾ پێشتر ڕاڤە کراوە، ئنجا زینب وتی: کەواتە سەرپێچی ناکەم لە فەرمانی خوا و پێغەمبەر، ئەوە پێی ڕازی بووم.

پاشان ناکۆکی کەوتە نێوان زینب و زید، و بووە هۆی جیابوونەوەیان لە یەکتری. کاتێ (عددەی) زینب تەواوبوو، خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَإذ تَقُولُ لِلَّذِي أنعَمَ اللهُ عَلَيهِ وَأنعَمتَ عَلَيهِ أمسِك عَلَيكَ زَوجَكَ وَاتَّقِ اللهَ وَتُخفِي فِي نَفسِكَ مَا اللهُ مُبدِيهِ وَتَخشَى النَّاسَ وَاللهُ أحَقُّ أن تَخشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيدٌ مِنهَا وَطراً زَوَّجنَاكَهَا لِكَي لاَ يَكُونَ عَلَى المُؤمِنِينَ حَرَجٌ فِي أزوَاجِ أدعِيَائِهِم إذَا قَضَوا مِنهُنَّ وَطراً وَكَانَ أمرُ اللهِ مَفعُولاً. واتا: کاتێ بەو کەسە دەڵێی کە خودا نیعمەتی لەگەڵ کردووە بەوەی ڕێنمایی ئیسلامی کردووە، تۆش نیعمەتت لەگەڵ کردووە بەوەی لە کۆیلایەتی ڕزگارت کردووە و بە جوانی پەروەردەت کردووە، واتا(زید کوڕی حارثة): دەست بە خێزانەکەت

بگره و تەلاقی مەدەو لە خوا بترسە، وە ئەوە لە دەروونت دەشاریتەوە کە خودا ئاشکرای کردووە لە ناردنی سروش بۆت بەوەی زید زەینەبی تەلاق دەدا و دەبێتە خێزانی تۆ تا باوی بە کوڕکردنی نەفامی پووچەڵ بکەیتەوە و، لەقسەی خەڵکی دوو ڕوو دەترسی؟ ڕەواترە لە خوا بترسی، کاتێ زید پێویستی بە زینب نەما و تەلاقیدا، ئێمە زەینەبمان لە تۆ مارەکرد، تا بۆ باوەڕداران نەبێتە مایەی گوناه و تەنگانەیی لە مارەکردنی خێزانی ئەوانەی کردوویانە بە کوڕی خۆیان کاتێك لێیان جیابوونەوە و هەمیشە فەرمانی خوا کاریگەرە﴾ الّحزاب: ۳۷. کە پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە پێکەنی و فەرمووی: ((کێ دەچێتە لای زینب و مژدەی پێدەدا کە خودا لە ئاسمانەوە لە منی مارەکردووە!!))

وەك بڵێی خودا پاداشتی زەینەبی داوەتەوە لەسەر گوێڕایەڵیە ڕەها و ناوازەکەی بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی، کاتێ ڕازی بوو بە فەرمانی خودا و پێغەمبەرەکەی بە مارەبڕینی لە زەید، ئەوەتا ئێستا دەکرێتە بووك بۆ پێغەمبەر ﷺ بە فەرمانی خودا و بە ئایەتی قورئان کە موسڵمانان تا ڕۆژی قیامەت وەکوو پەرستشێك دەیخوێننەوە. ئەمە ڕیزێك بوو خودا بە زەینەبی دابوو بەجیا لە دایکانیتری باوەڕداران، جا زینب هەموو جار شانازی دەکرد بەو ڕیزەی خودا پێی دابوو، خۆی هەڵدەکێشا بەسەر خێزانەکانیتری پێغەمبەر ﷺ و دەیوت: ((ئێوە کەس و کارتان مارەی کردون، بەڵام من خودا لەسەر حەوت ئاسمانەکان مارەی کردووم)) فتح الباری ۱۳/٤۰۳.

### لەگەڵ پیاوی بێگانە بە تەنها کۆنابێتەوە

گوێڕایەڵیکردنی خوا و پێغەمبەرەکەی تەنها بە ملکەچبوونە بۆ فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوەیە لە نەهیەکانی، لەوانە: نابێ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ پیاوی بێگانە بە تەنها کۆبێتەوە" چونکە تەنهابوونی لەگەڵ پیاوی بێگانە یاساغە (حرام)ە بە کۆی دەنگی زانایان، لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: ((نابێ هیچ پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێك بە تەنها بێت، مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت، وە گەشت ناکات مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت)) پیاوێك هەڵسایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هاوسەرەکەم بۆ حەج دەرچووە و منیش ناوم لە فلانە

سوپێی جەنگی نووسیووە. فەرمووی: (( هەڵسە بڕۆ لەگەڵ هاوسەرەکەت حەج بکە)) متفق علیه. شرح السنه ١٨/٧.

مەحرەم: هەر پیاوێکە کە بۆ هەمیشە مارەیی لەو ئافرەتە نەیەت، وەك باوك و برا و مام و خاڵ...هتد.

بێگانە: هەر پیاوێکە لە بنەڕەتدا حەلاڵ بێ بۆ ئافرەتەکە شووی پێبکات، هەرچەندە خزمیش بێت، بەتایبەتی شووبرا و خزمیتری، ئەمانە هەموویان حەرامە ئافرەت لەگەڵیان تەنیابێتەوە، بنەما لەسەر ئەم فەرموودەیە کە دەفەرمووێ: ((نەکەن بەتەنها بچنە لای ئافرەتان)) پیاوێك لە یاریدەدەران(الانصار) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر شوبرا (الحمو) بوو؟ فەرمووی: ((شوبرا (الحمو) واتا مردن)) متفق علیه. شرح السنه ٢٦/٩.

الحمو: واتا برای مێرد و هاوشێوەی لە کەس و کاری مێرد. وە کە دەفەرمووی: ((شوبرا واتا مردن))((الحمو الموت)) مەبەستی ئەوەیە کە خراپە و گەندەڵی لەویەوە زیاتر ڕوودەدات، چونکە بە ئاسانی دەتوانێ بچێتە ماڵی برای" بۆیە بە مردن ئەدگاری دەکات تا زیاتر سەخت و ترسناك و بێزراو بێت، وەك بڵێی تەنهابوونەوە لەگەڵ شووبرا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی خراپەکاری و گەندەڵی و گومان و تیاچوون لە ئاین وەك تیاچوونی مردن. بۆیە ئافرەتی موسڵمانی تەقوادار ناکەوێتە ئەم جۆرە سەرپێچیانە لە شەرع کە زۆر لە خەڵکی تێیکەوتوون لەم ڕۆژگارەدا.

## پابەندە بە بالاپۆشیە (حیجاب) شەرعیەکەی

هەرکاتێك ئافرەتی موسڵمان لەماڵ بچێتە دەر بەجوانی حیجابەکەی دەپۆشێ، حیجابیش ئەو جلە ئیسلامیە تایبەتیەیە کە دەقەکانی قورئان و فەرموودە شێوەکەیان دیاریکردووە، هەرگیز بە ناپۆشتەیی و بۆنداری و ڕازاوەیی ناچێتە دەر و لەبەرچاوی پیاوی بێگانە دەرناکەوێت" چونکە دەزانێت بە دەقی ئایەت ئەمە یاساغ و حەرامە، کە دەفەرمووێ: ﴿ وَقُل لِلمُؤمِنَاتِ يَغضُضنَ مِن أبصَارِهِنَّ وَيَحفَظنَ فُرُوجَهُنَّ وَلاَ يَبدِينَ زِينَتَهُنَّ إلاَّ مَا ظَهَرَ مِنهَا وَليَضرِبنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلاَ يَبدِينَ زِنَتَهُنَّ إلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أو آبَآئِهِنَّ أو آبَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أو إخوَانِهِنَّ أو بَنِي إخوَانِهِنَّ أو بَنِي

أَخَوَاتِهِنَّ أو نِسَآئِهِنَّ أو مَا مَلَكَت أيمَانُهُنَّ أوِ التَّابِعِينَ غَيرِ أُوْلِي الإربَةِ مِنَ الرِّجَالِ أوِ الطِفلِ الَّذِينَ لَم يَظهَرُوا عَلَى عَورَاتِ النِّساءِ وَلاَ يَضرِبنَ بأرجُلِهِنَّ لِيُعلَمَ مَا يُخفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللهِ جَمِيعًا أيُّهَ المُؤمِنُونَ لَعَلَّكُم تُفلِحُونَ. واتا: ئەی محمد بڵێ بە ئافرەتانی باوەڕدار چاویان داگرن لە ئاستی حەرام و داوێنیان بپارێزن و جوانیان دەرنەخەن مەگەر ئەوەی هەر خۆی بەدەرەوەیە (ڕووخسار و دوو دەستەکە) و با لەچکەکانیان بەردەنەوە سەر سنگ و بەرۆکیان و جوانیان دەرنەخەن تەنها بۆ مێردەکانیان نەبێت یا باوکیان یا باوکی مێردەکانیان یا براکانیان یا نەوەی براکانیان یا نەوەی خوشکەکانیان یا ئافرەتانی خزمەتکار یاکۆیلە و کەنیزەك یا خزمەتکاری‌تری پیاو کە پێویستیان بە ئافرەت نەماوە و تواناییان نییە یا ئەو منداڵانەی هێشتا نەگەیشتونەتە ڕادەی بلوغ، وە با بەلارولەنجە پێ لە زەوی نەکوتن بۆ ئەوەی جوانی و زینەی شاراوە دەرخەن، دەی هەمووتان بگەڕێنەوە بۆلای خوا و تەوبە بکەن تا سەرکەوتوو و براوە بن﴾ النور: ٣١.

کەواتە ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر لەو ئافرەتانە نییە کە هەر بەناو جلیان لەبەرە و، پڕن لەو کۆمەڵگایانەی دوورن لە ڕێنمایی خوا و گوێڕایەڵی کردن بۆی، بەڵکو ئافرەتی موسڵمان دەتۆقێ لەو وێنا ترسناکەی پێغەمبەر ﷺ کێشاویەتی بۆ ئەو جۆرە ئافرەتە ڕووت و گومڕا و گەندەڵکارانە، کە دەفەرمووێ: ((دوو جۆر لە خەڵکان لە کۆمەڵی ئاگرن و من نەمبینیون، جۆرێکیان قامچیان پێیە وەکوو کلکی مانگا وایە پێی لە خەڵکی دەدەن و، جۆرەکەی‌تر ئافرەتانی بەناو پۆشتەن کەچی لە ڕاستیدا ڕووتن، خۆیان سەر لێشێواون و خەڵکیش گومڕا دەکەن و سەریان وەك کۆپەری حوشتر وایە(مەبەستی ئەوەیە سەر و قژیان هەڵدەدەنەوە و دەیرازێننەوە و گەورەی دەکەن) ناچنە بەهەشت و بۆنیشی ناکەن، هەرچەندە بۆنی خۆشی بەهەشت لە دووریەکی یەکجار زۆر بۆن دەکرێت)) صحیح مسلم ١٤/١٠٩.

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو کە تێراوبووە لە سەرچاوەی ئیسلامی بێگەرد، لە ژێر ساباتە فێنك و بێخەوشەکەی گەورەبووە، تەنها بۆ چاولێکەری جلی حیجاب ناپۆشێ، یا لەبەر ئەوەی باوی باب و باپیرانە و بۆ ئەو جێماوە -وەك چۆن هەندێ پیاوان و ئافرەتی کەللە پووچ بەم شێوەیە وێنای حیجاب دەکەن، بێبوونی هیچ پاڵپشتێکی زانستی، یا بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو، یا

ئاماژەیەك لە قورئانی ڕۆشەن ـ بەلكو ئافرەتی موسڵمان بە دڵێكی ئارام و باوەڕی قـووڵی بـەوەی فەرمانی خودایە پەیوەستە بە حیجابەكەی، دەروونیشی پڕە لە دڵنیایی كە ئەمە ئاینێكـە و خـوا دایبەزاندووە بۆ پاراستنی ئافرەتی موسڵمان و جیاكردنەوەی كەسایەتیەكەی، تا دووری خاتەوە لـە پێخلیسكان لە خراپەكاری و ئاشوب و گێژاوی گومڕایی. بۆیە بە دەروونێكی ڕازی، دڵێكی ئارام، باوەڕێكی چەسپاو وەری دەگرێ، وەك چۆن ئافرەتانی كۆچبەر و یاریدەدەر وەریان گرت لـەو ڕۆژەی خودا بریارە دادپەروەرانەكەی خۆی دابەزاند: بوخاری لـە دایكـی بـاوەڕداران عائـشە (رضـي الله عنهـا) دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: ((خودا ڕەحم بكات بە ئافرەتانی كۆچبەری پێشینە، كاتێ خوا ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: ﴿وَلْيَـضْرِبنَ بِخُمُـرِهِنَّ عَلَـى جُيُـوبِهِنَّ﴾ یەكـسەر جلـەكانیان كـردە دوولـەت و سەروسیمایان پێداپۆشت. لە گیرانەوەیـەكیتری بوخـاری: ((جلـەكانیان لـەلای دامێنـەوە كـردە دوولەت و سەروسیمایان پێداپۆشت)) فتح الباری ٨/٤٨٩.

صفیة كچی شیبة دەڵێت: ((ڕۆژێكیان ئێمە لەلای عائـشە (رضـي الله عنهـا) بـووین و باسـی گەورەیی ئافرەتانی قورەیشمان كرد، خاتوو عائشە وتـی: ئافرەتـانی قـورەیش گـەورە و ڕێـزدارن، بەڵام سوێند بەخوا لە ژنانی ئەنصار باشتر و ڕیزدارترم نـەدیووە، كەسـیش وەكـوو ئـەوان ئایـەتی خودایان نەدەكردە كردار و، باوەڕیان پتـەو نـەبوو پێـی! كاتـێ ئایـەتی سـورەتی النـور دابـەزی: ﴿وَلْيَضْرِبنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُـوبِهِنَّ﴾ پیاوەكان گەڕانەوەماڵەوە و ئەم ئایەتەیان بۆ هاوسەر و كـچ و خوشك و كەس و كاریان خوێندەوە، یەكسەر هەرچی ئافرەت هەبوون هەڵسان و جلـە خوریـەكانیان كە نەخش و نیگاری لەسەر كێشرابوو خۆیان لەناو لوولدا، وەك بـاوەڕبوون و بـەكرداركردنی ئـەو ئایەتەی كە دابەزی، جا دەتبینی هەموویان لەناو جلەكانیان خۆیان لوول داوە وەك بڵێی قەلە ڕەش وا بەسەر سەریانەوەیە)) فتح الباری شرح صحیح البخاری ٨/ ٤٩٠،٤٨٩.

خودا ڕەحم بكات بە ژنانی كۆچبەر و یاریدەدەر، چەندە باوەڕیان بەهێزبوو! چەندە باوەڕیـان بـە ئیسلام پتەوبوو! چەندە جوان ملكەچی حەق بوون كە دادەبـەزی! ئنجـا هـەر ئافرەتێـك بەڕاسـتی باوەڕی بەخوا و پێغەمبەرەكەی بێت، یەكسەر شوێنی ئەو ئافرەتـە بەرزانـە دەكـەوێت، پەیوەسـت دەبێت بە جلە ئیسلامیە نایابەكەی، ڕووت و قووتی و خۆدەرخستنی دەوروبەر كاری تێناكات.

من لێرەدا هەڵوێستی ئافرەتێکی باڵاپۆشی (محەجەبە)ی ناو کۆلیژ باس دەکەم، کە هەڵوێستەکەی کەمتر نییە لە هەڵوێستی ئافرەتانی کۆچبەر و یاریدەدەر، کاتێك پەیامنێرێکی ڕۆژنامەوانی کە سەردانی کۆلیژی دیمەشقی کردبوو، لە بارەی حیجابەکەی پرسیاری لێکرد: ئایا چۆن بەرگەی گەرمای ئەو هاوینە دەگری؟ وەڵامی دایەوە: ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا. واتا: ئەی محمد بڵێ: ئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە﴾[1].

بەو جۆرە ئافرەتە موسڵمانە ڕۆشنبیرە پاکانە ماڵی موسڵمان ئاوەدان دەبێتەوە، نەوەکان لەسەر بەرزی و پاکی پەروەردە دەکرێن، ئەو کاتە کۆمەڵگا پڕدەبێت لە پیاوانی پاڵەوان و بنیاتنەر، ئەمرۆش سوپاس بۆ خوا لەم جۆرە ئافرەتانە زۆرن.

حیجابی شەرعی داهێنراوی تەنها شەریعەتی ئیسلام نییە، بەڵکو لە هەموو ئاینەکانی‌تری پێش ئیسلامیش هەبووە، وە هەندێ دەق لەو دەقە گۆڕدراوانەی تەورات و ئینجیل گەواهیدەرن لەسەر ئەم ڕاستیە، ئەوەتا بە چاوی خۆمان جلی ئافرەتی ڕاهبەی مەسیحیەکان دەبینین کە لە وڵاتە ئیسلامیەکان جێنشینن، لەوانەشی کاتێ دەچنە ناو کەنیسە سەری خۆیان دادەپۆشن.

چونکە ئینجیل داوا لە ئافرەتی مەسیحی دەکات سەر و قژی داپۆشێ وەك لە (الاصحاح) هاتووە (یانزەهەمین لە پەیامی بۆڵس بۆ خەڵکی کورنتوس)، بۆیە ئافرەتە ڕاهبەکان حیجاب دەپۆشن، هەروا هەر کاتێك پاپێی ڤاتیکان چاوی بکەوێ بە ئافرەتێك چ خێزانی سەرەك دەوڵەت بێ، چ ئافرەتێکی ناودار بێت، پێویستە سەر و قژی داپۆشێ.

---

[1] ئەم ڕووداوە ڕووداوێکی‌تری ڕاستەقینەی هێنامەوە یاد کە لە کوردستانی عێراق لە هەولێر ڕوویدابوو: کچێکی باڵاپۆش لە کۆلیژی هەرلێر لە شێوە و دیمەنی کچێکی جوان بوو، مامۆستاکەی وازی لێناهێنێ و هەموو ڕۆژێ داوای لێ دەکات لەچك و جلە پۆشتەکەی فڕێ بدات، ئەم ئافرەتە چەندە هەوڵدەدات بە ئایەت و بە فەرمووودە حاڵی بکات لە واتای حیجاب و حیکمەتی، بەڵام بێ هودەیە لەگەڵی، بۆیە ئاهەنگی دەرچوون بەهەل دەزانێ، و دوو جوکلێت ـ کە یەکیان بێ کاغەز و بەرگە و ئەویتر لەناو بەرگ و کاغەزی خۆیەتی ـ لەناو دەستی پێشکەش بە مامۆستاکەی دەکات تا یەکیان هەڵبژێرێ، مامۆستا جوکلێتی داپۆشراو هەڵدەبژێرێ، کچەکە دەپرسێ: لەبەرچی مامۆستا ئەمەت هەڵبژارد؟ مامۆستا دەڵێ: ئاخر ئەوەیان خاوێنە و تەندرستیە، بەڵام دانەپۆشراوەکە مێش و مەگەزی چۆتە سەر و تۆز و پیسی هەڵگرتووە. کچەکە دەڵێ: کەواتە ئافرەتی داپۆشراو وەك ئەو شیرینیە داپۆشراوە وایە خاوێن و بێگەرد و =ویستراوە، بەڵام ئافرەتی ناپۆشتە وەك شیرینی واڵا وایە پیسی و لەککە بێگەردیەکەی شێواندووە و شیرینیەکەی بێزراوکردووە! وەرگێڕ: سندس.

کەواتە هەر کەس نکۆڵی بکات لە باڵاپۆشی ئافرەت، ئەوا دەرچووە لە شەریعەت و ئاینە ئاسمانییەکانی وەك ئاینی ئیبراهیم و موسی و عیسی (علیهم السلام) تا دەگاتە ئەو ئاینە پاکەی ئیسلام هێناویەتی و، پچراوە لەئاینی خودای تاك کە خوا بۆ مرۆڤایەتی ناردووە بە درێژایی ڕۆژگار، پێغەمبەڕان نەوە دوای نەوە هەڵیانگرتووە بۆ بناغە دانانی دەروونی مرۆڤایەتی لەسەر حەق و ڕەوا و خێر و چاکە، تا هەموو مرۆڤایەتی بەهۆی ڕێنمایی ئاسمانی ببێتە یەك نەتەوە و ملکەچی تەنها خودا بن، وەك دەفەرموووێ: ﴿وَمَا كَانَ النَّاسُ إِلاَّ أُمَّةً وَاحِدَةً فَاختَلَفُوا وَلَولاَ كَلِمَةٌ سَبَقَت مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَينَهُم فِيمَا فِيهِ يَختَلِفُونَ. واتا: خەڵکی سەرەتا یەك ئاین و یەك جۆر بیروبۆچوون بوون بەڵام جیا بوونەوە بۆ باوەڕدار و بێ باوەڕ، وەئەگەر بەڵێنی خودا نەبووایە بەوەی تا هەر کەسە و ئەجەلی نەیەت لەناو ناچێت، ئەوا هەموو بێ باوەڕان و گەندەڵکارانی لەناو دەبرد و چاکەکارانیشی سەردەخست﴾ یونس: ١٩.

وە دەفەرموووێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعمَلُونَ عَلِيمٌ، وَأَنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُم أُمَّةٌ وَاحِدَةٌ وَأَنَا رَبُّكُم فَاتَّقُونِ. واتا: ئەی کۆمەڵی نێردراوانی خوا بخۆن لە خۆراکی پاك و حەڵاڵ و بەردەوام کردەوەی چاك بکەن، وە دڵنیابن من زانا و ئاگادار و شارەزام بە کردەوەکانتان، وە ئەم ئاینەی ئێوە تەنها یەك ئاینە و منیش پەروەردگارتانم، دەی خۆتان بپارێزن لە سەرپێچی کردنم﴾ المؤمنون: ٥١ـ ٥٢.

هەروا دەفەرموووێ: ﴿وَالَّتِي أَحصَنَت فَرجَهَا فَنَفَخنَا فِيهَا مِن رُوحِنَا وَجَعَلنَاهَا وَابنَهَا آيَةً لِلعَالَمِين، إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُم أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُم فَاعبُدُونِ. واتا: مەریەم دامێنی خۆی پاراست لە هەرچی حەڕامە ئێمەش فوومان لێکرد لە گیانی خۆمان و خۆی و کوڕەکەیان (عیسی) کردە سەڕاسیما(معجزە) و بەڵگە لەسەر دەسەڵاتی خوا بۆ هەموو جیهانیان، بەڕاستی ئاین و نەتەوەی ئێوە تەنها یەك ئاین و نەتەوەیە و منیش پەروەردگارتانم، دەی بمپەرستن﴾ الانبیاء: ٩١ـ ٩٢.

سوربونی زۆرێك لە کۆمەڵگە مرۆڤایەتیەکان لەسەر خۆدەرخستن و ڕووتکردنەوەی ئافرەت و بەکەم گرتنی، بەڵگەیە لەسەر لاری و لادان و دوورکەوتنەوە لە ڕێنمایی خوا، نەك تەنها لە وڵاتی موسڵمانان، بەڵکو لە هەموو وڵاتانی جیهان. جا ئەگەر ڕۆژئاواییەکان گوێ بەم لاری و لادانە

نادەن و بەردەوامن لەسەر داهێنانی شێوازە جۆربەجۆرەکانی ڕووتبوونەوە و سەر لێشێواندن و گومڕابوون، بێ ئەوەی دەقێك هەبێ لە پەرتووکە گۆڕدراوەکانیان قەدەغەیان بکات و بیانگێڕێتەوە، ئەوا موسڵمانان کە وەکوو پەرستش بە ڕۆژ و بەشەو قورئانی نەگۆڕدراوی پتەوی پارێزراو دەخوێننەوە، هەرگیز ڕازی نابن بەو لاری و لادانانە، هەرچەندە پەردەی غەفلەت و بێ ئاگایی و کەم و کورتی و لاوازی بەرامبەر بە ئاینەکەیان بەرچاوی گرتبێ" چونکە هەموو کات دەقە زیندووەکانی قورئان و فەرمووودە بە گوێیاندا دەزرنگێتەوە، هۆشداری دەدات بەوانەی سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، هەڕەشەی دوچاربوونی بەلاو نەگبەتی لە ژیانی دونیایان و، ئامادەکردنی سزای بەسۆی ڕۆژی دواییان لێ دەکات، وەك دەفەرموووێ: ﴿فَلیَحذَرِ الَّذِینَ یُخَالِفُونَ عَن أمرِهِ أن تُصِیبَهُم فِتنَةٌ أو یُصِیبَهُم عَذَابٌ ألِیمٌ. واتا: با ئەوانەی سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەن هۆشدار بن لەوەی دووچاری بەلای هەڵگەڕانەوە ببن لە ئاین یا دووچاری سزا و ئەشکەنجەی بەسۆ ببنەوە﴾ النور: ٦٣.

لەم ئایەتە خودا بانگی ئافرەت و پیاوی دۆڕاو و بەزیو و سەرنەکەوتوو دەکات لە ڕاکێشانی ئافرەت بۆ خۆدەرخستن و لادانی حیجابەکەی لەبەرامبەر خۆڕاگری ئافرەت و پیاوی باوەڕداری ئەمرۆی ڕابوونی ئیسلامی کە لە سەرانسەری جیهان بڵاوبوونەتەوە. بەم شێوەیە ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری تێگەیشتوو لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی کە دووچاری بانگەوازی نامۆکردنی ئافرەتی موسڵمان بوونەتەوە و داوای داماڵینی حیجابەکەی و وازهێنان لە شەرم و بێگەردیەکەی دەکەن، گەڕایەوە بۆ پۆشینی جلە ئیسلامیە تایبەتیەکەی، حیجابە شەرعی و پارێزراوەکەی، شەرم و حەیا ڕەسەنەکەی، بە کوێرایی چاوی بانگەوازکارانی شەڕ و گەندەڵی و خراپەکاری لە وێنەی ئەتاتورك لە تورکیا، ڕەزا بەهلەوی لە ئێران، محمد ئەمان لە ئەفغانستان، احمد زوغو و انور خوجا لە ئەلبانیا، مرقص فهمی و قاسم امین و هدی شعراوی لە مصر. وە زۆرێکیش لەوانەی پشتگیری بەرەڵڵابوونی ئافرەت و داماڵینی حیجابیان دەکرد پاشگەزبوونەوە لە ڕاکانیان سەبارەت بە خۆدەرخستنی ئافرەت و تێکەڵبوونی ناشەرعی بە پیاوان.ئەوەتا دکتورە نوال السعداوی کە ڕۆژگارێکی درێژ هێرشی دەکردە سەر باڵاپۆشان، زۆر بەتوندی و دڕندانە داوای لادانی حیجابی دەکرد و سووربوو لەسەری، کەچی ئەمڕۆ وەستاوە و ڕەخنە دەگرێ لە خۆدەرخستنی ئافرەت و

نیگەرانە لە ڕووت و قووتیە ئابڕو بەرەکەی ئەوروپا و دەڵێ: (( ئێستا من لە شەقامەکانی لەندەنم...ئافرەتی نیمچە ڕووت دەبینم، ئەوانە دەبینم کە لاشە و جەستەیان وەکوو کەل و پەل نمایشکردووە. جل و بەرگ ئەرکی خۆی هەیە کە پاراستنی جەستەیە لە هۆکارە سروشتیەکان، هەرگیز نابێت پەیامی فریودان بگەیەنێ. ئەگەر ئافرەت سەیری خۆی بکات وەکوو مرۆڤ. نەك وەکوو کەل و پەل، هەرگیز پێویستی نەدەبوو بە خۆڕووتکردنەوە))[1].

بەڵێ، پاشان دەرکەوت بۆ نوال السعداوی کە لادانی حیجاب دەبێ لەسەر عەقڵ بێت نەك لەسەر جەستە، بەتایبەتی لەسەر هۆشی ئافرەت و پیاوی ڕۆشنبیر" نمونە زۆرن لەو ئافرەتانەی بالاپۆشن و ئاستی خوێندنیان مام ناوەندیە، کەچی خاوەنی عەقڵ و هۆشێکی ڕووناك و کراوەن، کە بارتەقای کێشی دە لە عەقڵی خاوەن ئاستی خوێندنی بەرز دەکات لەوانەی بێ مێشك و ناپۆشتەن و سەر و قژ و جەستەیان دەرخستووە، عەقڵ و فیترە و هۆشیان پەردە پۆشکردووە" بۆیە نوال دەڵێ: ((پێویستە پیاو و ئافرەتی ڕۆشنبیر حیجابی سەر عەقڵی هەڵگرێ))[2].

لە هەمان گۆڤاردا دەڵێت: ((من چەندین مامۆستای کۆلیژ و پزیشك و ئەندازیاری ئافرەت دەناسم کە دەناڵێنن بەدەست نەخوێندەواری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری)).

ئەوەتا نووسەری بەناوبانگ احسان عبد القدوس کە بازاری ئەوروپی پڕکردبوو لە ئەدەبیاتی چیرۆك و داستانەکانی کە تیایاندا داوای دەرچوونی ئافرەتی دەکرد لە ماڵ وتێکەڵبوونی بە پیاوان لە شوێنی سەما و ئاهەنگ و یانە و ئاهەنگی شەوان، لە دیمانەیەکدا کە ڕۆژنامەی الانباء الکویتی لەگەڵی سازدابوو لە ژمارەی دەرچووی بەرواری ١٩٨٩/١/١٨" دەڵێ: ((من وا دادەنێم کە بنەڕەت و بنەمای بەرپرسیاریەتی هەر ئافرەتێك ماڵ و منالە. ئەمەش بە پلەی یەکەم لەسەر خۆم دێتە دی، ئەگەر خێزانەکەم نەبووایە نەمدەتوانی خێزان و دامەزراوی و سەرکەوتن وەدەست بێنم، چونکە ئەو تەنها بۆ ماڵ و منالْ خۆی یەکلا کردۆتەوە...)) هەر لەم دیمانەیەدا دەڵێ: (( لە ژیانمدا ئاواتی ئەوەم نەخواستووە ئافرەتێکی خاوەن پیشە بخوازم، لەلای خەڵکیش هەر بەو شێوەیە

---

[1] مجلة المجتمع الكويتية: العدد ٩٣٢.

[2] مجلة المجتمع الكويتية: العدد ٩٣١.

ناسراوم، چونکه من لەسەرەتاوە دەرکی بەرپرسیاریەتی ترسناکی مالّم کردووە سەبارەت بە ئافرەت!!)).

## خۆی دووردەگریّ لە تیّکەلّی بیّ سنوور

ئافرەتی موسلّمانی تیّگەیشتوو تا بتوانیّ خۆی دووردەگریّ لە تیّکەلّی بیّ سنوور لەگەلّ پیاوان و هەولّی بۆ نادات و کەسیش هان نادات بۆ ئەم کارە، لەم کارەیدا شویّنکەوتەی فاتیمەی کچی پیّغەمبەر ﷺ و دایکانی باوەرداران و، ئافرەتانی چاکە خوازی پیّشینە لە هاوەلّانی پیّغەمبەر ﷺ و شویّنکەوتووانی....

ئافرەتی موسلّمانی تیّگەیشتوو بیّ ئاگا نییە لە ئاکامە دژوارەکانی تیّکەلّاوی بیّ سنوور لەسەر هەردوو رەگەزی نیّر و میّ، ئەو ئاکامەی بووە هۆی دابەزاندنی ئاستی خویّندەواری، رۆژئاواییەکان هەستیان بە ترسناکیەکەی کرد، بۆیە لە زۆربەی کۆلیژ و پەیمانگاکان کچانیان لە کوران جیاکردەوە.کۆمەلّیّك لە گەورە پیاوانی پەروەردە ئەم جیاکردنەوەیان بە چاوی خۆیان بینیوە کاتیّ سەردانی ئەوروپا و ئەمریکا و روسیایان کردووە، لەوانە مامۆستای پەروەردەکار احمد مظهر عظمة کە وەزارەتی پەروەردەی سوریە وەکوو نویّنەر لە گەشتیّکی زانستیدا ناردی بۆ بەلجیکا. لە میانەی یەکیّ لە سەردانەکانی بۆ قووتابخانەیەکی سەرەتایی، لە بەریّوەبەرەکەی پرسی: بۆچی لەم قۆناغەدا کچان و کوران تیّکەلّ ناکەن؟ بەریّوەبەر وەلّامی دایەوە: ئیّمە ئاکامە خراپەکانی تیّکەلّکردنی منالّانمان لەم تەمەنەدا بۆ دەرکەوتووە، بۆیە تیّکەلّاویمان نەکردووە.

لە روسیاش کە گەیشتۆتە نیمچە هەستکردن بەم بارە، هەلّساون بە دامەزراندنی چەند لقیّکی زانکۆیی، تا کوران و کچانی قووتابی تیّکەلّی یەکتر نەبن.

لە ئەمەریکاش زیاتر لە ١٧٠ لقی زانکۆیی هەیە، کە تیایدا قووتابیانی کچ و کور تیّکەلّی یەکتر نابن، بەهۆی هەستکردنی پەروەردەکار و سەرپەرشتیارەکانی ئەم زانکۆیانە بە ترسناکی

تێکەڵبوون لە کۆمەڵگەیەك ڕاهاتووە لەسەر تێکەڵبوون لە سەرجەم لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی[1]

گەواهیدەرەکان لەسەر خراپی ئاکامەکانی تێکەڵاوبوون لە جیهان هێندە زۆرە لە ژمارە نایەت، هەموویان بەڵگەی ڕۆشن دەدەنە دەست لەسەر حیکمەت و دانایی ئیسلام کاتێ سنوورێکی دانا بۆ تێکەڵاوبوون و کۆمەڵگە ئیسلامیەکانی دوورخستەوە لە ئاکامە دژوارەکانی، ئەم تێکەڵیە تواناکان لەناودەبات، دڵ و هەست و ویژدان بەرەو تڕازان دەبات.

هەرچی تێکەڵی پیاوانە بە ئافرەتان بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیەکی ڕەوا، یا پێویستیەکی گرنگ، وەك نوێژکردن لە مزگەوت، یا ئامادەبوون لە کۆڕی زانستی، یا پێویستیتری هاوشێوە لە کردەوەی چاك کە بەشداریکردنی هەردوولا دەخوازێ، ئەوا ئیسلام ڕێگەی پێداوە بەپێی مەرجە شەرعیە ناسراوەکان، بەڵکو لە هەندێ کاتدا هانیشی داوێن لەسەری" وەك نوێژی دوو جەژنە" چونکە ئەم جۆرە کۆبوونەوەیە وەك تێکەڵیە بێ سنوورە بەربڵاوەکەی کۆمەڵگەی نامسوڵمان نییە.

## تەوقە لەگەڵ پیاوی نامەحرەم ناکات و دەست ناخاتە ناودەستی

کارێکی ڕەسەن و جوانە کە ئەو ئافرەتەی تێکەڵی پیاوان نابێت، تەوقەشیان لەگەل ناکات جگە لە مەحرەمەکانی، لەمەوە پەیرەوی فەرمووودە و کرداری پێغەمبەرە ﷺ " بوخاری لە خاتوو عائشە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: جاران کاتێ ئافرەتی باوەڕدار کۆچیان دەکرد بۆلای پێغەمبەر ﷺ بەم ئایەتە تاقی دەکردنەوە: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ.... ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، عائشە دەڵێ: هەر ئافرەتێکی باوەڕدار دانی نابوایە بەم مەرجانەیدا واتای دان نان بوو بە بەیعەت ـ واتا بەیعەتی شەرعی داوە ـ، کاتێ ئەم بەیعەتەیان دەدا پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموون: ((بڕۆن ئەوا پەیمانم لێ وەرگرتن)).عائشە دەڵێ: نەخێر، سوێند بەخوا هەرگیز دەستی پێغەمبەر ﷺ بەدەستی ئافرەتێکیتر نەکەوتووە، تەنها بەقسە بەیعەتی لێ وەرگرتوون و، سوێند بەخوا هەرگیز پێغەمبەر ﷺ شتێکی لە ئافرەتان وەرنەگرتووە ئەگەر بە فەرمانی خوا

---

[1] لە بەرواری ٢٠٠٢/١٠/٢٢ کەناڵی جەزیرە دواین هەواڵی بڵاوکردەوە لەسەر تێکەڵی لە ئەمەریکا، کە دەڵێ: سەرۆکی ئەمریکی (بۆش) بریارێکی دەرکردووە بە جیا کردنەوەی کوڕان لە کچان لە قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی" چونکە لێکۆڵینەوەکان و ئامارەکان ناچاری ئەم جیاکاریەیان سەلماندوویانە بەمەبەستی بەرز کردنەوەی ئاستی خوێندن لەلایەن قووتابیانی کچ و کوڕ.

نەبووبێ، کاتێ بەیعەتیشی لێوەردەگرتن پێی دەفەرموون: ((ئەوا بە قسە بەیعەتم لێ وەرگرتن)) فتح الباری ٩/٤٢٠.

## گەشت ناکات ئەگەر لەگەڵ مەحرەمێکی نەبێت

لە ڕێنماییەکانی ئیسلام بۆ ئافرەتی موسڵمان ئەوەیە نابێ گەشت بکات بەبێ بوونی پیاوێکی مەحرەم" چونکە گەشت بەدەر نییە لە سەختی و ناخۆشی، بەڵکو لەوانەیە پڕبێت لە مەترسی و دژواری، جا ڕەوا نییە ئافرەت بەتەنیا بەبێ پیاوێکی مەحرەم دووچاری شتێك لەوانە ببێتەوە، تا ئەم پیاوە ئەرك و سەختی گەشتەکەی بۆ هەڵگرێ، مەترسیەکانی لێدوورخاتەوە.بۆیە فەرمووودە لەم بارەیەوە زۆرە" لە صحیحی بوخاری پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئافرەت گەشتی سێ ڕۆژە ناکات ئەگەر لەگەڵ مەحرەمێکی نەبێت)) فتح الباری ٢/٥٦٦.

هەروا لە صحیحی مسلم هاتووە، فەرموویەتی: ((هەر ئافرەتێك باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت دروست نییە بۆی گەشتی سێ شەوە بکات ئەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا نەبێت)) صحیح مسلم ٩/١٠٣.

لەم بارەیەوە فەرمووودە زۆرن و هەموویان جەخت لەسەر گەشتنەکردنی ئافرەت دەکەنەوە بەتەنیا، تەنها لە هەندێ باری پێویست نەبێت کە زاناکان روونیانکردۆتەوە و ڕای جیاوازیان لەبارەی هەیە.صحیح مسلم ٥/١٠٢ـ ١٠٥

ئافرەتی موسڵمان ئاوەها گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی پەروەردگاریەتی، خۆی دووردەگرێ لە نەهیەکانی، ڕازییە بە بڕیارەکانی، دەستگرە بە ڕێباز و ئادابەکانی ئاینی ئیسلام، هەرچەندە زۆر لە ئایەتەکان پێچەوانەی ئەمڕۆی تێگەیشتنە کۆمەڵایەتیەکان بن، ئافرەتی موسڵمان سەرتاپێی متمانە و دڵنیاییە کەوا تا شوێنکەوتەی ڕێنماییەکانی ئەم ئاینە بێت سەرکەوتوو و براوەیە" وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿ وَالعَصرِ، إنَّ الإنسَانَ لَفِي خُسُر، إلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَواصَوا بِالحَقِّ وَتَوَاصَوا بِالصَّبرِ. واتا: سوێند بە ڕۆژگار، بەڕاستی گرۆهی ئادەمیزاد لە زیان و زەرەرمەندی دایە، تەنها ئەوانە نەبن کە باوەڕیان هێناوە و بەردەوام کردەوەی چاکیان

کردووه و ئامۆژگاری یەکتریان کردوو بە دەستگرتن بە حەق و بەرنامەی خوا و دەستگرتن بە ئارامگری﴾ سورە العصر.

## ڕازییە بە قەزا و قەدەری خوا

شتێکی نوێ نییە ئافرەتی موسڵمان گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاری بێت و ڕازی بێت بە قەزا و قەدەری خودا" چونکە ڕازی بوون بە قەزا و قەدەری خوا گەورەترین نیشانەی باوەڕبوون و ملکەچییە بۆ خوا و تەقوا و چاکەکارییە لە ئادەمیزاد. ئەم ڕازی بوون و ملکەچبوونە هەمیشە بە خێرو چاکە بۆی دەگەڕێتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((کاری موسڵمان جێی سەرسوڕمانە، هەموو کارێکی مایەی خێرە بۆی، ئەمەش تەنها بۆ باوەڕدارە، کاتێ دوچاری خۆشی دەبێتەوە سوپاسگوزارە و، مایەی خێرە بۆی، وە کاتێك دوچاری ناخۆشی دەبێتەوە ئارام دەگرێ و دەبێتە مایەی خێر بۆی)) صحیح مسلم ۲۵/۱۸.

ئافرەتی موسڵمان لە قوڵایی دەروونیدا باوەڕی وایە هەرچی لەم ژیانەدا دوچاری دەبێتەوە بە هەڵە نەبووە، ئەوەشی هەڵەی کردووە بۆ ئەوە نەبووە بیپێکێ، هەموو شتێك بە ویستی خوایە، هەموو کارێکیشی مایەی خێرە بۆی...

ئافرەتی موسڵمان بەم باوەڕە پتەوەوە و بە دەروونێکی ئارام و ڕازی بە قەدەری خوا ڕووبەڕووی پێکان و ئەشکەنجە و ئازار دەبێتەوە، لەم کاتانەدا پەنا دەباتەبەر ئارامگرتن و نوێژ بەئومێدی پاداشتی خوایی" وەك خەنسا لەڕۆژی شەهیدبوونی هەر چوار کوڕی وتی: سوپاس بۆ خوا کە ڕیزداری کردم بە شەهیدبوونی هەر چوار کوڕم، ئومێد دەکەم خودا لە باوەشی ڕەحمەتی کۆمان بکاتەوە. الإصابە ۸/۶۷،۶۶.یان وەك ئەسمای کچی عومەیس پەنا دەباتەبەر نوێژ و ئارامگرتن کاتێ یەك لە دوای یەك نەگبەتی و ناخۆشی بەسەریدا دەڕژێ، مێردی یەکەمی لەدەستدا کە (جعفر کوڕی ئەبو تالیب) بوو، پاشان برینی قوولتربوو بە مردنی مێردی دووەمی (ابوبکر الصدیق ﷺ)، پاشان مردنی کوڕەکەی (محمد کوڕی ابوبکر الصدیق).

سوپاس بۆ خوا نمونەی خەنسا و ئەسما زۆرن لە مێژووی ئافرەتی موسڵمانی باوەڕدار و ئارامگر، خوا پاداشتیان بەبێ حیساب دەداتەوە،کە دەفەرموووێ: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُوون أجرَهُم بِغَيْرِ حِسَاب﴾ الزمر: ١٠.

## تەوبەکار و گەڕاوەیە

لەوانەیە بڕێك لە بێ ئاگایی و غەفڵەت ڕووبکاتە دەروونی ئافرەتی موسڵمان، قاچی پێ بخلیسکێ، یان هەندێك لە کەم و کورتی و خاوی دوچاری بێتەوە لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پەروەردگاری، کە شایستەی ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری بێدار نییە، بەڵام تا هەمیشە لەو بێ ئاگاییە نامێنێتەوە خێرا دەگەڕێتەوە بۆ بەرزی باوەڕەکەی و بێگەردی دەروونی و گەرم وگوڕی دینداریەکەی و دەچێتەوە ژێر ساباتی خودای بە تەوبە و داواکردنی لێخۆشبوون" ﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوا إِذَا مَسَّهُم طَائِفٌ مِنَ الشَّيطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُم مُبصِروون. واتا: ئەوانەی پارێزکارن کاتێ لەلایەن شەیتانەوە دوچاری ڕاڕایی دەبنەوە و تۆزێك دەترازێن لە ڕێگای ڕاست، خێرا دەگەڕێنەوەو پەشیمان دەبنەوە و ملکەچی خوا دەبن و سەرپێچی شەیتان دەکەن﴾ الاعراف: ٢٠١.

غەفڵەت و بێ ئاگایی لە دڵێك خۆی ناگرێت تێکەڵ بووبێت بە ڕووناکی باوەڕ، بەڵکو لە دڵێك خۆی دەگرێت ژەنگدار بووە بە سەرپێچی و تاوان و دابڕان لە بەرنامەی خوا. دڵی ئافرەتی موسڵمانی تەقوادار هەمیشە کراوەیە بۆ وەرگرتنی ڕێنمایی، هەمیشە گوێڕایەڵ و پەشیمان و گەڕاوەیە و شەونمی تەوبە و ڕەحمەت و لێخۆشبوون هەڵدەمژێ.

## هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکات لە ئاست ئەندامانی خێزانەکەی

بەرپرسیاریەتی ئافرەتی موسڵمان لە ئاست ئەندامانی خێزانەکەی لە بەرامبەر خوا کەمتر نییە لە هی پیاو، بەڵکو بەرپرسیاریەتی ئافرەت گەورەترە لە پیاو بەهۆی زانینی نهێنییەکانی ژیانی منداڵەکانی چونکە" کاتێکی زۆریان لەگەڵ بەسەر دەبات، لەوانەیە منداڵ هەندێ شت لای دایکی باس بکات و بۆ باوکی باس نەکات و نەدرکێنی. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((هەمووتان شوانن، هەمووشتان بەرپرسیارن لەئاست ئەوانەی لەژێر دەستتانن: پێشەوا شوانە و بەرپرسیارە لە

ژێردەستەکەی، پیاو شوانە لە کەس و کاری و بەرپرسیارە لـە ژێردەسـتەکەی، ئـافرەتیش شـوانی ماڵی مێردەکەیەتی و بەرپرسیارە لەوەی لە ژێردەستیدایە، خزمەتکار شوانە لە ماڵی گەورەکەی و بەرپرسیارە لەوەی پێی سپێردراوە، جا هەمووتان شوانن و بەرپرسیارن لـەوەی لـەژێر دەسـتتانە)) متفق علیه. شرح السنه ٦١/١٠.

هەستکردنی ئافرەت بە بەرپرسیاریەتی هەمیشە پاڵی دەنێ بۆ ڕاستکردنەوەی هـەموو لاریـەك ئەگەر هەبوو لە دڵی هەندێ لە ئەنـدامانی خێزانەکـەی و چارەسـەرکردنی هـەر کـەم و کورتیـەك هەستی پێبکات، بێ دەنگ نابێت لە ئاستیان، مەگەر ئافرەتێك بێ دینی لاواز بێـت، کەسـایەتی بێهێز بێت و کەم و کورتیەك هەبێت لە تێگەیشتنی..

## خەمی سەرەکی ڕەزامەندی خوایە

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ هەموو کات لە کاروکردەوەکانیدا لە خەمی ڕەزامەندی خـوا دایـە، بەم تەرازووە وردە کێشانەی کردەوەکانی دەکـات، کـە هەرچـی پێیـڕازی بێـت ئـەنجامی دەدات، هەرچی خوداش پێیڕازی نەبێت پشتی تێدەکات و رقی لێدەبێتەوە. کاتێك دژایەتیەك هەبێت لـە نێوان ئەوەی خودا پێیڕازییە و ئەوەی خەڵك پێیڕازییە، ئەوا ڕەزامەندی خـوا بـەبێ دوو دڵـی و دەمەقاڵی هەڵدەبژێرێ، هەرچەندە خەڵکی نیگەران بن. چونکە بـەهۆی ڕۆشـنبیرییە قووڵەکـەی و هەستە بەرزەکەی تێدەگـات لـەوەی ڕەزامەنـدی خـەڵك ئامانجێکـە وەدەسـت نایـەت، لەوانەیـە سەربکێشێ بۆ توڕەیی خوا" پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموووێ: ((هـەر کەسـێ داوای ڕەزامەنـدی خـوا بکات بەرامبەر نیگەرانی خەڵك، خودا لە پێویستبوونی بەخەڵك دەیپـارێزێ و، هەرکەسـێ داوای ڕەزامەندی خەڵك بکات بەرامبەر توڕەیی و نیگەرانی خوا، خودا دەیسپێرێت بە خەڵك و دەیداتـە دەستی ئەوان)) رواە الترمذي ٣٤/٤.

بەم تەرازووە وردە، بەم پێوەرە پتەوە نیشانەی ڕێگـا و مەبەسـتی ڕاسـت لەبەرچـاوی ئـافرەتی موسڵمان روون دەبێتـەوە، ئـەو کاتـە دەزانـێ چـی وەردەگـرێ و وازیـش لەچـی دێنـێ، پێـوەری هەمیشەیشی کە هەڵە ناکات ڕەزامەندی خوای گەورەیە، بەم شێوەیە لە ژیانی ئافرەتی موسـڵمان

هەرچی دژەکرداری گاڵتەجارِ و ڕیسواکار هەیە نامێنێ کە زۆرێك لە ئافرەتانی دوور لە ڕێنمایی خوا تێی دەکەون.

ئەو ئافرەتانەی لە نوێژەکانیان بەملکەچی و خشوعەوە دەبینرێن، کەچی لە زۆربەی هەڵوێستەکانیان دەچنە پاڵ ئارەزووواتی دەروون، تا دووردەکەونەوە لە ڕەوا و ڕاستی، بەمەش زمانیان بە باسکردنی پاشملە و قسەهێنان و بردن و بریندارکردنی خەڵك دەجوڵێ، پیلان بۆ ئەو کەسانە دەگێرن کە حەزیان بە پیلانگێران نییە، قسە و بوختانیان بۆ هەڵدەبەستن، بۆ ئەوەی هەڵەیان پێبکەن و ئازاریان بدەن، ئەمانە کەلێنێك لە ئاینیان هەیە، لاوازیەك لە بیروباوەڕیان و کەم و کورتیەك لە بۆچوونیان لە ئاست ڕاستی ئەم ئاینە تەوا و تەواوکارە هەیە کە خودا دایبەزاندووە بۆ دارِشتنەوەی مرۆڤ دارِشتنەوەیەکی تەواو لە سەرجەم لایەنەکانی کەسایەتیەکەی، بەشێوەیەك هەموو هەڵوێستە تایبەتی و گشتیەکانی جێگای ڕەزامەندی خوا دەبێت ڕێك وەکو ڕێبازەکەی، بەم جۆرە ڕەفتاری ڕاست بەدی دەهێنێ کە ئیسلام بۆ مرۆڤی کێشاوە.

بەڵام ژمارەی ئەوانەی لە کارێك گوێڕایەڵی خوا دەکەن و لە هی‌تر سەرپێچی دەکەن، سەرجەم یا هەندێ لە ڕەفتارەکانیان بە تەرازوی ئارەزوواتی دەروون کێشانە دەکەن، نیوەی ئافرەتانی موسڵمان پێك دەهێنن، ئەمە ئەو ئاڵۆزیەیە کە ئافرەتی دواکەوتوو لە ڕێنمایی ئاینەکەی تێی‌کەوتووە، ئەمەش ترسناکترین ئەو دەردە خوڕەوەشتیەیە کە مرۆڤی ئەو سەردەمە بەدەستیەوە دەناڵێنێ.

## خۆی دەنوێنێ لە واتای بەندایەتی بۆ خوا

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو لە ڕێنمایی دینەکەی باوەڕێکی قووڵی هەیە بەوەی دروستکراوە بۆ ئامانج و مەبەستێکی گەورە لەم ژیانەدا، کە خودا بۆی دیاریکردووە، وەك دەفەرموووێ: ﴿وَمَا خَلَقتُ الجِنَّ وَالإِنسَ إلاَّ لِيَعبُدُونِ. واتا: ﴿پەری و ئادەمیزادم تەنها بۆ پەرستشی خۆم دروستکردووە﴾.

ژیان لە سۆنگەی ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو تەنها بەسەربردنی کات نییە لە کاری ئاسایی ڕۆژانە و، ڕابواردن لە خۆشیەکانی ژیان و جوانییەکەی، بەڵکو ژیان نامەیەکە، لەسەر هەموو

باوەڕدارێـك پێویـستە بـەو جـۆرە بیگەیـەنێ کـە پەرسـتشی خـوای تیـا بێتـەدی، ئەمـەش بـە یەکلاکردنەوەی نیەتە بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا و گەڕان بەدوای ئەو ڕەزامەندییە" چونکە لـە ئیسلامدا کردوەکان بەندن لەسەر نیەت و مەبەست، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((هـەموو کردەوەیەك بەندە لەسەر نیەت و، هەر مرۆڤێك بەڕادەی نیەتەکەی پاداشت وەردەگرێ، جـا ئـەوەی نیەتی کۆچکردنەکەی بۆ خوا و پێغەمبەر بێت، ئـەوا کۆچـکردنەکەی بـۆ خـوا و پێغەمبـەرە، وە ئەوەی نیەتی کۆچکردنەکەی بۆ دەسـتهێنانی دنیـا بێـت، یـا مـارەکردنی ئافرەتێـك بێـت، ئـەوا کۆچکردنەکەی بۆ ئەو شتەیە کە کۆچی بۆ کردووە ﴾ متفق علیه. شرح السنه ١/٤٠١.

لەم ڕوانگەوە ئافرەتی موسڵمان دەتوانێ هەمیشە لە پەرستش و عیبادەتدا بێـت" لـەو کاتـەی کارەکانی دەکات، وەك بڵێی لە پەرستگایەکی گەڕۆك دایە، تا لە نیـەتی ئـەوە هـەبێت کـە ئـەو هەڵدەستێ بەگەیاندنی ئەرکی خۆی لە ژیاندا بەو شـێوەیەی خـودا داوای لێکـردووە. لـەو کاتـەی چاکە لەگەڵ دایك و باوکی دەکات لە پەرستشدایە، یا لەگەڵ مێردی هاوسەرێکی باشـە و گرنگـی دەدات بە پەروەردەکردنی منداڵەکانی، لەو کاتەی هەڵدەستێ بە ئەرکەکانی ماڵەوە، یـا پەیوەنـدی خزمایەتی دەگەیەنێ....هتد، هەر کاتێك ئەمانە هەموو بکات وەکو ملکەچکردن بـۆ فـەرمانی خودا، بە نیەتی پەرستنی خوا، ئەوا لە پەرستشدایە.

## کار دەکات بۆ سەرخستنی ئاینی خوا

بەرزترین کاری پەرستش کە ئافرەت پێی هەڵدەسـتێ، سەرخـستنی ئـاینی خوایـە لـە ژیـان و کارکردن لەسەر بەرجەستەکردنی ڕێبازەکەی لە ژیانی تاك و خێزان و کۆمەڵگە و دەوڵەت.

ئافرەتی موسڵمانی شارەزا بە ڕێنمایی ئاینەکـەی هەسـتدەکات پەرسـتشەکەی کـەم و کـورتی تیایە، ئەگەر کەمتەرخەم بێت لەو لایەنە چالاك و زیندووەی ژیانی خۆی و موسڵمانان بە گـشتی" چونکە بەهۆیەوە ئەو ئامانجە گەورە دێتەدی کە خوا پەری و ئادەمیزادی لە پێنـاو دروسـتکردووە، ئەویش بەرزکردنەوەی وشەی خوایە لەسەر زەوی (لااله الا لله محمد رسول الله)، کە تەنها بەو هۆیە پەرستنی خوا لەلایەن مرۆڤەوە دێتەدی.

ئافرەتی موسڵمانی پێشینە زۆر بەقووڵی ئەم واتایەی دەرك كردبوو و چووبووە نـاخی دەروونـی، كاتێ دەتدی گەرم وگوڕی و خۆبەختكردن و بوێریەكەی لە پیاوان كەمترنەبوو، بـەڵكو هەنـدێ لـە ئافرەتانی پێشینەی ئەم میللەتە زۆر لە پیاوان سەركەوتوتر بوون لەم مەیدانە.

ئەوەتا أسماء بنت عمیس خێزانی جعفر كوڕی ابو طالب خێـرا لەگـەڵ مێردەكـەی بـەرەو پـیری ئیسلام دێت، لە ڕۆژە سەرەتاكانی ئیسلام، ڕۆژانی سەختی و دژواری و تەنگانە و بەڵا و ناخۆشی، پاشان كۆچ دەكات بۆ حەبەشە لەگەڵ بوونی ئەو هەموو مەترسی و سەختیە، ئەمانە هەمووی لـە پێناوی خوا و سەرخستنی ئاینەكەی بوو. ڕۆژێك عمر كوڕی خـەتتاب بـە گاڵتـە پێی‌دەڵێ: ئـەی ئافرەتی حەبەشی، ئێمە لە ئێوە لە پێشترین لە كۆچكردن، وتی: بەڵێ سوێند دەخۆم ڕاست دەكەی! ئێوە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بوون، برسیەكانی تێر دەكردن، نەفامەكانی فێردەكردن، ئێمـەش دوور و دەركراو بووین. بەڵام سوێند بەخوا دەبێ بێمە لای پێغەمبـەر ﷺ و ئەمـەی لـەلا بـاس دەكـەم. ئنجا دەچێتە لای پێغەمبەر ﷺ و دەڵێ: ئەی پێغەمبەر خوا، پیاوانێك هەن گاڵتەمان پێ‌دەكـەن، وا گومان دەبەن ئێمە لە كۆچبەرە پێشینەكان نین. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڵكو ئێـوە دوو كۆچتان بۆ هەیە، كۆچێكتان كرد بۆ حەبەشە، كە ئێمە لـە مەككـە وەكـو بارمتـە وابـووین، پاشان كۆچتان كرد بۆلای من)) طبقات ابن سعد ٣١١/٨.

ئەسما بەبەڵگەوە سەلماندی لەسەر زمـانی پێغەمبـەر ﷺ لەسـەر گـەورەیی و ڕیـزی كۆچـبەرانی پێشینە بۆ حەبەشە و دەستكەوتنی فەزلی دوو كۆچ، ئەمەش ڕیزێكی گەورەیە كـە ئـەم فەزلـەیان هەبێت لە پەلەكردن لە سەرخستنی پێغەمبەر ﷺ، و جێهێشتنی كەس و كار و خـاك و وڵات لـە پێناوی خوادا.

لە پەیمانی عەقەبە كە لە نیوە شەوا و بە نهێنی ئەنجامدرا و ئـافرەتیش بـوونی هـەبوو تیایـدا، گەورەترین كاریگەربوو بۆ سەرخـستنی پێغەمبـەر ﷺ" چـونكە لـە شـاندەكەی یاریـدەدەران دوو ئافرەت هەبوون لەوانەی خاوەنی ڕا و پلەوپایە بوون" كـە (نـسبة بنـت كعـب المازنییـة) و (دایكـی منیع أسماء بنت عمرو السُّلَمِیَّة دایكی مُعاذ بن جبـل ﷺ) كە ئامادەی جەنگی خەیبەر بوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ كە لەوێ دووچاری تاقیكردنەوەیەكی سەركەوتوو و پلەو پایە بەرزبوو.

کاتێ پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی ئاشکراکرد، خەڵکی بانگکرد بۆ یەکتاپەرستی پاك و پوخت و وەلانانی پەرستنی بت و دار، موشریکەکان ئارامیان لێهەڵگیراو، پیلانیان دانا بۆ ئەوەی بەشەو لەناو ماڵی خۆی بیکوژن، پیلانگێران کۆبوونەوە و پەیمانیان بەست و بەڵێنیاندا لەسەر ئەوەی ئەم پیلانە نهێنی بێت لە نێوانیان. بێجگە لە (رەقیقەی کچی صیفی) کەسیتر بەم هەواڵەی نەدەزانی، بۆیە پیری و لاوازیەکەی بەرگری نەکرد لە هەرچی زووە پێغەمبەر ﷺ رزگار بکات، زۆری لە خۆی کرد و هاتە لای و باس و پیلانی ئەم کۆمەڵەی پێ ڕاگەیاند، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە خۆی ئامادەکرد بۆ کۆچکردن و بە جێهێشتنی خۆشەویسترین خاکی خوا لەلای، بۆ ئەم مەبەستە ئامۆزای (علی) لەناو جێگەکەی خۆیدا خەواند، تاوەکو پیلانگێران و ئەوانەی دەوری ماڵەکەیان دابوو وا خەیاڵ ببەن پێغەمبەر ﷺ لەو جێگایەیە و بێ ئاگابن لە شوێنکەوتن و کوشتنی لە ڕێگا.

سەیرکە ئەم ئافرەتە بەرزە چ خزمەتێکی بە ئیسلام و موسڵمانان کرد؟!

وە چ تێکۆشانێك بوو بۆ رزگارکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دژوارترین بارودۆخ کە دووچاری بوویەوە و ترسناکترین هەڵوێست بوو تێپەڕی بە بانگەوازە پیرۆزەکەی.

کاتێ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکەی مەککەیان جێهێشت و لەبەرچاو ونبوون و چوونە ناو ئەشکەوتی سەر چیای ثور، کچێکی لاو کە ئەسمای کچی ئەبوبەکر الصدیق ﷺ بوو، خواردن و خواردنەوەی بۆ دەبردن و هەواڵی کۆمەڵی پیلانگێرانی پێ ڕادەگەیاندن.

ئەم ئافرەتە موسڵمانە پاڵەوانە لە نیوەشەوا ڕێگایەکی درێژی لە نێوان مەککە و چیای ثور دەبڕی، دژواری و ترسناکی ڕێگا و چاودێریکردنی دوژمن چۆکی پێدانەدا" چونکە دەیزانی لە رزگاربوونی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکەی و سەرکەوتنی مەبەستەکەیان لە گەیشتن بۆ خاکی کۆچ (مدینە)، سەرخستنی ئاینی خوا و بەرزڕاگرتنی وشەی خوایە و زاڵبوونی حەق و سەربازانیەتی. لە دیدگای ئەم تێگەیشتنەوەی ئەسما هەڵسا بە ئەرکە قورسەکەی لەم ڕۆژەدا، کە بەپیادەیی و بەنهێنی و ئاگاداری و چاوڕایی کردنەوە ئەم دەشت و دەرەی دەبڕی و سەردەکەوتە سەرلوتکەی

چیا، تا خۆراك و هەواڵ بگەیەنێتە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکەی، پاشانیش دوبارە لەژێر باڵی تاریکایی شەوا بۆ مەککە دەگەڕایەوە. سیرەی ابن هشام.

ئەمە هەموو ئەو ئەرکە قورسە نەبوو ئەسما ئەنجامیدا کە بەهێزترین پیاو ناتوانێ ئەنجامی بدات لەپێناو سەرخستنی ئاینەکەی و پێغەمبەرەکەی، بەڵکو دوچاری بەڵایەکی سەختتربوو و وەکو چیای پۆڵایین خۆی لەبەرگرت، ئەمەش لەو ڕۆژەی پیاوانی موشریکەکان هاتنە سەری و سەبارەت بە باوکی پرسیاریان لێکرد، ئەویش پێی نەوتن و بێ ئاگایی خۆی نیشاندا لە هەواڵی باوکی، بۆیە زۆر بەتوندی ڕەفتاریان لەگەڵکرد و ابو جهل زللەیەکی لێدا و گوارەی لە گوێ پەڕاند، بەڵام نەیتوانی هیچ لە خۆڕاگریەکەی کەمکاتەوە و پاشگەزی بکاتەوە لە سوربوونی لەسەر پاراستنی نهێنییەکەی ناو دڵی، لە ئەرك و کارەکانی بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکەی ئەشکەوتیان جێهێشت ڕووەو مەدینە. ئەسما خان بەخاوەنی دووپشتێن ناوزەد کرابوو" چونکە شەوی کۆچکردنەکە لە ماڵی ابوبکر خواردنی بۆ پێغەمبەر ﷺ و ابوبکر ئامادەکردبوو، کاتێ ویستی باری بکات هیچی دەستنەکەوت پێ بیبەستێ، پشتێنەکەی نەبێت، ئەمەی بۆ باوکی باسکرد، باوکیشی پێیوت: بیکە دوو کەرت، بە یەکێکیان پرێسکەی خۆراکەکە ببەستە و، بەوەیتر یش ئاوەکە، ئەمیش وایکرد، بۆیە ناونرا (خاوەنی دوو پشتێنەکە)[1].

سەرخستنی ئاینی خوا و گەیشتن بە کاروانی بانگەکەی خەم و مەبەستی ئافرەتی موسڵمان بوو لە سەرەتای ئیسلامەتی" چونکە ئەو کاتە دڵی ئافرەتی موسڵمان پڕبوو لە باوەڕ، باوەڕێکی قووڵی گەشی پڕ فەڕ، بۆیە بەرگەی مانەوەیان لە وڵاتی بێ باوەڕی نەگرت، دوور لە ڕووناکی و لێبوردەیی و گەشاوەیی ئیسلام. ئەگەر هاوسەریان بووایە لەگەڵیان کۆچیان دەکرد، دەرچوونیشیان وەك دەرچوونی پیاوان تەنها بە مەبەستی گوێڕایەڵیکردن بۆ خوا و سەرخستنی ئاینەکەی بوو.

ئافرەتی موسڵمان خاوەن پرسێك بوو و باوەڕی پێهەبوو وەك چۆن پیاوان باوەڕیان پێهەبوو، وە لە پێناویدا فیداکاریان دەدا وەك چۆن پیاوان فیداکاریان دەدا. ئەم باوەڕبوونە بوو وایکرد لە (أم

---

[1] سەیری فتح الباري شرح صحيح البخاري بکە ٢٣٣/٧، ٢٤٠ کتاب مناقب الانصار: باب هجرة النبي وأصحابه الى المدينة، ١٢٩/٦ کتاب الجهاد: باب حمل لزاد في الغزو.

کلثوم بنت عقبة بن ابي معيط) بەتەنیا کۆچبکات بۆ مەدینە لە میانەی ڕێکـەوتنی حودەیبییەـ ڕێکەوتنی حودەیبییە ئەو پەیمانی ئاگربەستنە بوو لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و نێـوان موشـریکەکان، بەپێی ئەو پەیمانە: هەر پیاوێك موسڵمان بێت و بێتـە لای پێغەمبـەر ﷺ دەبـێ بیگێڕێتـەوە بـۆ مەککە، پێغەمبەر ﷺ پەیمانەکەی بردە سەر و دوو پیاوی بۆ گەڕاندنەوە. کاتێ ام کلثوم موسڵمان بوو و هاتە مەدینە بە پێغەمبەر ﷺ ی وت: من بەخۆم و ئاینەکەم دەربازبووین بۆلای تۆ، تـۆش مەمگەڕێنەوە بۆلایان، تا لەژێر ئازار و ئەشکەنجە هەڵمگەڕێننەوە، ناشتوانم بەرگەی ئەشـکەنجە و ئازار بگرم، من ئافرەتم و خۆشت لاوازی ئافرەت دەزانی تا چ ڕادەیەکە، وە من بینـیم دوو پیـاوت گەڕانـدەوە، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ((خـودا بەگـەورەیی خـۆی پەیمانەکـەی لـە ژنـان هەڵوەشاندۆتەوە))[٢] بۆیە خودا سروشی دابەزاند و تیایدا پەیمانەکە هەڵدەوەشێنێتەوە و قەدەغـەی ناردنەوەی ئافرەتان دەکات بۆلای موشریکەکان پاش ئەوەی تاقیان دەکاتەوە و دڵنیا دەبێت لەوەی بۆ مێرد و ماڵ و دنیا دەرنەچوونە، بەڵکو تەنها لـە پێنـاو خۆشەویـستی خـوا و پێغەمبەرەکـەی دەرچوونە" کە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامتَحِنُوهُنَّ اللّهُ أَعلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِن عَلِمتُمُوهُنَّ مُؤمِنَاتٍ فَلاَ تَرجِعُوهُنَّ إِلَى الكُفَّارِ لاَ هُنَّ حِلٌّ لَهُم وَلاَ هُم يَحِلُّونَ لَهُنَّ.... واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ ئافرەتانی باوەڕدار کۆچ دەکەن لە خانـەی کـوفر بۆ خانەی ئیسلام تاقیـان بکەنـەوە و سـوێندیان بـدەن کـە تـەنها لـەپێناو خۆشەویـستی خـوا و پێغەمبەرەکەی کۆچیانکردووە، خوداش باشتر زانـا و شـارەزایە بـەباوەڕ و ڕاسـتی کۆچـکردنیان، کاتێ دڵنیابوون لە باوەڕەکەیان، نەیانگەڕێننەوە لای بـێ بـاوەڕان، نـە ئـەو ئافرەتـە موسـڵمانانە حەڵاڵن بۆیان نە ئەوان حەڵاڵن بۆ ئەمان......﴾ المتحنە: ١٠.

لەو ئافرەتانەی دەست پێشخەربوونە بۆ سەرخستنی ئیسلام و پێغەمبەرەکـەی (ام الفضل بنت الحارثة، لبابة) خوشکی مەیمونەی دایکی باوەڕداران لە دایکی و باوکی، ئەمە دووەم ئـافرەت بـوو لە ئیسلام" چونکە پاش خاتوو خدیجە کچی خوەیلد موسڵمان بوو، ئەم ئافرەتە پاڵپشت و دڵنەوایی و یارمەتی دەری پێغەمبەر ﷺ بوو. هاوسەری عباس بن عبدالمطلب مـامی پێغەمبـەر ﷺ بـوو،

---

[٢] احكام النساء لابن الجوزي: ٤٣٩.

پێچەوانەی هاوسەری مامەککەیتری (ام جمیل کچی حەرب) هاوسەری (ابـو لهـب)، ام جمیـل وەك قورئان باس دەکات دار و دڕکی هەڵدەگرت بۆ ئازاردانی پێغەمبـەر ﷺ، بۆیـە لـە ڕۆژی دوایـی پەتی ئاگرینی دەکرێتە مل، کەچی ام الفضل لە خێراترین سەرخەر و پاڵپشت و خۆبەختکاران بـوو لەپێناو سەرخستنی ئاینەکـەی لـە دژوارترینـی ڕۆژە سـەخت و تەنگـەکان کـە تێپـەڕی بەسـەر موسڵمانانی پێشینە.

ئەم ئافرەتە خـۆی و مێردەکـەی العبـاس و منداڵـەکانی بەفـەرمانی پێغەمبـەر ﷺ و بـەپێی پیلانێکـی داڕێـژراوی پتـەو ئیـسلامەتی خۆیـان ئاشـکرا نـەدەکرد، تـاوەك لـە نهێنییـەکانی موشریکەکان ئاگاداربن و پێغەمبەریـشی لێئاگـادار بکەنـەوە. کاتـێ جـەنگی بـەدر لـە نێـوان موسڵمانان و موشریکەکان ڕوویدا و، هەواڵی نشوستی قورەیش هـات، ئـەم ئافرەتـە ئامۆژگـاری خزمەتکارەکەی کرد کە ناوی ابا ڕافع بوو بە شاردنەوەی دڵخۆشیەکەی بەم نشوستیە، تا خۆیان لە خراپەی موشریکەکان بپارێزن، بەتایبەتی لە خراپەی ابو لهب کـە خـەریك بـوو لـە داخـان و ڕق و کینەی بۆ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی و بانگەوازەکەی شەق ببات. بەڵام ابا ڕافع لە چنگی ابو لهب ڕزگاری نەبوو" کاتێ دڵخۆشی خۆی نیشاندا بە سەرکەوتنی موسڵمانان، ابو لهب گرکانی تـوڕەیی هەڵساو کاسەی توڕەییەکەی ڕژاندە سەر کۆیلەی بەستەزمان و لەبەرچاوی ام الفضل لێیدا. پاشـان ام الفـضل لە دژی ابو لهب وەك شێر ڕاپەڕی و هاواریکرد و وتی: لاوازی ئەم کۆیلەت بە هەل زانی لەو کاتەی گەورەکەی لێرە نەبوو؟! وە بەیەکێ لە ئاسنەکانی ماڵـەوە لێتـدا و برینێکـی گـەورە و کوشندەت لەسەری پەیداکرد و، بەهۆیەوە پاشان تەنها حەوت شەو ژیا و کۆچیکرد.

ئەم ئافرەتە لەپێناوی خوا و سەرخستنی ئاینەکەی لەو ڕۆژەی پێغەمبەر ﷺ فـەرمانیکرد بـە مانەوەی عباس لە مەککـە و کۆچـکردنی ام الفـضل بـۆ مەدینـە ئـارامی گـرت لەسـەر دووری مێردەکەی، ئەم دووریە درێژەی کێشا، تاڵاوێکی سەخت و پڕ لـە ئـازاربوو، ئـەم ئافرەتـە شـەو و ڕۆژەکانی بە ئارامگرتن و ئومێدی پاداشتی خـوایی دەبردەسـەر بـە پـەنا بردنەبـەر ڕۆژووگـرتن و نوێژکردن، پاش تەواوبوونی ئـەرکی العبـاس لـە مەککـە، ام الفضل چاوەڕوانی هـاتنی مێـردە خۆشەویستەکەی بوو بۆ مـەدینە، بەڵام ئەم دابرانە درێژەی کێشا و العباس کۆتا کۆچبەر بوو هاتـە

مەدینە. ئەوەی برینی دووری مێردەکەی بۆ سارێژ دەکرد بینینی عبداللە ی کوڕە گەورەی بوو کە هەردەم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دابوو و لە سەرچاوەی ڕێنماییەکانی خۆی تێراودەکرد، هەموو ڕۆژێ پزیسکێکی لە رووناکیە پرشنگدارەکەی وەدەست دەکەوت. هەرگیز لە خەیاڵی دانەبوو ڕۆژێك دابێ لە فراوانترین دەرگاکانی بچێتە ژوورەوە و ببێتە ئەو ئافرەتە مەزنە و دایکی زانای نەتەوەی ئیسلام و وەرگێڕی قورئان کە (عبداللە بن عباس ﷺ) بوو.

یەکێکیتر لەو ئافرەتە پێشینانەی ئیسلام کە گوێی بەو ئەشکەنجە و ئازار و ناخۆشیانە نەدەدا کە دووچاری دەبوویەوە لەپێناوی ئیسلام: سومەییە، دایکی عەماری کوڕی یاسرە. بەرەی مەخزوم بەجۆرێك ئەشکەنجە و ئازاریان دەدا کاتێ گەرمای نیوەڕۆ زۆر بەتین دەبوو، خاکی مەککە لە تاوی گەرما سوردەبوویەوە، خۆی و کوڕی و مێردیان دەهێنایە ئەم بیابانە و لمی سوربوویەوەیان بەسەردا دەکردن و قەڵغانی داخکراویان لەبەردەکردن، بەردبارانیان دەکردن، تا لەتاوی ئەو ئەشکەنجە و ئازارە سەختانە کوڕەکەی و مێردەکەی وشەیەکیان بەدەمدا هات کە دڵی موشریکەکانی ڕازیکرد، وشەیەك بەزۆر وتیان، بۆیە لەوان و لە وێنەی ئەوان ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ ...إلاَّ مَن أُكرِهَ وَقَلبُهُ مُطمَئِنٌّ بِالإِيمَان.... واتا:... خودا لەوانە خۆش دەبێت و تاوانیان لەسەر نییە کە بەزۆر کوفریان پێدەکرێت لەکاتێکا دڵیان ئارامە بەباوەڕ و ئیمان بەخوا...﴾ النحل: ١٠٦.

هەرچی سومەییەیە ئارامی گرت و ڕازی نەبوو تەنها بە وشەیەکیش بێ باوەڕان ڕازی بکات، بۆیە ابو جهل هەر ئەوەندەی بۆ کرا بە ڕمێك لێیداو گیانی هەڵفڕاند، مێژوش بە دێری نورین بەیەکەم شەهید لە ئیسلام تۆماریکرد.

لە مێژوی ئیسلامدا زۆرانێك هەن بێجگە لە سومەییە بەرگەی زیاتریان گرتووە لەپێناو سەرخستنی ئیسلام، هەرگیز لە خۆڕاگری و چەسپاویدا لاواز نەدەبوون، ئەشکەنجە و ئازار ورەی پێبەرنەدان، بەڵکو بەئارامی و ڕازی بوون و بە ئومێدی پاداشتی خوایی ڕووبەڕووی ئازار و ئەشکەنجە دەبوونەوە، هیچ کاتێك ڕازی نەبوونە بە ڕیسواکردن و سوکایەتی پێکردن لە ئاینەکەیان، سەریان شۆر نەکردۆتەوە و داوای بەزەییان نەکردووە لە دوژمنانی ئەم ئاینە، هەتا

ئەوانەی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیان نووسیووە، دەڵێن: پیاوە سزادراوەکانی ئیسلام لە ژێر ئەشکەنجە و ئازاردا و لەپێناو مانەوەی خۆیان ـ بێجگە لە بلال ـ ناچاربوونە وشەیەك بڵێن ستەمکاران ڕازی بکات، بەڵام نەهاتووە ئافرەتێکی موسڵمان لەژێر ئەشکەنجە و ئازاردا هیچ لەو جۆرە وشانەیان وتبێ.

ئەم ئافرەتە بوێرە موسڵمانانە بەرگەی ئەشکەنجە و ئازاری زۆریان گرتووە لە پێناوی خوا و بەرزڕاگرتنی ئاینەکەی، بەردەوامبوون لە بانگەوازکردن بۆ ئیسلام، گوێیان نەدەدایە دڕك و داڵ و دژواری ڕێی بانگەوازکردن بۆ ئاینی خوا.

ابن عباس لەبارەی ام شریك القرشيّة العامرية بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لەو کاتەی ام شریك هێشتا لە مەککە بوو ئیسلام چووە ناو دڵی و موسڵمان بوو، پاشان بەنهێنی دەچووە ناوماڵی ژنانی قورەیش و بانگی دەکردن بۆ ئیسلام و لەبەرچاوی شیرین دەکردن، تا کارەکەی لەلای خەڵکی مەککە ئاشکرابوو و دەستگیریان کرد و پێیان وت: ئەگەر لەبەر هۆزەکەت نەبێ ئاوا و ئاوامان لێ دەکردی بەڵام بۆ ناو هۆزەکەت دەتگەڕێنینەوە. ام شریك وتی: لە پشتی حوشترێك هەڵیانگرتم و هیچیان لەژێر دانەنام، پاشان سێ ڕۆژ جێیان هێشتم، نە خواردنیان دامێ نە خۆراك. وتی: پاش تێپەڕبوونی ئەو سێ شەوە هێندە بێتوانا و لاواز و نەخۆش بووم هیچ شتێکم نەدەبیست لەسەر ڕووی ئەم زەمینە. هەرکاتێ دایانبەزاندبام لەبەر خۆری گەرم دەیانبەستمەوەو، خۆشیان دەچوونە ژێر سێبەر، خواردن و خواردنەوەیان لێقەدەغە کردم تا ڕۆیشتن...هتد.

ئافرەتی موسڵمانی پێشینە هەر بەوەندە نەوەستاوە لەپێناو سەرخستنی ئیسلام، بەڵکو وەپێشکەوت بۆ شەڕکردن شان بەشانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە چەندین جەنگداو، کاری زۆر نایاب و جوانی دەکرد لە ئامادەکردنی مەشکە و پڕکردنی لە ئاو و بردنی بۆ تێکۆشەران و تێرئاوکردنیان و چارەسەرکردنی بریندارانو گواستنەوەی شەهیدان بۆ دەرەوەی گۆڕەپانی شەڕ، هیچ کاتێکیش دەستەوسان نەوەستاوە، بەڵکو چەکی هەڵگرتووە و شان بەشانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی شەڕیکردووە: مسلم لە ام عطیة الانصاریة دەگێڕێتەوە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ

حەوت غەزام کردوە، لەناو رەشماڵ دەمامەوە و خواردنم بۆ ئامادە دەکـردن، چارەسـەری بریـندارانم دەکرد، بە کاری نەخۆشەکان هەڵدەستام. صحیح مسلم ١٢/١٩٤.

انس بن مالك دەڵێت: ((هەرکاتێك پێغەمبەر ﷺ بـچووبایە جـەنگ ام سـلیم و چـەند ژنێکـی ئەنصاری دەبرد لەگەڵ خۆی، کە ئاویان دەدا بـە خـەڵك و بریـندارانیان چارەسـەردەکرد)) صـحیح مسلم ١٢/١٩٤.

بخاری لە الرُّبَیِّع بنـت مُعَـوِّذ دەگێڕێتـەوە، وتویـەتی: ((ئێمـە لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ بـووین، بریندارانمان چارەسەردەکرد و شەهیدانمان بۆ مەدینە دەگێڕایەوە)) فتح الباری: ٦/٨٠.

بوخاری و مسلم لە انس ﷺ دەگێڕنـەوە، وتوویـەتی: ((لـە ڕۆژی جـەنگی ئوحـود خـەڵکانێك ڕایانکرد و دەوری پێغەمبەریان چۆڵکرد، ابو طلحة لەبەر دەسـتی پێغەمبـەر ﷺ بـوو و قـەڵغانی لەبەرکردبوو و خۆشی وەکو قەڵغان پارێزگاری لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد لە چەکی بێ باوەڕان، وتـی: ابو طلحـة پیاوێکی تیرهاوێژی بەتوانابوو، لەو ڕۆژە دوو یان سێ کەوانی لە دەست شکا. وتی: جـا پیاوی هەڵاتوو بەلایدا تێدەپەڕین و کۆمەڵێك تیریان پێبوو، دەیوت: هەڵیڕێـژە بـۆ ابـو طلحـة. وە پێغەمبەر ﷺ سەری هەڵدەبڕی تا سەیری ئەو خەڵکە بکات، ابو تەڵحەش دەیوت: ئەی پێغەمبـەر خوا دایك و باوکم بە فیدات بن، سەرت بەرزمەکەوە، با تیرێکی ئەو خەڵکەت بەرنەکەوێ، سـنگم قەڵغانی سنگت بێ. وتی: لەو ڕۆژە خاتوو عائشەی کچی ابوبکر و ام سولەیم بینـی، کـە خۆیـان گورج و گۆل کردبوو بەشێوەیەك خلخاڵی پێیانم دەبینی، مەشکەکانیان لەسەر پشتیان هەڵگرتبوو، پاشان لە دەمی خەڵکەکە بەتاڵیان دەکرد، دیسان دەچوونەوە و پڕیان دەکردەوە، پاشان دوبـارە لـە دەمی خەڵکەکە بەتاڵیان دەکردەوە، لەو ڕۆژە دووجار یان سـێ جـار لـە تـاوی خـەو و وەنـەوزەوە شمشێر لە دەستی ابو تەڵحە بەربۆتەوە)) فتح الباری ٧/٣٦١. صحیح مسلم ١٢/١٨٩.

چەندە کارێکی بەرزە ئەوەی ئەو دوو ئافرەتـە بـەڕێزە تێکۆشـەرە پێیهەڵـسان لـە تێراوکردنـی جەنگاوەڕان، لەو کاتەی لەناو گەرمەی جەنگ و هەڕابوون، لەو کەشە گەرمـە گرکانییـەی وڵاتـی حیجاز، کاتێ لەوبەر بۆ ئەو بەری گۆڕەپانی جەنگ دەچوون، بێگوێدانـە شـاڵاوی تـیر و دەنگـی

شمشێر!! هەر بۆیە خەلیفەی تێگەیشتوو عمر بن الخطاب ام سلیطی پێ لەپێشتربوو لە هاوسەرەکەی ام کلثوم لەکاتی دابەشکردنی کالآی حیجاب لە نێوان ژنانی مەدینە" چونکە ام سلیط مەشکەی دەدروی لە ڕۆژی ئوحود، ئەمەش کارێکی زۆر گرنگ بوو" چونکە جەنگاوەرانی تێراودەکرد و دوبارە گڕووتینی وەبەر دەخستنەوە.

بوخاری لە ثعلبة بن ابي مالك دەگێڕێتەوە: ((عمر کوڕی خەتتاب ﷺ هەندێ کالآی حیجابی لە نێوان ژنانی مەدینە دابەشکرد، جلێکی باش مابوو، هەندێ لە ئامادەبووان وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەمە بدە بە کچەکەی پێغەمبەر ﷺ کە لەلاتە ـ مەبەستیان ام کلثوم کچی عەلی بوو[1] ـ عمر وتی: ام سلیط لەپێشترە، ام سلیط ژنێك بوو لە ژنانی ئەنصار کە پەیمانیان دابوو بە پێغەمبەر ﷺ. عمر وتی: چونکە ئەو مەشکەی بۆ دەدروین و ئامادەی دەکرد لە ڕۆژی ئوحود)) فتح الباری ٧٩/٦ وە ٣٦٦/٧.

لە جەنگی ئوحود ڕووخساری پێغەمبەر ﷺ بریندار بوو، ددانی پێشەوەی شکا، گۆنا و لێوی سەرەوەی بریندار بوو، فاتیمەی کچی برینەکانی بۆ دەشوشت و ئاوی بەسەردادەکرد، کاتێ فاتیمە بینی ئاوەکە تەنها خوێنەکە زیاتر دەکات، پارچەیەك لە قەمیشی هێنا و سوتاندی و نوساندی بە برینەکەی، ئنجا خوێنەکە وەستا. فتح الباری ٣٧٢/٧.

یەکێکیتر لەو ژنانەی خۆڕاگربووە لەکاتە دژوارەکانی جەنگی ئوحود: صەفییەی کچی عبد الموتەلیب، پوری پێغەمبەر ﷺ، کاتێ هەڵسا و تیرێکی لە دەست بوو لە دەم و چاوی خەڵکەکەی دەدا و دەیوت: ڕادەکەن لە پێغەمبەر خوا ﷺ! کاتێ پێغەمبەر ﷺ صەفیەی بینی ئاماژەی بۆ زبیر بن العوامی کوڕی کرد تا بیگەڕێنێتەوە نەبادا ئەو هەتککردنە ببینێ کە بە حەمزەی برای کراوە، صەفیە وتی: جا بۆچی؟ بینیومە هەتك بە برام کراوە، ئەمە لە پێناوی خوا هێشتا کەمە، ڕازین بەوەی بەسەرمان هاتووە، ئارام دەگرم بە ئومێدی پاداشتی خوایی انشاءالله.

---

[1] واتا کچەزای پێغەمبەر ﷺ کە بچوکترین کچی فاتیمە بوو ـ علیها السلام ـ بۆیە پێیان دەوت کچی پێغەمبەری خوا.

خاتوو صەفییە جەنگی خەندەقیشی بینیووە، هەرکاتێ پێغەمبەر ﷺ دەرچووبایە بۆ جەنگی دوژمنانی لە مەدینە خێزانەکانی و ئافرەتانی لە حەشارگەی حسان بن ثابت دەپاراست، کە لە هەموو حەشارگاکانی مەدینە پارێزراوتربوو، پیاوێکی جوولەکە لە دەوری حەشارگاکە دەهات و دەچوو و دەسوڕایەوە، صەفییە وتی: ئەی حسان، ئەو جوولەکەیە لە دەوروبەری ئەم حەشارگەیە دەسوڕێتەوە، سوێند بەخوا گومانم لێی هەیە بچێ شوێنمان بە جوولەکەکانیتر پیشان بدات، لەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی سەرقاڵن و ئاگایان لە ئێمە نامێنێ، جا دابەزە و بیکوژە، حسان وتی: خودا لێت ببوڕا ئەی کچی عەبدولموتەلیب، سوێند بەحوا خۆت دەزانی من پیاوی ئەم کارە نیم. کە صەفییە گوێی لەم قسانە بوو هەڵسا و ئاسنێکی برد و لە حەشارگاکە دابەزی و بە ئاسنەکە لە جولەکەکەی داو کوشتی، پاشان بۆ حەشارگاکە گەڕایەوە و وتی: ئەی حسان، بڕۆ چی لەلایە بۆ خۆتی ببە" چونکە سوێند بەخوا هیچ شتێك ڕێگای لێنەگرتم لە بردنی ئەوەی لەلایەتی تەنها لەبەرئەوەی پیاوە، حسان پێی وت: هیچ پێویستیەکەم بە بردنی شتەکانی نییە ئەی کچی عەبدولموتەلیب. پاشان صەفییە ئامادەی جەنگی خەیبەریش بوو.

یەکێکیتر لە دیارترینی سەرجەم ئافرەتانی تێکۆشەری ڕۆژی ئوحود بەگشتی: نوسەیبەی کچی کەعبی مازنییە، دایکی عومارە ﷺ ، ئەم ئافرەتە لە سەرەتای جەنگ کاتێ سەرەتا موسڵمانان سەرکەوتووبوون ئاوی دەدا بە تینووان، بریندارانی چارەسەردەکرد وەك ئافرەتانیتر، تا ئەو کاتەی سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ یان کرد و بووە هۆی شکست هێنانیان، پاشان ڕاکردنیان لەبەرەی جەنگ، خودا دەفەرموویێ: ﴿إِذ تُصعِدُونَ وَلاَ تَلوُنَ عَلَى أَحَدٍ وَالرَّسُولُ يَدعُوكُم فِي أُخرَاكُم ...واتا: لەو کاتەی ئێوە لە شەڕ ڕادەکەن و دووردەکەونەوە و ئاوڕ لە کەس نادەنەوە لەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ خۆڕاگرن و بەردەوامن، ئێوەش نەیارمەتیان دەدەن و نە بەدەمیانەوە دەچن، پێغەمبەریش ﷺ لە دواتانەوەیە ڕووبەڕووی دوژمنە و بانگتان دەکات تا بگەڕێنەوە.....﴾ ال عمران: ١٥٣. لەو کاتە نوسەیبە دێتە پێشەوە و شمشێر هەڵدەگرێ و تیر و کەوان دەکاتە پشتی و، دەچێتە پاڵ ئەو چەند کەسە کەمەی لەپاڵ پێغەمبەر ﷺ ماونەتەوە و وەکوو دیوارێکی ئادەمیزادی خۆشەویستیان لە تیری موشریکەکان دەپاراست، هەرکاتێك مەترسی لە پێغەمبەر ﷺ نزیك بایەوە، خێرا نوسەیبە پارێزگاری لێ دەکرد و بەرگری لێ دەکرد، بە ڕادەیەك سەرنجی

پێغەمبەر ﷺ ڕاکێشابوو و فەرمووی: ((هەرچەندە بەلای ڕاست و بەلای چەپا ئاوڕم دەدایەوە هەر نوسەیبەم دەدی لە جیاتی من و لەپێناو پاراستنی من شەڕی دەکرد)) عومارەی کوڕی لەم هەڵوێستە سەختە لەبارەی دایکی دەڵێت: من لەو ڕۆژە باڵی چەپم برینداربوو، پیاوێك لێی دام وەکوو دارخورما بەرزبوو و ڕۆیشت، کەسیش نەهات بەدەممەوە، خوێنیش لێم دەچۆڕا. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: برینەکەت بپێچە. جا دایکم هات و هەندێ پارچە قوماشی پێبوو کە لەناو پشتێنیدا هەڵی گرتبوو، بۆ برینپێچی ئامادەی کردبوو، برینەکەی پێچام، پێغەمبەریش ﷺ سەیری دەکردم، پاشان دایکم وتی: دەی کوڕم هەڵسە، لەگەڵ ئەو خەڵکە جەنگ بکە. جا پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئنجا کێ بەرگەی ئەوە دەگرێ کە تۆ بەرگەی دەگری ئەی دایکی عومارە؟ نوسەیبە وتی: لەکاتی ئەم قسەیە ئەو پیاوە هات کە لە کوڕەکەمی دابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە بوو لە کوڕەکەتیدا. نوسەیبە وتی: چوومە سەر ڕێگای و لە قاچیمدا و خستم بەزەویدا، نوسەیبە وتی: پێغەمبەرم بینی ﷺ بەجۆرێك پێکەنی ددانەکانی بەدەرکەوتن، فەرمووی: پێکات ئەی دایکی عومارە، پاشان لەدوای یەك بە چەك لێماندا تا کوشتمان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوپاس بۆ خوا کە زاڵی کردی بەسەر دوژمنەکەت و بیلبیلەی چاوی پێ نیشاندای لە دوژمنەکەت، تۆڵەی کوڕەکەتت بەچاوی خۆت بینی.

لەو ڕۆژە جەستەی نوسەیبە پەنمابوو لەگەڵ برین، بەهۆی هێندە شەڕ و کوشتاری کردبوو و هێندەی لە سنگی بێ باوەڕان دابوو، کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەیری دەکات هەموو جەستەی لەناو خوێنە، بانگی کوڕەکەی دەکات: دایکت..دایکت، برینی بپێچە، خودا فەڕ و پیرۆزیتان تێخا ئێوە لە ئال و بەیتی منن. پلە وپایەی دایکت لە پلەوپایەی فلان و فلان باشترە، کاتێ نوسەیبە گوێی لە قسەی پێغەمبەر ﷺ بوو وتی: داوا لە خوا بکە بۆمان لە بەهەشت هاوەڵت بین، ئنجا فەرمووی: خودایە بیانکە هاوەڵی من لە بەهەشت، ئنجا نوسەیبە وتی: ئیتر گرنگ نییە هەرچی دووچارم بێتەوە لە دونیا))[1].

---

[1] سەیری أخبار غزوة احد بکە سيرة ابن هشام و انسن العيون والآثار المحمدية وطبقات ابن سعد، والاصابة، وأسد الغابة.

تێکۆشانی ام عومارەی ڕاستگۆ و کارەچاکەکانی تەنها لە جەنگی احد نەبووە، بەڵکو چەندین دیمەنی‌تری لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بینیوە لە پەیمانی عەقەبە و حودەیبیە و خەیبەر و حونەین، پاشان لە جەنگی یەمامەش بەشداریکردووە لە سەردەمی ابوبکر الصدیق، کە جوانترین تێکۆشانی نیشانداوە، لەو ڕۆژە یانزە جار بریندارکراوە، دەستیشی بڕاوە. بۆیە سەیر نییە پێغەمبەر ﷺ مژدەی بەهەشتی پێبدات، پاش خۆشی ببێتە جێگای ڕیزی خەلیفە ابوبکر و سەرکردە خالیدی کوڕی وەلید و خەلیفە عمر ﷺ.

لەم ماوە ڕۆشنەی مێژووی ئافرەتی موسڵمانی تێکۆشەر ئافرەتێکی‌تر هەیە کە مەزنییەکەی لە خاتوو نوسەیبە کەمترنییە ئەویش: ام سولەیم کچی میلحانە" ئەمەش وەکو ئافرەتە تێکۆشەرەکانی‌تر ئاوی دەدا بە جەنگاوەڕان، بریندارانی چارەسەردەکرد. ابو تەڵحەی مێردی ام سولەیم لەگەڵ ئەو موسڵمانانەیە کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ خۆیان ئامادە کردووە بۆ ڕزگارکردنی مەککە، ام سولەیمیش دووگیان بوو لە مانگەکانی کۆتایی، بەڵام ئەم دووگیانییەی بەرگرنەبوو لە زۆر سووربوونی لەسەر هاوەڵێتی‌کردنی ابو تەڵحەی مێردی، تا بەرزی و ڕیزی تێکۆشان لەپێناوی خوا بباتەوە، بێ ئەوەی گوێ بداتە دژواری گەشت، سەختی سەرکەوتنە سەرپشتی حوشتر، ووشکی و ئەزیەتی ژیان، ابو تەڵحە بەزەیی پیادەهاتەوە لەو هەموو ناخۆشیە، بەڵام ناچاربوو مۆڵەت لە پێغەمبەر ﷺ وەربگرێ، ئەویش مۆڵەتی‌دا، ام سولەیم بە هاوەڵێتی کردنی مێردی شادبوو، بەشداری بینینی سەرکەوتنی خوا و ڕزگارکردنی مەککەی کرد، لەو ڕۆژە پیرۆزەی کە شاری مەککە جمەی دەهات بە بانگ و زایەڵەی تێکۆشەرانی باوەڕدار کە دەیانوت: ((لا الـه الا الله وحده، صدق وعده، نصر عبده، هزم الاحزاب وحده، لا شيء قبله ولا بعده، لا الاه الا الله، ولا نعبد الا اياه، مخلصين له الدين ولو كره الكافروون))

واتا:

تەنها الله خودایە بێ شەریك و هاوتایە

بەڵێنی ڕاستی‌دایە سەرخەری بەندە خوایە

پارتەکانی ژێر نایە لەپێش و لەدوای نایــە

تەنها الله خودایە بێ شەریك و هاوتایـــە

پەرستنمان تەنهایە بەس بۆ زاتی الله یــە

دڵسۆزی بۆ دین وایە کافر پێی نارەوایـە

ئەم ئافرەتە بینی بناغەی بتپەرستی و هاوبەش دانان بۆ تاتایی دەڕوخێ لە دوورگـەی عــەرەب، بتەکان لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ دادەڕماو دەیفەرمووو: جاء الحق وزهق الباطل ان الباطل کان زهوقا. واتـا: حەق و ڕەوا هات و پووچەڵ و ناڕاستی ژێرکەوت، بەڕاســتی هــەموو کـات ناڕاســتی ژێرکەوتووە.

ئەم دیمەنانە دەروونی ام سولەیمی پڕکرد لە باوەڕ و، زیاتر گڕووتین و حەزی تێخست بۆ تێکۆشان لەپێناو الله. چەند ڕۆژێکی کەم تێپەڕین و جەنگی حونەین هاتەبەر، سەرەتا موسڵمانان دووچـاری لەرزنێکی زۆر توندبوون، پشتیان هەڵکرد و ڕایانکرد، ئاوڕیان لە هیچ نەدەدایەوە، پێغەمبــەر ﷺ هاتە لای ڕاستیان، پاشان فەرمووی: بۆ کوێ ئەی خەڵکینە؟ وەرنەوە لام، من پێغەمبــەری خـوام، من محمد کوڕی عبدالله م. بەڵام بێجگە لە چەند کەسێکی کەم لە کۆچبەران و یاریدەدەران و ئال و بەیت کە ام سولەیم و ابو تەڵحەی مێردیشی لەوانە بـوون، کـەس لـە تـەك پێغەمبــەر ﷺ خـۆی نەگرت، پێغەمبەر ﷺ ام سولەیمی بینی ناو قەدی خۆی بە عەباکەی پێچابوو و دووگیـان بـوو بـە عبدالله کوڕی ابی تەڵحە، حوشترەکەی ابی تەڵحەشی پێبوو و دەترسا لەدەستی دەرچێ، بۆیە سەر خۆی لە سەری حوشترەکە نزیککردەوەو دەستی خستە ناو ئەڵقــەی لـوتی، تـاوەکوو ئـارامبگرێ و دوای حوشترە هەڵاتووەکانیتر نەکەوێ، پێغەمبەریش ﷺ هەرچەند بـانگی دەکـات: ئـەی دایکـی سولەیم؟ وەڵامی دەدایەوە: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا دایك و باوکم بە قوربانت بن.

لە صحیحی موسلیم هاتووە: ((ام سولەیم لە ڕۆژی حونــەین خەنجـەرێکی هــەڵگرتبوو لەگـەڵ خۆی، ابو تەڵحە بینی، وتی: ئەی پێغەمبەری خـوا، ئەمــە ام ســولەیمە و خەنجەرێکیــشی پێیــە،

پێغەمبەریش ﷺ بە ام سولەیمی فەرمووو: ئەم خەنجەرە چی‌یە؟ وتی: بۆ ئەوە هەڵمگرتووە تا ئەگەر یەکێ لە موشریکەکان لێم نزیك بوویەوە بەم خەنجەرە زگی هەڵدڕم، کاتێ ام سولەیم ئەمەی وت، پێغەمبەر ﷺ پێکەنی.ام سولەیم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوانە بکوژە کە لە ڕۆژی مەککە موسڵمان بوون، پاشان لە حونەین لە تۆ ڕایانکرد و جێیانهێشتی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ام سولەیم، خودا کۆتایی پێ‌هێنا و چاکەی لەگەڵیان کردووە)) ام سولەیم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ خۆی گرت لەکاتی دژواری و سەختی و تەنگانەدا...بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە گیرانەوەی بوخاری و مسلم وهی تر لە جابری کوڕی عبداللە، وتی: ((لەخەوا بینیم چوومە بەهەشت، بینیم (رمیصاء)[1] کچی میلحان لەوێ‌یە، هاوسەری ابی تەڵحە..)) متفق علیە. شرح السنە ١٤/٨٦.

پێغەمبەر ﷺ سەردانی ام سولەیم و خوشکەکەی ام حەڕام کچی میلحانی دەکرد، وە چۆن مژدەی بەهەشتی بە ام سولەیم داوە، ئاوەهاش مژدەی بە ام حەڕام داوە بەوەی سواری شەپۆلەکانی دەریا دەبێت لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێگای خوا غەزا و جیهاد دەکات.

بوخاری لە انس بن مالك ﷺ دەگێڕێتەوە، وتی: ((پێغەمبەر ﷺ چووە ماڵی کچی میلحان و پاڵیدایەوە، پاشان پێکەنی، ام حەڕام وتی: بۆچی پێدەکەنی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: کۆمەڵێك لە ئۆممەتی من سواری دەریای سەوز دەبن لە پێناوی خوا، وێنەیان وەك پاشایەکە لەسەر تەخت. ام حەڕام وتی: ئەی پێغەمبەر خوا، داوا لە خوا بکە منیش لەوان بم، فەرمووی: ((خودایە ام حەڕامیش یەکێك بێت لەوان)).پاشان دیسان پێکەنی، ام حەڕام وتی: هەر وەکو جارەکەی پێشوو، فەرمووی: هەروەکو جارەکەی پێشوو، ام حەڕام وتی: داوا لە خوا بکە منیش لەوان بم، فەرمووی: تۆ لە پێشینەکانی نەك لەوانەی لە دواوەن)).

مژدەی پێغەمبەر ﷺ هاتەجێ وەك انس ﷺ دەڵێ: ام حەڕام شوویکرد بە عوبادەی کوڕی صامت، لەگەڵیدا ڕۆیشتن بۆ تێکۆشان، سواری دەریا بوو لەگەڵ کچی قَرَظَة(خێزانی معاویەیە).

---

[1] الرمیصاء: ام سُلَیم بەم سیفەتە ناوزەد کرابوو، بەهۆی بوونی پەڵەیەك لە چاوی.

کاتێ لە دەریا دابەزین ام حەڕام سەرکەوتە سەرپشتی حوشترەکەی، حوشترەکە هەڵبەزی و ئـەمیش لەسەرپشتی بەربوویەوە و کۆچی دوایی کرد)) فتح الباری ٧٦/٦. گۆڕەکەی لە قوبرصـە، خـەڵکی کاتێ بەلایدا تێدەپەڕن دەڵێن: ئەمە گۆڕی ئافرەتە صاڵحەکەیە، ڕەحمەتی خودای لێبێ[1].

لەو ژنانەی بەشداری سەرخستنی ئیسلام و تێکۆشان لە پێناویدا کردووە و لە پێـشەوەی بـەرەی جەنگدا بووە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ: ام ئەیمەن دایـەنی پێغەمبـەر ﷺ "ئـەم ئافرەتـە بەشـداری لـە جەنگی ئوحود و خەیبەر و موئتە و حونەین کردووە، بە کاری زۆر دلێرانـە هەڵـساوە، بریـندارانی چارەسەرکردووە، تینوانی ئاوداوە[2].

یەکێکیتر: کەبشەی کچی ڕافعی ئەنصاریە، دایکی سەعد کوڕی معـاذ ﷺ " لە ڕۆژی ئوحـود بە سواری ئەسپەکەی بەڕاکردن هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و سەعدیش جڵەوی ئەسپەکەی بۆ گرتبوو، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەر خوا، دایکم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((زۆر بەخێر بێـت)) و لەبـەری هەڵسا و لێی‌نزیك بوویەوە و لەبارەی عەمری کوڕی سەرەخۆشی لێکرد و، مژدەی بەهەشتی‌دا بـە خۆی و بنەماڵە شەهیدەکەی و لە خودا بۆیان پاڕایەوە.

دووای‌تر لەوان: فورەیعەی کچی مالك و ام هیشام کچی حارثة کچی نوعمان ﷺ" کـە لەوانـە بوون پەیمانی (بیعة الرضوان)یان دایە پێغەمبەر ﷺ لە ژێر دارەکە لە حودەیبیە کە پێغەمبـەر ﷺ بۆ ئەو شوێنە بانگی کردبـوون لـەو کاتـەی موشـریکەکان باوەڕدارانیـان قەدەغـەکرد لـە چوونە مەککە، کاتێ پێغەمبەر ﷺ عوسمان کوڕی عەففانی نارد بۆلای قورەیش، عوسمـان زۆری پێچـوو و هەر نەهاتەوە، موسڵمانان گومانیان برد کـە قـورەیش دەسـتی خـۆی وەشـاندووە و عوسمانیـان کوشتووە. ئنجا خودا ڕیزی نا لە پێغەمبەرەکەی و هەموو ئەوانەی ئامـادەی ئـەو پەیمانـە بـوون، ڕەزامەندی خۆی پێ شایستەکردن کە لەپێناویدا مرۆڤ خـۆی بـە کوشـت دەدا و هـیچ خۆشـیەکی ئـاوات نایگاتـێ، خـودا لەبارەیانـەوە قورئـانێکی دابەزانـد کـە تـا ئاسمانـەکان و زەوی مابێـت دەخوێندرێتەوە، وەك دەفەرموووێ: ﴿ لَقَد رَضِيَ اللهُ عَنِ الْمُؤمِنِينَ إذ يُبَايِعُونَكَ تَحتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ

---

[1] الحلية ٦٢/٢، وە صفة الصفوة ٧٠/٢.
[2] سەیری المغازی ٢٧٨/١و، انساب الاشراف٣٢٦/١ و، دلائل النبوة للبيهقي٣١١/٣ بكة.

مَا فِي قُلُوبِهِم فَأنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيهِم وَأثَابَهُم فَتحًا قَرِيبًا. واتا: خودا ڕازی بوو لەو باوەڕدارانەی کە بەیعەتیان پێدای ئەی محمد لەژێر دارەکە و شارەزای نیازی ناو دڵیان بوو و هێز و ئارامی بۆ دابەزاندن و قەرەبووی کردنەوە بە فەتحی خەیبەر و دەستکەوتی مەککە﴾ الفتح: ١٨.

ئافرەتێکیتر: ام المنذر سەلمای کچی قەیس کە ئامادەی بەیعەی رضوان بوو، پێشتریش ئامادەی (بەیعەی موئمنات) بوو، بۆیە ناونرا بە (پەیماندەر بە دوو بەیعەت). وە کاتێ پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان هەڵسان بۆ گەمارۆدانی بەنی قُرَیظَة ئەم هاوەڵە بەڕیزە لەگەڵیاندابوو، فەزڵی تێکۆشان لەپێناو خوای بەرکەوتووە.

ئافرەتێکیتر ئەسمای کچی یەزید بن السکن ی ئەنصاریيە، بەشداری پێغەمبەر ﷺ کردووە لە جەنگی خەندەق، دەرچووە لەگەڵی بۆ حودەیبیە، ئامادەی بەیعەی رضوان بووە، بەشداری جەنگی خەیبەری کردووە، بەردەوام کۆشش و ماندووبوونی پڕ لە پاداشتی پێشکەش دەکرد بە ئیسلام و پرسەکانی تا پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد و لێی ڕازی بوو. پاش ئەمەش هەر نەوەستا لە سەرخستنی ئیسلام، بەڵکو لە ساڵی ١٣ی کۆچی دەرچووە بۆ وڵاتی شام، ئامادەی جەنگی یەرمووك دەبێت و ئاو دەدات بە تینوان، برینی بریندارانی دەپێچایەوە، هانی تێکۆشەرانی دەدا بۆ بەرەوپێش چوون و خۆڕاگری. جەنگی یەرموك بەناوبانگترین جەنگی ئیسلامە کە ئافرەتی موسڵمان بەشداری بونێکی چالاك و بەرچاوی تیادابووە لەگەڵ تێکۆشەرانیتر، لەم ڕۆژە زۆر لە جەنگاوەران دڵیان لەرزی و بێوەرەبوون، هەندێکیان گەڕانەوە، لەکاتێکا ئافرەتانی موسڵمانی تێکۆشەر لە پشتیانەوە شەڕیان دەکرد، بە بەرد و دار ڕووبەڕووی ڕاکردووان دەبوونەوە و هانیان دەدان بۆ بەرەوپێش چوون و خۆڕاگری. جا ابن کثیر ئاماژەی بە ئازایەتی ئافرەتانی موسڵمان و ڕۆڵی بەرچاویانی لەم جەنگەدا کردووە، دەڵێ: ((لەم ڕۆژەدا ئافرەتانی موسڵمان شەڕیان کردووە، کەسانێکی زۆریان لە سوپێی ڕۆم کوشتووە، لەوانەشیان دەدا کە ڕایان دەکرد لە موسڵمانان و پێیان دەوتن: بۆ کوێ دەچن و بە جێمان دێڵن بۆ ئەو ئاژەڵانە؟ کاتێ ئافرەتان ئەمەیان دەوت پیاوەکان دەگەڕانەوە))[1].

---

[1] البداية والنهاية ١٣/٧ و، تاريخ الطبري ٣٣٥/٢ وما بعدها طبعة دار الكتب العلمية.

هەڵوێستی جوانی ئافرەتانی موسڵمان و تین و گڕ خستنیان بە جەستەی تێکۆشەڕان گـەورەترین کاریگەربوو بۆ بەرگەگرتن و خۆڕاگری سوپاکە تا خودا سەرکەوتنی بۆیان نووسی بەسەر ڕۆم.

لەم ڕۆژە سەختەدا ئەسمای کچی یەزیدی پاڵـەوان مەردایەتیـەکی کـەم وێنـەی نوانـد، هێنـدە نمونەی ئازایەتی و پاڵەوانێتی و سەقامگیری نواند کە زۆر لە پاڵـەوانان نەیاننوانـد" ئـەم ئافرەتـە لەناو ڕیزی کوشتاردا ونببوو، ژمارەیەکیشی لە موشریکەکان کوشتبوو.

ابن حەجەریش ئاماژەی بە ئازایەتیەکەی کردووەو، دەڵـێ: ((ام سـەلەمەی ئەنـصاری (ئـەسمای کچی یەزید بن السکن) جەنگی یەرموکی بینیووە، لەو ڕۆژە ٩ کەسی لە ڕۆمـەکان کوشـتووە بـە ئاسنی ڕەشماڵەکەی، پاش ئەم ڕووداوەش ڕۆژگارێك ژیاوە)) الإصـابە ٢٢٩/٤. سـير اعـلام النـبلاء ٢٩٧/٢ز

پێدەچێ ئەم ئافرەتە پاڵەوانە ماوەی کۆتایی ژیانی لـە وڵاتـی شـام بەسـەر بردبـێ، کـە لـەوێ جەنگی یەرموك بەرپابووە" چونکە ئەو کاتە لەگەڵ هاوەڵـە بـەڕیزەکان چـۆتە ئـەوێ و ژیـاوە تـا گەیشتۆتە سەردەمی یەزید کوڕی معاویە. کاتێ ئەجەلی هات خاکی دیمەشقی گوڵاوپڕژێن کـردووە بە تەرمە پاکەکەی و لە گۆڕستانی (الباب الصغیر) نێژراوە. ئێستا گـۆڕە شـکۆدارەکەی گـەواهی تێکۆشانی بێوچانی ئەم ئافرەتە دەدات لە پێناوی خوادا. سیر اعلام النبلاء ٢٩٧/٢.

ئنجا، ئەمە چەند لاپەرەیەکی ڕۆشنە لە مێژووی ئافرەتی موسڵمان، کە دێرەکـانی بـە بـاوەڕی ڕاستەقینە، قووڵی تێگەیشتن، فراوانی پەی بردنیـان بـۆ پـەیامی ئـافرەتی موسـڵمان لـە ژیـان و ئەرکەکانی بەرامبەر پەروەردگاری و ئاینەکەی نووسـراوە. ئەمانـە چـەند لاپەرەیـەکی کـەمن لـە پەراوێکی دەوڵەمەندی مەزنی پڕ لە کـارە چـاك و بـەرزەکانیان و فیداکاریـە کـەم وێنـەکانیان و باوەڕی قووڵیان.

## شانازی دەکات بە کەسا یەتیە ئیسلامیەکەی و ئاینە ڕەواکەی

گومانی تیانییە ئافرەتی موسـڵمانی ڕۆشـنبیری ئـەمڕۆ لـە لاپـەڕە پیرۆزەکـانی چـیرۆکی ئـەم شاژنانەی ئیسلام نمونەی پێشەنگی و چرایەکە رووناکی لێوەردەگرێت و نمونەیەکی زیندوو و زمـان حاڵیانە، لە خەمی ئەوەدایە ئەمڕۆ هـەنگاوەکانیان هـەڵگرێ بـۆ دروسـتکردنی کەسـایەتیەکەی. شانازی دەکات بە کەسایەتیە ئسلامیەکەی و ئاینە ڕەواکەی. ئافرەتی موسـڵمانی ڕۆشـنبیر دەبـێ شانازی بکات بە کەسایەتیە ئیسلامیەکەی، سەربەرز بێت بە پلەوپایە شـکۆدارەکەی کـە ئیـسلام هەر لە زووەوە پێیگەیاندووە، پێش ئەوەی ئافرەتانی نەتەوەکانیتر بگەن بە شـتێك لـەم بەرزیـە" پێش پازدە سەدە ئیسلام بۆ یەکەمجار لە مێژوو تەواوی مافەکانی ئافرەتی ڕاگەیاند، بـەم شـێوەیە ئافرەتی موسڵمان هەموو مافەکانی ئادەمیزادانەی بۆ دەستەبەرکرا چەندین سەدە پـێش جیهـان و ڕێکخراوە مرۆییەکان و بەڵگەنامەی مافی مرۆڤ.

لەم کاتە زووەوە ئیسلام ڕایگەیاند کە ئافرەتان هاوشانی پیاوانن (النـساء شـقائق الرجـال) وەك لە فەرمووودەی خۆشەویست هاتووەو کە ابو داود و ترمـذي و دارەمی و احمد گێراویانەتـەوە، لـەو کاتەی کە نێوەندەکانی مەسیحیەت گومانی دەکـرد لـە مرۆڤایـەتی بـوونی ئـافرەت و سروشـتی گیانەکەی، ئەو کاتە قورئان ڕایگەیاند: ﴿فَاستَجَابَ لَهُم رَبُّهُم أنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنكُم مِـن ذَكَرٍ أو أنثَى بَعضُكُم مِن بَعضٍ... واتا: پەروەردگاریان وەڵامی داواکاریەکەی دانەوە کە بەڕاسـتی من کردەوەی هیچ کرێکارێك وێڵ ناکەم چ نێر چ مێ ....﴾ ال عمران: ١٩٥.

پێغەمبەریش ﷺ پەیمانی بیـستن و گوێڕایـەڵی وەرگـرت لـە ئافرەتـان وەك چـۆن لـە پیـاوانی وەرگرت، پەیمان وەرگرتن لە ئافرەتان بە شێوەیەکی سەربەخۆبوو، نەك شوێنکەوتن و پەیڕەوەکردنی ڕەها بۆ پیاو. ئەمانە هەموی جەختکردنەوەیە لەسەر سەربەخۆیی کەسایەتی ئافرەتی موسـڵمان و شایـستەبوونی بـۆ هـەڵگرتنی بەرپرسـیاریەتی پـەیمان و بـەڵێنی پـشتگیریکردن بـۆ خـوا و پێغەمبەرەکەی. ئەمانە هەمووی پێش چەندین سەدە پێش دان نانی جیهانی سـەردەمی نـوێ بـە مافەکانی ئافرەت لە دەربرینی ڕای سەربەخۆی خۆی لە ڕێگـای دەنگـدان و هەڵبژاردنـەوە. ئەمـە لەپاڵ کۆمەڵێ لە مافیتر، وەك سەربەخۆیی بوونی ئافرەت لـە ماڵەکـەی و خاوەنـداریێتیکردنی و بەخشینی لە خەرجی ماڵ و منداڵ هەرچەندە دەوڵەمەندیش بێت، هەروا یەکسان بوون لەگەڵ پیاوا

له ڕێز و پلەوپایەی مرۆڤایەتی و پەروەردەکردن و تەمێکردن و ئەرکە شەرعیەکان بەگشتی. خۆ ئەگەر بێین سەرجەم ئەو مافانە بخەینەڕوو کە ئیسلام داویەتی بە ئافرەت و بۆی ڕەوا بینیووە، ئەوا دەرفەت و بوار تەنگ دەبێ و ناتوانین بیانژمێرین.

ڕیزی ئافرەتی موسڵمان و مافەکانی و شایستەکردنی بە ئەرك و کار لە ئیسلامدا گەیشتە ڕادەیەك ئافرەتانی ڕۆژئاوای سەرسامکرد.بەم بۆنەیەوە وتەی یەکێ لە ئافرەتانی ئەمریکام هاتەوە یاد لەو کاتەی گوێبستی وتارێك بوو لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە یەکێ لە زاناکانی سوریە خوێندیەوە، ئەمیش استاذ شیخ بهجت البیطار بوو، لە ڕوونکردنەوەی مافەکانی ئافرەت لە ئیسلام، ئەم ئافرەتە ئەمریکیە بە سەرسامیەوە وەستا لەبەردەم ئەو ماف و دەستکەوتە شەرعیانەی ئافرەتی موسڵمان پێش ١٥ سەدە دەستی کەوتبوو، پرسیاری لە شێخ کرد، ئایا ئەمەی لەبارەی مافەکانی ئافرەتی موسڵمان دەیڵێی ڕاستەقینەیە یان پڕوپاگەندەیە، ئەگەر ڕاستەقینەیە ببەنە لای خۆتان تا ماوەیەك لەلاتان بژیم پاشان بمکوژن!؟ هەڵوێست و قسەی ئافرەتانی ڕۆژئاوا کە گوزارشت لە واقی وڕمان و سەرسامیان دەکات بە پلەوپایەی ئافرەتی موسڵمان و ڕیز لێگرتنیان یەکجار زۆرە.

کاتێك ئافرەتی موسڵمان ئەم شتانە دەزانێت شاگەشکەی ئاینەکەی دەبێت، هێندەیتر باوەڕی پتەو دەبێت و زیاتر دڵنیا دەبێت لە مەزنی و تەواوەتی و گشتگیری بەرنامەی پەروەردگاری بۆ هەموو ئەو هۆکارانەی بەختەوەری ئادەمیزادی لە ئامێز گرتووە چ بۆ نێر یا مێ، ئەوەندەش بەسە کە بزانیت ئەوەی ئیسلام پێش ١٥سەدە پیادەی کرد و هێنایەدی لە چاککردنی ڕەوشی ئافرەت، کەسێك نەیتوانیووە تەنانەت لە مێژووی ئەم سەدەی بیستەمەشدا بیهێنێتەدی.

ئەوەش بەسە کە بزانیت کاتێ شۆرشی فەرەنسی لە کۆتایی سەدەی ١٨ بەڵگەنامەی مافی مرۆڤی ڕاگەیاند، لەژێر ناونیشانی (مافەکانی پیاو) دایبەزاند. لە مادەی یەکەمی ئەم بەڵگەنامەیە هاتووە: ((پیاو بە ئازادی لەدایك دەبێت و نابێ بکرێ بە کۆیلە)). پاشان هەوڵی زۆر درا بۆ زیادکردنی وشەی ((وە ئافرەت)) لەم مادەیەدا، بەڵام هەوڵەکان ڕەتکرانەوە و مادەی یەکەمی ڕاگەیاندنی شۆرشی ئازادی هەر وەکوو خۆی مایەوە. ئنجا پاش یەك سەدە زانای گەورەی

فەرەنسی (غوستاف لوبون) لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٩ و سەرەتاکانی سەدەی بیست لە پەرتووکێکی خۆیدا بەناوی ( روح الاجتماع) ڕایدەگەیەنێ: هیچ کاتێك ئافرەت یەکسان نابێت لەگەڵ پیاو مەگەر لە سەردەمی سەرشۆری و کەمایەتی بێت، ئەمەش وەکو وەڵامێکی ئەو زانایە بوو بۆ ئەوانەی داوای یەکسانی ئافرەت لەگەل پیاو دەکەن لە دانی مافەکانی دەنگدان و هەڵبژاردن وەکو پیاوان. کار بەم شێوەیە مایەوە تا کۆمەڵەی نەتەوەکان هات پاش جەنگی جیهانی یەکەم،ئنجا سەردەمی نەتەوە یەککگرتووەکان پاش جەنگی جیهانی دووەم، وە ئەوانەی کاریان دەکرد لەسەر نووسینی دەقێك لەسەر یەکسانی مافەکانی ئافرەت و پیاو سەرنەکەوتن تەنها پاش ماندووبوون و کۆششێکی زۆر نەبێت“ چونکە ڕووبەڕووی چەند باو و عورفێکی ئاین ئامێز دەبوونەوە کە وەکوو کۆسپێك بوو لەبەردەم هەوڵەکانیان، وە هیچ دەقێکی یاسایی ناوخۆیی و نێو دەوڵەتیان لەلا نەبوو کە دادپەروەر بێت بەرامبەر ئافرەت، تا وەکو ڕێگاچارەیەکی شەرعی بیگرنەبەر بۆ زالبوون بەسەر ئەم کۆسپانە بۆ گەیشتن بە ئازادیکردنی ئافرەت لە کۆتی شکستیە کۆنە چڕ و سەختەکانی. لەکاتێکا پێش ١٥ سەدە دەقی قورئان و فەرمووودەی یەکلاکەرەوە دێت کە یەکسانی دەکات لە نێوان ئافرەت و پیاو لە پاداشت و سزا، پەرپرسیاریەتی و ئەرك، پەرستش و ڕیزلێنانی مرۆڤایەتی و مافەکانی مرۆڤ بە گشتی.

ئەو ئیسلامەی یەکسانی خستە نێوان ئافرەت و پیاو لە دەستهێنانی مافە ئادەمیزادەییەکانی، یەکسانیشی خستە نێوانیان لە پیادەکردنی ئەرکە مرۆڤایەتیەکان، کاتێ فەرمانی بە هەردووکیان کرد بە جێنشینیکردنی زەوی و ئاوەدانکردنەوەی و پەرستنی خوا تیایدا، وە بۆ هەر یەکەیان ڕۆڵێکی جیاوازی دانا لە دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی بەرز و تێگەیشتوو و خاوێن، ئەم دوو ڕۆڵە تەواوکەری یەکترن نەك دژی یەکتر بن، وە ئافرەت و پیاو پەیوەستن پێی و لەسەر هەریەکەیانە کە زیاتر لەوەیتر هەڵسێ بەوەی پێی شایستە بینراوە لە دروستکردنی مرۆڤ و خێزان و کۆمەڵگە، بەمەبەستی هێنانەدی هاوبەرپرسیاری و پشتگیری و هاریکاری لە نێوان هەردوو ڕەگەز بێ ئەوەی زۆری کردن هەبێ لە پیادەکردنی ئەو کارە شایستەی بۆی دروستکراوە، بەڵکو بەپێی پێویستی بەرژەوەندی گشتی مرۆڤ پێویستە لەسەر ئافرەت و پیاو بە ئەرکی خۆیان هەڵسن، کە دامەزراوە لەسەر وەرگرتنی پاداشتی ورد لەسەر کارەکانیان لەم ژیانە، وەك خودا دەفەرموووێ:

(النحل: ٩٧) پێشتر ڕاڤە کراوە، بنەما لەسەر ئەوەی هەریەك لە ئافرەت و پیاو بەرپرسیارە لە ژێر دەستەکەی وەك لە فەرمووودەی خۆشەویستدا هاتووە.

باری ئافرەت لە نەتەوەکانی پێش ئیسلامەتی لە نزمترین ئاستی بووە، بەتایبەتی لە ولاتانی شەریعەتە کۆنەکان وەك هند و روما، لە سەدەکانی ناوەڕاستیش لە جیهانی مەسیحیەتدا و لە ولاتی عەرەب پێش ئیسلام، لێرەوە ئافرەتی موسڵمان زیاتر شانازی دەکات بە کەسایەتیە موسڵمانەکەی و ئاینە ڕەواکەی و پلەوپایە مرۆڤایەتیە بەرز و شکۆدارەکەی.

هەرچی ڕەوشی ئافرەتە لە شەریعەتە کۆنەکان، وەك چۆن زەعیمی هندی (جواهر لال نهرۆ) لە پەرتووکەکەی (اکتشاف الهند) بە گشتی باسیکردووە، دەڵێ: ((هەرچی ڕەوشی یاسایی ئافرەتە بەپێی وتەی (مانو) بێگومان زۆر خراپ بوو، هەمیشە پشتیان بە باوك و برا و مێرد بەستبوو))، کە وەك زانراوە میراتەکانی ئەوان لە مردووە نێرەکانەوە دەگوێزرایەوە بۆ زیندووە نێرەکان و ڕەگەزی مێینەش بێبەش بوو.

نەهرۆ بەدواچوونەوەیەکی هەبوو لەسەر ئەمە، کە دەڵێ: ((هەر چۆنێك بێ باری ئافرەت لە هندی کۆن باشتربوو لە باری ئافرەت لە ولاتی یونانی کۆن، یان لە ڕۆمای کۆن، یان لە سەردەمی مەسیحیەتی یەکەم)).

ڕەوشی ئافرەت لە شەریعەتی ڕۆمای کۆن دامەزرابوو لەسەر دان نەنان بە شایان بوونی ئافرەت بۆ مافەکانی، دەبێ هەردەم لە ژێر چاودێری دابێت" چونکە ڕەگەزی مێینەیە، جا چ بچوك بێت یا پێگەیشتوو، بۆیە هەمیشە لە ژێر چاودێری باوك یان مێرد دابوو، هیچ جۆرە ئازادیەکی نەبووە لە هەڵس و کەوتیدا، بە گشتی میراتی لێدەگیرا بەڵام پێی نەدەدرا.

ئافرەت لە دەستوری ڕومانی شتێك بووە لەو شتانەی پیاو خاوەنداریێتی کردووە، بۆیە کەسایەتیەکەی ونکردبوو، بێبەش بوو لە ئازادی هەڵس و کەوتکردنی. شوێنەوار و کاریگەری ئەمانە تا ئەمرۆی سەدەی بیست و یەکیش هەر ماوە، وەك چۆن لە ولاتانی ئەم سەردەمە کە هێشتا لە یاساکانیدا کاریگەری مافەکانی ڕۆمانی لەسەر ماوە.

هەندێ لە کۆنە ئاینەکان گومانیان هەبوو لە مرۆڤایەتی بوونی ئافرەت و سروشتی گیانەکەی. چەندین کۆنگرە لە ڕۆما بەسترا بۆ گەڕان بەدوای گیانی ئافرەت کە ئایا ئەمیش هاوشێوەی گیانی پیاو گیانی هەیە؟ یا گیانی ئافرەت هاوشێوەی گیانی ئاژەڵانە وەك گیانی مار و سەگ... هتد. بەڵکو یەکێ لەو کۆبوونەوانە بڕیاریدا" ئافرەت بە شێوەیەکی ڕەها هیچ گیانی نییە و دوبارە لە ژیانەکەیتر زیندوو نابێتەوە!

استاذ (جاسم محمد المطوع) لە پەرتووکەکەی (زوجات النبی ﷺ فی واقعنا المعاصر ـ ص٧٤ ـ) دەڵێ: (( پەرلەمانی ئۆسکۆتلەندی لە ساڵی ١٥٦٧ بڕیارێکی دەرکرد، کە دەڵێ: ئافرەت نابێ هیچ دەسەڵاتێکی هەبێت لەسەر هیچ شتێك))

جاران پیاوەکان لە بەریتانیا ژنەکانی خۆیان دەفرۆشت تا یاسای ساڵی ١٩٣٠ دەرچوو و ئەم کارەی یاساغکرد.

لە سەردەمی هنری هەشتەم پاشای ئینگلتەڕا پەرلەمانی ئینگلیزی بڕیارێکی دەرکرد بەوەی ئافرەت نابێ پەرتووکی (العهد الجدید) بخوێنێتەوە کە المسیح علیه السلام هێناویەتی.

هەرچی ئافرەتە لە دوورگەی عەرەب، ئەوا لە زۆربەی هۆزەکانی پێش هاتنی ئیسلام جێگای سووکایەتی پێکردن بوو، مایەی شەرمەزاری بوو، بۆیە زۆر لە سەرپەرشتکارانیان سووربوون لەسەر ئەوەی ئەم شەرمەزاریە دوچاریان نەبێتەوە، ئەمەش بە زیندەبەچاڵکردنی لەو کاتەی لە دایکبووە. خودا گوزارشت لەو هەستە نزمە دەکات بەرامبەر بە ئافرەت لەسەردەمی نەفامی، کە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالأُنثَى ظَلَّ وَجهُهُ مُسوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ، يَتَوَارَى مِنَ القَومِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ، أَيُمسِكُهُ عَلَى هُونٍ أم يَدُسُّهُ فِي التُّرابِ، ألاَ سَآءَ مَا يَحكُمُونَ. واتا: لە سەردەمی نەفامی کاتێ یەکێکیان مژدەی لە دایکبوونی کچیان پێدابوایە ڕوخساری لە خەفەتانا ڕەش هەڵدەگەڕا لە داخی ئەم هەواڵە و لە ناخیشیدا پڕدەبێ لە رق و کینە بەڵام دەیشارێتەوە، لەبەر سەختی و نالەباری ئەم مژدەیە خۆی لە خەڵکی دەشارێتەوە، ئەگەر بەخێوی بکات بە نادڵیەوەیە و یان زیندەبەچاڵی دەکات، بەڕاستی موشریکەکان خراپ بڕیار دەدەن﴾ النحل: ٥٨ـ ٥٩.

هەروا خودا وێنای دڕندایەتی تاوانی زیندەبەچاڵکردنی ئەو بێتاوان و پاکە دەکات و دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا الْمَوْؤدَةُ سُئِلَت بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَت. واتا: لەڕۆژی قیامەت لە کچی زیندەبەچاڵکراو دەپرسرێت لەبەرچی کوژراوە﴾ التكوير: ٨ـ ٩.

بەڕاستی رەوشێکی پڕ لە ناسۆر و شەرمەزاری بوو بۆ مرۆڤایەتی، (مرۆڤایەتی ئافرەت) بە شێوەیەکی تایبەت لە ولاّتی عەرەب پێش ئیسلام و لە زۆربەی ولاّتە پێشکەوتووەکانی ئەو کاتە، بەتایبەتی ولاّتی رۆمان، لە سەردەمی مەسیحیەتی یەکەم، پاشان لە زۆربەی ولاّتەکانی سەردەمی ئێستا کە هێشتا کاریگەرە لە یاساکانی بە مافەکانی رۆمانی، وەك ئەمە لەلایەن زاناکانی ماف ناسراوە[1].

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر لەو بەخششە گەورە تێدەگات کە خوا بەسەری باراندووە لەو رۆژەی خۆری ئیسلامی هەڵێنا و جیهانی عەرەبی نقومی روناکیە پرشنگدارەکەی کرد کە دەفەرمووێ: ﴿اليَومَ أكمَلتُ لَكُم دِينَكُم وَأتمَمتُ عَلَيكُم نِعمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسلاَمَ دِينًا... واتا: ئەمرۆ ئاین و دەستور و بەرنامەی ژیانم بۆ تەواوکردن و بەخششەکانم لە سەرتان تەواوکرد و بە ئاینی ئیسلام بۆتان ڕازی بووم وەکو پەیرە و پرۆگرامی هەتاهەتایی ژیانتان..﴾ المائدە: ٣.

بەڵکو ئەوەی دەروونی ئافرەتی موسڵمان پڕدەکات لە بەختەوەری و ڕەزامەندی و ئارامی و شانازی و، ڕیز و پلەوپایەی زیاتر دەکات ئەوەیە پلەوپایەی دایکایەتی بەرزتر ڕاگرتووە لە پلە وپایەی باوکایەتی" پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا، کێ لە هەموو لەکەس لێم لە پێشترە بە هاوەڵێتی کردنی؟ فەرمووی: ((دایکت)). وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: ((دایکت)). وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: ((دایکت)). وتی: پاشان کێ فەرمووی: ((باوکت)) متفق عليه. شرح السنه ١٣/٤.

لەبەرئەوەی ئافرەت بەهۆی سروشتی درستبوونییەوە تایبەتمەند بووە بە هەڵگرتنی منداڵ لە سکیدا، پاشان شیرپێدانی و لە باوەشگرتنی، ئەمەش ماندووبوونێکی زۆر و کارێکی گەورەیە،

---

[1] سەیری المراة في الاسلام للدكتور معروف الدواليبي: ٢٣ بکە.

بۆیه قورئان دەفەرمووێ: ﴿وَوَصَّينَا الإنسَانَ بِوَالِدَيهِ حَمَلَتهُ أُمُّهُ وَهنًا عَلَى وَهنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَينِ أن اشكُر لِي وَلِوَالِدَيكَ إلَيَّ المَصِير. واتا: مرۆڤمان ڕاسپاردووه سەبارەت بە دایك و بـاوكی" چـونكه دایكی لە باری ناخۆشی و سەختی یەك لەدوای یەك هەڵیگرتووه و پاشان بە دوو سـاڵ ئنجـا لێـی جیادەبێتەوه بەهۆی شیرپێدانی، كەواته سوپاسـی مـن بكـه و سوپاسـی دایـك و باوكـت بكـه و گەڕانەوەشتان بۆلای منه﴾ لقمان: ١٤.

لە بەرامبەر ئەم ماندووبوونه زۆرەی خراوەته سەر شانی ئافرەت، لەسەر پیـاوه ئـەركی خـەرجی خێزان و پاراستنیان هەڵگرێ، لەگەڵ ئەوەش پیـاو هێـشتا هەسـتی بـەو پلەوپایـەی نـەدەكرد لـه ئیسلام وەك ئەمه لە فەرمووده‌كەی پێغەمبەر ﷺ دەركەوتووه....

لەپاڵ ئەم شكۆداریەی پلەی دایكایەتی، ئیسلام جارێكیتریش ئافرەتی بەرزكردەوه و ڕێزی لێنـا پاش شووكردنی، بەوەی پاش شووكردنیش پاریزگاری هەوڵبداتی بـاوكی و بنەماڵەكـەی دەكـات و لەناو ڕەچەڵەك و بنەماڵەی مێردەكەی ناتوێتەوه و ناوی خۆی و باوكی ڕەش نابێتەوه، وەك حـاڵی كۆمەڵگه ڕۆژئاواییەكان كـه پـاش شـووكردن هەوڵبـداتی بـاوكی دادەمـاڵرا و نـاوی مێردەكـەی هەڵدەگرت، لە تۆمارەكـانی بـاری كەسـێتی و ڕەگەزنامـه نـاوی بنەماڵەكـەی ڕەش دەكرێتـەوه. بەمەش ئیسلام پارێزگاریكردووه لە كەسایەتی ئافرەت تەنانەت پاش شووكردنیشی، وێڕای ئەوەی ئیسلام زۆریش ئافرەتی ڕاسپاردووه بـه گوێڕایـەڵیبوون بـۆ مێردەكـەی و ڕێزلێنـانی و چـاكبوون لەگەڵی، كەچی ناشیەوێت بە تەواوی بتوێتەوه لە كەسایەتی پیاو.

هەروا ئیسلام مافی تەواوی بە ئافرەت داوه لەڕووی سەربەستی تەواو لە هەڵس و كەوتكردن لە ماڵی خـۆی، ئـەركی خـەرجی مـاڵی نەخـستۆته سەرشـانی. دوای باسـكردنی ئـەم مافانـه، زۆر بەئاشكرا بۆمان روونبوویەوه كه ئیسلام چەنده پلەوپایەی ئافرەتی بەرز ڕاگرتـووه، هـەروا بۆمـان دەركەوت ئیسلام چەنده گرنگیداوه بە سەربەستی و سەربەرزی و ڕێـزداری و كراوەیـی و چـالاكی كەسایەتیەكەی تا بتوانێ هەڵسێ بە گەیاندنی پەیامه مەزنەكەی لەم ژیانەدا.

## پشتگیری و خۆشەویشتی تەنها بۆ خوایە

لە بەرهەمەکانی شانازیکردنی ئافرەتی موسڵمان بە کەسایەتیە ئیسلامیەکەی ئەوەیە کە خۆشەویستی و پشتگیری هەرگیز بێجگە لە خودا بۆ کەسیتر نییە، هەرچەند ئەو کەسە مێرد یا باوکی بێت کە نزیکترین کەسن بۆی. لوتکەی ئەم خۆشەویستی و پاڵپشتیەیە دەردەکەوێ لە کردەوەی دایکی باوەڕداران ام حەبیبە (ڕەملەی کچی ئەبو سوفیان)ی گەورەی مەککە و پێشەوای موشریکەکان" ئەم ئافرەتە سەرەتا خێزانی پورزای پێغەمبەر ﷺ (عبداللە بن جحش الاسدی) بوو، کە برای خاتوو زەینەبی دایکی باوەڕداران بوو، عبداللە موسڵمان بوو و ڕەملەش لەگەڵی موسڵمان بوو، ابو سفیانی باوکیشی هێشتا بێ باوەڕبوو. ڕەملە لەگەڵ مێردی کۆچیکرد بۆ حەبەشە لەگەڵ موسڵمانە پێشینەکان، باوکی لە مەککە جێهێشت کە لە داخ و مەرەقەوە خۆی دەخواردەوە لە خەفەتی موسڵمان بوونی کچەکەی و لە داخی ئەوەی دەستی پێینەگات و ناتوانێ هیچی لێ بکات.

بەڵام ژیان بۆ ئەم ئافرەتە موسڵمانە ئارامگرتووە کۆچبەرە هەر بەخۆشی نەمایەوە، داخێکی گەورەی لێکەوت کاتێ مێردەکەی لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە و چووە سەر ئاینی حەبەشیەکان و بوو بە مەسیحی!!زۆری لەگەڵ هەوڵدا تا بیگەڕێنێتەوە سەر ئاینی ئیسلام بەڵام ڕازی نەبوو، ڕەملە لەسەر ئاینی ئسلام مایەوە، دەستیگرت بە ئارامگرتن و دوورە پەرێزی لە خەڵك، هێندەی نەمابوو لە داخانا بمرێت لە تاوی ئەو هەموو خەم و پەژارەیەی ڕژان بەسەری کە دەبینێ خۆی و کچەکەی لە وڵاتی غەریبیە و باوکی کچە بچوکەکەی مەسیحیە و باپیریشی هاوبەش بریاردەرە و دوژمنی ئیسلامە و شەڕی ڕاگەیاندووە لە دژی ئەو پێغەمبەرە و ئەو ئاینەی ئەم باوەڕی پێهێناوە.

ئەوەی ئەم ئافرەتەی لەو غەم و ناخۆشی و وێڵی و سەرگەردانییە دەرهێنا چاودێری کردنی پێغەمبەر ﷺ بوو بۆ باوەڕدارانی کۆچبەر و لێکۆڵینەوە لە کاروباریان، کاتێ ناردی بۆ لای نەجاشی و خوازبێنی ام حەبیبەی کچی ابو سفیانی لێکرد کە یەکێکە لە کۆچبەرانی وڵاتەکەی -

وەك چۆن سەرچاوەكانی سیرە و وەرگێران و مێژوو باسی دەكەن ـ، بەم شێوەیە ام حەبیبە بووە دایكی باوەڕداران!!

ڕۆژگار تێپەری و فەتحی مەككە نزیك بوویەوە، مەترسیەكان هەڕەشەیان لە قورەیش دەكرد پاش هەڵوەشانەوەی پەیمانی حودەیبیە لەلایەن ئەوانەوە، بۆیە سەركردەكانی قورەیش ڕاوێژیان لەگەڵ یەكتركرد و زانیان محمد ﷺ لەسەر ئەم كارە بێ دەنگ نابێت و ڕازی نابێت ستەمی لێبكرێت و پەیمانی هەڵبوەشێنرێتەوە، پێكهاتن لەسەر ناردنی شاندێك بۆ مەدینە تا گفتوگۆ بكات لەگەڵ محمد ﷺ لە بارەی نوێكردنەوەی ماوەی ئاگربەستی (هدنە) ی نێوانیان، بۆ ئەم مەبەستە ابو سفیانیان وەكو نێردراوێك ناردە لای محمد ﷺ.

ابو سفیان هاتە مەدینە، خۆی ئامادەكرد بۆ دیدەنی محمد ﷺ، یادی كەوتەوە كە كچێكی لەلای پێغەمبەرە ﷺ، بۆیە بە نهێنی چووە لای و داوای یارمەتی لێكرد. دایكی باوەڕداران سەرسام بوو كاتێ لە ناكاو بینی باوكی هاتە ماڵی، كە لەوەتەی چووبووە حەبەشە نەیدیبوو، بەسەرسامیەوە وەستا و سەیری باوكیكرد، نازانێ چی بڵێ و چی بكات. ابو سفیان زانی كچەكەی سەرسام بووە. بۆیە پێش ئەوەی ئەم فەرمووی دانیشتنی لێ بكات هاتە پێش و ویستی دانیشێ، ڕەملە خێرا دەستی دایە جێگاكە و پێچایەوە و نەیهێشت لەسەری دانیشێ، ابو سفیان واقیوڕما بوو، وتی: كچەكەم نازانم ئایا منت لە جێگاكە خۆشتر دەوێ و پێ گەورەترە یان جێگاكە؟! ڕەملە وتی: بەڵكو ئەمە جێگای پێغەمبەر ﷺ و تۆش پیاوێكی هاوبەش بڕیاردەری و حەزم نەكرد لەسەری دانیشی!

ڕەملە خۆشەویستی و پشتگیریەكەی بۆ خوا وای لێكرد خەفەت بۆ مێردە بێنرخەكەی نەخوات كە ئاینی بە دونیا گۆڕیەوە، دەستگربوو بە ئیسلامەككەی، بەرگەی ئازار و تەنگانە و خەم وناڵەكانی غەریبی و وڵاتی كۆچی گرت، لە كاتێكا زۆر پێویستی بە پیاوێكی مێرد بوو بیپارێزێ و چاودێری بكات و دڵنەوایی تەنیاییەكەی بكات و كچەكەی لە ئەستۆ بگرێت، بۆیە خودای بەخشندە بە بەرزترین ئاوات كە ئافرەتی ئەو دەمە خەوی پێوە دەبینی پاداشتی دایەوە، قەرەبووی بۆ كردەوە بە مارەكردنی پێغەمبەر ﷺ بۆی و، بەرزكردنەوەی بۆ پلەی دایكی باوەڕداران.

هــەروا بینینـــی بــاوکی پــاش دابرانێکـــی زۆر خۆشەویـــستی و پاڵپـــشتیەکەی بــۆ خــوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لەبیرنەبردەوە، کاتێ جێگەی پێغەمبەر ﷺ پێچایەوە چونکە باوکی بێ بــاوەڕە و دروست نییە لەسەری دانیشێ و پیسی بکات!! دەبێ ئەمە کاری هــەموو ئــافرەتێکی موســڵمان بێت کە شانازی بە ئاین و بیروباوەڕەکەی بکــات" چــونکە لــە دەروونــی پــڕ لــە باوەڕیــدا شــوێنی تێدانییە دەمارگیری و خۆشەویستی و پاڵپشتیتر بەرامبەر بە پاڵپشتی و خۆشەویستی بــۆ خــوا و پێغەمبەرەکەی و ئاینەکەی.

شانازی کردنی ئافرەت بە کەسایەتیە باوەڕدارەکەی لە هەموو سەردەمێکدا هێــز و خــۆڕاگری و ســەقامگیری پێبەخــشیووە لــە بەرامبــەر مەترســیەکان و حــەز و خۆشەویــستیەکانی دونیــا، پاراستوویەتی لە خزانە ناو شەپۆڵەکانی ئەفسانە و ناڕاستی هەرچەندە بە هێز و زاڵ و گەورە بێت، ئەم کەسایەتیە پشکۆی باوەڕی لە ناخیدا هەڵگیرســاند کــە هــەرگیز ناکوژێتــەوە، وەك چــۆن ئــەم خۆڕاگریە لە خێزانی فیرعەوندا دەبینرا لەسەر ئاینەکەی و دژایەتیکردنی ئاینی فیرعەونــەکان کــە پڕبوو لە هەموو جۆرەکانی ڕابواردن و خۆشی و باق و بریقی دنیا، بێ گوێدانە ئەو هەموو ئازارەی فیرعەون رژاندبوویە سەری بەهۆی دەستگرتنی بە ئاینەکەی و هەردەیوت: ﴿رَبِّ ابنِ لِي عِندَكَ بَيتًا فِي الجَنَّةِ وَنَجِّني مِن فِرعَونَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّني مِنَ القَـومِ الظَّـالِمِينَ. واتــا: پــەروەردگارا" لــەلای خــۆت کۆشکێکم بۆ دروست بکە و رزگارم کە لە فیرعەون و کارەکەی و رزگارم کــە لــە کۆمــەڵ و گــەلی ستەمکاران﴾ التحریم: ١١.

لەبەر ئەوەی ڕەزامەندی خوا لەسەرووی هەموو حەزێکە و سەرخستنی وشەی خوا پــێش هــەموو ئامانجێکە و شەرعی خوا ڕاسترین ڕێگایە، بۆیە ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر ئەم ڕاستیانەی لێ ون نابێت، ڕۆژ بە ڕۆژ شانازیکردنی بە کەسایەتیە موسڵمانەکەی و دەستگرتنی بــە بەرنامــە خواییــە نایابەکەی و خۆشەویستی و پشتگیرکردنی بۆی زیاتر دەبێت.

## فەرمان دەکات بە چاکە و جڵەوگیری دەکات لە خراپە

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بە ڕێنماییی ئاینەکەی کاتێ ئەم ئایەتە دەخوێنێتــەوە: ﴿وَالمُؤمِنُـونَ وَالمُؤمِنَاتُ بَعضُهُم أولِيَاءُ بَعضٍ يَـأمُرُونَ بـالمَعرُوفِ وَيَنهَـونَ عَـنِ المُنكَـرِ وَيُقِيمُـونَ الـصَّلَاةَ وَيُؤتُـونَ

الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ سَيَرحَمُهُمُ اللهُ إِنَّ اللهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ. واتـا: پيـاوانی بـاوەڕدار و ئافرەتانی باوەڕدار هەر یەکەو پاڵپشت و پشتیوانی یەکن، فەرمان دەکـەن بـە چـاکە و جڵـەوگیری دەکەن لە خراپە و نوێژەکان بە جوانی ئەنجامدەدەن و زەکاتی ماڵی خوا دەردەکـەن، ئەوانـە خـودا رەحمیـان پێدەکـات، بەڕاسـتی خـودا زاڵ و دانایـە﴾ التوبـە: ٧١.کـە خـودا پـێش پـانزە سـەدە دایبەزاندووە، بۆیە خۆی لـە لوتکـەی ئاسـتەکانی فیکـری کۆمەڵایـەتی و، بـەرزترین پلەوپایـەی کۆمەڵایەتی دەبینێتەوە کە ئافرەت ناسیویەتی لە نەتەوە جیاجیاکان و ڕەگەز و ڕەنگەکان.

ئیسلام دانی تەواوی ناوە بە مرۆڤایەتی بوونی ئافرەت و ڕێز و پلەوپایە و تەواوی شایان بـوونی بۆ مافەکانی و سەربەستیەکەی، هیچ جیاوازیەك لە نێوان ئەم و پیـاودا نییـە لـە خاوەنـداریتی و کڕین و فرۆشتن و هاوسەرگیری، ئەمەش تەنها لە ئیـسلامدا هـەبووە و لـە هـیچ نەتەوەیـەکیتردا نەبووە، بەڵکو ئافرەت لە نەتەوەکانیتر شوێنکەوتەی ڕەهای پیاو بووە و لەژێر بەزەیی و چـاودێری فەرمانی ئەودا بووە.

ئەم ئایەتەی پێشووش ئاماژەیە بۆ بەرزکردنەوەی ئافرەت بۆ پلەی مافگەریتی لە نێوان پیـاو و ئافرەتدا، بەشداری پێکردنیەتی لە ئەرکی فـەرمانکردن بـە چـاکە و جڵـەوگیریکردن لـە خراپـە، داواکاریە بۆی به بەرپرسیاریەتی و هەڵگرتنی سپاردە لەگەڵ پیاو بەبێ جیاوازی لەوەی فـەرمانی پێکردووە لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی و پەرستنی خوا تیایدا.

بەمە ئیسلام ئـافرەتی رزگـارکرد لـە شـوێنکەوتەیی ڕەهـا بـۆ پیـاو و چـاودێریە گـشتیەکەی لەسەری، ئەو چاودێریەی لە زۆربەی کات وای لە پیاوکردبوو دەسەڵاتدار بێ بەسەر ژیان و مردنـی ئافرەت، لە بەرامبـەردا بـەرزی کـردەوە بـۆ پایـەی یەکـسانی کاتـێ داوای لێکـرد هەڵـسێ بـە فەرمانکردن بە چاکە و جڵەوگیریکردن لە خراپە، شوێنێکی بـەرزتری بـۆ دابینکـرد" چـونکە بـۆ یەکەمجار لە مێژوو بووە فەرمانده، لە سەرجەم چـەرخەکاندا بێجگـە لـە ئیـسلام هـەمووکات بـە فەرمانپێکراو ناسراوبوو.

لە ڕووی شایان بوونی بۆ ڕێز و گەورەیی پەرستنی خوا و بۆ ڕەحمەتەکەی، ئەوا هـەردوو رەگـەز لەبەرامبەر الله یەکسانن. دەقەکانی قورئان و فەرموودەش لەم بارەیەوە زۆرن.

بەم پێکهاتەی بەرز و گشتگیرەی کەسایەتی ئافرەتی موسڵمان مێژوومان پڕبوو لە ئافرەتی جاویدان و شکۆدار لە وتەکانیان و کردارەکانیان و هەڵوێستیان، کە ڕەوا و ڕاستی پیادە دەکەن، هەست بەم بەرپرسیاریەتیە دەکەن لە بەرامبەر خودا، لەم پێناوەشدا سەرزەنشتی خەڵك ساردیان ناکاتەوە و نایانگێڕێتەوە.

نمونەی ئەم هەڵوێستانەی ئافرەت کە بەڵگەن لەسەر بەهێزی کەسایەتی ئافرەتی موسڵمان و پێگەیشتنی و ئازادبوونی لە ڕەخنەگرتن و ڕادەربرین ئەوەیە کە لەسەر زمانی یەکێ لە ئافرەتان وترا لەو کاتەی گوێی لە عمر کوڕی خەتتاب بوو ﷺ کە ئەمیری باوەڕداران بوو قەدەغەی زۆری مارەیی دەکرد و داوای سنوور بۆ دانانی دەکرد بە بڕێکی دیاریکراو، بۆیە ئەم ئافرەتە هەڵسایەوە و وتی: ئەمە بە دەست تۆ نییە ئەی عمر! عمر وتی: لەبەرچی؟ وتی: چونکە خودا دەفەرمووێ: ﴿ وَإن أَرَدتُمُ استِبدَالَ زَوجٍ مَكَانَ زَوجٍ وَآتَيتُم إحدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأخُذُوا مِنهُ شَيئًا أَتَأخُذُونَهُ بُهتَانًا وَإثمًا مُبِينًا ﴾. عومەر ﷺ وتی: ئافرەتێك پێکای و ڕاستی کرد و پیاوێك هەڵەی کرد.فتح الباری: ٣٩٣.

ئەمیری باوەڕداران گوێی بۆ ئەم ئافرەتە شلکرد، کاتێکیش بۆی دەرکەوت لەسەر حەقە دانی بە حەقەکە ناو، دانیشی بە هەڵەی خۆی نا، بەمەش ئافرەتی موسڵمان یەکەم هەڵوێستی مێژوویی تۆمارکرد لە ڕەخنەگرتن لە سەرۆکی دەوڵەت، چ سەرۆکێك؟! خەلیفەی تێگەیشتووی موسڵمانان، مەزنترین دادوەری ئەو سەردەمە، ئەو پیاوە بەهێز و بەشەوکەتە کە فارس و ڕۆمی هەڕاسان کردبوو و نشوستی پێهێنابوون، ئەم ئافرەتەش نەیدەتوانی و نەیدەوێرا بەرەنگاری سەرۆك دەوڵەت ببێتەوە و ڕەخنەی لێبگرێ ئەگەر ڕۆشنبیری و تێگەیشتنی نەبوایە لە ئاینەکەی کەوا مافی ڕادەربڕین و فەرمانکردن بە چاکە و جڵەوگیریکردن لە خراپەی پێداوە.

## زۆر قورئان دەخوێنێ

بۆ ئەوەی ئافرەتی موسڵمان بگا بەم ڕادە بەرزە لە گوێڕایەڵی و چاکسازی و پارێزکاری و تێگەیشتن و پێگەیشتن، پێویستە لە شەونمی بۆنداری ڕێنمایی قورئان هەڵمژێ، هەموو ڕۆژێك بچێتە ژێر ساباتەکەی، بەم شێوەیە ڕۆژانە ویردێکی بەردەوامی دەبێت لە قورئان، دەچێتە سەر

ئایەتە ڕۆشنەکانی و بە وردی و دانایی دەیخوێنێتەوە، تا واتاکان دەچۆڕێتە ناو قووڵایی هۆش و هەستی، دڵیشی تێراو دەبێت لە تیشکە بێگەردەکەی و....

بەسە بۆ ئافرەتی موسڵمان تا پلەوپایەی قورئان خوێن بزانێ وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتەکانیدا فەرموویەتی، تا هەرکاتێ بواری هەبوو ڕووبکاتە خوێندنەوەی و ڕووناکی ڕۆژ و تاریکی شەوی پێ پڕکاتەوە، کە دەفەرمووێ: ((وێنەی ئەو باوەڕدارەی قورئان دەخوێنێ وەك لیمۆ وایە، بۆنی خۆشە و تامی خۆشە، وە وێنەی ئەو باوەڕدارەی قورئان ناخوێنێ وەك خورما وایە، بێبۆنە و تامی شیرینە، وە وێنەی ئەو دووڕووەی (منافق) قورئان دەخوێنێ وەك ڕەیحانە وایە، بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، وە وێنەی ئەو دووڕووەی قورئان ناخوێنێ وەکو گوژاڵك وایە، بێبۆن و بێتامە)) متفق علیه. شرح السنه ٤/٤٣١.

هەروا دەفەرمووێ: ((قورئان بخوێنن" چونکە لە ڕۆژی قیامەت دەبێتە تکاکار بۆ خاوەنەکەی)) صحیح مسلم ٦/٩١.

وە : ((ئەوەی قورئان دەخوێنێ و شارەزایە لێی لەگەڵ فریشتەکانی نووسەری سروشی ڕێزدار و پایە بەرزی لای خوا دەبێت، وە ئەوەی قورئان دەخوێنێ و زمانی تەتەڵە دەکات و سەختە لەسەری، دوو پاداشتی بۆ هەیە)) متفق علیه. شرح السنه ٤/٤٣٠،٤٢٩.

پاش بیستنی ئەم فەرموودانە، ئایا ئافرەتی موسڵمان تەمبەڵی دەکات لە خوێندنەوەی قورئان، ئەگەرچی کاری ماڵ و ئەرکی مێرد و منداڵیشی لەسەر زۆربوون؟ ئایا دادەبڕی لە ڕووکردنە خوێندنەوەی و ژیان بەسەربردن لە کەشە خوایی و بۆندارەکەی و خۆی بێبەش دەکات لەو بەخشش و خۆشی و پاداشتە نەبڕاوە و گەورەی خودا بۆی ئامادەکردووە بەرامبەر قورئان خوێندنەوەکەی؟

ئەمە کاری ئافرەتی موسڵمانە لەگەڵ پەروەردگاری: باوەڕێکی قووڵ بە الله، ملکەچبوون بۆ قەزا و قەدەری، ڕووکردنێکی ڕاستگۆیانە لەپەرستنی، گوێڕایەڵیەکی ڕەها بۆ فەرمانەکانی و خۆدوورخستن لە نەهیەکانی، بوونی وێنایەکی ژیرانە بۆ واتای بەندایەتی بۆ خوا، کارێکی بەردەوام و هەمیشە لەپێناو سەرخستنی ئاینەکەی، پیادەکردنی وشەکەی، شانازیکردن بە کەسایەتیە

موسڵمانەکەی کە سەرچاوە دەگرێ لە هێز و بێگەردی باوەڕەکەی، باش تێگەیشتن و پەی بردن بەو ئامانجەی کە ئادەمیزادی بۆ هاتۆتە بوون لەم ژیانەدا وەك خودا ئامـاژەی پێکـردووە لـە سـورەتی الذاريات: ٥٦ پێشتر ڕاڤە کراوە.

## ٤. ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ خودی خۆی

### دەسپێک

ئیسلام موسڵمانانی هانداوە وەکو خاڵێک بن لەناو خەڵکی، لە شێوە و ڕەفتار و جل و بەرگیشدا جیاوازبن، تا ببنە پێشەنگێکی چاك، شایانی هەڵگرتنی پەیامە مەزنەکەیان بن بۆ خەڵکی" لە فەرموودەی هاوەڵی بەڕێز (ابن الحنظلية) هاتووە، پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵەکانی کە لە گەشت دەهاتنەوە بۆلای براکانیان فەرمووی: (( ئێوە دێنەوە لای براکانتان، بارگەتان ڕێك و پێك بکەن، جل و بەرگتان چاك و باش بکەن، هەتا وەکو خاڵێك دەبن لەناو خەڵکا" چونکە خودا حەزی لە پیسی و ناشیرینی نییە)) رواه ابو داود ٤/٨٣.

ئەگەر ئیسلام بەگشتی هانی موسڵمانانی داوە لەناو خەڵکی وەك خاڵێك وابن، ئەوا ئەم هاندانە بۆ ئافرەت تایبەتییە، تا لە ڕووی ڕواڵەت و شێوە و شێوازی وەك خاڵێکی جیاواز و دیار بێت" چونکە ئەمە ڕەنگ دەداتەوە لەسەر ژیانی خۆی و مێردی و ماڵ و منداڵەکانی.

ئافرەتی موسڵمان نابێ خۆی فەرامۆش بکات و بێ ئاگا بێت لە شێوەی جوان و خاوێنی بەهۆی سەرقاڵبوونی بە ئەرکی ماڵ و دایکایەتی، بەڵکو سوورە لەسەر ئەوەی شێوەی پاك و ڕێك و پێك و جوان بێت بێزیادەڕۆیی و زیادەخەرجی. بایەخدانی ئافرەت بە شێوە و ڕواڵەتی ئاماژە بە تێگەیشتنی دەدات لە کەسایەتیەکەی، بەڵگەیە لەسەر زەوقی و وردبینی بۆ ئەرکی لە ژیان و ساغی و سەلامەتی بۆچوونی بۆ کەسایەتی ئافرەتی میانڕەو کە نابێ ڕواڵەتی هەوڵبداتەرۆکی جیاواز بێت" چونکە ڕواڵەت و شێوەی جوان و ڕێك و پێك شایانی ناوەڕۆکی بەرز و کرۆکی دەوڵەمەندە، جا لە هەردووکیانەوە(ڕواڵەت و ناوەڕۆك) کەسایەتی ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر پێك دێت.

ئافرەتی موسڵمانی ژیری ڕۆشنبیر هاوسەنگیەك دروست دەكات لە نێوان ڕواڵـەت و نـاوەرۆكی، دەزانێ ئەو پێكهاتووەوە لە جەستە و هۆش و گیان، بۆیە مافی هەریەكەیان دەدات، زیـادەڕۆی لـە هیچ لایەنێك ناكات لەسەر حیسابی لایەنەكەیتر، لەمەشدا ڕێنمایی لە ئیسلام وەرگرتووە كە بـەر لە هەموو شتێك هانی یەكسانی و هاوسەنگی و میانگیری داوە.

جا ئایا ئافرەتی موسڵمان چۆن دەتوانێ ئەم تەرازوی یەكـسانییە ڕابگـرێ لـە نێـوان جەسـتە و هۆش و گیان؟

## أـ جەستەی

## میانڕەوە لە خواردن و خواردنەوەیدا

ئافرەتی موسڵمان ئاگاداری باشی باری تەندروستی جەسـتەی و بناغەیـەكی پتـەو و لەشـێكی چالاك دەكات، نە زۆر لاوازە و نە زۆر قەڵەو، بە پەلە پەل ناكەوێتە سەر خواردن و زیاد لـە خـۆی ناخوات، بەڵكو ئەوەندە دەخوات بتوانێ هێزی پشتی ڕابگرێ و بێتوانا نەبێت و پارێزگاری بكـات لە تەندروستی و پتەوی و زیندەگی و لار و لەنجەی جەستەی، وەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ وَكُلُوا وَاشرَبُوا وَلاَ تُسرِفُوا إنَّهُ لاَ يُحِـبُّ المُـسرِفِينَ. واتـا: بخـۆن و بخۆنـەوە و زیـادووڕۆیی مەككـەن" چونكە خودا مرۆڤی زیادەڕۆیی خۆش ناوێت﴾الأعراف: ٣١

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێ: ((ئادەمیزاد هیچ كاسەیەك پڕناكات خراپتر بێت لە ورگی، جا ئەگەر مەحاڵ بوو و هەر نەیتوانی، با ورگی بكاتە سێ بەش: سێیەكی بۆ خۆراكی و سێیەكی بـۆ خواردنەوەی و سێیەكی بۆ هەناسەی)) رواه احمد ١٣٢/٤والترمذي ١٨/٤.

هـەروا ئـەمیری بـاوەڕداران پێـشەوا عمـر ﷺ دەڵـێ: ((دووركەونـەوە لـە زیـادە خـواردن و خواردنەوە" چونكە ئەم كارە جەستە دەشێوێنێ وگەندەڵی دەكـات، نەخۆشـی بەرهـەم دێنـێ، لـە نوێژكردن سست و خاوت دەكات. وە دەستگرن بـە میـانڕەوی لـە خـواردن و خواردنـەوە" چـونكە

جەستە ڕێك و چاك دەكات و دووره لە زیادەڕۆیی، خودا ڕقی لە زانای قەڵەوە، پیاویش تیا ناچێت تا حەز و ئارەزووو خۆشیەكانی زاڵ دەبن بەسەر ئاینی و كاری تێدەكەن))[1].

بێگومان ئافرەتی موسڵمان زۆر دووره لە مادە بێهۆشكەر و سڕكەرەكان، بەتایبەتی ئەوانەی حەڕامكراون“ چونكە لەو دەرد و بەڵایانەیە زۆربەی ئافرەتانی ئەو وڵاتانە تێیكەوتون كە دوورن لە ڕێنمایی خوا و پێغەمبەرەكەی، شەونخونی كردنی بێسوود و بەسەربردنی لە یاری و گەمە و كوشتنی كاتیش یەكێكە لە باوە خراپەكانی ناو كۆمەڵگەی ئیسلامی و موسڵمانان، ئافرەتی موسڵمان دەبێ زوو بخەوێ و زوو هەڵسێ ، تا كارەكانی ڕۆژانەی و ئەركەكانی بە جوانترین شێوە و بە دەروونێكی كراوە و جەستەیەكی چالاك ئەنجامبدات، بە شەونخونی پشكۆی چالاكیەكانی نەكوژێنیتەوە، ئەم باو و عادەتە خراپانە لە هێزی كەم نەكاتەوە، ئەوسا هەمووكات بەهێز و چاپووكە، كاری ماڵ پەكی ناخات“ چونكە پەیڕەوی سیستەمێكی تەندروستی سروشتی كردووە، كە هەمیشە هێز و ووزە و چالاكی و زیندەگی پێبەخشیووە.

پەی بردووە بەوەی كە باوەڕداری بەهێز خۆشەویسترە لەلای خودا لە باوەڕداری لاواز، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، بۆیە دەبینی هەمووكات لە خەمی بەهێزكردنی جەستەی دایە بە پەیڕەوكردنی ئەم سیستەمە سروشتیە لە ژیانیدا.

## وەرزشی جەستەیی ئەنجام دەدات

لەلای ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر شاراوە نییە كە پاراستنی لەش و لاری جەستەی و تەندروستیەكەی بەگشتی لەو كارانەیە ئیسلام پاڵی بۆ دەنێ و خۆشەویستی دەكات. بۆیە تەنها بە پەیڕەوكردنی ئەو سیستەمە تەندروستیە سروشتیە ناوەستێ، بەڵكو ڕۆژانە وەرزشی جەستەیی وا ئەنجام دەدات بگونجێ لەگەڵ جەستەو كێش و تەمەن و ژینگەی كۆمەڵایەتی، لە كاتانێكی دیاریكراو و جێگیر كە لێی دواناكەوێت، تاوەكوو ئەم ڕاهێنانە وەرزشیانە لاری و نەرمی و ڕێك و پێكی ببەخشن بە جەستەی لەلایەك، لەلایەكیترەوە هێز و بەرگری ببەخشن بە تەندروستیەكەی

---

[1] كنز العمال ١٥/٤٣٣ و سەیری المقال بكە: القيم في مضار الشبع المفرط على الجسم والعقل والنفس للدكتور الطبيب محمد ناظم نسيمي في مجلة حضارة الاسلام، العددين: ٥،٦ من السنة: ١٥.

دژی نەخۆشی و دەرد، تا زیاتر و بەتواناتر هەڵسێ بە ئەرکەکانی، گەرم و گوڕتر ئامادەبێ بۆ گەیاندنی پەیامەککەی لە ژیان، جا چ هاوسەر بێت چ دایك ، یا ئافرەتێکی تازە هەڵکەوتوو و لاو بێت یا بەتەمەن.

## جەستە و جل و بەرگی خاوێنە

ئافرەتی موسڵمانی شارەزا بە ئاینەکەی جەستە و جل و بەرگی زۆر خاوێنە، زوو زوو خۆی دەشوات، پارێزگاری لە خاوێنی جەستە و جل و بەرگی دەکات، بەتایبەتی لە ڕۆژی هەینی، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((لە ڕۆژی هەینی خۆتان و سەرتان بشۆن، هەتا ئەگەر لەش پیسیش نەبن و خۆتان بۆنخۆش بکەن)) فتح الباری ٢/٣٧٠.

هەروا دەفەرموووێ: ((هەرکێیەك لە ئافرەتان و پیاوان هاتە نوێژی هەینی با خۆی بشوات)) فتح الباری ٢/٣٥٦.

بەهۆی زۆر هاندانی ئیسلام بۆ خۆشوشتن، هەندێ لە زانایان وای بۆ چوونە کە خۆشوشتن لە ڕۆژی هەینی بۆ نوێژی هەینی واجبە.

ابو هریرە ﷺ-دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ-فەرموووبەتی: ((واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك هەر حەوت ڕۆژ جارێك خۆی بشوات، تیایدا سەر و جەستەی بشوات)) متفق علیه. شرح السنه ٢/١٦٦.

خاوێنی لە پێویسترین ئاکارەکانی مرۆڤە، بەتایبەتی ئافرەت، لە هەمووشیان زیاتر بەڵگەیە لەسەر کەسایەتی میانگیری و ژیری و خۆشەویستی، ئەم خاوێنییە تەنها لەلای مێردی خۆشەویستی ناکات، بەڵکو خۆشەویست دەبێ لەلای هەموو ئافرەتان و کەس و کاری.

امام احمد و ابو داود و النسائی بە سەنەدی صحیح لە جابر ﷺ- دەگێرنەوە: پێغەمبەر ﷺ بەسەردان هاتە لامان، پیاوێکی بینی جلێکی پیسی لەبەردابوو، فەرموووی: (( ئایا ئەوە هیچی دەستنەکەوت جلەکەی پێ‌بشوات!))

پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبووە مرۆڤ بە جلی پیسەوە بچێتە ناو خەڵك لەکاتێکا دەتوانێ بیشوات و خاوێنی کاتەوە، وەکوو ئاماژەیەکە بۆ موسڵمان کە دەبێ هەمووکات خاوێن بێت، ڕواڵەتی پـاك و چاك بێت ، دیمەنی خۆشەویست بێت.

جا ئەگەر ئەم ئامۆژگاریانە ئاڕاستەی پیاو بکرێت، ئەوا ئافرەت لە پێشترە بـەم ئاڕاسـتەکردنە" چونکە ئافرەت خۆی خود و کرۆکی خاوێنییە، جێگای دڵنەوایی و سەرچاوەی گەشاوەیی و خۆشـی و ئارامیە لەماڵ، بێگومـان هەستکردنی قووڵی ڕۆشنی ئافرەت بە خـاوێنی ڕەنگدەداتـەوە لەسـەر ماڵ و مێرد و منـاڵەکانی" چونکە بەهۆی بایەخدانی ئافرەت بە خاوێنی، ئەوانیش خاوێن و ڕێك و پێك و جوان دەبن و بۆنی خۆش لە جەستە و جل و بەرگیان پەخش دەبێت.

ئەم هاندانەی ئیسلام بۆ خاوێنی و خۆشوشتن پێش ١٥ سەدە سـەرنجی لێکۆڵـەرەوانی ڕاکێـشا، لەو کاتەی جیهان هەر لە بنەڕەتەوە گەرماو و خۆشوشتن لە گەرماوی نەدەناسی" بـەڵکو جیهـانی ناموسڵمان پاش هەزارساڵیش دوای ئەم ڕێنمایی‌یەی پێغەمبەر ﷺ بۆ خاوێنی نەگەیشتە ئاسـتی ئەو کاتەی خاوێنی موسڵمانان.

لێکۆڵەرەوەی تورکی خاتوو (سامیحە ئای ویردی) لە پەرتووکەکـەی (مـن الـرق إلى الـسیادە) دەڵێ: ((پێویست ناکات بگەڕێینەوە سەردەمی هەڵمەتی خاچ پەرستەکان تاوەکوو ئاسـتی ژیـاری ئەوروپا بزانین لەو سەردەمە. بەسمانە چەند سەد ساڵێك بگەڕێینەوە بۆ ڕۆژگاری دەوڵەتی عوسمـانی و بەراوردێك بکەین لە نێوان ئاستی ئەوروپاییەکان و ئاستی ژیاری عوسمانییەکان)).

لە ساڵی ١٦٢٤ ئەمیر براندبو brandboug لە نامەیەکی بانگەشەی بۆ دەوڵەمەندانی نارد کە بۆ نانخواردن بانگی کردبوون، تیایدا نووسیبووی: ((تکا لە میوانان دەکەین دەست و پلیـان تـا ئانیشك نەخەنە ناو قاپ و قاچاغ، خواردن فڕێ نەدەنە پشتیان، پەنجەیان نەلێسنەوە، تـف نەکەنـە ناو قاپەکان، لوتیان بە لێواری سەرپۆشی خوانەکە نەسڕنەوە)).

هەروا سامیحە دەڵێ: ((ئەم گوزارشتانە بە ئاشکرا بەڵگەن لەسەر ئاسـتی ژیـاری و ڕۆشـنبیری ئەوروپاییەکان و ڕادەی زانینیان بۆ ئادابەکان. لە هەمان کاتدا و لـە شـوێنێکیتری ئـەوروپا" لـە

کۆشکی (جاکی یەکەم) پاشای ئینگلتەڕا، بۆنی ناخۆشی بڵاوبوو لەپاشا و ئەمیر و شازادەکان و باڵی کێشابوو بەسەر دیاردەکانی خۆش گوزەرانی لە جلی جوان و مەخمەل و دانتێلای فەرەنسی. ئەمە لە ئەورووپا" لە ئەستەنبول لە کۆشکی خەلافەت وا باوبوو باڵیۆزی ئەورووپایەکان لە دەوڵەتی عوسمانی دەبووایە بیانبەنە گەرما و جوان سەریان بشۆن پێش چوونیان بۆ لای سوڵتان. لە دەوروبەری ساڵی ١٧٣٠ و لە سەردەمی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم، لەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی لاوازی تێکەوتبوو لەلایەنی سەربازی و ڕامیاری، خاتوو خێزانی باڵیۆزی ئینگلیزی لەلای ئاستانە (الليدى مۆنتغۆ) چەندین یادەوەری نووسیبوو، کە پاشان بڵاوکرانەوە، تیایدا پەردە لادەدات لەسەر رادەی خاوێنی لەلای عوسمانییەکان و ئادابی جوانیان و خوڕەوشتی بەرزیان، دەڵێت: شاژنی عوسمانی (حفيظة) دەستەسرێکی بە دەست نەخشێنراوی بەدیاری بۆ ناردبوو، هێندە سەرسام بوو بەو دەستەسرە بە ڕادەیەك دڵی نەدەهات دەمی پێبسڕێ. هەروا لەو شتانەی ئەورووپاییەکانی سەرسام کردبوو کە دەیانبینی موسڵمانان پێش دانیشتن لەسەر خوان و پاش ناخواردن دەستیان دەشوشت. ئەمەش بەسە بۆ مرۆڤ کە نووسراوی برین پێچی ئینگلیزی بەناوبانگ (فلوڕانس نیتغل) florance nightigale بخوێنێتەوە سەبارەت بە نەخۆشخانەکانی ئینگلیزی لە دەوروبەری نیوەی سەدەی ١٩، تیایدا باسی چۆنیەتی نەخۆشخانەکان دەکات کە چۆن ببویە شوێنی زبڵ و فەرامۆشکردن و بێ ئابڕوویی، چۆن ژوورەکانی نەخۆشخانەکان پڕببوو لە سەدان نەخۆش کە تەنانەت پێویستی سروشتیان وەك چوونە سەراو لەسەر جێگا جێبەجێدەکرد))[1].

ئای لەو جیاوازیە بەرفراوانەی هەیە لە نێوان ژیاری ئیسلامی خودایی گشتگیر و لە نێوان ژیاریە مرۆییە کەم و کورت و سنووردارەکان!!

## گرنگی و بایەخ دەدات بە دەم و ددانی

ئافرەتی موسڵمانی ژیر زۆر ئاگاداری دەمی دەبێت، هیچ کەس بۆنێکی ناخۆشی لێناکات، ئەمەش بەهۆی خاوێنکردنەوەی ددانەکانی پاش هەموو ژەمێکی خواردن بە سیواك و فڵچە و هەویری ددان، زۆر لە خەمی ددانەکانی دەبێت و بەلای کەمەوە ساڵی جارێك نیشانی پزیشکی دەدات، ئەگەرچی هەست بە ئازاریش نەکات، تا پارێزگاری لە تەندروستی و خاوێنی و بریقەداری

[1] سەیری کتاب (من الرق الى السيادة) تألیف ساحة آي ويردى بکە. نشر damga yayinevi nu ٩٨ ص٢٨ وما بعدها.

ددانەکانی بکات، هەروا ڕاوێژ بە پزیشکی قورگ و گەروش دەکات ئەگەر پێویستی کرد، تاکوو بۆنی هەناسەی خۆش بێت، بێگومان ئەمەش بۆ ئافرەت جوانتر و شیاوترە.

خاتوو عائشە زۆر بایەخی بە ددانەکانی دەدا، هەرگیز تەمبەڵی نەدەکرد لە خاوێنکردنەوەی بە سیواك، لە صحیحی بوخاری هاتووە لە مجاهد لە عوروەی ﷺ دەڵێ: ((گوێمان لە سیواك کردنی عائشەی دایکی باوەڕداران دەبوو لە ژوورەکەی...)) فتح الباری ٥٩٩/٣.

وە مسلم لە عطاء لە عروة ﷺ دەڵێ: ((ئێمە گوێمان لە خاوێنکردنەوەی ددانەکانی خاتوو عائشە دەبوو بە سیواك...)) صحیح مسلم ٢٣٦/٨.

خاتوو عائشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێك لە خەو هەڵسابووایە چ لە شەو چ لە ڕۆژن ئیلا پێش ئەوەی دەستنوێژ بگرێ سیواکی دەکرد)) رواه احمد٦/١٦٠وابو داود ٤٦/١.

ڕادەی گرنگی دانی پێغەمبەر ﷺ بە خاوێن ڕاگرتنی دەم و ددان گەیشتە ئەوەی بفەرمووێ: (( ئەگەر لەسەر ئۆممەتم بە سەخت و دژوار نەوەستایە ئەوا فەرمانم پێدەکردن بە سیواك کردن لەگەڵ هەموو نوێژێك)) فتح الباری ٣٧٤/٢ وصحیح مسلم ١٤٣/٣.

پرسیارکرا لە خاتوو عائشە کاتێ پێغەمبەر ﷺ بهاتایەوە ماڵ سەرەتا چی دەکرد؟ وتی: ((سیواکی دەکرد)) صحیح مسلم ١٤٣/٣.

بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە هەندێ لە ئافرەتان ئەم لایەنە فەرامۆش دەکەن، لەکاتێکا لە گرنگترین پێویستیەکانی کەسایەتی ئافرەتە، وێڕای ئەوەی خاوێنی کرۆك و بنچینەی ئیسلامە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەر کەسێ پیاز و سیر و کەوەری خوارد با نزیکی مزگەوتەکانمان نەکەوێت" چونکە فریشتەکان ئازار دەکێشن بەوەی مرۆڤ ئازاری پێدەکێشێ)) صحیح مسلم ٥٠/٥.

پێغەمبەر ﷺ قەدەغەیکردووە کەسێك شتی بۆن ناخۆشی خوارد نزیکی مزگەوت بکەوێ، نەبادا فریشتە و خەڵك بەهۆیانەوە ئازاربکێشن، بەڵام سوێند بەخوا ئەم بۆنە زۆر سووکترە لەسەر

دەروون لە بۆنی ناخۆشی جل و گۆرەوی پیس و جەستە و دەمە پیس و بۆن ناخۆشەکان کە دێت لە هەندێ کەسی کەمتەرخەم لە خاوێنی، بەهۆیەوە دەوروبەر و کۆمەڵگاکانیان ئازاردەکێشن.

## گرنگی دەدات بە چاککردن و جوانکردنی قژەکەی

پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکردوە بە چاودێریکردن و جوانکردنی قژ بە شێوەیەکی شەرعی. ابو داود لە ابو هريره دەگێرێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( هەر کەسێ قژی هەبوو با ڕیزی لێبگرێ)) رواه ابو داود ٤/١٠٧.

ڕیزلێنانی قژ لە ئیسلام ئەوەیە خاوێن بکرێتەوە و شانە بکرێ و بۆنخۆش بکرێ و شێوە و ڕواڵەتی چاك بکرێ.

امام مالك لە الموطأ مرسلا لە عطاء بن يسار دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت دەبێ، پیاوێکی سەر و ریش هەڵقژاو دێتە ژوورەوە، پێغەمبەر ﷺ بە دەست ئاماژەی بۆ کرد، مەبەستی فەرمانکردن بوو بە ڕێکخستنی سەر و ریشی، پیاوەکەش ڕۆیشت و سەر و ریشی چاك کرد و گەڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( ئایا ئەمە چاکتر نییە لەوەی یەکێکتان بە سەر و ریشی نارێك و قژن دەرکەوێ وەك بلێی شەیتانە))[1].

ئەمە بایەخدانی ئیسلامە بە ڕێك و پێکی دیمەن و جوانی شێوەو، نکوڵی کردنە لە دیمەن و شێوەی فەرامۆشکراو و نارێك.

پێغەمبەر ﷺ هەمووکات تێبینی شێوە و دیمەنی مرۆڤی دەکرد، هەر پیاوێکی شێوە نارێکی بدیبایە نیگەرانی خۆی دەردەبڕی لە شێوە و دیمەنەکەی" امام احمد و النسائی لە جابر ﷺ دەگێرنەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بە میوانی هاتە لامان، پیاوێکی بینی سەر و قژی تێك هەڵقژابوو، فەرمووی: ((ئایا ئەوە شتێکی دەستنەکەوت سەرو قژی پێ شانە و ئارام بکات!)) رواه احمد ٣/٣٥٧والنسائی ٨/١٨٣.

---

[1] الموطأ ٢/٩٤٩ كتاب الشعر: باب اصلاح الشعر.

جا ئەگەر ئەمە ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ بێت بۆ پیاوان، دەبێ فەرمانی چۆن بێت بۆ ئافرەتان، لەکاتێکا ئەوان خودی جوانی و بەرزی و ڕازاوەیین، پیاو لەلایان ئارام دەگرێ، لە دانیشتن و ژیان لەگەڵیان ئارامی و خۆشی و بەختەوەری و دڵ گوشادی دەبینن؟

ئەمەش لە ئافرەتی موسڵمانی ژیر شاراوە نییە کە جوانی قژەکەی لە گرنگترین پێکهاتەکانی جوانییەکەیەتی، چاککردن و بایەخدان پێی لە دیارترین هۆکارەکانی سەرنج ڕاکێشانە بەلای خۆی.

## دیمەن و شێوەی ڕێک و پێک و چاکە

ئافرەتی موسڵمان دەبێ گرنگی بدات بە جل و بەرگ و دیمەنی، شێوەی جوان بێت، ڕواڵەتی نازدار و شیرین بێ، بێ ئەوەی خۆی دەرخا یا زیادەڕۆیی و جوانکاری بەکاربێنێ، بە شێوەیەك بێ چاوی مێرد ومناڵەکانی و مەحرەمەکانیتر و ژنانی موسڵمان بە بینینی شاد بێت، دەروون لەلای ئارام بگرێ. بۆیە هەرگیز بە شێوە و دیمەنێکی نارێك خۆی بەو کەسانە نیشان نادات کە دیتنی حەڵاڵە بۆیان، بەڵکو بەدوای کەم و کورتی و نارێکیەکانیدا دەگەڕێت و چاك و پاك و جوانی دەکات بەپێی ڕێنماییکانی ئیسلام.

قرطبي لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە ﴿قُل مَن حَرَّمَ زِينَةَ اللهِ الَّتِي أخرَجَ لعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزق... واتا: ئەی محمد بڵێ: کێیە لە خۆیەوە ئەو جوانکارییە یاساغ دەکات کە خودا بۆ بەندەکانی دەرهێناوە لەگەڵ خۆراکی حەلاڵ و پاك، بڵێ: ئەوە بۆ ئەو کەسانەیە باوەڕیان بەخوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە لە ژیانی دونیایاندا و لە ڕۆژی قیامەتیش بەتەنها بۆ باوەڕدارانە و بێباوەڕان بەشدار نابن تیایدا لەگەڵیان وەکوو لە دونیا ...﴾، دەڵێ: ((مکحول لە خاتوو عائشە دەگێڕێتەوە: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەرگا چاوەڕوانیان دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ ویستی بچێتە دەرەوە بۆلایان، دەفرێك هەبوو ئاوی تیابوو، پێغەمبەر ﷺ سەیری خۆی لە ئاوەکە کرد و خەریك بوو سەر و ڕیشی چاك دەکرد. خاتوو عائشە دەڵێ: وتم پێی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆش وا دەکەی؟! فەرمووی: بەڵێ: ئەگەر پیاوێك چووە ناو براکانی، با خۆی ئامادە و چاك و ڕێك بکات" چونکە خودا جوانە و جوانیشی خۆش دەوێت)) الاعراف: ٣٢.

موسڵمان ئەم شتانە هەمووی بەپێی بۆچوونی میانڕەوی ئیسلام پیادە دەکات، کە نە کەمتەرخەمی تیایە نە زیادەڕۆیی، خودا دەفەرموووێ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَم يُسرِفُوا وَلَم يَقتُرُوا وَكَانَ بَينَ ذَالِكَ قَوَامًا. واتا: ئەو باوەڕدارانە حاڵیان وەهایە کاتێ دەبەخشن، نە زیادەڕۆیی لەو سنوورەی خوا دایناوە و نە کەمتەرخەمی دەکەن، لە نێواندان و میانڕەون﴾ الفرقان: ٦٧.

ئیسلام حەزدەکات کوڕ و کچەکانی، بەتایبەت بانگخوازانی، کاتێ دەچنە ناو کۆمەڵگە، وەك خاڵێکی سەرنج ڕاکێش وابن، نەك دیمەنێکی نامۆ و ناشیرین کە چاو لە بینینی پەست بێ" ئەوە لە ئیسلام دانییە مرۆڤ بەناوی دونیا نەویستییەوە (الزهد) و خۆ بەکەم زانینەوە چ پیاو بێ چ ئافرەت شێوە و دیمەنی فەرامۆش بکات بەڕادەیەك خاوەنەکەی بێزراو و ناحەز بکات" ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ کە پێشەنگی خاك سیفەتانە، جلی باشی لەبەردەکرد، خۆی جوان دەکرد بۆ کەس و کار و هاوەڵەکانی، ئەمەی بە دەرخستنی بەخششی خوا هەژمار دەکرد، وەك دەفەرموووێ: ((خودا حەز دەکات شوێنەواری بەخششەکانی لەسەر بەندەکەی ببینێ)) رواه الترمذي ٤/٢٠٦.

لە طبقات ابن سعد ٤/٣٤٦: لە جندب بن مكيث ﷺ، دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ کاتێ شاندێکی دەهاتە لای باشترین جلی لەبەردەکرد، فەرمانیش بە هاوەڵانی دەکرد بەهەمان شێوەبن، دەڵێ: لەو ڕۆژەی شاندی کیندە هاتنە لای، پێغەمبەرم ﷺ بینی جلێکی نوێی یەمانی لەبەردابوو، وە ابوبکرو عومەریش وەك ئەویان لەبەر دابوو)). ابن المبارك والطبراني والحاكم والبيهقي وهیتر، لە عمر ﷺدەگێرنەوە: ((پێغەمبەر ﷺم بینی داوای جلێکی نوێی کرد و لەبەری کرد، کە جلەکەی بەسەر خۆیدا هێناو گەیشتە سەرسنگی فەرمووی: ستایش بۆ خوا کە جلێکی پێ بەخشیم تا شەرمگا و جەستەمی پێ داپۆشم و لە ژیانمدا خۆمی پێ جوان بکەم)) الترغيب والترهيب ٣/٩٣.

خوا ئەو جۆرە جوانکاریەی ڕێپێداوە نەگاتە ڕادەی زیادەڕۆیی: ﴿ يَابَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُم عِندَ كُلِّ مَسجِدٍ وَكُلُوا وَاشرَبُوا وَلاَ تُسرِفُوا إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ المُسرِفِينَ، قُل مَن حَرَّمَ زِينَةَ اللهِ الَّتِي أَخرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزقِ قُل هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الحَيَاةِ الدُّنيَا خَالِصَةً يَومَ القِيَامَةِ كَذَالِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَومٍ يَعلَمُونَ. واتا: ئەی نەوەی ئادەم کاتێ چوونە مزگەوت بە جلی ڕێك و پێك بچن نەك وەك سەردەمی نەفامی کە بەڕووتی تەوافیان دەکرد، وە بخۆن و بخۆنەوە و زیادەڕۆیی مەککەن" چونکە

خودا مرۆڤی زیادەڕۆیی خۆش ناوێت، ئەی محمد بڵێ: کێیە لە خۆیەوە ئەو جوانکارییە یاساغ دەکات کە خودا بۆ بەندەکانی دەرهێناوە لەگەڵ خۆراکی حەڵاڵ و پاك، بڵێ: ئەوە بۆ ئەو کەسانەیە باوەڕیان بەخوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە لە ژیانی دونیایاندا و لە ڕۆژی قیامەتیش بەتەنها بۆ باوەڕدارانە و بێباوەڕان بەشدار نابن تیایدا لەگەڵیان وەکوو لە دونیا، بەم شێوەیە ئایەتەکان ڕۆشن دەکەینەوە و شیدەکەینەوە بۆ گەلێك زانینی هەبێت﴾ الاعراف: ٣١، ٣٢.

لە صحیح مسلم لە ابن مسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ناچێتە بەهەشت ئەوەی تۆزقاڵێك فیز و لوت بەرزی لە دڵدا هەبێت)) پیاوێك وتی: پیاو هەیە حەز دەکات جل و پێڵاوی جوان بێت، واتا: ئایا ئەمەش دەچێتە بازنەی لوت بەرزی؟ فەرمووی: ((خودا جوانە و جوانیشی خۆش دەوێت، لوت بەرزی دان نەنانە بە حەق و ڕاستی و ڕەتکردنەوەیەتی و بە سووك سەیرکردنی خەڵکە و رق و کینەیە بەرامبەریان)) صحیح مسلم ٢/٨٩.

هاوەڵان و شوێنکەوتووان و ئەوانەی بەچاکە پەیڕەویانکردووە باش لەمانە تێگەیشتبوون" بۆیە پێشەوا ابو حەنیفە ﷺ شێوە و جل و بەرگی جوان و ڕێك و پێك بوو، بۆنی خۆش بوو، گرنگی دەدا بە بەردەوام خۆجوانکردن لە جل و بەرگیدا، بەڕادەیەك خەڵکی هاندەدا لەسەری، ڕۆژێك لە کوڕەکەی یەکێکی بینی جل و بەرگی نارێکە، جیایکردەوە و بە نهێنی ١٠٠٠ درهەمی پێدا تا شێوە و ڕواڵەتی پێ چاك بکات، پیاوەکە وتی: من هەبوونم و دەوڵەمەندم و پێویستم بەوە نییە، ابو حەنیفەش بە سەرزەنشتەوە پێی وت: ئەی ئەم فەرموودەت پێنەگەیشتووە: ((خودا حەز دەکات شوێنەواری بەخششی لەسەر بەندەکەی ببینێ؟)) بۆیە پێویستە بارودۆخت بگۆڕی، تاوەکوو برادەرکەت دڵی پێت نەسوتێ و بۆت غەمبار نەبێت.

پێویستە لەسەر بانگخوازانی ڕێگای خوا لە ئافرەتان و پیاوان لە جوانترین شێوە و باشترین دیمەن و تەواوترین ڕێك و پێکی دابن، لە خەڵکیتر زیاتر سەرنج ڕاکێشەر بن، بۆ ئەوەی بتوانن بچنە ناو دڵی خەڵك، بە بانگەوازەکەیان بگەنە ناخی دەروونیان. بەڵکو ئەو جۆرانە لە هەموو کەس زیاتر داوایان لێکراوە بەم شێوەیە بچنە ناو خەڵکەوە، بانگخوازی ڕێی خوا دەبێ زۆر گرنگی بدات بە ڕواڵەت و خاوێنی جەستە و جل و بەرگ و نینۆك و قژی، ئەگەرچی بە تەنیاش بوو و

کەس نەیدەبینی، بەمە دەچێت بەدەم بانگی فیترەی بێگەرد، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((پێنج شت لە خۆڕسکی(فیترە) مرۆڤن: خەتەنە کردن و، تاشینی مووی شەرمگاو، هەڵکەندنی مووی ژێر باڵ (بن هەنگڵ)و، نینۆك قرتاندن، کورتکردنەوەی سمێڵ)) فتح الباری ١٠/٣٣٤ ومسلم ٣/١٤٦.

کەواتە جوانی خۆرسکی مرۆڤایەتی لەو شتانەیە کە ئەم ئاینە پێی دڵگیر و خۆشەویست بوو، وە خاوەنی زەوقی ساغ و خورەوشتی شیرین حەزی لێ دەکات و لای خۆشەویستە.

## ناخزێتە ناو خۆدەرخستن و زیادەڕۆیی کردن لە خۆڕازاندنەوە

ئەم بایەخدانە بە شێوە و دیمەن ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ ناخزێنێتە ناو خۆدەرخستن و دیارخستنی جوانکاری بۆ بێجگە لە مێرد و مەحرەمەکانی، لارناکاتەوە بۆ زیادەڕۆیی و دەرچوون لەو هاوسەنگیەی ئیسلام هەموو دەستوورەکانی لەسەر دامەزراندووە" چونکە ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆی ڕۆشنبیر هەمیشە ئاگاداری میانڕەوی و هاوسەنگیە لە هەموو شتێك، تا هیچ لایەنێك لە ژیانیدا باڵادەستتر نەبێت بەسەر لایەنێکیتری.

هەر ئەو ئیسلامەی هاندەدات بۆ جوانکاری و ڕازاوەیی و حەڵاڵ و خۆشەویستی دەکات، هەر ئەویش هۆشداری داوە لە زیادەڕۆییکردن تیایدا، بە جۆرێك ئافرەت بکاتە کۆیلە لەم ژیانەدا و هەموو کار و خەمێکی گەورەی هەر ئەمە بێ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((بەدبەختە بەندە و کۆیلەی دینارو درهەم و جلی قەدیفە و صوف، کاتێ بیدەیێ ڕازی دەبێ و، ئەگەر نەیدەیێ ڕازی نابێ و نیگەرانە)) فیض الباری ٦/٨١.

ئافرەتانی ئەمڕۆ ئەوانەی زۆربەیان چوونەتە ژێربار و بەند و کاریگەری (بیوت الازیاء) ـ خانەی مۆدێل ـ و بازرگانە جیهانییەکان، تا وای لێهاتووە ئافرەتی دەوڵەمەندی وا هەیە جلێکی گرانبەها دەکڕێت و تەنها یەکجار لەبەری دەکات، بەڕاستی ئەمانە کەوتونەتە ناو ئەو کۆیلایەتیەی کە پێغەمبەر ﷺ هۆشداری لێداوەو خزاونەتە ناو باری بەدبەختی کە وایکردووە بکەونە ناو ئەو کۆیلایەتیە بێ واتایەی بۆ جل و بەرگ و مۆدێل و جوانکاری کە لە ڕادەی

میانڕەوی دەرچووە و خاوەنەکەی لاداوە لەو مەبەستە سەرەکیەی مرۆڤی لەپێناو دروستبووە لەم ژیانە.

هەروا لەو بەدبەختیانەیتر کە زۆربەی ئافرەتی موسڵمانی ئەو سەردەمەی تێکەوتووە، ئەو زیادەڕۆیی کردنەیە لە کڕینی جل و بەرگی گرانبەها و پەیڕەوکردنی مۆدێلی تازە لە شەوانی ئاهەنگ و زەماوەند، دەیانبینی لەکاتی ئاهەنگ چۆن پێشبڕکێ دەکەن بۆ بازاڕگاکان و پارە هەڵدەڕێژن، تا خۆیان پێبادەن و فیز و شانازی پێوە بکەن دوور لە هەموو شوێنەوار و کارێکی هۆش و عەقل، دوور لە ڕەوتی میانڕەوی. ئەو ئافرەتانەی ئەو جۆرە خۆدەرخستن و ناز و فیزە دەکەن، ئەوەیان لەبەرچاو نییە کە ڕەنگە ئافرەتی وا هەبێ لە ئامادەبووان توانای مادی وانییە بتوانێ جلی لەو شێوە و بەو نرخە بکرێ، بەمەش دڵی پڕ دەبێ لە خەم و پەژارە، لەوانەشە لە دەروونیدا ئێرەیی و ڕق و کینە دروست ببێ بۆ بووك و خزم و کەسی لەوانەی دەوڵەمەندن، بەڵام ئەگەر بووکەکە پەیوەست بێ بە میانەڕەوی لە کارەکانیدا ئەوا هیچ یەکێك لەو ئاکامانە دروست نابن، زیاد لەوە ئەم دیاردەیە سەرپێچی کرۆك و مەبەستی ئیسلامە کە دامەزراوە لەسەر ئاسانکاری و گونجان و میانڕەوی، قەدەغەی هەموو جۆرێکی زیادەڕۆیی و خۆهەڵکێشان دەکات.

بێگومان ئافرەتی موسڵمانی شارەزا بە ئاینەکەی خۆی دەربازکردووە لەم جۆرە خزان و کۆت و سەرپێچیە" چونکە ئاینە مەزنەکەی و تێروانینە میانەرەوەکەی و زیادەرۆیی نەکردنی هەردەم لەبەرچاوە کە شەریعەتە پاکەکەی ئیسلام هێناویەتی.

### ب- بیرو هۆشی

### بیروهۆشی ڕادێنێ بە زانست و زانیاری:

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو وەك چۆن بایەخ بە جەستەی دەدات ئاوەهاش بایەخ بە بیروهۆشی دەدات" چونکە گرنگی دانی بە بیروهۆشی کەم بایەختر نییە لە گرنگی دانی بە جەستەی، بۆیە شاعیر زهیر بن ابی سلمی[1] وتوویەتی:

---

[1] سەیری جمهرة اشعار العرب بکە بتحقیق المؤلف ١/ ٣٠٠ دار القلم ١٤٠٦.

لسان الفتى نصف ونصف فؤاده    فلم يبق إلا صورة اللحم والدم

واتا: مرۆڤ نیوەی زمانە و نیوەکەیتر دڵ و هۆشە کەواتە چیتر ماوە بێجگە لە شێوەی گۆشت و خوێن.

هەروا وتراوە: مرۆڤ بە دوو ئەندامی بچووك ماوە: دڵ و زمانی. واتا: بیروهۆش و بۆچوون و تێروانینی. لێرەوە گرنگی ڕۆشنبیرکردنی عەقڵ و گۆشکردنی بە زانیاری و زانستی و گەشەپێدانی بە خوێندنەوەو شارەزابوون لە هەموو جۆرە زانستێك دەردەکەوێ.

ئافرەت وەکوو پیاو ئەرکی پێسپێردراوە، لەسەریەتی بە دوای زانستێك بگەڕێت سوودی دونیا و دواڕۆژی تیا بێت، خودا دەفەرمووێ: ﴿وقل رب زدني علما. واتا: بڵێ پەروەردگارا زانست و زانیاریم زیاد بکە﴾ طه: ١١٤.

پیغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((داواکردنی زانست و بەدواداگەڕانی فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك)) رواه ابن ماجه ١/٨١.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەت و فەرمووودانە ئافرەت دەزانێ ئەم فەرمانە هەردووکیان دەگرێتەوە، لەگەڵ پیاو یەکسانە لە فێربوونی زانستەکانی فەرزی عەین و فەرزی کیفایە لەوەتەی زانست هەبووە لە کۆمەڵگەی ئسلامی.

ئافرەتی موسڵمان لەو کۆمەڵگە خواییە هەر لە سەرەتای ئیسلامەتییەوە نرخی زانستی دەزانی، بۆیە ژنانی یاریدەدەران بە پێغەمبەریان دەوت: ((ڕۆژێکمان بۆ دانێ تیایدا فێری زانست بین" چونکە پیاوەکان هەموو کاتێکیان بردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وادەی ئێوە لە مالی فلانە کەسە. جا لە ڕۆژی دیاریکراو هاتە لایان و ئامۆژگاریکردن و یادی خستنەوە و فێری کردن)) فتح الباري ١/١٩٢.

ئافرەتی موسڵمانی ئەو کاتە ڕووی کردبووە داواکردنی زانست، لە پرسیارکردن دەربارەی ئەحکای ئاینەکەی شەرمی نەدەکرد" چونکە پرسیاری لەبارەی حەق و ڕاستی دەکرد، خوداش لە

ئاستی حەق شەرم ناکات. خاتوو عائشە دەڵێ: ئەسمائی کچی یەزیدی بن السکن الانصاریە[1]، پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی خۆشوشتن لە بێنوێژی، پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوە: ((هەر یەکێك لە ئێوە ئاو و ڕووەکێکی بۆنخۆش دەهێنێ، و خۆی باش خاوێن دەکاتەوە، پاشان ئاوی بەسەر خۆیدا دەکات، پاشان پەڕۆکێکی بۆنخۆش دێنێ و خۆی باش پێ‌خاوێن دەکاتەوە)) ئەسماء وتی: چۆن خۆی پێ خاوێن دەکاتەوە؟ فەرمووی: سبحان الله، خۆتی پێ خاوێن دەکەیتەوە. خاتوو عائشە بە نهێنی چرپاندی بە گوێی: شوێنەواری خوێنەکەی پێ خاوێن دەکەیتەوە)) هەروا ئەسماء لەبارەی خۆشوشتن لە لەش پیسی پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئاو دەهێنی و خۆتی پێ خاوێن دەکەیتەوە بەباشی، پاشان ئاو بەسەر سەرت دابکە و پەنجە بخەرە ناو قژی سەرت و لێی بخشێنە تا دەگەیتە هەموو شوێنێکی سەرت، پاشان ئاو بەسەر سەرتدا برژێنە)) فتح الباری ٤١٤/١ وصحیح مسلم ١٥/٤ـ ١٦. خاتوو عائشە دەڵێ: ((باشترین ژن ژنانی ئەنصارە، شەرم و حەیا قەدەغەی نەدەکردن لە تێگەیشتن لە ئاین)) فتح الباری ٢٢٨/١ وصحیح مسلم ١٦/٤.

ام سلیم کچی میلحان دایکی ئەنەس بن مالك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا لە ئاستی حەق شەرم ناکات، ئایا ئافرەت خۆشوشتنی لەسەرە ئەگەر خەوی بینی (ئیحتیلام بوو)؟ فەرمووی: ((بەڵێ، ئەگەر ئاو ببینێ)). ئوم سەلەمە لە شەرمانا سەری خۆی داپۆشت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئافرەتیش ئیحتیلام دەبێ؟ فەرمووی: ((بەڵێ خاك بەسەر، ئەی بەچی کوڕەکەی شێوەی دەکات)) فتح الباری ٢٢٨/١ وصحیح مسلم ٢٢٣/٣، ٢٢٤. لە گێرانەوەیەکی‌تری مسلم، ام سلیم هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و عائشەی لەلابوو، کاتێ ام سلیم ئەم پرسیارەی کرد، عائشە وتی: ئەی ام سلیم ئابروی ژنانت برد، خاکت بەسەر، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی بە عائشە: بەڵکو تۆ خاکت بەسەر، ئەی ام سلیم با خۆی بشوات ئەگەر ئاوی بینی)) صحیح مسلم ٢٢٠/٣.

---

[1] لە ژنە ناودارەکانی ئیسلامەو، وتاربێژی و تێکۆشەر بووەو، بەیعەتی داوەتە پێغەمبەر ﷺ و، بەشداری جەنگی یەرموکی کردووە و ٧ سەربازی رۆمی بە دینگەی رەشماڵەکەی کوشتووە.

ئافرەتی موسڵمان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ هەرگیز نەدەگەڕایەوە و دوودڵی نەدەکرد لە ڕوونکردنەوەی حوکمی شەرعی لە پێغەمبەر ﷺ و ڕاستەوخۆ پرسیاری دەکرد لەبارەی ئەوەی لەسەری دادەبەزێ، هەر کاتێ گومانی هەبوایە لە فەتوای یەکێ، یا لە ڕاستی فەتواکە دڵنیا نەبوایە، بەوردی بە دوای تێگەیشتنی پرسیارەوە بوو تا دەگەیشتە دڵنیایی، ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری ژیر دەبێ وابێ" (سُبَیعَة بنت حارث الاسلمي) کە خێزانی سعد کوڕی خەولە بوو، لەبەرەی عامر بن لوئەی بوو، لەوانە بوو بەشداری جەنگی بەدر بوو، لە حەجی ماڵئاوایی کۆچیدوایی کرد، سوبەیعەش دووگیان بوو، هێندەی پێنەچوو دوای مردنی مێردی کۆرپەکەی دانا، کاتێ لە زەیستانی خاوێن بوویەوە، خۆی جوانکرد بۆ خوازبێنیکاران، لەو کاتە ابو السنابل بن بەعکەك (پیاوێك بوو لە بەرەی عبدالدار) لێی هاتە ماڵەوە و پێی وت: دەتبینم خۆت جوانکردووە بۆ خوازبێنیکاران، دەتەوێ شووبکەیتەوە؟ سوێند بەخوا تا ٤ مانگ و ١٠ ڕۆژ تێنەپەڕێ شووناکەیتەوە. سوبەیعەش دەڵێ: کاتێ وای پێم وت خۆم پێچایەوە تا شەو هات، هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ و پرسیارم لێیکرد لەم بارەیەوە، فەتوای بۆ دام بەوەی لەو ڕۆژەی کۆرپەکەم داناوە ئازاد بووم، فەرمانی پێکردم بە شووکردنەوە هەرکاتێ بۆم گونجا)) فتح الباری ٣١٠/٧ وصحیح مسلم ١١٠/١٠.

وردبینی سوبەیعە لە ڕوونکردنەوەی حوکمی شەرعی و دڵنیابوون لێی، خێر و بەرەکەت و سوودی هەبوو، نەك تەنها بۆ سوبەیعە، بەڵکو بۆ سەرجەم موسڵمانان تا ڕۆژی دوایی" چونکە کۆمەڵی زانایانی پێشینە و دواییینە ئەم فەرمووودەیان کردۆتە فەتوا، لە سەرووی هەموویانەوە چوار ئیمامەککە، دەڵێن: عیدەی ئافرەتی مێرد مردوو، دانانی کۆرپەکەیەتی، تەنانەت ئەگەر ڕاستەوخۆ لەپاش مردنی مێردی کۆرپەکەی دابنێ، ئەوا خۆی دەشوات و عیدەی تەواودەبێت، ڕاستەوخۆ مێردکردنەوە حەڵاڵ دەبێ بۆی. شرح النووی لصحیح مسلم ١٠٩/١٠.

ئیسلام داواکردنی زانستی واجبکردووە لەسەر ئافرەت و پیاو کە دەفەرموووێ: ((داواکردنی زانست فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك)) واتا: واجبە لەسەر هەموو مرۆڤێکی موسڵمان کە دوو شەهادەکەی هێنابێ، چ پیاو بێ چ ئافرەت، بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە ئافرەتی موسڵمان

شەیدای زانست بێ، ڕووی تێبکات، بە تێگەیشتنەوە گرنگی بە پرسەکانی بدات. لە هەموو کاتێك ئافرەتی موسڵمان خۆی ڕازاندۆتەوە بە زانستی بەسوود، پەی بردووە بە کاریگەری و شوێنەواری لەسەر منداڵەکانی و خێزان و کۆمەڵگەکەی، بۆیە دەیبینی بە دەروونێکی پڕ لە ویست و دڵنیا و تینوو ڕوودەکاتە دەستکەوتنی زانستی سوودبەخش بۆ ئاین و دونیای.

## ئافرەتی موسڵمان پێویستە چی فێر ببێت و لێی شارەزا بێت

یەکەم شت ئافرەتی موسڵمان پێویستە لێی شارەزا بێت، قورئان خوێندنەوەیە، بە تەجوید و ڕاڤەکەیەوە، پاشان زانستەکانی فەرمووودە و ژیاننامە، هەواڵی هاوەڵ و تابعین لە ئافرەتە ناودارەکانی ئیسلام، هەروا ئەوەی گرنگە لە ئەحکامەکانی فقه دەیخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی پەرستش و مامەڵەکانی دامەزراوبن و، زانینی ئەحکامەکانی ئاینەکەی لەسەر بنەمایەکی پتەو بێت.

پاشان ڕوودەکاتە یەکەم تایبەتمەندی خۆی لە ژیان، ئەویش گرنگی دانە بە ماڵ و مێرد و خێزان و منداڵەکانی" چونکە ئافرەت ئەو دروستکراوەیە کە خودا تایبەتی کردووە بەوەی خۆشی و بەختەوەری و ئارامی و گەشاوەیی بخاتە ماڵی هاوسەرێتی و دایکایەتی، هەر ئافرەتە کە ئیسلام بەرپرسیاریەتی گەورەی پەروەردەکردنی نەوەکان و دروستکردنی پاڵەوانان و پێگەیاندنی نەوەی زۆر ژیر و هۆشیاری پێ سپاردووە. لەم ڕوانگەوە وتەی نەستەق و پەندی زۆر وتراوە، لەوانە: (فتش عن المراة) واتا: (بەدوای ئافرەت بگەڕێ) وە(وراء كل عظيم امراة) واتا: (لەدوای هەموو مەزنێك ئافرەتێك هەیە) وە (ان التى تهز المهد بيمينها تهز العالم بشمالها) واتا: (ئەوەی بەدەستی ڕاستی بێشکە دەهەژێنێ بە دەستی چەپی جیهان دەهەژێنێ) ...هتد. ئافرەتیش ناتوانێ هەموو ئەوانە پێشکەش بکات ئەگەر بیروهۆشی کراوە نەبێت، هزری ڕووناك نەبێت، کەسایەتی بەهێز و دەروونی بێگەرد وخوڕەوشتی بەرز نەبێت، لەژێر ئەم ڕۆشنایییەوە پێویست دەکات گرنگی زیاتر بدرێت بە پەروەردە و فێرکردن و ئاراستەکردن و ڕێنماییکردنی ئافرەت بۆ دروستکردنی کەسایەتیە موسڵمانە تایبەتیەکەی.

له حیکمەت و دانایی دانییە کە فێرکردن و ڕۆشنبیرکردنی پیاو و ئافرەت وەکوو یەك بن لە هەموو شتێك، بەڵکو هەندێ شت هەنە تایبەتن بە ئافرەت، پیاو ناتوانێ پێی هەڵسێ، شتانێکیش هەن تایبەتن بە پیاو، ئافرەت ناتوانێ پێی هەڵسێ، یا بە واتایەکیتر" هەندێ کار هەنە ئافرەتی بۆ دروستکراوە، هەندێ کاریش پیاوی بۆ دروستکراوە، هەر یەکەیان ئەوەی بۆ ئاسانکراوە کە بۆی دروستکراوە. کاتێ ئافرەتی موسڵمان ڕوودەکاتە خوێندن و تایبەتمەندی بوون، دەبێ ڕێنمایی ئیسلامی مەزنی لەبەرچاو بێت لە ڕووی پێکهاتەی عەقلی و دەروونی و کۆمەڵایەتی، بەجۆرێك فێربوونەکەی شایانی بکات بە هەڵسان بە ئەرکی بنەڕەتی خۆی کە بۆی دروستکراوە، تا ببێتە کەسێکی ڕۆشنبیر و بەرهەمهێن و بنیاتنەر لەناو خێزان و کۆمەڵگە و نەتەوەکەی، نەك وێنەیەکی هاوشێوەی پیاو بێت و ململانێی لەگەڵدا بکات لە کار و پیشە و جێگای بگرێتەوە لەناو ڕیزی پیاوان، وەك چۆن ئەمە دەبینین لەو کۆمەڵگایانەی جیاوازی ناکەن لە پرۆگرێمەکانی خوێندن و یاسا و دامەزراندن لە نێوان پیاو و ئافرەت.

ئافرەت لەهەر زانستێك تایبەتمەند بێ، دەبێ پەیوەست بێ بە وردەکاری و کارامەیی و تواناداری تێیدا، لەسەر جوانترین شێوە بە ئەنجامی بگەیەنێ، وەك ملکەچی بوون و گوێڕایەڵی بوون بۆ ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرمووێ: ((خودا خۆشی دێت لەوەی ئەگەر یەکێکتان کارێکی کرد بەجوانی و وردی بیکات)) رواه البیهقی ٤/٣٣٤.

### شارەزابوونی ئافرەتی موسڵمان لە زانست

وێڕای ئەوەی دەرگاکانی زانست کراوەن بەڕووی ئافرەتی موسڵمان، هەرچی حەزبکات فێری دەبێت، خۆی بە جوانکاریەکانی دەڕازێنێتەوە، بەڵام مەرجە بەهۆیەوە مێیانەیی و سروشتیەکەی لەکەدار نەبێت، هۆش و هەستی ڕووناك کاتەوە،گەشەبدا بە کەسایەتیەکەی. ئەوەتا دایکی باوەڕداران عائشە سەرچاوەی یەکەم بووە بۆ فەرمووودە و سونەتی بێگەرد، یەکەم فەقێ بووە لە ئیسلام، لەکاتێك لە هەرەتی لاویدایە و تەمەنی هێشتا نەبۆتە ١٩ساڵ.

امام الزهری دەڵێت: ((ئەگەر زانستی عائشە کۆبکرێتەوەو بەراوردبکرێ بە زانستی هەموو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ و هەموو ژنان، هێشتا زانستی عائشە باشتر و زۆرترە دەبێ))

الاستيعاب ١٨٨٣/٤ والاصابه ١٤٠/٨. چەندین جار گەورە هاوەڵان پەنایان بۆ وتەی عائشە بردووە بۆ یەکلابوونەوە و ڕاستە ڕا بوون لە بارەی بنەماکانی ئاین و وردەکاریەکانی قورئان.

ڕەئی پێکاو و بیروهۆش فراوانی عائشە تەنها لە پرسەکانی ئاین نەبووە، بەڵکو وەك زانای موسڵمانان (عوروەی کوڕی زوبێر) کە هشامی کوڕی لێی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ((کەسێکم نەبینیووە لە عائشە شارەزاتر و زاناتر بێ لە فقه یا لە بواری پزیشکی یا لە شیعر))[1].

خاتوو عائشە ئافرەتێکی بلیمەت و ژیربوو، بوونی لە نزیك پێغەمبەر ﷺ وایکرد ببێتە گەنجینەی زانیاری. بوخاری لە کتاب العلم لە ابی مولەیکە دەگێڕێتەوە: خاتوو عائشەی هەر شتێکی ببیستایە و نەیزانیایە بەدوایدا دەچوو تا دەیزانی، جارێکیان پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەس لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت ئەشکەنجە دەدرێت)) عائشە وتی، وتم: ئەی خوا نافەرموویێ: ﴿فسوف يحاسب حسابا يسيرا. واتا: پاشان لێپرسینەوەیەکی ئاسانیان لەگەڵ دەکەین﴾ وتی: فەرمووی: ((بەڵکو ئەمە تەنها وەستانە لەبەر دەستی خوا، بەڵام هەرکەسێ لێپرسینەوە و بەدواداچوونەوەی لەگەڵدا بکرێت تیادەچێت)) فتح الباري ١٩٦/١.

خاتوو عائشە وێڕای ئەو هەمو زانستە، زمانیشی زۆر پاراو و قسە زان بوو، کاتێ قسەی بکردایە سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشا، دڵی کەمەندکێش دەکردن. الاحنف بن قیس دەڵێ: گوێم لە وتاری ابوبکر و عومەر و عوسمان و عەلی و خەلیفەکانیتری پاش ئەوان بووە، هیچ قسەیەکم نەبیستووە وەك قسەی عائشە پاراو و چاك و باش لە دەم دەربچێ.

موسی کوڕی تەڵحە دەڵێ: ((کەسم نەبینیوە لە عائشە زمانی پاراوتر بێ)) أخرجه الترمذي ٣٦٤/٥.

ئافرەتێکیتر لەوانەی شارەزای زانست بووە،کچی (سعيد بن المسيب کە زانای سەردەمی بووە) و ڕازی نەبووە کچەکەی بداتە کوڕی ئەمیری باوەڕداران(عبدالملك بن مروان)، بەڵکو لە یەکێ لە قووتابیە چاکخوازەکانی کە زانستی لەلای دەخوێند کە ناوی (عبدالله بن وەداعە) بوو مارەی

[1] تاريخ الطبري: حوادث سنة ٥٨، والسمط الثمين: ٨٢، والاستيعاب ١٨٨٥/٤.

بڕی، ئەم عبداللە یە کاتێ بۆ یەکەمجار چووە لای هاوسەرەکەی، بینی لە هەموو خەڵك جوانترە، لە هەموو کەس زیاتر قورئانی لەبەرە، لە هەموو کەس زیاتر شارەزایە بە سوونەتی پێغەمبەر ﷺ و مافەکانی هاوسەرەکەی. بەیانی دوای شەوی یەکەم، عبداللە هەڵسا بچێتە دەرەوە، هاوسەرەکەی پێی وت: بۆ کوێ؟ وتی: دەچمە کۆڕی باوکت (سعید بن المسیب) تا زانست فێربم، پێی وت: دانیشە بامن لە زانستی سەعیدت فێربکەم.عبداللە یەك مانگ لە ماڵەوە لە زانستی ئەم کچە فێر دەبوو و نەدەچووە کۆڕی سعید.

ئافرەتێکی‌تری زانا و شارەزا (فاتیمە) کچی (علاء الدین السمرقندی)یە، دانەری پەرتووکی (تحفة الفقهاء )یەو، ساڵی ٥٣٩ کۆچی دوایی کردووە، فاتیمەش لە باوکیەوە فقه و زانایی وەرگرتووەو توحفەی باوکیشی ئەزبەرکردووە. باوکی دایە شوو بۆ یەکێ لە قووتابیانی کە ناوی (علاء الدین الکاسانی) بوو، کە زۆر کارامە و لێهاتووو بوو لە زانستی (الاصول والفروع) و دانەری پەرتووکە مەزنەکەیەتی (بدائع الصنائع)ە کە ڕاڤەی توحفەی الفقهایە و لەلای ماملاستاکەی خوێندوویەتیەوەو، زۆر پێی دڵخۆش بووەو، کردوویەتیە مارەیی کچەکەی، کە زۆرێك لەپاشاکانی ڕۆم داوایان کردبوو، بەڵام باوکی نەیدانێ و ئەم قووتابییەی لەوان بالآتر گرت، بۆیە زاناکانی سەردەمی ئەم دەیانوت: ((توحفەکەی ئەمی ڕاڤەکردوو ئەویش کچەکەی لێمارەکرد)). ئەم ئافرەتە پێش شووکردنی بەشداری فەتوای باوکی دەکرد، هەر فەتوایەك دەرچووبایە خەتی خۆی و باوکی لەسەربوو، کاتێ شووی بە خاوەنی (البدائع) کرد، فەتواکە دەردەچوو خەتی خۆی و باوکی و مێردی لەسەربوو، هەندێ جار مێردەکەی هەڵەی دەکرد، فاتیمە دەیگێرایەوە بۆ سەر ڕاستیەکەی.

تەنها ئەوانە ئافرەتی موسڵمانی شارەزا و زانای ئیسلام نەبوونە، بەڵکو هیتری هێندە زۆرمان هەنە کە لە ژمارە نایەن، ئەوەتا ابن سعید بەشێکی لە پەرتوکەکەی لەژێر ناونیشانی ( الطبقات لراویات الحدیث من النساء) گرێداوە، کە تیایدا هاتۆتە سەر باسی زیاتر لە ٧٠٠ ئافرەت کە فەرمووودەیان لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە، یا لە هاوەڵانی متمانە پێکراو، لەوانیشەوە کۆمەڵێك لە زانایانی ئەم ئاینە و پێشەنگانی موسڵمانان گێڕاویانەتەوە. یەکێ لەوانە الحافظ ابن عساکر کە

له ساڵی ٥٧١ کۆچی دوایی کردووه، له هەموو فەرموووده گێڕەوەکان متمانه پێکراو و ڕاستگۆتر بووه، بەجۆرێك نـاوزەدکراوه بـه (حـافظ الامـة) ئـەم زانایـه هەشـتاو هەنـدێك لـه مامۆسـتا و فێرکارەکانی ئافرەت بوونه[1]. وێڕای ئـەوەی ئـەم پیـاوه زانایـه لـه بەشـی ڕۆژهـەڵاتی دەوڵـەتی ئیسلامی تێنەپەڕیووه، چونکه نەچۆته میصر و وڵاتـی مـەغریب و ئەنـدەلس، کـه ئـەم وڵاتانـه پڕتربوون له ئافرەتی خاوەن زانست و زانیاری، لێرەوه بۆمان دەردەکەوێ که ئەوانـەی ابـن عـساکر پێیان نەگەیشتووه ژمارەیان زۆر زیاتره لەوانەی پێیان گەیشتووه.

لەو ئافرەتانەی له صحیحی بوخاری فـەرموووده‌یان گێڕاوەتـەوه و ناویـان هـاتوووه: (اللاّمِعَـة: (ست الوزراِء وزیرة بنت محمد بن عمر بن اسعد بن النمجّی التنوخیة) و (کریمة بنت احمـد المروزیـة) که ابن حجر العسقلانی له پێشەکی کتابەکەی فتح الباری باسیکردووون.

ئەوەی زیاتر ئافرەتی موسڵمان بەرز و پاك و بێگەرد ڕادەگرێ ئەوەیه: ئەوانەی لەسەرەوه ناویان هاتووه لەوانەی فەرموووده‌یان گێڕاوەتەوه، زۆر به ڕاستگۆیی و دەسـتپاکی گێڕاویانەتـەوه، دوور له هەرچی گومان و تاوان و ترازانه، بەجۆرێك زۆر له پیاوان پێیـنەگەیشتون. ئەوەتا امـام الحافظ الذهبي له کتـابی (میـزان الاعتـدال في نقـد رجـال الحـدیث) تیایـدا ٤٠٠٠ فـەرموووده گێـڕەوەی تاوانباری له پیاوان لێدەرکردووه، پاشان دەڵێت: ((نەمزانیووه هیچ یەکێك لـه ئافرەتـان تاوانبـار کرابێت یا کەسێك فەرموووده‌ی لێ وەرنەگرتبێت))[1].

ئافرەتی موسڵمانی ئەم چەرخه، کاتێ لەبەردەم ئەم کەلتووره ڕیزدارەی ئـافرەتی موسـڵمان لـه مێژوو دەوەستێ، تەنها خۆشەویستی و ڕووکردنه زانستی زیاددەبێ" چونکه ئەم ئافرەتانه تەنها به زانـست نـاودار و هەمیـشه زینـدوو ماونەتـەوه و ئـەو شـوێن و پلەوپایـه بـەرزەی لـه مێـژوو دەستکەوتووه، تەنها زانستی بەسوود و ڕێنمایی دروست بیروهۆشـی گەشـەپێدان و ڕای دروسـت و دووربینی و هێزی بەخشی به کەسایەتی و عەقڵیان.

---

[1] طبقات الشافعیة ٢٧٣/٤.

[1] میزان الاعتدال ٣٩٥/٣.

## دووره له ئەفسانه و قسه و کرداری پرو پووچ

کاتێ ئافرەتی موسڵمان ڕوودەکاته زانست دەبێ زۆر خۆی دووربگرێ لە ئەفسانە و شتی پڕوپووچ کە لە مێشکی هەندێ لە ئافرەتانی نەفامدا هەیە، بەڵکو ئافرەتی موسڵمان دەزانێ هەرکەسێ دوای ئەفسانە و جادو و بیدعە بکەوێ گوناهی گەورەی ئەنجامداوە کە کردەوەی مرۆڤی باوەڕدار پووچەڵ دەکاتەوە و هەڕەشە لە قیامەتی دەکات" مسلم لە هەندێ لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: ((هەر کەسێك بچێتە لای جادوگەرێك و لەبارەی شتێك پرسیاری لێ بکات ئەوا نوێژی ٤٠ شەوی لێوەرناگیرێ)) صحیح مسلم ١٤/٢٢٧.

هەروا ابو داود لە سونەنی خۆیدا لە ابو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێ بچێتە لای جادوگەرێك و باوەڕ بە قسەکانی بکات، ئەوا دەرچووە لەوەی بۆ سەر محمد دابەزیووە)) اخرجه ابو داود ٤/٢١.

## لە خوێندنەوە دانابڕێ

کاری ماڵ و ئەرکەکانی دایکایەتی ئافرەتی موسڵمان دانابڕێ لە خوێندنەوە" چونکە ئافرەتی موسڵمان دەزانێ خوێندنەوە دەستکەوتی بیروهۆشە لە زانست و زانیاری، خۆراکی کراوەیی و پێگەیشتن و گەشە و بەرزی پێدەبەخشێ.

بەڵکو ئافرەتی موسڵمانی شارەزا بە ئاینەکەی، دەبێ کات چڕکاتەوە و ماوە ماوە پەرتووکێك یا گۆڤارێکی بەسوود بخوێنێتەوە، تا بیروهۆشی دەوڵەمەند بکات لەو نوێکاریانەی کە زانایان و ئەدیبان و ڕۆشنبیران دایانهێناوە لە لێکۆڵینەوەی فیکری و کۆمەڵایەتی و وێژەیی و زانستی، تاوەکو تادێ ئاسۆی بیر و هزری فراوانتر بێ، گەنجینەی زانیاریشی گەشەی تێکەوێ.

## ج- گیانەکەی

### پابەندە بە خواپەرستی و خاوێنکردنەوەی دەروون:

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بە ئاینەکەی، گیانەکەی بە پەرستش و یادی خوا و خوێندنەوەی قورئان خاوێن دەکاتەوە، هەمیشە بۆ ئەم مەبەستە چەند کاتێکی دیاریکراوی هەیە و

لێیدواناکەوێ. وەك چۆن گرنگی و بایەخ دەدات بە جەستە و بیروهۆشی ئاوەهاش بایەخ دەدات بە گیانەکەی" چونکە ئەو سێ پێکهاتەیە مافیان هەیە لەسەر مرۆڤ. کارامەیی و سەلیقەیی مرۆڤیش لە باش ڕاگرتنی هاوسەنگی دەردەکەوێ لە نێوان جەستە و هۆش و گیان، لایەنێکیان بەگەورەتر ناگرێ لەلایەنەکەیتر " چونکە لە ڕاگرتنی هاوسەنگی ئەم لایەنانە مسۆگەربوونی دامەزراندنی کەسایەتیەکی میانڕەوی هاوسەنگی پێگەیشتوو هەیە کە پەیوەستە بە پەرستش و خاوێنکردنەوەی دەروون.

ئافرەتی موسڵمان مافی دەروونی خۆی دەدات بە خاوێنکردنەوەی گیانەکەی بە پەرستش، بە دەروونێکی ئارام و هێمن و زەمینەساز بۆ چوونە ناو کرۆکی واتاکان ڕوو لە پەرستش دەکات، تا لە توانای دابێت دووردەبێت لە گاڵە و دەمەقاڵێ و سەرقاڵی لەکاتی پەرستشدا، نوێژەکەی لە بارێکی هێمناو بیرێکی روون و بێگەرد ئەنجامدەدا، بەجۆرێك دەروونی واتاکان هەڵمژێ لەوەی لە نوێژ دەیڵێ لە قورئان و زیکر و تەسبیحات، پاش نوێژ کەمێك بۆ دەروونی خۆی خاڵی دەکاتەوە و سبحان الله دەکات و چەند ئایەتێك لە قورئان بەوردی و تێگەیشتنەوە دەخوێنێ، ماوە ماوەش سەیرێکی حاڵی خۆی دەکات و بەلای ڕەفتار و گوفتارەکانی دەوەستێ، دەروونی سەرزەنشت دەکات لە بینینی هەر سەرپێچیەك یا کەم و کورتیەك، بەو شێوەیە پەرستش بەرهەمی چاوەڕوانکراوی لێدێتە بەرهەم لە خاوێنکردنەوەی دەروون و بێگەرکردنی ویژدان لە پیسی سەرپێچی و تاوان، هەرچی فێڵی شەیتان هەیە لە ڕاڕیی بەردەوام پووچەڵ دەکاتەوە، جا ئافرەتی موسڵمانی پارێزکاری ڕاستگۆ لەوانەیە هەڵە بکات، یا کەم و کورتی هەبێت، هەندێ جار لەوانەیە قاچیشی بخزێ، بەڵام خێرا وەئاگا دێتەوە و داوای لێخۆشبوون دەکات و پەشیمان دەبێتەوە" وەك خوای گەورە لە سورەتی الاعراف: ٢٠١ کە پێشتر ڕاڤە کراوە.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی دەفەرمووو: ((باوەڕتان تازەکەنەوە)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن باوەڕمان تازەکەینەوە؟ فەرمووی: ((زۆر لا الە الا الله دوبارە کەنەوە)) رواه احمد ٣٥٩/٢.

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار بۆ بەهێزکردنی گیانی و خاوێنکردنەوەی دەروونی هەمیشە پەنا دەباتەبەر پەرستش و زیکر و سەرزەنشتکردنی خۆی و لەبەرچاوگرتنی ترسی خوا و چاودێریەکەی لەسەر هەموو کردەوەکانی، هەرچی خوا پێی ڕازی بێت دەیکات، هەرچی نیگەرانی بکات وازی لێدەهێنێ. بەم شێوەیە ڕاستەڕێ دەبێت و سنوور نابەزێنێ و لارناکاتەوە لە ڕێی ڕاست.

## هاوڕێی خواناس هەڵدەبژێرێ و پابەندە بە ئامادەبوون لە کۆڕی ئیمان

ئافرەتی موسڵمان بەمەبەستی گەیشتن بەم بەرزیە هاوڕێی پارێزکار و خواناس هەڵدەبژێرێ، کە لە دەربڕینی خۆشەویستیەکەی بۆی دڵسۆزە، ئامۆژگاری دەکات، ناپاکی لەگەڵ ناکات نە لە مامەڵە نە لە گفتوگۆ" چونکە هاوڕێی چاك کاریگەری زۆرە لەسەر بەردەوامبوونی ئافرەتی موسڵمان و ڕازاندنەوەی بە باوی چاك و بەرز" چونکە زۆربەی کات مرۆڤ وێنەیەکی هاوشێوەیە لە خوڕەوشت و ڕەفتاری هاوڕێیەکەی، وەك شاعیر دەڵێ:

عن المرء لا تسأل وسل عن قرينه        فكل قرين بالمقارن يقتدى[1]

واتا: پرسیار لە خودی کەس مەککە بەڵکو پرسیار لە هاوڕێکەی بکە" چونگە مرۆڤ شوێنکەوتە و پەیرەوکاری هاوڕێکەیەتی.

هەروا هاموشۆکردنی خەڵکی باش بەڵگەیە لەسەر ڕێزداری و بەرزی دەروون. وەك شاعیر دەڵێ:

بعشرتك الكرام تعد منهم        فلا ترين لغيرهم أُلوفا[2]

واتا: تۆ بە هاموشۆکردنت و هەڵکردنت لەگەڵ مرۆڤی بەرز و بەڕێز هەژمار دەکرێی بە یەکێ لەوان، بۆیە ناتبینن لەگەڵ کەسانیتر هەڵبکەی.

لەم ڕوانگەوە پێویست دەبێ لەسەر مرۆڤ هاوەڵێتی مرۆڤی چاك بکات و دووربێ لە مرۆڤی خراپ، وەك عدی بن زید العبادی دەڵێ:

---

[1] سەیری عدي بن زيد العبادي بكە للمؤلف: ١٧٢.

[2] ئەوەی ئەم شیعرەی وتووە نەمدۆزیووەتەوە.

إذا كنت في قوم فصاحب خيارهم ولا تصحب الاردى فتردى مع الرَّدى

واتا: ئەگەر لەناو كۆمەڵێك بووی هاوەڵێتی چاكەكانیان بكە، نەكەی هاوەڵێتی خراپەكانیان بكەی نەبادا وەكوو ئەوان نزم و ریسوا بی.

ئافرەتی موسڵمان هەوڵدەدات ئامادەی ئەو جۆرە كۆڕانە بێت كە باسی ئیسلام و بەرزیەكەی دەكەن لە دروستكردنی تاك و خێزان و كۆمەڵگە، ئەو وتارانەی باس لە دەسەڵاتی مەزنی خوا دەكەن و بەخششەكانی بۆ سەر دروستكراوان، و پەیمان دەدەن بە پەیوەستبوون بە فەرمانەكانی و دووركەوتنەوە لە نەهیەكانی‌و، ڕووكردنە گوێڕایەڵی و ملكەچی، بەم جۆرە كۆڕانە دەروون نەرم دەبێت، گیان خاوێن دەبێتەوە، ئەندامەكان ملكەچ و خاشع دەبن، دواتر مرۆڤ بەرزدەبێتەوەو دڵی پڕدەبێت لە ڕۆشنایی باوەڕ، بۆیە عبدالله بن ڕەواحە ﷺ هەركاتێ گەیبایە یەكێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەیوت: ((دە وەرە با ساتێك باوەڕ بەخودا بێنین))، ئەم قسەیەی عبدالله دەگاتەوە بە پێغەمبەر ﷺ و دەفەرمووێ: ((خودا ڕەحم بە كوڕی ڕەواحە بكات، بەڕاستی حەزی لەو كۆڕانەیە كە فریشتەكان شانازی پێوە دەكەن)) رواه احمد ٢٦٥/٣.

هەروا خەلیفە عمر ﷺ زۆرجار پەست دەبوو لە كارەكانی خەلافەتی و ئەركی دادپەروەری، جا دەستی پیاوێك دوو پیاوی دەگرت و دەیگوت: ((دە وەرن با باوەڕمان زیاتركەین))، ئنجا دەستی دەكرد بە یادكردنی خوای مەزن. حیاة الصحابة ٣٢٩/٣.

پێشەوا عەمەر ﷺ وێڕانی ئەو هەموو تەقوا و باوەڕە قووڵە و جوانی كردار و پەرستشەی هەیبوو، هەستی بە پێویستی خاوێنكردنەوەی دەروون دەكرد ماوە نا ماوە. هەروا معاذ بن جبل ﷺ بە هاوەڵانی دەوت: ((وەرن دانیشن با ساتێك باوەڕبێنین)) حیاة الصحابة ٣٢٩/٣ .

موسڵمان بەرپرسیارە لە بەهێزكردنی گیانی و خاوێنكردنەوەی دەروونی، هەمیشە پاڵنانی بەرەو بەرزی و بەردەوام پاراستنی لە بەرەوە نزم چوون، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿وَنَفسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَألْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقوَاهَا، قَد أفلَحَ زَكَّاهَا، وَقَد خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾ الشمس: ٧ـ ١٠.

لەم سۆنگەیەوە ئافرەتی موسڵمان داواكراوە هاوڕێی چاك و كۆڕ و ژینگەی باش هەڵبژێرێ كە گیانی بەرەو بەرزی دەبەن، هێز دەبەخشنە كردارەكانی، بێگەردی دەدەن بە دەروونی، خودا

دەفەرمووێ: ﴿وَاصبِر نَفسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدعُونَ رَبَّهُم بِالغَدَاةِ وَالعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجهَهُ وَلاَ تَعدُ عَينَاكَ عَنهُم تُرِيدُ زِينَةَ الحَيَاةِ الدُّنيَا وَلاَ تُطِع مَن أَغفَلنَا قَلبَهُ عَن ذِكرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمرُهُ فُرُطًا. واتا: لەگەڵ ئەو باوەڕدارانەی هەمیشە یادی خوا دەکەنەوەو لە کۆڕی ئەوانا ئارامبگرە، پشتیان تێمەککە و بەکەم سەیریان مەککە، دەتەوێ لە کۆڕی گەورە پیاوان دانیشی و ئەو هەژارانە فەرامۆش بکەی، بەگوێی ئەوانە مەککە کە دڵیانمان مۆری بێ ئاگایی لێداوە و دوای ئارەزووی دەروون کەوتووە و گومڕا بووە﴾ الکهف: ٢٨.

## ویردەکان و پاڕانەوەکان زۆر دوبارە دەکاتەوە

یەکێ لەو هۆکارانەی پاڵپشتن بۆ ئافرەتی موسڵمان لە بەهێزکردنی گیانی و گرێدانی دڵی بە خوا: ئەزبەرکردنی چەند پاڕانەوە و ویردێکە لە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو ئەو کردارانەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ چەسپاوە تیایدا دوعا و پاڕانەوەی هەبووە" وەك پاڕانەوەی دەرچوون و هاتنە ماڵ و نووستن و..هتد، پێغەمبەر ﷺ هەر کارێکی بکردایە ڕووی لە خوا دەکرد و دەپاڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانیشی هاندەدا پابەندبن بەم نزا و پاڕانەوانە و دوبارە کردنەوەی.

ئافرەتی موسڵمانیش پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ دەکات وهەمیشە لە کاتەکانی و بۆنەکان بەپێی توانا نزادەکات، بەمەش دڵی پەیوەست دەبێ بەخوا، گیانی پاك دەبێتەوە، هەست و هۆشی بەرز دەبێتەوە، باوەڕیشی پتەو دەبێت.

ئافرەتی موسڵمانی ئەمرۆش زۆر پێویستی بەم توێشووە گیانییە هەیە بۆ پاك ڕاگرتنی دەروونی و دوورخستنەوەی لە بەلاّ و ئاشوبی سەردەم و خراپەکاریەکانی کە ئافرەتی بەرەو نزمی بردووە لە زۆرێك لە کۆمەڵگە دوورە پەرێزەکان لە ڕێنمایی خواو، بەرەو ئاگری بردون، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((سەیری ئاگرم کرد بینیم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتە)) صحیح مسلم ٥٣/١٧. ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیریش ڕێگای خۆی دەدۆزێتەوە، کاری چاکە زۆردەکات تا لەم چارەنووسە دژوار و ترسناکە رزگاری بێت کە شەیتانەکانی ئادەمیزاد و پەری هەوڵی بۆ دەدەن لە هەموو کات و شوێنێکدا تا بیخەنە ناوی و دوچاری ئەو بەدبەختیەی بکەن.

## ٣ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ دایك و باوكی

### چاكەكارە لەگەڵیان

لە دیارترین جیاكەرەوەكانی ئافرەتی موسڵمان لە ئافرەتیتر چاكەكردنیەتی لەگەڵ دایك و باوكی" چونكە ئیسلام لە چەندین شوێن لە قورئان و فەرموودەهانی چاكەكردنی داوە لەگەڵ دایك و باوك، موسڵمانیش ڕەوش و باری هەر چۆنێك بێت و، پەیوەندی نێوان كچ لەگەڵ دایك و باوك لەهەر چ ئاستێك بێت، دەبێ پەیوەست بێ بەم دەقانەو، پەلە بكات لە چاكەكردن لەگەڵیان.

### ڕێزیان دەزانێ و دەزانێ چی واجبە لەسەری بەرامبەریان

ئافرەتی موسڵمان كاتێ قورئان دەخوێنێ هەست بەو پلەوپایە بەرزە دەكات كە خودا دایك و باوكی لێداناوە، بەڕاستی پلەوپایەیەكە مرۆڤایەتی بێجگە لەم ئاینە نەیناسیووە، كاتێ وایكردووە ڕاستەوخۆ شوێنی گرنگیەكەی لەدوای گرنگی شوێنی باوەڕبوون بەخوا و پەرستش بێت، كە دەفەرمووێ: ﴿ وَاعبُدُوا اللهَ وَلاَ تُشرِكُوا بِهِ شَيئًا وَبَالوَالِدَينِ إحسَانًا ﴾.

واتا: ﴿تەنها خودا بپەرستن و هاوەڵی بۆ بریارمەدەن و لەگەڵ دایك و باوكیش چاكەكار بن﴾.

لەم ڕوانگەیەوە ئافرەتی موسڵمان لە هەموو ئافرەتێكیتری ئەم بوونەوەرە زیاتر لەگەڵ دایك و باوكی چاكە دەكات" نابێ تەنها ئەو كاتە چاكەیان لەگەڵ بكات كە شوودەكات و منالی دەبێت، كە ئەو كاتە جیهانێكی تایبەتی دەبێت و سەرقاڵی دەكات، بەڵكو چاكەكردن لەگەڵیان بەردەوام دەبێت تا هەناسەی بێت و ڕۆژگاری مابێت، بەتایبەتی لەو كاتەی دایك و باوك بەساڵا دەچن و دەگەنە قۆناغی لاوازی پەككەوتەیی و زیاتر پێویستیان بە ڕەفتاری بەرز و خەندەی بەسۆز و وشەی نەرم دەبێت، وەك قورئان دەفەرمووێ: ﴿ وَقَضَى رَبُّكَ ألاَّ تَعبُدُوا إلاَّ إيَّاهُ وَبِالوَالِدَينِ إحسَانًا إمَّا يَبلُغَنَّ عِندَكَ الكِبَرَ أحَدُهُمَا أو كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَهُمَا أفٍ وَلاَ تَنهَرهُمَا وَقُل لَهُمَا قَولاً كَرِيمًا، وَاخفِض لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحمَةِ وَقُل رَبِّ ارحَمهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا. واتا: خودا فەرمانی داوە

بێجگە لەو هیچیتر نەپەرستن و لەگەڵ دایك و باوكیش چاكەكار بن، وە كاتێ دەگەنە تەمەنی پیری یەكێكیان یا هەردووكیان ئاخ و ئۆف نەكەی لە كرداریان و بێزاریان لێنەكەی بەڵكو ئارامبگرە، بەڕوویان هەڵمەشاخێ و دەستی خزمەتكردن و یارمەتیت لێیان مەكێشەوەو بەجوانترین شێوە و ڕێزدارترین وشە لەگەڵیان بئاخافتە، باڵی ڕەحمەت و سۆز و میهریان بۆ ڕاخە و لەبەردەمیان وەك كۆیلە وابە و هەمیشە لە خزمەتیان دابە و بڵێ: پەروەردگارا، ڕەحم و بەزەییت پێیان دابێتەوە وەك چۆن ئەوان منیان بە بچوكی گەورەكردووە و پێگەیاندووە﴾ الاسراء : ٢٣ـ ٢٤.

ئافرەتی موسڵمانی پارێزكار كە چاوی دانایی بە قورئان ڕۆشن بووە، كاتێ ئەم ئایەتانە دەخوێنێتەوە چاكتر دەبێت لەگەڵیان و لە ڕاژەیان دادەبێت بە ئومێدی دەستكەوتنی ڕەزامەندیەكەیان، هەرچەندە مێرد و ماڵ و منداڵ و بەرپرسیاریەتی لە ئەستۆ دابێت" وەك دەفەرمووێ: ﴿وَوَصَّينَا الإنسَانَ بِوَالِدَيهِ حَمَلَتهُ أُمُّهُ وَهنًا عَلَى وَهنٍ. واتا: ئادەمیزادمان ڕاسپاردووە بە چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوكی چونكە دایكی لە قۆناغی سەختی لە دوای سەختی هەڵیگرتووە﴾ لقمان: ١٤.

هەروا دەفەرمووێ: ﴿وَوَصَّينَا الإنسَانَ بِوَالِدَيهِ إحسَانًا. واتا: ئادەمیزادمان ڕاسپاردووە بە چاكەكردن لەگەڵ دایك و باكی﴾ العنكبوت: ٨.

لە پاڵ ئەم ئایەتانەوە فەرموودەی زۆر هەن جەخت دەكەنەوە لەسەر چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوك، هۆشداری دەدەن لە خراپەكردن لەگەڵیان هۆكارەكان هەرچی بن.

عبداللە بن مسعود ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەر ﷺ پرسی: چ كردەوەیەك لەلای اللە خۆشەویسترینیانە؟ فەرمووی: ((نوێژ لەكاتی خۆی)) وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: ((چاكەكردن لەگەڵ دایك وباوك)) وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: ((تێكۆشان لەپێناوی خوادا)) متفق علیە. شرح السنە ١٧٦/٢.

پێغەمبەری پەروەردکاری مەزن، چاکەکردنی لەگەڵ دایك و باوك لەنێوان دوو کردەوەی گەورە داناوە لە ئیسلام: نوێژکردن لەکاتی خۆی، تێکۆشان لەپێناوی خوا. نوێژیش کۆڵەگەی ئاینە، تێکۆشانیش چڵەپۆپەی ئیسلامە، جا چ پلەوپایەیەك لەمە بەرزترە کە پێغەمبەر ﷺ داینــاوە بۆ دایکان و باوکان؟!

پیاوێك دێتە لای پێغەمبەر ﷺ تا بەیعەتی پێبدات لەسەر کۆچکردن و تێکۆشان، بەمەبەستی وەدەستهێنانی پاداشتی خوایی، پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ دەکات: ((ئایا هیچ کام لە دایك و باوکت زیندوون؟)) پیاوەکە دەڵێ: بەڵێ، هەردووکیان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((وە بەئومێدی پاداشتی خوای؟)) پیاوەکە وەڵامی دەداتەوە: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((دەی بگەڕێوە لای دایك و باوکت و چاکەیان لەگەڵ بکە و بەچاکە هاوڕێیەتیان بکە)) متفق علیـه. ریاچ الصالحین: ۱۹۱.

موسلم و بوخاری دەگێڕنەوە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و مۆڵەتی جیهاد کردنی خواست، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دایك و باوکت زیندوون؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((دەی لەوان جیهـاد بکە)) رواه الشیخان. ریاض الصالحین: ۱۹۱.

دڵە نەرمەککەی پێغەمبەر ﷺ هەتا لە کـاتی تێکۆشـان و جیهادیشا کـە زۆر پێویستی بـە بازوویەکە شمشێر بوەشێنێ، کەچی لاوازی و پێویستی دایك و بـاوك لـەیاد ناکـات و خۆیـەختکار دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی چاودێری دایك و باوکی بکات. ئەوەتا کاتێ دایکی سەعد بـن ابـی وەقـاص نکۆڵی لە ئیسلامبوونی سعد کردوو ڕازی نەبوو، پێیوت: یا ئەوەتا لـە ئیـسلام هەڵدەگەڕێیتـەوە یان واز لە خواردن دێنم تا دەمرم، ئەو کاتە عەرەب سەرەکۆنەت دەکـەن و پێـت دەڵـێن: بکـوژی دایکیەتی، سعد لە وەڵامدا دەڵێ: بزانە، سوێند بەخوا ئەگەر ۱۰۰ گیانت هـەبێ و یـەك لـەدوای یەك دەرچن لە ئیسلامەتیم هەڵناگەڕێمەوە. دایکی سعد ڕۆژێك دوو ڕۆژ ئارامی گـرت، لـە ڕۆژی سێیەم برسێتی زۆری بۆ هێنا و نانی خوارد، خودا قورئـانێکی دابەزانـد و پێغەمبـەریش ﷺ بـۆ موسڵمانی خوێندەوە، کە تیایدا سەرزەنشتی سعد دەکات لەسەر شێوەی توندی وەڵامدانەوەی سعد بۆ دایکی کە دەفەرمووێ: ﴿ وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا

وَصَاحِبهُمَا فِي الدُّنيَا مَعرُوفًا. واتا: ئەگەر دایك و باوك زۆریان لێکردی تا بەبێ زانیاری و زانست هاوەڵم بۆ بڕیاربدەی ئەوا لەو فەرمانە گوێڕایەڵیان مەبە و لە دونیادا بەچاکە لەگەڵیان بە و لە چاکەش گوێڕایەڵیان بە و پەیڕەوی ڕێگای ئەوانە بە کە بۆلای من گەڕاونەتەوە، پاشان دواجار گەڕانەوەتان بۆلای منە و هەواڵی کردەوەکانتان پێ ڕادەگەیەنم﴾ لقمان: ١٥.

لە چیرۆکی جورەیجی خواپەرستیش پەندێکی گەورە هەیە لەسەر گرنگی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك و پەلەکردن لە گوێڕایەڵی بوونیان، کاتێ دایکی بانگی دەکات و ئەویش نوێژ دەکات و دەڵێ: دایکم و نوێژم؟ نوێژەکەی هەڵبژارد. دوبارە بانگی دەکات، هەر وەڵامی نەدایەوە و لە نوێژەکەی بەردەوامبوو، سێبارە بانگی کرد، کاتێ ئەمجارە وەڵامی نەدایەوە نزای لێکرد کە خودا نەیمرێنێ تا ڕووخساری ئافرەتی داوێن پیسی نیشاندەدات. جا ئافرەتێکی داوێن پیس لەگەڵ شوانێك داوێن پیسی دەکات و لێی دووگیان دەبێت، کاتێ لە ئابڕووچوون و ئاشکرا کردنی کارەکەیان ترسا، شوانەکە پێی دەڵێ: ئەگەر لە باوکی ئەم منداڵە پرسیارت لێکرا بڵێ: جورەیجی خواپەرست باوکیەتی، ئافرەتەکەش وایکرد، خەڵك چوون و پەرستگاکەی جورەیجیان ڕووخاند، دادوەریش بانگیانی کردە مەیدان، لەو کاتەی لە ڕێگابوو نزاکەی دایکی هاتەوە یاد و زەردەخەنەیەکی کرد، کاتێ بانگکرا بۆ سزادان، داوای مۆڵەتی کرد بۆ ئەنجامدانی دوو ڕکات نوێژ، پاشان داوای منداڵەکەی کرد و چرپاندی بەگوێیدا: باوکت کێیە؟ وتی: باوکم فلانە شوانە[1]، خەڵکی هاواریان کرد و الله اکبریان کرد و وتیان: پەرستگاکەت لە زێڕ و لە زیو دروست دەکەینەوە، وتی: نەخێر، بەڵکو وەکو جاران لە خاك و قوڕ دروستی بکەنەوە. پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودەی بوخاری دەفەرمووێ: ((ئەگەر جورەیج زانا بووایە دەیزانی وەڵامدانەوەی دایکی لە پێشترە لە پەرستشی پەروەردگاری)) فتح الباری ٧٨/٣. لەم ڕوانگەیەوە زانایان بۆچوونیان وایە کاتێ مرۆڤ لە نوێژی سوننەت بێ و دایکی یان باوکی بانگی بکات ئەوا پێویستە وەڵامیان بداتەوەو نوێژەکەی ببڕێ.

---

[1] ئەم منداڵە یەکێکە لەو سێ کەسەی هەڵبدات بێشکە قسەیان کردووە، دووانەکەی‌تر عیسای کوڕی مەریم و، ئەو کوڕە بوو کە لەگەڵ دایکی بوو لە کۆمەڵی (اصحاب الاخدود).

پێویستی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك لەناو مێشكی ئافرەت و پیاوی موسڵمان چەسپابوو، بۆیە كچان و كوڕان پەلەیان دەكرد لە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوكیان چ لە ژیانیان چ لەپاش مردنیان" ئافرەتێك لەبەرەی جوهەینە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: دایکم نەزری کردبوو حەج بکات، بەڵام مردوو حەجی پێنەکرا، ئایا من دەتوانم لە جیاتی حەج بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، حەجی لە جیات بکە، ئایا ئەگەر دایکت قەرزێکی لەسەربووایە لە جیاتیت نەدەدایەوە؟ کەواتە قەرزی خودا بدەنەوە، چونکە دانەوەی قەرزی خوا لەپێشترە لە قەرزی خەڵکی)) فتح الباری ٦٤/٤.

لە گێرانەیەکیتری موسلم: ((ئافرەتەکە وتی: ڕۆژووی مانگێکی لەسەر ماوە، ئایا لە جیاتی بەڕۆژوو بم؟ فەرمووی لە جیاتی بەڕۆژوو بە. وتی: هەرگیز حەجی نەکردووە، حەجی لە جیات بکەم؟ فەرمووی: لە جیاتی حەج بکە)) صحیح مسلم ٢٥/٨.

## چاکەکارە لەگەڵ دایک و باوکی ئەگەرچی موسڵمانیش نەبن

پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ڕێنماییەکانی بەرزدەبێتەوە بۆ لوتکەی مرۆڤایەتی، کاتێ ئامۆژگاری موسڵمان دەکات بە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکی هەتا ئەگەر موسڵمانیش نەبن" ئەسمائی کچی ابوبکر ﷺ دەڵێ: دایکم هاتە سەردانیم، کە هێشتا بێ باوەڕبوو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ، بۆیە پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد و وتم: دایکم هاتۆتە سەردانم، چاوی لە دەستی منە دەستی بۆ درێژکەم، ئایا پەیوەندیم لەگەڵ دایکم بگەیەنم؟ فەرمووی: ((بەڵێ، پەیوەندیت لەگەڵ دایکت بگەیەنە)) متفق علیه. شرح السنه ١٣/١٣.

بۆیە لەم ڕوانگەوە ئافرەتی موسڵمانی دیندار لە هەموو کەس زیاتر چاکە لەگەڵ دایك و باوکی دەکات و دڵیان ڕادەگرێ و بریندارییان ناکات، هاوەڵان و شوێنکەوتووانیش لەسەر ئەمە ژیاون. پیاوێك لە سەعیدی کوڕی موسەییەبی پرسی: لە هەموو ئایەتی چاکەکردن لە گەڵ دایك و باوك تێگەیشتووم تەنها ئەوە نەبێ: ﴿وقل لهما قولا كريما﴾، جا ئایا قەولی کەریم چۆن دەبێ؟ سعید وتی: مەبەستی ئەوەیە چۆن کۆیلە لەگەڵ گەورەکەی قسە دەکات ئاوەها قسەیان لەگەڵ بکەی. ابن

سیرینیش کاتێ قسەی لەگەڵ دایکی دەکرد دەنگی زۆر لاواز و نـزم دەکـرد، وەك بلێـی نەخۆشـە وەکوو بەگەورەگرتنی و ڕێزلێنانی.

## زۆر دەترسێ لە خراپەکردن لەگەڵ دایک و باوکی

چەندە ئافرەتی موسڵمان پەلە دەکات لە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکی، هێندەش دەترسێ لـە تاوانی خراپەکردن لەگەڵیان" چونکە دەزانـێ لـە گوناهـە گەورەکانـە، ئـەو تـابلۆ ڕەش و تاریکـە دەزانێ کە دەقە ڕاستەکان کێشاویانە بۆ ئەوانەی خراپن لەگەڵ دایك و باوکیـان و دڵـە ڕەقەکـەیان دەلەرزێنێ، ویژدانە بێ ئاگا و سڕەکەیان دەهەژێنێ، هەستە نووستوو و سڕەکەیان دەوروژێنێ، کـە دەبینی ئەو تاوانەی گرێداوە بە هاوبەشی دانان بۆ خوا وەك چۆن چاکەکردنی لەگەڵیان گرێـداوە بـە باوەڕبوون بەخوا، بۆیە خراپەکاری لەگەڵ دایـك و بـاوك تـاوانێکی ڕەشـی چـەپەڵە، گـەورەترینی گوناهەکانە پاش هابەشی دانان دێت" لە ئەبی بەکرە (نُفَیع بن الحارث) دەڵێ: پێغەمبـەر خـوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا هەواڵی گەورەترینی گوناهەکانتان پێڕابگەیەنم؟ ـ سێ جـار ئەمـەی فـەرمووو ـ وتمان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((هاوبەشی دانان بۆ خواو، خراپەکاری لەگەڵ دایـك و باوك ...)) متفق علیه. شرح السنه ۱۳/۱۵.

## یەکەمجار چاکە لەگەڵ دایکی دەکات پاشان لەگەڵ باوکی

ڕێنمایی ئیسلام هاتووەوە لەسەر هاندان بۆ چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك، هەریەکەیانی بـەجیا لەوەیتر تایبـەتکردووە و باسـکردووە، بەگـشتی بـە پێویـستی زانیـووە هاوسـەنگی بکرێـت لـە چاکەکردن لەگەڵیان و چاکەکردن لەگەڵ یەکێکیان لەسەر حیسابی ئەوەیتر نەبێ، بەڵام چـاکەکردن لەگەڵ دایك لەپێشترە لە چاکەکردن لەگەڵ باوك. وەك بینیمان چۆن پێغەمبەر ﷺ سـێجار باسـی دایکی کرد و لە جاری چوارەم ناوی بـاوکی هێنـا، هـاوەڵانیش دوای پێغەمبـەر ﷺ لەسـەر ئـەم ڕێنمایی ڕۆیشتون" پیاوێك هاتە لای ابن عباس و وتی: من چوومە خوازبێنی ئافرەتێـك و شـووی پێنەکردم، پاشان یەکێکیتر داوایکرد ڕازی بوو شووی پێبکات، بۆیـە غـیرە گرتمـی و ئافرەتەکـەم کوشت، ئایا تەوبە بکەم لێم وەردەگیرێ؟ ابن عبـاس وتـی: دایکـت مـاوە؟ وتـی: نـەخێر، وتـی: پەشیمان بەوە و داوای لێبوردن بکە لە خواو، تا دەتوانی بەکردەوەی چاك خۆتی لێنزیك بکەرەوە.

عطاء بن یسار که ئەم فەرموودەیەی لە ابن عباس گێڕاوەتەوە، دەڵێ: چوومە لای ابن عباس و لێم پرسی: لەبەرچی لە ژیانی دایکیت پرسی؟ وتی: چونکە هیچ کردەوەیەك نابینم هێندەی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك نزیکت بکاتەوە لە خوا. البخاری فی الادب المفرد ١/٤٥.

هەروا لە پەرتووکەکەی پێشەوا بوخاری (الادب المفرد)دا هاتووە، سەرەتای پەرتووکەکەی بە (باب بر الوالدین) دەستپێکردووە و بابی چاکەکردن لەگەڵ دایکی پێشخستووە لە بابی چاکەکردن لەگەڵ باوك، وەکوو گونجان و هەماهەنگیەك لەگەڵ ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ.

قورئانیش هەستی چاکەکردنی ووروژاندووە لە دەروونی منالان، ڕایسپاردون بە چاکەکردن لەگەڵیان، هەروا ئاماژەی بە گەورەیی دایك کردووە لەکاتی دووگیانی و شیرداندا، بەهۆی ئەو ئەزیەت و ناخۆشیانەی لەم دوو قۆناغە دەیبینێ، وە لە تابلۆیەکی پڕ لە سۆز و بەزەییدا نواندوویەتی، کاتێ ئاماژەی بە خۆبەختکاری و ئاوڕدانەوەیەکی پڕ لە میهرکردووە لەلایەن دایکەوە" وەك دەفەرمووێ لە سورەتی لقمان: ١٤پێشتر ڕاڤەکراوە.

ئای لەو پەروەردەکردنە بەرزە! لەو ئاڕاستەکردنە پڕ لە میهرە بۆ مرۆڤ! کە دەفەرمووێ: ﴿ان اشکر لی ولوالدیك﴾، جا سوپاسکردنی دایك وباوك لەسەر ماندووبوونیان لەگەڵ منالەکیان لەدوای سوپاسکردنی خوا هاتووە، کە بنەمای هەموو کارێکی چاکەیە. چەندە پایەیەکی ڕێزدارە ئەم ئاینە بە دایك و باوکی بەخشیوە!

ئەوەتا ابن عمر پیاوێکی یەمەنی دەبینێ دایکی لە پشتکردووە و تەوافی کەعبەی پێدەکات و دەڵێت: وەکوو حوشترێکی ملکەچم بۆی، ئەوەندەی ئەو منی هەڵگرتووە من زیاتر ئەوم هەڵگرتوە، ئایا پاداشتیم داوەتەوە ئەی ابن عمر؟ وەڵامی دایەوە: نەخێر ناگاتە یەك هاواری ژانی کاتی لە دایکبوون. البخاری فی الادب المفرد ١/٦٢.

ئەوەش عمر بن خەتتابە ﷺ هەرچەند جاری خەڵکی یەمەنی بدیبایە لەوانەی کۆمەکیان دەهێنا بۆ سوپێی ئیسلام، لێیدەپرسین: ئایا ئوەیسی بن عامرتان تێدایە؟ تا ئەو ڕۆژەی گەیشت بە ئوەیس، وتی: تۆ ئوەیس بن عامری؟ وتی: بەڵێ، وتی: لە مراد پاشان لە قەرەن هاتی؟ وتی:

بەڵێ، وتی: نەخۆشی بەڵەکت هەبووە و هەموی چاکبۆتەوە تەنها شوێنی درهەمێك نەبێت؟ وتی: بەڵێ، وتی: دایکێکت هەیە؟ وتی: بەڵێ، وتی: لە پێغەمبەر ﷺ م بیستووە دەیفەرمووو: ((ئوەیس بن عامر لەگەڵ کۆمەکی خەڵکی یەمەن دێت، لە موراد پاشان لە قەرەن دێت، پێشتر نەخۆشی بەڵەکی هەبووەو هەمووی چاکبۆتەوە تەنها شوێنی درهەمێك نەبێت، دایکێکی هەیە زۆر لەگەڵی چاکەکارە، ئەم کابرایە ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات خودا سوێندەکەی ناخات، جا ئەگەر توانیت پێیبگەی و داوای لێخۆشبوونت بۆ بکا لە خوا ئەوا بیکە)) ئنجا عمر وتی: دەی داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە لە خوا، ئەویش وایکرد، عمر وتی: لەبارەی تۆوە نامەیەکی ڕاسپاردە بنێرم بۆ سەرکاری کۆفە؟ وتی: زیاتر پێم خۆشە نەناسراو بم و لەناو خەڵکی هەژار دابم. صحیح مسلم ١٦/٩٥.

سەیرکە ئوەیس بەهۆی چاکەکردن لەگەڵ دایکی گەیشتە چ پلەوپایەیەك، بەڕادەیەك پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری هاوەڵانی کرد داوای دوعاکردنی لێبکەن!

ئەمانە هەمووی بەڵگەن لەسەر پلەوپایەی شکۆداری دایکایەتی لە ئیسلام کە پێش پلەوپایەی باوکایەتی خستووە، بەڵگەن لەسەر ڕێزگرتنی هەردووکیان، هاندان بۆ چاکەکردن لەگەڵ هەردووکیان.

هەندێ جار دنیا باوەشی بۆ کچ دەکاتەوە، شوودەکات و دەچێتە ڕابواردنەوە و سەرقاڵ دەبێ بە مێرد و ماڵ و پەروەردەیان و ئاگای لە دایك و باوکی نامێنێ، بایەخ و گرنگیدانی پێیان کەم دەبێتەوە. بەڵام ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو دوورە لەم بێ ئاگاییە" چونکە هەرکاتێ ئامۆژگاریەکانی قورئان و فەرموودە بخوێنێتەوە سەبارەت بە دایك و باوك، یەکسەر لێیان دەپرسێ و پێویستیەکانیان جێبەجێ دەکات، پەلەدەکات لەچاکەکردن لەگەڵیان هەرکاتێ بوار و دەرفەتی هەبوو و لە توانای دابوو.

**بە شێوازی جوان چاکە لەگەڵ دایک و باوکی دەکات**

ئەو ئافرەتە موسڵمانەی چاوی بە ڕێنمایی ئسلام هەڵێناوە، بنەما و شەریعەت و ئامۆژگاریەکانی لە باوەشگرتووە، لەگەڵ دایك و باوکی چاکەکارە، بەرزترین و باشترین ڕێگا

هەڵدەبژێرێ لەکاتی گفتوگۆ و ڕەفتارکردن لەگەڵیان، زۆر بە ئەدەب و ڕێزەوە قسەیان لەگەڵ دەکات، چاودێریان دەکات و بە گەورەیان دەگرێ، باڵی ملکەچی ڕەحمەتیان بۆ ڕادەخا، وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالوَالِدَينِ إِحسَانًا إِمَّا يَبلُغَنَّ عِندَكَ الكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَو كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَهُمَا أُفٍ وَلاَ تَنهَرهُمَا وَقُل لَهُمَا قَولاً كَرِيمًا، وَاخفِض لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحمَةِ وَقُل رَبِّ ارحَمهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا. واتا: پەروەردگارت فەرمانی داوە کە بێجگە لەو هیچیتر نەپەرستن و لەگەڵ دایك و باوکتان چاکەکاربن، کاتێ بەتەمەن دادەچن و پیر دەبن ئاخ و ئۆف نەکەی لە دەستیان یا لە ئەرك و کاروباریان و بەڕوویان هەڵمەشاخێ و قسەی ناخۆشیان پێمەڵێ، بە گفتوگۆی جوان و نەرم بیاندووێنە و هەموو داواکاریەکیان بەجێبگەیەنە، باڵی سۆز و بەزەییت بۆیان ڕاخە و بڵێ: خودایە ڕەحم بە دایك و باوکم بکەی وەك چۆن ئەوان منیان بە منداڵی پەروەردەکرد و پێگەیاند﴾ الاسراء: ٢٣، ٢٤.

وادێت هەندێ جار دایك و باوك هەردووکیان یا یەکێکیان لە ڕێگای ڕاست لاردەکەنەوە، لەو کاتەدا ئەرکی کچی موسڵمانی چاکەکار لەگەڵ دایك و باوکی ئەوەیە بزانێ بە چاکە بچێتە ناو دەروونیان و ڕێگای نەرم و نیانی و سۆز و بەزەیی و باوەڕ پێهێنانیان بگرێتەبەر، ڕەق نابێت و لە سنووری خۆی لانادات و لە بازنەی ئەدەب و ڕێز دەرناچێ، بەڵکو هەوڵدەدات بە ڕێگاچارەی گونجاو ڕازیان بکات، لەم بارەدا چەکی ئافرەت ئارامگرتن و قسەی ناسك و خەندەی بە سۆز و بەڵگەی بەهێز و شێوازی دانایی و ئەدەبە بۆ گەیشتن بە ئامانجی.

کچی موسڵمان داوای لێکراوە هەڵسێ بەم هەموو چاکەکاریە لەگەڵ دایك و باوکی ئەگەرچی بێباوەڕیش بن، بەڵکو ڕاسپێردراوە ژیانیان بەچاکە لەگەڵ بباتەسەر لەگەڵ ئەوەی دەشزانێ شیرك لە گەورەترینی گوناهانە، کەچی ئەمە پێگری نابێت لە چاکەکردن لەگەڵیان، خودا دەفەرمووێ: ﴿وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَى أَن تُشرِكَ بِي مَا لَيسَ لَكَ بِهِ عِلمٌ فَلاَ تُطِعهُمَا وَصَاحِبهُمَا فِي الدُّنيَا مَعرُوفًا وَاتَّبِع سَبِيلَ مَن أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرجِعُكُم فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُم تَعمَلُونَ. واتا: ئەگەر دایك و باوك زۆریان لێکردی تا بەبێ زانیاری و زانست هاوەڵم بۆ بڕیاربدەی ئەوا لەو فەرمانە گوێڕایەڵیان مەبەو، لە دونیادا بەچاکە لەگەڵیان بە و لە چاکەش گوێڕایەڵیان بە و پەیرەوی ڕێگای ئەوانە بە

که بۆلای من گەڕاونەتەوە، دواجار گەڕانەوەتان بۆلای منە و هەواڵی کردەوەکانتان پێڕادەگەیەنم﴾ لقمان: ١٥.

چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك لە ئیسلامدا کارێکی مەزنە" چونکە سەرچاوەی گرتووە لە توندترینی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان، لە پەیوەندی پێغەمبەرایەتی بەرامبەر دایکایەتی و باوکایەتی، بەڵام ئەم پەیوەندییە وێڕای گەورەیی و ڕێزی پاش پەیوەندی بیروباوەڕ دێت. جا ئەگەر دایك و باوك بێ باوەڕبوون و فەرمانیان بە منداڵ کرد هاوبەش بۆ خوا دانێن، ئەوا نابێ گوێڕایەڵیان بن! چونکە گوێڕایەڵی بوون لە شتێکدا نییە سەرپێچی خوای تێدابێت، هیچ پەیوەندیەکیش بەرزتر نییە لە پەیوەندی عەقیدە، وێڕای ئەمەش پێویستە لەسەر منداڵ چاکەکار بن لەگەڵ دایك و باوك و چاودێریان بکەن.

لەم ڕوانگەیەوە ئافرەتی موسڵمان هەمیشە چاکەکارە لەگەڵ دایك و باوکی، هەرکاتێك بوار هەبێت هەوڵدەدات بۆ بەختەوەرکردنیان و خۆشی و ئاسوودەیی خستنە ناو دڵیان لەو کارانەی خودا پێیڕازییە، ماوە ماوە لە حاڵیان دەپرسێ و خزمەتیان پێشکەش دەکات تا دڵیان خۆش بێت، زۆر سەردانیان دەکات و بە ڕووی خۆش و زەردەخەنە و دەروونێکی فراوان و دیاری جوان و دڵخۆشکەر و وشەی پاك و بەسۆز ڕوویان تێدەکات ـ ئەمە لە ژیانیاندا ـ لەپاش مردنیشیان چاکەکاری منداڵ بۆ دایك و باوکی بەردەوام دەبێت بە دوعاکردن و خێرکردن بۆیان و گێڕانەوەی ئەو قەرزەی لە ئەستۆیان بووە بەرامبەر بە خوا یان خەڵك.

چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك خوڕەوشتێکی ڕەسەنە لە خوڕەوشتی موسڵمانان، وە پێویستە ئەم خوڕەوشتە ڕەسەنە نایابە هەر بمێنی لە ژیانیان، هەرچەند ژیان توندبێت و خەرجی ژیان بەرزبێت و ئەرکی کارو بەرپرسیاریەتی زۆربێت" چونکە ئەم خوڕەوشتە بەڵگەیە لەسەر ئاودێری سۆز و بەزەیی کە هێشتا ماوە لە وڵاتی موسڵمانان، بەڵگەیە لەسەر ئەمەکداری کە موسڵمان دەبێ خۆی پێبرازێنێتەوە بۆ ئەو نەوە گەورە و خۆبەختکارانە، کە بە ئاڕاستەی کۆتایی ژیان دەچن و زۆر پێویستیان بە وشەی دڵنەوایی، گوفتاری نەرم و نیان، دەستی بەسۆز، دڵێك خۆشەویستی دەربڕێ، زەردەخەنەی ژیان بەخش بە هیواکان هەیە.

ئەم خوڕەوشتە مرۆڤ دەپارێزێ لە ڕەقبوونی دڵ، ووشکبوونی سۆز، تاریکایی کوفر و ڕقەکاری، لەپاڵ هەموویان دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە.

# ٤ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ هاوسەرەکەی

## هاوسەرگیری لە ئیسلام

هاوسەرگیری لە ئیسلام گرێبەستەیەکی پیرۆزە لە نێوان پیاو و ئافرەتدا، بەهۆیەوە بۆ یەکتری حەلاڵ دەبن و گەشتی ژیانێکی درێژ دەست پێدەکەن بە خۆشەویستی و هاریکاری و تەبایی و لێبوردەیی، هەریەك بۆ ئەویتر ئارامگەیە، لەو پێکەوە ژیانە ئارامی و دڵنەوایی و ئاسایش و هێمنی و چێژی ژیان وەدەست دێنن. قورئانیش ئەم پەیوەندییە شەرعیە بەرزەی نێوان پیاو و ئافرەتی لە تابلۆیەکی بەرز و ڕووندا نواندووە، تیایدا شەونمی خۆشەویستی و تەبایی و متمانە و لەیەکگەیشتن و سۆز و بەزەیی بڵاوە، بۆنی گوڵاوی ئەویندار و بەختەوەری و شادی و کامەرانی لێدەکرا " وەك دەفەرمووێ: ﴿وَمَن آيَاتِهِ أن خَلَقَكُم مِن أنفُسِكُم أزوَاجًا لِتَسكُنُوا إلَيهَا وَجَعَلَ بَينَكُم مَوَدَّةً وَرَحمَةً. واتا: یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکان لەسەر دەسەڵاتی ڕەهای خودا ئەوەیە لە خودی خۆتان هاوسەری بۆ هێناونە بوون تا لە تەکیا ئارامبگرن و لە نێوانتاندا ئەوپەری خۆشەویستی و بەزەیی و میهری داناوەو دروستکردووە﴾ الروم: ٢١.

ئەمە پەیوەندی خواییە لە بەهێزترین پەیوەندیەکانیدا، کە خودا لە نێوان دەروونی هەردوو هاوسەری موسڵمانی گرێدەدات، کە دەیانبینی لەسەر خۆشەویستی و لێك تێگەشتن و هاریکاری و ئامۆژگاری و دڵسۆزی بۆیەکتر بەیەك دەگەن و خێزانی موسڵمان دادەمەزرێنن، تیایدا قۆناغەکانی منداڵی دێتە بوون و ناوەرۆکی بیروهۆش دەکرێتەوە، دەروونەکانیش لەسەر ڕێنمایی خوڕەوشتی بەرز دادەڕێژرێتەوە کە ئیسلامی بێگەرد هێناویەتی، ئەوکاتە خێزانی موسڵمان دەبێتە بەردێکی پتەوی کۆمەڵگەی موسڵمانی تێگەیشتوو، تاکەکانیشی دەبنە ئەندامگەلێکی بەرهەمهێن و بنیاتنەر، لەسەر خێر و تەقوا و چاکە هاوکاری یەکتردەکەن، پێشبڕکێ دەکەن لە ئەنجامدانی کاری چاکە.

ئافرەتی چاکیش کۆڵەگەی خێزانی موسڵمانە، دیواری بەهێز و بنچینەی پتەویەتی، هەرئەویش ڕابواردن و خۆشی یەکەمە لە ژیانی پیاو، بەڵکو باشترین خۆشی و ڕابواردنە بۆی لە ژیان، وەك

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((دونیا ڕابواردن و خۆشییە، وە باشترین ڕابواردن و خۆشی دونیا ئافرەتی چاك و صالیحەیە)) صحیح مسلم ۱۰/۵٦.

ئافرەت بەخششی گەورەی خوایە لەسەر پیاو" چونکە ئارامگەی پیاوە لە ماندوێتی و شەکەت و ئازاری ژیان، لەلایەوە حەسانەوە و دڵسۆزی و ئارامی و ڕابواردنێك دەدۆزێتەوە کە هیچ ڕابواردن و خۆشیەکی ژیان نایگاتێ.

ئایا چۆن ئافرەت دەبێتە باشترین ڕابواردنی ژیان و هاوسەرێکی سەرکەوتوو؟ چۆن لە لوتکەی مێیانەکەیدا دەبێت و، خۆشەویست و بەرز و بەڕێز دەبێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە لە لاپەرەکانی داهاتووو روون دەکەینەوە:

## بەباشی هاوسەری هەڵدەبژێرێ

یەکێ لە ڕێزلێنانەکانی ئیسلام بۆ ئافرەت ئەوەیە مافی هەڵبژاردنی هاوسەری پێداوە، دایك و باوك بۆیان نییە زۆری لە کچەکەیان بکەن تا شوو بەیەکێ بکات بەدڵی نەبێت. ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتووش ئەو مافە دەزانێ، لەهەمان کاتدا دەستبەرداری ئامۆژگاری و ڕێنمایی وەرگرتن نابێ لە دایك و باوکی لەوەی بەرژەوەندی تێدایە کاتێ کەسێك داوای دەکات" چونکە دایك و باوك خاوەن ئەزمونن لە ژیان و شارەزاییان لەو زیاترە سەبارەت بە ژیان و خەڵك، کەچی ڕازیش نابێت ئەو مافەی لێزەوت بکرێ لەبەرخاتری ویست و ئارەزووی باوك، کە دەیبینی کچەکەی ناچاردەکات شووبکات بەیەکێ بەدڵی نییە!

دەقەکانی فەرمووودەش زۆرن کە لایەنگیری ئافرەت دەکەن لەم پرسە هەستیارە، لەوانە: بوخاری لە خەنسای کچی خیدام دەگێڕێتەوە" وتوویەتی: ((باوکم لە برازای خۆی مارەی کردم، منیش حەزم لێ نەبوو، سکاڵای ئەمەم بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وتم: ((ڕازی بە بەوەی باوکت کردوویەتی)) وتم: هیچ حەزێکم لەو کارەی باوکم نییە، فەرمووی: ((برۆ، مارەبییت نەهاتووە و شوو بەو کەسە بکە کە دەتەوێ)) وتم: ئێستا ڕازیبووم بەوەی باوکم کردوویەتی،

بەڵام ویستم ئافرەتان بزانن کە باوکانیان لەم بارەیەوە هیچیان بەدەست نییە بەرامبەر بە کچەکانیان)) فتح الباری ١٩٤/٩ وابن ماجه ٦٠٢/١.

دەبینین سەرەتا پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایی کرد تا فەرمانی باوکی پیادە بکات، ئەمەش بنچینە و بنەمایە، بەهۆی خەمی باوکان بۆ بەختەوەرکردنی منداڵەکانیان. بەڵام کاتێ بینی باوکی زۆری لێ دەکات، ئازادی پێدا لە هەڵبژاردن، ڕزگاریکرد لە چەپۆکی باوکی ستەمکار بۆ کچەکەی لە زۆرلێکردنی لەسەر شووکردن بە کەسێك پێی ڕازی نییە. چونکە ئیسلام سەختی و ناخۆشی ناخاتە ئەستۆی ئافرەت، ڕازی نییە لەگەڵ پیاوێك بژیێ کە خۆشی ناوێت، ئیسلام دەیەوێت پرۆسەی هاوسەرگیری سەرکەوتوو بێت و دامەزرێ لەسەر بنچینەی پتەو لە ڕووی لەیەك نزیکبوونی ئافرەتەکە و پیاوەکە لە ڕواڵەت و ناوەڕۆك، لە زەوق و باو و ئارەزووو و ئامانج و مەبەست. کاتێك درزێك بکەوێتە کۆشکی هاوسەرگیری و ژیان لەسەر خۆشیەکەی نێوانیان نەمایەوە و، ئافرەتەکە هەستی کرد ناتوانێ خۆشەویستی و دڵسۆزی وەفا ببەخشێتە مێردەکەی، ترسا لەوەی بکەوێتە تاوانی خراپەکاری و سەرپێچی بەرامبەر بەو مێردەی خۆشی ناوێت، بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات" خێزانی ثابت بن قیس کە ناوی جەمیلە بوو خوشکی عبداللە بن أبی بوو، هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هیچ گلەییەکم لە خوڕەوشت و ئاینی ثابت بن قیس نییە، بەڵام من لە ئیسلاما ڕقم لە بێ باوەڕی و کافر بوونە ـ مەبەستی ئەوە بوو ڕقی لەوەیە کە ئەگەر لەلای بمێنێتەوە بکەوێتە گوناهێك بەرەو بێ باوەڕی ببیات ـ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((باخچەکەی بۆ دەگەڕێنیتەوە)) ـ مارەییەکەی باخچەیەك بووە ـ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ناردی بە شوێن ثابت و فەرمووی: ((باخچەکەت وەرگرەوەو تەڵاقی بدە)) فتح الباری ٣٩٥/٩. لە گێرانەوەی بوخاری لە ابن عباسەوە دەڵێ: ((من گلەییم لە ثابت نیە نە لە ئاینی نە لە خوڕەوشتی، بەڵام ناتوانم لەگەڵیدا بژیم)).

ئیسلام مرۆڤایەتی ئافرەتی پاراستووە و ڕێزی گرت لە ویستی لە هەڵبژاردنی ئەو پیاوەی دەیەوێ ژیانی لەگەڵ بباتەسەر، ڕازینەبوو کەسێك هەرکێیەك بێت بەزۆری بەشووی بدات" بەریرە کە کەنیزەکێکی حەبەشی بوو لەژێر خاوەندارێتی عوتبەی کوڕی ئەبو لەهەب بوو، زۆری لێکرد

شووبكات بە كۆیلەیەك ناوی مُغیث بوو، كە حەزی نەدەكرد ئەم كۆیلەیە ببێتە مێردی ئەگەر بە ویستی خۆی بووایە. بۆیە خاتوو عائشە دڵی پێ‌سوتا و كڕیەوە و ئازادی كرد. ئەوكاتە ئەم كەنیزەكە هەستی كرد خۆی خاوەنی خۆیەتی، دەست نیشانكردنی چارەنووسی هاوسەرگیری خۆی بە دەست خۆیەتی، بۆیە داوای جیابوونەوەی كرد لە مێردەكەی. پاش ئەم داواكاریە مێردەكەی لە دواوەی دەرۆیشت و دەگریا، ئەمیش پشتی تێكردبوو و نەیدەویست، پێغەمبەری دڵ گەورەش فەرمووی بە عباس: ئەی عباس سەیرت نایێ لە خۆشەویستی مغیث بۆ بەریرەو لە ڕقی بەریرەش بۆ مغیث؟!)). بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە بەریرە: ((ئەگەر بكرێ بگەڕێیتەوە لای)). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانم پێدەكەی؟ فەرمووی: ((نەخێر بەڵكو تكاكارم)) وتی: هیچ پێویستیم پێی نییە و حەزم لێی نییە.

پێغەمبەر ﷺ بەم دیمەنە مرۆییە پڕ لە سۆزە زۆر كاریگەربوو: خۆشەویستیەكی قووڵ و بە لێشاو لەلایەنی مێرد، بێزاری و ڕازی نەبوونیش لەلایەنی ئافرەت، لێرەدا پێغەمبەر ﷺ هیچی بەدەست نەبوو بێجگە لەوەی بڵێ: ئەگەر بكرێ بگەڕێیتەوە لای" چونكە ئەو مێردتە و باوكی منداڵتە. لێرەدا ئەم ئافرەتە باوەڕدارە دەیەوێت تێبگات: ئایا فەرمانم پێدەكەی؟ واتا ئەگەر فەرمانە، پێویستە لەسەرم پیادەی بكەم؟ وەڵامی پێغەمبەری مرۆڤی مامۆستا و یاسادانەری مەزن دێت: ((بەڵكو تەنها تكاكارم)) واتا مەبەستم فەرمان و زۆر لێكردن نییە!

دەی با باوكە دڵڕەق و ستەمكار و سالارەكان لەسەر كچەكانیان گوێبیستی ئەم ڕێنمایی مەزنەی پێغەمبەر ﷺ بن!!

ئافرەتی موسڵمانی هۆشیار بە ئاینەكەی پێوەرگەلێكی ئامانجگر و پتەو و تۆكمەی هەیە لە هەڵبژاردنی هاوسەر، تەنها جوانی ڕواڵەت و ڕێك و پێكی دیمەن و بەرزی پۆست و دیاردەكانی هەبوونی و دەوڵەمەندی و خاسیەتەكانی‌تری كە وەك باوە هەندێ لە ئافرەتان پێوەی فریو دەدرێن بەس نییە، لە ئاست ئاین و خوڕەوشتی دەوەستێ" چونكە ئەم دووانە كۆڵەگەی ماڵی هاوسەری سەركەوتووە، بەهادارترین خشڵە كە مێرد پێوەی برازێتەوە" وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ئەگەر كەسێك هاتە خوازبێنی كچەكانتان، لە ئاین و خوڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا بیدەنێ، ئەگەر

وانەکەن فتنە و گەندەڵیەکی بەرفراوان لە زەوی بلاّودەبێتەوە)) الترمذي ٢٧٤/٢ وابن ماجه ٦٣٣/١.

وەك چۆن کوڕی موسڵمانی ڕاستەقینە ناخەڵەتێ بە چیمەنێکی سەوز کە لەسەر گۆماو و گوفەك و چڵپاو سەوزبووە کە ئاماژەیە بۆ ئافرەتی جوان لە ماڵێکی خراپ پەروەردە بووبێ، بەهەمان شێوە کچی موسڵمانی هۆشیار و تێگەیشتوو ناخەڵەتێ بە گەنجی سەرشێت و ئارەزووپەرست و دەبەنگ و بێهۆش، ئەگەرچی دیمەن و شێوەی جوان و سەرنج ڕاکێشەر بوو، بەڵکو ڕازییە بە گەنجی باوەڕدار و ڕاستگۆ، کە هۆشیار و هزر کراوەیە، دەروونی بێگەردە، ڕابردووی پاکە، ئاین و ڕەوشت و ژیانی چاك و پاکە" کچی باوەڕداری چاك هەر شایانی کوڕی باوەڕدار و چاکە، کچی خراپ و سەرلێشێواویش هەر شایانی کوڕی خراپ و سەرلێشێواوە" الله دەفەرموووێ: ﴿الخَبِيثَاتُ لِلخَبِثِينَ وَالخَبِيثُونَ لِلخَبِيثَاتِ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ. واتا: ئافرتانی پیس بۆ پیاوانی پیسن و پیاوانی گەندەڵ و پیسیش بۆ ئافرەتانی پیس و گەندەڵن، ئافرەتانی پاکیش بۆ پیاوانی پاکن و پیاوانی پاکیش بۆ ئافرەتانی پاکن...﴾ النور: ٢٦.

ئەمە واتای ئەوەنییە ئافرەتی موسڵمان لایەنی شێوە و ڕواڵەت ڕێك و پێکی فەرامۆش بکات، بە شپرێوی و ناشیرینی و نارێکی شێوە ڕازی بێ! مافی خۆیەتی بە پیاوێك ڕازی بێت پڕ بە دڵی بێت، هەست و نەستی ڕازی بکات لە شێوەی و ناوەڕۆکی، کەواتە شێوە فەرامۆش ناکات لەسەر حیسابی ناوەڕۆك، باشترین شت لەم کێشەیە ئەوەیە ئافرەتی موسڵمان ئەو کەسە هەڵبژێرێ کە کەسایەتیەکەی بە تەواوی دڵی پڕبکات، جێگای ڕەزامەندی و ڕێزی بێت، ئافرەتی موسڵمانی هۆشیار بە بریسکە و بریقەی ڕواڵەت چاوی نابەسترێ لە بینینی ڕاستەقینە و ناوەڕۆك.

ئافرەتی موسڵمان دەزنێ پیاو مافی بەرێوەبردنی خۆی و ماڵ و منداڵی لە ئەستۆدایە بەپێی دەقی قورئان: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَآء بِمَا فَضَّلَ اللهُ بَعضَهُم عَلَى بَعضٍ وَبِمَا أنفَقُوا مِن أموَالِهِم ....واتا: پیاوان بەرێوەبەر و سەردارن لەسەر ئافرەتان بەهۆی ئەوەی فەزڵی هەندێکی داوە بەسەر ئەوانیتر و بەهۆی خەرجکردنی ماڵەکانیان...﴾ النساء: ٣٤.

بۆیە حەزدەکات بگوێزرێتەوە بۆ پیاوێك کە شانازی بە سەرداریيەکەی دەکات بۆی، بەختەوەر دەبێت بە هاوسەرگیرییەکەی و پەشیمان نابێتەوە. ئافرەتی موسڵمان پیاوێکی دەوێت دەستی لەناو دەستی دابنێت، تا بەیەکەوە ڕاپەڕن بۆ گەیاندنی پەیامەککەیان لە ژیان، لە دروستکردنی خێزانی موسڵمان، پێگەیاندنی نەوەی پاك، پەروەردەکردنی هۆش و دڵ و هەستی کراوە، لە کەشێکی گونجاو و پڕ لە خۆشەویستی و لەیەکگەیشتن، نابێ بهێڵێ خاسیەتی ناشیرین، یا دژە حەز و ئارەزووو، یا جیاوازی لە ڕەفتار، یا ناکۆکی لە ئاین، ڕێ بە کاروانەکەی بگرێ" چونکە کەژاوەی پیاوی باوەڕدار و ئافرەتی باوەڕدار لە تەك یەکتری دەروات لە گەشتی ژیانێکی پڕ لە باوەڕ و ڕاستەقینە، بۆ گەیاندنی پەیامە مەزنەکەی خوا کە کردوویەتیە سپاردە لە گەردنی پیاوان و ئافرەتان، بەم شێوەیەی قورئان وێنای کردووە، وەك دەفەرمووێ لە سورەتی الاحزاب: ٣٥ پێشتر ڕاڤەکراوە.

بۆ بێ‌وەیی ئەم کاروانە و گەیشتنی بەم ئامانجە گەورە پێویستی بە پەیوەندی توندوتۆڵی هاوسەری، دامەزراوی کۆڵەگەکانی خێزان و دروستکردنی لەسەر بنەمای ساغ لە ڕەفتاری جوان و بەرزی ئامانج و دووربینی لە هەڵبژاردنی هاوسەر" ئوم سولەیم لە خێراترینی ژنانی یاریدەدەران بوو بۆ ئیسلام، پێشتر خێزانی مالك بن النضر بوو، کە ئەنەسی کوڕی لێبووە، کاتێ موسڵمان بوو مالك ڕازی نەبوو و لە ڕقانا جێی هێشت، ئوم سولەیمیش سووربوو لەسەر ئیسلامەتیەکەی. پاشان مێردەکەی مرد، لەوکاتە ئوم سولەیم لە هەڕەتی لاوێتی دابوو. لەسەر هەموو ئەمانە ئارامی گرت بە ئومێدی پاداشتی خوایی، خۆی یەکالاکردەوە بۆ کوڕەکەی ئەنەس، کە تەمەنی ١٠ ساڵان بوو، بردی بۆلای پێغەمبەر ﷺ تا لە خزمەتی دابێت.

چاکترین لاوی مەدینە هاتە داوای، لاوێکی بەهێزو دەوڵەمەند و دلێر، کە (ئەبو تەڵحە) بوو پێش ئەوەی موسڵمان بێت. ئەم پیاوە بەهۆی ماڵ و گەنجێتی و هێزەکەی سوارچاکی خەونی کچەکانی یَثریب بوو، ئەبو تەڵحە وایزانی ئوم سولەیم لە خۆشیانا باڵدەگرێ کاتێ بچێتە خوازبێنی، بەڵام تووشی سەرسامی بوو کاتێ پێیوت: ئەی ئەبا تەڵحە، ئایا تۆ دەزانی ئەو خوایەی دەیپەرستی، دارێکە و لە زەوی سەوزدەبێت، وە فلانە حەبەشی تاشیوویەتی؟ وتی: بەڵێ،

وتی: ئایا شەرم ناکەی کڕنووش بۆ دارێك دەبەی حەبەشیەك تاشیبێتی؟ ئەبو تەڵحە لافی لەسەر لێدا و ئاماژەی بۆکرد بە مارەییەکی زۆر و ژیانێکی دەوڵەمەند و خۆش. بەڵام ئوم سولەیم لەسەر هەڵوێستی خۆی سووربوو و بە ڕاشکاوی پێیوت: سوێند بەخوا ئەی ئەبا تەڵحە هی وەك تۆ ڕەتناکرێتەوە، بەڵام تۆ پیاوێکی بێ باوەڕی و منیش ئافرەتێکی موسڵمانم، ناشێ شوت پێبکەم، ئەگەر موسڵمان دەبیت ئەوە موسڵمان بوونت مارەییەکەمە و هیچیترت لێداوا ناکەم. النسائی ٦/١١٤.

لە ڕۆژی دووەم هاتەوە مارەییەکی گەورەتر و بەخششێکی زۆرتری پێشکەش کرد، ئوم سولەیمیش هەر لەسەر هەڵوێستی خۆی بوو، ئەم نەگۆڕانەی ئوم سولەیم زیاتر لەبەرچاوی ئەبو تەڵحە جوانتر و سەرنج ڕاکێشەرتر و ژیرتر نیشاندا، ئوم سولەیم وتی: ئەی ئەبا تەڵحە نازانی ئەو خوایەی ئێوە دەیپەرستن فلانە کۆیلەی بەرەی فلانە دارتاش دەیتاشێ؟ وە ئەگەر ئێوە ئاگری تێبەربدەن دەسوتێ؟ ئەم وشەیە وەکوو ڕاچڵەکینێك بوو و هەستی ئەبا تەڵحەی هەژاند، پرسیاری لە خۆی کرد: ئایا خودا دەشێ بسوتێ؟ بۆیە یەکسەر وتی: اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله، لێرە ئوم سولەیم بە کوڕەکەی ئەنەسی وت، لەوکاتەی هەموو گیانی پڕە لە شادی و خۆشی: هەڵسە ئەنەس مارەبڕینم لە ئەبا تەڵحە ئەنجامبدە، ئەنەسیش گەواهیدەرەکانی هێناو، مارەبڕینەکە ئەنجامدرا.

ئەبا تەڵحە لە خۆشیانا هەموو سامانەکەی لەبەردەستی ئوم سولەیم هەڵڕێژت، بەڵام ئوم سولەیم وەکوو ئافرەتێکی باوەڕداری بەرزی ڕاستگۆی پاك و بێگەرد پێیوت: ئەی ئەبا تەڵحە، من بۆ خوا شووم پێتکرد، بێجگە لەمەش هیچ مارەییەکیتر وەرناگرم. ئوم سولەیم دەیزانی بەو شووکردنەی تەنها ئەوە نییە مێردێکی دەستکەوێت، بەڵکو پاداشتی خوایی دەستکەوت" وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: (( ئەگەر خودا بەهۆی تۆوە یەك پیاو ڕێنمایی بکات چاکتر و گەورەترە بۆت لە حوشتری سوور)) فتح الباری ٧/٤٧٦.

ئەم جۆرە ئافرەتە مەزنانە سەرمەشقی ئافرەتی موسڵمانە، هەر لەوانەشەوە بێگەردی باوەڕی، هێزی کەسایەتی، ساغ و سەلامەتی بیروباوەڕ، چاك و جوان هەڵبژاردن وەردەگرێ.

## گوێڕایەڵ و چاکەکارە لەگەڵ هاوسەری

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتو هەمیشە گوێڕایەڵە بۆ مێردەکەی و سەرپێچی ناکات، چاکەکارە لەگەڵی، هەوڵی ڕازیکردن و خۆشی خستنە دڵی دەدات، ئەگەرچی هەژار و کەم دەرامەتیش بێت، هەرگیز بێزاری دەرنابڕێ لە کەمی رزق و رۆزی، ئاخ و ئۆف ناکات لەبەر کاروباری ناوماڵ، هەمووکات کۆمەڵێك لە ئافرەتانی چاکی مێژووی ئیسلامی لەیادە کە نمونەی ئارامگرتن و چاکسازی و مەردایەتی بوونە و لە خزمەتی مێرد و منداڵدابوونە، وێڕای نەبوونی و تەنگی ژیان. لە پێشەنگی هەموویانەوە خاتوو فاتیمەی زەهرا کچی پێغەمبەر ﷺ و خێزانی عەلی بن ابی تالیب ﷺ کە سکاڵای ئازاری دەستی دەکرد بەهۆی دەستاڕەوە، ڕۆژێکیان عەلی پێی وت: ئەوە باوکت بەهۆی منەوە هات، بڕۆ لای و داوای خزمەتکارێکی لێبکە. فاتیمە چووە لای باوکی، بەڵام لە شەرمانا نەیتوانی داوای لێ بکات، بۆیە عەلی چوو داوای خزمەتکارێکی لێکرد بۆ فاتیمەی کچە خۆشەویستی، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەیتوانی بەدەم داواکارییەکەیان بێت و هەژارانی موسڵمانانیش لێی بێبەش بن، بۆیە هاتە لای کچەکەی و مێردەکەی و فەرمووی: ((شتێکتان فێربکەم باشتربێ لەوەی داواتان کرد؟ کاتێ چوونە سەر جێگاتان شەو بۆ نووستن، ٣٣ جار بڵێن سبحان الله، ٣٣ جار الحمد لله، ٣٤ جار الله اكبر، ئەمە بۆتان باشترە لە خزمەتکارێك)) پاشان ماڵئاوایی کرد و ڕۆیشت، پاش ئەوەی ئەم یارمەتییە خواییەی کە ماندووبوون لەیاد دەباتەوە و سەختیەکان دەبەزێنێ، چەسپاندی لەناو ناخی دەروونیان. عەلی ﷺ بەردەوام ئەم ووشانەی دووبارە دەکردەوە و دەیوت: سوێند بەخوا لەوەتەی پێغەمبەر ﷺ ئەم زیکرەی فێرکردوومە وازم لێنەهێناوە، یەکێ لە هاوەڵان لێی پرسی: هەتا شەوی صیففینیش؟ وتی: هەتا شەوی صیففینیش لە یادم نەکردوو. فتح الباري ٧١/٧ ومسلم ٤٥/١٧.

بوخاری و مسلم لە ئەسمائەوە دەگێڕنەوە: ((کاتێ زوبەیر منی خواست، لەسەر ڕووی زەوی نە پارە نە کۆیلە هیچی نەبوو بێجگە لە ئەسپەکەی. دەڵێ: من ئالیکم دەدا بە ئەسپەکەی، لە جیاتی ئەو ئالیکم بۆ دابین دەکرد و خزمەتیم دەکرد، ناوکی خورماشم دەکوتا و وەکوو ئالیك پێیم دەدا، ئاوم دەکێشایەوە، گۆزەییم بۆ چاك دەکردەوە، هەویرم دەکرد، بەڵام نەمدەزانی جوان نان بکەم، هەندێ لە دراوسێکانم بۆیان دەکردم، کە ئافرەتی ڕاستگۆ و دڵسۆزبوون. دەڵێ: ناوکە

خورمام لەسەر سەرم هەڵدەگرت لە زەوی زوبەیر کە پێغەمبەر ﷺ بۆی دابڕیبوو دەمهێنایەوە بۆ ماڵەوە کە دووسێیەکی فەرسەخ لێمان دووربوو ـ کە دەکاتە نزیکەی ٦ کیلۆمەتری ئێستا ـ، ڕۆژێکیان دەهاتمەوە و ناوکە خورماشم لەسەر سەربوو، لە ڕێگا گەیشتم بە پێغەمبەر ﷺ کە هەندێ هاوەڵی لەگەڵدا بوو، بانگی کردم و پاشان حوشترەکەی ییخ کرد تا لەسەر پشتی هەڵمگرێ. ئەسما دەڵێ: لەلایەك شەرمم کرد و لەلایەکیش غیرەی تۆم هاتەوە یاد ئەی زوبەیر. زوبەیر وتی: سوێند بەخوا هەڵگرتنی ناوکە خورما لەسەر سەرت زۆر سەختترە لەلام لە سواربوونت لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، ئنجا ئەسما دەڵێ: ئەمە حاڵم بوو تا ئەوکاتەی ابوبکر ﷺ خزمەتکارێکی بۆ ناردم و خزمەتکردنی ئەسپەکەی لە کۆڵ کردمەوە، وەك بلێی کۆیلە بووم و ئازادی کردم هێندە باڵم سووك بوو)) فتح الباری ٣١٩/٩.

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ بەدڵسۆزیەوە خزمەتی ماڵ و مێردی دەکات" چونکە دەزانێ مافی مێردی لەسەری چەندە مەزنە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ناگونجێ مرۆڤ کڕنووش ببات بۆ مرۆڤ، ئەگەر بگونجایە بۆ مرۆڤ کڕنووش ببات بۆ مرۆڤ، ئەوا فەرمانم دەکرد ئافرەت کڕنووش بۆ مێردەکەی ببات لەبەر گەورەیی حەق و مافی مێردی لەسەری)) رواه البزار واحمد (مجمع الزوائد ٤/٩).

خاتوو عائشە لە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری کرد: کێ لە هەموو کەس مافی گەورەترە لەسەر ئافرەت؟ فەرمووی: ((مێردەکەی)) وتی: ئەی کێ لە هەموو کەس مافی گەورەترە لەسەر پیاو؟ فەرمووی: ((دایکی)) البزار (مجمع الزوائد ٣٠٨/٩).

ئافرەتێك بۆ پێویستیەکی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، کاتێ لە پێویستیەکەی تەواوبوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووو: ((ئایا مێردت هەیە؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((باشە چۆنی بۆی؟)) وتی: کەمتەرخەمی ناکەم لە مافەکانی مەگەر لە توانام دانەبێ. فەرمووی: ((بزانە تۆ لە چ ئاستێکی ئەوی یاخود تا چەندە لە جێی ڕەزامەندی ئەودای، چونکە مێردت بەهەشت و دۆزەختە)) رواه احمد والنسائی والحاکم (الترغیب والترهیب ٥٢/٣).

ئایا کاتێ ئافرەتی موسڵمان ئەمانەی گوێ لێدەبێ دەتوانێ ئاخ و ئۆف بکات لە خزمـەتکردنی مێردی؟ نەخێر، بەڵکو بە دەروونێکی پڕ لە خۆشی و شادی بـە ئـەرکی مـاڵ و چـاودێری کردنـی مافی مێردی هەڵدەستێ" چونکە هەست دەکات ئەوەی دەیکـات ئـەرکێکی قـورس نییـە لەسـەر دەروونی مرۆڤ و بە سەختی نازانێ، بەڵکو پاداشتی خوایی لێ دەستدەکەوێت.

هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان ئەم ئەدەبە ئیسلامیەیان زانیوە" زانای حەنبەلی (ابن الجـوزي) لـە کتابەکەی احکام النساء (ص۲۳۱) دەگێڕێتەوە: پیاوێکی چاکی ڕۆژووگری شەونوێژکار لە پیـاوانی سەدەی دووی کۆچی ناوی (شوعەیب بن حەرب) بووە، ویـستی ئافرەتێـك بخـوازێ، بـە گیـانێکی تەوازوعەوە پێیوت: من پیاوێکی خوڕەوشت خراپم. ئافرەتەکـە زۆر بەدانابیـەوە وتـی: لـە تـۆش خراپتر ئەو کەسەیە کە ناچاری کردووی خوڕەوشتت خراپ بێت. ئەو کاتە شوعەیب زانی لەبەردەم ئافرەتێکی تێگەیشتووی ژیر دایە، بۆیە یەکسەر وتی: کەواتە تۆ خێزانی منی.

ئەمەیە تێروانینی ژیرانە و هۆشیارانە سەبارەت بە بوونی هاوسەرێتی چـاك، کـە ئـەم ئافرەتـە پەی پێبردبوو، ئەوەتا بۆ کابرای داخوازیکار دوپات دەکاتـەوە کـە ئەگـەر ئـافرەت لـە چـۆنیەتی خاسیەت و دەروونی مێردی تێگەیشت، باو و خوڕەوشتەکانی زانـی، بـۆی روونبوویـەوە چ شـتێك ڕازی دەکات و چیش نیگەرانی دەکات، ئەو کاتە دەتوانێ دڵی بۆ خۆی ڕاکێشێ و ببێتـە جێگـای بەختەوەری و ڕیزی، هەر درزێك بای ناکۆکی لێ بێتەدەر دایدەخا و نایەڵێ بێگـەردی ژیـانی لـێڵ بکات، هەر ئافرەتێکیش هەست بەم ڕاستیانە نەکات نابێتە هاوسـەرێکی سـەرکەوتوو، لەوانەشـە بەهۆی دەبەنگی و بێهۆشی و نەفامی و کەمتەرخەمیەکەی مێردەکـەی بـەرەو خوڕەوشـت خراپـی ڕاکێشێ، ئەو کاتە مێردەکەی لە خـۆی ڕەفتـار ناشـیرینتر دەبـێ" چـونکە ئـەو ناچـاری کـردووە خوڕەوشتی نالەبار و خراپ بێت.

ئافرەتی موسڵمانی خاوەن خوڕەوشتی جوان و هۆشیار ئاوەها دەبێت، بـەڵکو دەبێتـە پاڵپـشتی مێردی بۆ جوانکردنی خوڕەوشتی، بەهۆی دەرخستنی نمونەی ژیـری و دانـایی لـە مامەڵـەکردن و ڕەفتاری جوان کە کلیلەکانی دڵـی بـۆ دەبێتـەوە، دەروون بـۆی نـەرم دەبێـت ، ئـەم خوڕەوشـتانە سەرچاوە دەگرن لەوەی بە هاوسەری بوونی چاك تەنها خوڕەوشتێکی کۆمەڵایەتی نییە کە لە نێوان

هاوڕێکانی خۆی پێ دەرخا، بەڵکو ئاینێکە و خودا لەبارەیەوە لێی دەپرسێتەوە، ئەگەر چاك بێت پاداشتی دەداتەوە، ئەگەریش کەمتەرخەم بێت سزای خۆی وەردەگرێت.

لە دیارترین شێوەکانی گوێڕایەڵی بوونی ئافرەت بۆ مێردی و چاکەکردن لە گەڵی ئەوەیە بێت بەدەم داواکاری حەزە تایبەتی و شەرعیەکانی کە تیایدا بە تەواوترین شێوە ڕادەبوێرێ و خۆشی دەبینێ لە ژیانی هاوسەرێتی و تەواوترین وێنەیە لە وێنەکانی پێکەوە ژیان و سەردان و خواردن و جل و بەرگ و قسەکردن.. تا کۆتایی شێوەکانی ژیانی ڕۆژانە. جا هەرچەندە بەدەمەوە چوونی ئافرەت لەم کارانە زیاتربێت، زیاتر ژیانیان بەختەوەر و ئارام و بێگەرد دەبێت، زۆرتر نزیك دەبنەوە لە کرۆك و مەبەستی ئیسلام و پەیامەککەی.

ئەوەش لەلای ئافرەتی موسڵمان شاراوە نییە کە گوێڕایەڵی بوونی بۆ مێردی لەو هۆکارانەن کە دەیخەنە بەهەشتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەگەر ئافرەت هەر پێنج نوێژی بکات، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت، گوێڕایەڵی مێردی بکات، دامێنی بپارێزێ، لە ڕۆژی قیامەت پێی دەوترێ: بڕۆ بەهەشتەوە لەکام دەرگا خۆت حەزی پێدەکەی)) رواه احمد والطبراني (مجمع الزوائد ٤/٣٠٦).

ئوم سەلەمە دەڵێ: ((هەر ژنێك مێردی بمرێ و لێی ڕازی بێت، ئەو ژنە دەچێتە بەهەشت)) ابن ماجه ١/٥٩٥ والحاكم ٤/١٧٣).

پێغەمبەر ﷺ تابلۆیەکی ڕۆشنی پرشنگداری خۆشەویست دەکێشێ بۆ ئافرەتی چاکەکار و گوێڕایەڵ و نەرم و نیان و خوڕەوشت جوان، کە بەختەوەری دونیا و دواڕۆژی تیایە" وەك دەفەرمووێ: ((ئایا هەواڵی ژنەکانتان بدەمێ لە بەهەشت؟ وتمان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەو ئافرەتەیە زگ و زار دەکات، نەرم و نیان و خۆشەویستە، ئەگەر توڕەبێ، یا خراپەی لەگەڵدا بکرێ، یا مێردی توڕە ببێ، دەڵێ: ئەمە دەستی منە لە دەستی تۆ، چاوم ناخەمە خەو تا ڕازی نەبیت)) رواه الطبراني (مجمع الزوائد ٤/٣١٢).

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو دەزانێ ئەو ئیسلامەی پاداشتی دەداتەوە لەسەر گوێڕایەڵی بوونی بۆ مێردی و دەیخاتە بەهەشت، هەر ئەویشە هەڕەشە دەکات لەو ئافرەتانەی لادەدەن لە گوێڕایەڵی کردنی مێردیان و، پشتی تێدەکەن و فەرامۆشی دەکەن، هەڕەشەیان لێ دەکات بە ڕووبەڕووبوونەوەی گوناه و خەشم و نەفرەتی فریشتەکان: لە صحیحی مسلم و بوخاری لە ئەبو هورەیرە هاتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر پیاو بانگی خێزانەکەی بکات بۆ سەر جێیی و بە گوێی نەکات و نەیەت، وە بەهۆیەوە پیاوەکە بە تووڕەیی و نیگەرانی بخەوێ، ئەوا فریشتەکان نەفرەتی لێدەکەن تا بەیانی دادێت)) فتح الباری ٢٩٤/٩ ومسلم ٨/١٠.

لە صحیحی مسلم لە ئەبو هورەیرە هاتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، هەر پیاوێك بانگی ژنەکەی بکات بۆ سەر جێیی و بە گوێی نەکات، ئەوا خودا لێی زویر دەبێت و ڕازی نابێت تا ئەو کاتەی مێردەکەی لێی ڕازی دەبێت)) مسلم ٧/١٠.

ئەم نەفرەتە هەموو ئافرەتێکی سەرپێچی کار و سەرسەخت دەگرێتەوە، هەروا ئەوانەش دەگرێتەوە کە سست و کەمتەرخەمی دەنوێنن و پیادەکردنی فەرمانی مێردەکانیان دوادەخەن. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((نەفرەتی خوا لەو ئافرەتانە بێت کە مێردی بۆ سەرجێیی بانگی دەکات، دەڵێ: دوایی، تا ئەو کاتەی خەو بەسەر چاوەکانی زاڵ دەبێت)) رواه الطبراني (مجمع الزوائد ٢٩٦/٤).

هاوسەرگیری لە ئیسلامدا بۆ پاراستنی پیاو و ئافرەتە، لەم ڕوانگەوە پێویستە ئافرەت بەدەم داواکاری و حەزی مێردی بچێت کاتێ داوای لێ دەکات، پاساوی خەیاڵی و دوور لە ڕاستی ناهێنێتەوە تا لە کۆڵی خۆیی بکاتەوە، بەڵکو بەپێی توانا بەدەم داواکاریەکانی دەچێت، ئەگەرچی کار و پێگری زۆریشی هەبوو، مەگەر پاساوێکی زۆر بەهێز بێت کە دەستبەرداربوون لێی مەحاڵ بێت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەر کاتێ پیاو بانگی هاوسەرەکەی خۆی کرد بۆ سەر جێیی بابچێ بەدەمیەوە تەنانەت ئەگەر لەسەر پشتی حوشتریش بێت)) رواه البزار (مجمع الزوائد ٣١٢/٤).

پاراستنی پیاو و دوورخستنەوەی لە خراپە و فتنە لە گرنگترین کارەکانی ئافرەتە" چونکە ئیسلام دەیەوێت پیاو و ئافرەت بەیەکەوە لە گەشتێك بژین هەمووی پاکی و بێگەردی و خاوێنی بێ و دوور لە هەرچی شوێنەواری ئاشوب و خراپی و ڕووکردنە چێژی حەرامە. وە هیچ شتێك کڵپەی حەز ناکوژێنێتەوە، خەیاڵی مەیلکردن بۆ حەرام دەرناکات، بێجگە لە بەتاڵکردنی وزەی سروشتی ئەم حەزە لە شوێنی حەڵاڵ و سروشتی شەرعی خۆی. مسلم لە جابر ﷺ دەگێڕێتەوە لە باب النکاح: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر یەکێکتان لە دەرەوە ئافرەتێکی چووە دڵی، با بێتەوە لای خێزانی خۆی و سەرجێیی لەگەڵ بکات، چونکە ئەم کارە ئەوەی لە دڵیەتی ناهێڵێ و دەردەکات)) مسلم ۱۷۸/۹.

هەڕەشەی خودا بۆ ئەو ئافرەتەی مێردی لێی ڕازی نییە زیاتر دەبێ، تا دەگاتە ڕادەیەك دڵی هەموو ئافرەتێکی پارێزکار کە بە ئومێدی بەزەیی خوا و ڕۆژی دواییە بۆی ڕادەچڵەکێ" چونکە جابر بن عبدالله ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: فەرموویەتی: ((سێ کەس نوێژیان وەرناگیرێ و هیچ چاکەیەکیان بەرزنابێتەوە بۆ ئاسمان: کۆیلەی هەڵاتوو تا دەگەرێتەوە بۆلای گەورەکانی و دەستی دەخاتە ناو دەستیان. وە ئەو ئافرەتەی مێردی لێی تورە و ناڕازییە تا ڕازی دەبێت. هەروا سەرخۆش تا دێتەوە هۆش)) ابن حبان ۱۷۸/۱۲.

مەبەست لە تورەیی مێرد لە ژنەکەی ئەوەیە کاتێ پیاوەکە لەسەر حەق بێ و ژنەکە پێچەوانە بێت. بەڵام ئەگەر مێرد ستەمکاربوو ئەوا تورەییەکەی زیانی پێناگەیەنێ، بەڵکو خودا پاداشتی ئارامگرتنەکەی دەداتەوە، داواشی لێدەکرێ بەجوانی گوێڕایەڵی مێردی بکات ئەگەر گوێڕایەڵی بوونەکەی لە سەرپێچی خودا دانەبێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەر ئافرەتێك باوەڕی بەخوا هەبێ نابێ ڕێگە بە کەسێك بدات بێتە ماڵی لە کاتێك مێردی ناڕازییە، ناچێتەدەر ئەگەر مێردی ناڕازی بێت، بە گوێی کەسێك ناکات مێردی ڕازی نەبێت، جێگای لەگەڵ جیاناکاتەوە، لێی نادات، ئەگەریش ئەو ستەمی لێکرد با بچێتەوە لای تا ڕازی دەکات، ئەگەر وەری گرت و ڕازی بوو چاکە، خودا پاساوەکەی وەردەگرێ و سەرکەوتوو و بەڵگە بەهێز دەبێ، هیچ تاوانێکی

لەسەر نابێ، بەڵام ئەگەر ڕازی نەبوو، ئەوا پاساوەکەی لەلای خوا گەیشتۆتە شوێنی خۆی)) الحاكم ٢/١٩٠.

یەکێکیتر لە گوێڕایەڵی و چاکەکاری ئافرەت بۆ مێردەکەی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((ناشێ بۆ ئافرەت ڕۆژووی سونەت بگرێ و مێردەکەشی ئاگادارە بێڕەزامەندی ئەو، ڕێگە بەکەس نادات بێتە ماڵی ئەگەر ڕازی نەبوو، وەهەر شتێك لە دەستکەوت و ماڵی پیاوەکەی خەرج بکات بێ فەرمانی ئەو، ئەوا نیوەی پاداشت و خێرەکەی بۆ پیاوەکەیە)) فتح الباری ٩/٢٩٥.

هەمووی لەسەر ڕەزامەندی مێرد دەوەستێ، ئەگەر لە ماڵی مێردی وەکوو صەدەقە و خێر ببەخشێ بەبێ ڕەزامەندی ئەو، ئەوا هیچ پاداشتێکی بۆ نییە، بەڵکو گوناهیشی دەگات، وە ئەگەر ویستی بێ ئاگاداری ئەو لە ماڵی خەرجبکات و خێربکات و دەیزانی ئەگەر مێردەکەی لەوکاتە ئاگاداربووایە ڕێگای دەدا و ڕازی دەبوو، ئەوا دروستە، ئەگینا بە جۆریتر دروست نابێ. چونکە لەیەك تێگەیشتن و گونجان لە نێوان دوو هاوسەردا نایێتەدی مەگەر بە هاریکاری و هەماهەنگی نێوانیان نەبێت لەم جۆرە کارانەدا، هەتا هیچ لایەك زیان و هەراسان و تەنگی دوچاری نەبێ، کە خۆشی ژیانی هاوسەرایەتیان لێتێك بدات، کە ئیسلام لەسەر خۆشەویستی و سۆز دایمەزراندووە و حەزدەکات هەمیشە خۆش و پارێزراو و گونجاوبن.

بەڵام ئەگەر مێرد چروك بوو، ڕەزیلی کرد لە خەرجیکردن لە خۆیىو منالەکانی، ئەوا: هندی کچی عوتبە خێزانی ابو سفيان هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێیوت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەبو سوفیان پیاوێکی چروکە، هێندەم ناداتێ بەشی خۆم و کوڕەکەم بکات، مەگەر بەبێ ئاگاداری ئەو لێی ببەم. فەرمووی: ((ئەوەندەی بەشی خۆت و کوڕەکەتە ببە بەچاکە)) متفق عليه. شرح السنه ٩/٣٢٧.

بەمەش ئیسلام کردیە بەرپرس لە بەچاکە ڕەفتارکردن لە بەرێوەبردنی ماڵ.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر پەی دەبات بەو بەرپرسیاریەتیەی خراوەتە ئەستۆی لەلایەن ئیسلامەوە بە چاودێریکردنی بۆ ماڵ و مێرد و منالی، کردوویەتیە پارێزکار و شوان و چاودێر

لەسەرماڵی مێردی و منداڵی، وە بەتایبەتی ناوی بردووە، وەکوو ڕێزلێنانێك بۆی لە بەرگەگرتنی بۆ هەڵگرتنی ئەم بەرپرسیارەتیە.

ئافرەتی موسڵمان هەمووکات خاسیەتی وایە دڵنەرمە بەرامبەر منداڵەکانی و چاودێرە بۆ مێردەکەی، ئەوانە دوو خاسیەتی جوانن کە ئافرەت لە هەمووکات و شوێنێکدا خۆی پێدەڕازێنێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((باشترین ئافرەت سواری سەرپشتی حوشتربووبێ، ئافرەتی قورەیشە، چونکە لەگەڵ منداڵ زۆر نەرم و بەسۆزن، لە هەموو ئافرەتانیش زیاتر چاودێری ماڵی مێردیان دەکەن)) مسلم ١٦/٨١.

ئەمە گەواهیدانێکی گرانبەهایە لەلایەن پێغەمبەرەوە، وەکوو ملوانکەیەك دەکرێتە ملی ژنانی قورەیش و زیاتر جوانتر و گەورەتر و ڕێزدارتریان دەکات، ئەم گەواهیدانەش بانگەوازێکە بۆ هەموو ئافرەتێکی موسڵمان تاوەکوو بەسۆز بن بۆ منداڵەکانیان و چاودێری بەرژەوەندیەکانی مێردیان بن، بەم دوو خاسیەتە مەزنە پرۆسەی هاوسەرگیری سەردەکەوێت، تاك بەختەوەر دەبێت، خێزان دەکەوێتە خۆشی، کۆمەڵگەش پێشدەکەوێت.

ئەمە ڕێزێکی گەورەیە بۆ ئافرەت کە گرنگی بدات بە کاروباری مێردەکەی و چاودێری بکات لە هەموو کاتێك، بە جۆرێك هێندەی لە زەوق و کەیف و خۆشی و دڵئارامی پێدەبەخشێ، تا ژیانی پڕدەکات لە بەختەوەری و شادی و دڵنیایی و هێمنی. ئەوەتا خاتوو عائشە کە بوخاری و مسلم لێیدەگێرنەوە، وتوویەتی: ((بە دەستی خۆم پێغەمبەرﷺ م بۆنخۆشکردووە بۆ ئیحرام بەستنی، هەروا بۆ شکاندنی ئیحرامەککەش پێش تەوافکردن بە کەعبە)) مسلم ٨/٩٩.

عوروە دەڵێ: پرسیارم لە خاتوو عائشە کرد: بەچی پێغەمبەر ﷺ ت بۆنخۆشکرد کاتێ ئیحرامی بەست؟ وتی: ((بە خۆشترین گوڵاو)) مسلم ٨/١٠٠.

بوخاری و مسلم لە خاتوو عائشە دەگێرنەوە، وتوویەتی: ((پێغەمبەر ﷺ کاتێ خەڵوەی دەکێشا سەری خۆی بۆم نزیك دەکردەوە و منیش قژیم شانە دەکرد، وە هەرگیز نەدەهاتە ماڵەوە مەگەر بۆ خۆرزگارکردن لە پێویستی سروشتی خۆی)) مسلم ٣/٢٠٨.

هەروا خاتوو عائشە دەڵێ: ((من سەری پێغەمبەر ﷺ م دەشوشت لە کاتێکا بێنوێژیش بووم)) فتح الباری ١/٤٠٣ ومسلم ٣/٢٠٩.

خاتوو عائشە هێندە بەتوندی ئامۆژگاری ئافرەتانی دەکرد سەبارەت بە مێردەکانیان و زانینی مافەکانیان لەسەریان تا ئەو ڕادەیەی وتی: ((ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، ئەگەر بتانزانیایە مافی مێردەکانتان لەسەرتان چەندە، ئەوا خۆڵ و تۆزی سەر قاچەکانیانتان بە ڕوومەتەکانتان دەستریەوە)) رواه ابن حبان والبزار واحکام النساء ص٣١١.

ئەمە وێنایەکی گوزارشتکارە بۆ گرنگی مافی مێرد لەسەر ئافرەت، کە دایکی باوەڕداران ویستی نزیکی بکاتەوە لە هزری ئافرەتان، تاوەکوو لە دەروونی هەندێ لە ئافرەتی خۆبەزل زان لەسەر مێردی ئەم هەستە ووشکە ڕەقە لاملێیە دەربێنێ کە دەبێتە مایەی ڕووخانی کۆشکی هاوسەرایەتی، یا دەیگۆڕێ بۆ دۆزەخێك کە بەرگەی ناگری.

چاکەکردن لەگەڵ مێرد و ڕیزلێگرتنی خوڕەوشتێکی ڕەسەنە لە نەتەوەکەمان، لە بەهاڕەوشتیەکانە کە لە سەردەمی نەفامیشدا هەبوون پاشان ئیسلام چەسپاندی، دواتر نەوەکانی‌تر لێیان وەرگرتنەوە.

یەکێ لە نمونە جوانەکان کە عبدالملك بن عمیر القرشی دەیگێڕێتەوە ـ کە یەکێك بوو لە پیاوە شارەزا و زاناکانی سەدەی دووی کۆچی ـ: لە ئومامەی کچی حارث ـ کە یەکێکە لە ئافرەتە زمان پاراو و خاوەن عەقل و هۆش و دانایی ـ ئامۆژگاری کردنی کچەیان بۆ دەگێڕێتەوە کە نزیکی شووکردنە، دەڵێ: ((کاتێ عەوف بن مولحیم الشیبانی ـ کە پیاوێکی گەورە و فەرمانبەجێ بوو لەناو عەرەب لەسەردەمی نەفامی ـ کچەکەی خۆی ئوم ئیاس دا بەشوو بۆ الحارث بن عمر الکندي، کاتێ ئەم کچە ئامادەکرا و خەریك بوو بیبەن، دایکی دەچێتە لای و ئامۆژگاری دەکات: ((کچەکەم، ڕاسپاردە ئەگەر جێبهێشتنی بۆ زیادە ئەدەبە، یان شانازی و ڕیزلێنانی عەشیرەتە، ئەوا بۆ هەمان شتیش بۆ تۆ جێدەهێشترێ. بەڵام ئەوەی من پێت دەڵێم، یادخەرەوەیە بۆ بێ ئاگا، پاڵپشتە بۆ هۆشیار. کچەکەم، ئەگەر ئافرەت بەهۆی دەوڵەمەندی باوکی و زۆر پێویستی کچەکەی بەو دەستبەرداری مێردی بێت، ئەوا تۆ لە هەموو کەس لەپێشتری بەمە، بەڵام ئافرەتان بۆ پیاوان

دروستکراون، وەك چۆن پیاوان بۆ ئافرەتان دروستکراون. کچەکەم، تۆ وا ئەو کەشە جیٚدێڵی کە لێی دەرچووی، ئەو هێلانەیەی لێی گەورەبووی، بۆ لانەیەك نایناسی، هاوەڵێك شارەزای نیت، کە بەهۆی خاوەندارێتی کردنی بۆت بۆتە پاشا، تۆش بۆی ببە بە کەنیزەك ئەو بۆت دەبیٚ بە بەندە و کۆیلە. (دە) خاسیەت لەمن هەڵگرە بۆت دەبێتە توێشوو و یادخستنەوە و یادگاری:

یەکەم و دووەم: هاوەڵێتی کردنت بۆ مێردت با بە قەناعەت و ڕازی بوون بیٚ، پێکەوە ژیانیش لەگەڵی با بەچاکی گوێڕایەڵی بوون بیٚ بۆی“ چونکە لە قەناعەت ئارامی دڵ هەیە، لە بەچاکە گوێڕایەڵیش ڕەزامەندی خوا هەیە.

سیٚیەم و چوارەم: بەدوای شوێنی لوتیدا بگەڕیٚ، چاودێری شوێنی چاوی بکە، با چاوی نەچێتە سەر شتێك جوان نەبیٚ، وە بێجگە لە بۆنی خۆشیش هیچیترت لیٚ بۆن نەکات، کل باشترین جوانییە لە بوونەوەر، ئاویش پاکترین گوڵاوە.

پێنجەم و شەشەم: ئاگاداری کاتی خواردنی بە، بیٚ دەنگ بە لەکاتی نووستنی“ چونکە ئاگری برسێتی سوتێنەرە، خەو هاتنیش پیاو توڕە دەکات.

حەوتەم و هەشتەم: چاودێری خزم و کەس و منالّی بە، پارێزگاری مالّی بە، چونکە پارێزگاریکردنی مالّ واتا چاك ڕیزلێنان، چاودێریکردنی خزم و کەس و منالّیش واتا چاك بەرێوەبردن.

نۆیەم و دەیەم: هیچ نهێنییەکی نەدرکێنی، سەرپێچی هیچ فەرمانێکی نەکەی“ چونکە ئەگەر نهێنیت درکاند ئەوا لە تۆڵەکەی دڵنیا نابیت، وەئەگەر سەرپێچی فەرمانی بکەی، سنگ و دڵی پڕدەکەی لە توڕەیی.

پاشان کچەکەم خۆت بپارێزە لە دەربڕینی خۆشی لەو کاتەی غەمبارە، وە لە مڕومۆچی لەو کاتەی دڵخۆشە“ چونکە ئەوەی یەکەم لە کەم و کوڕیە، ئەوەی دووەمیش لە تێکدان و شێواندنە.

لەوانەبە کە زۆر ڕێزی لێدەگرن و بە گەورەی دەگرن ئەو کات لە هەمووکەس زیاتر ڕێزت لێدەنێ، چەندە زۆریش یەکڕا و گونجاو بی لەگەڵی، هێندە زیاتر هاوڕێت دەبێ و لەگەڵت دەبێ.

بشزانە کچم ناگەیتە ئەوەی لەو حەزی لێدەکەی، تا ڕەزامەندی ئەو پێشتر نەخەی لە ڕەزامەندی خۆت، وە ئارەزووی ئەو پێشتر نەخەی لە ئارەزووی خۆت، لەوانەی پێت خۆشە یان پێت ناخۆشە، ئەو کاتە سوێند بەخوا بۆت چاك دەبێ و دەتپارێزێ[1]. پاشان کچەکەیان گواستەوە و شوێن و پلەوپایەی لەلای مێردەکەی مەزن بوو، لەم پیاوە پاشاکانی پاش خۆی لێپەیدا بوو.

ئاشکرایە ئەم ڕاسپاردەیە گشتگیر و هەمە لایەنە بۆ هەموو ئەو شتانەی دێتە خەیاڵ لەوانەی ئافرەت لە ژیانی هاوسەرێتی پێویستی پێدەبێ لە بەهارەوشتیەکان، پێکەوە ژیان، ژیری لە هەڵس و کەوت و مامەڵەکردن. لێرەوە ئەم ڕاسپاردەیە چاکە دەبێتە دەستورێك بۆ هەموو کچێك نزیکی شووکردنە.

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکاری ڕۆشنبیر ئەگەر دەوڵەمەندبێ، فیتنەی پارە و دەوڵەمەندی و سەربەخۆیی دارایی کە هەیەتی چاوەکانی ناگرن و لێڵ ناکەن، بەڵکو هەردەم مافەکانی مێردی دەپارێزێ، بە ڕێکی ژیانی لەگەڵ دەباتەسەر، ئەگەرچی نەداریش بێ و ئەمیش دارا بێ، ئەو کاتە سوپاسی خوا دەکات لەسەر بەخشەکانی، خێر و صەدەقە زۆردەکات بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خوای، یەکەم کەسیش کە سوود وەردەگرێ لە بەخشین و خێری مێردەکەیەتی، ئەگەر نەداربوو، زینب الثقفیة خێزانی عبدالله بن مسعود ﷺ دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان صەدەقە بکەن، ئەگەر لە خشڵ و زێریشتان بێت)) زینب دەڵێ: گەڕامەوە لای عبدالله بن مسعود، وتم: تۆ پیاوێکی کەم دەرامەتی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێکردووین صەدەقە بدەین، جا بڕۆ لای و لێی بپرسە، ئەگەر ئەمە بۆ من ببێ، ئەگەرنا دەیدەم بە یەکێکیتر. عبداللە وتی: بەڵکو تۆ بڕۆ. زینب دەڵێ: ڕۆیشتم، بینیم چەند ژنێك لە یاریدەدەران لەبەر دەرگای پێغەمبەر ﷺ وەستاون، پێویستیان وەك پێویستی منە، پێغەمبەریش ﷺ سامێکی هەبوو، جا بیلال ﷺهاتە دەرەوە بۆلامان، پێمان وت: بڕۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێیبڵێ: دوو ئافرەت لەبەر دەرگان

---

[1] قطب العرب ١/١٤٥.

دەپرسن: ئایا دەشێ صەدەقە بە مێردەکانیان و هەتیووی ماڵیان بکەن؟ پێی نەڵێی ئێمە کێین. وتی: بیلال چووە ژووریّ لای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو دوو ئافرەتە کێن؟)) وتی: ژنێکی یاریدەدەر و زەینەبە، فەرمووی: ((کام زەینەب؟)) وتی: خێزانی عبدالله بن مسعود، ئنجا فەرمووی: ((دوو پاداشتیان هەیە، پاداشتی خزمایەتی و پاداشتی صەدەقەکە)) فتح الباری ٣٢٨/٣ ومسلم ٨٦/٧.

لە گێڕانەوەی بوخاری: ((مێردت و منالّت لەپێشترن بە صەدەقەکردن پێیان)) فتح الباری ٣٢٥/٣.

ئافرەتی موسڵمان هەمیشە سوپاسگوزارە لە کاتەکانی خۆشی و هەبوونی، ئارامگرە لە کاتی ناخۆشی، ئەم هۆشداریەی پێغەمبەر ﷺ لە یادناکات کە بۆ ئافرەتان بە گشتیەیە، وەك دەفەرموویّ: ((ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، صەدەقە و خێربکەن، چونکە ئێوەم بینی زۆربەی دانیشتووانی ئاگرن)) وتیان: بەهۆی چی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: زۆر نەفرەت دەکەن لە شت، بێئەمەك و ناسوپاسگوزارن بەرامبەر مێردەکانتان)) فتح الباری ٣٢٥/٣ ومسلم ٦٥/٢.

لە گێڕانەوەیەکی بوخاری: ((ناسوپاسگوزارن بەرامبەر مێردەکانتان و بێئەمەکن بەرامبەر بە چاکە، تەنانەت ئەگەر یەکێك بەدرێژایی ڕۆژگار چاکەتان لەگەڵ بکات، پاشان شتێکی لێببینیّ، دەڵێت: هەرگیز بە ژیانم چاکە و خێرم لە تۆ نەدیووە)) فتح الباری ٨٣/١.

لە گێڕانەوەی ئەحمەد: ((پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی ئەوانە دایکان و خوشکان و خێزانەکانی ئێمە نین؟ فەرمووی: بەڵیّ، وایە، بەڵام ئەگەر بیانەدەیتیّ سوپاست ناکەن، وەئەگەر توشی بەڵا و ناخۆشی بوون ئارام ناگرن)) احمد ٤٢٨/٣.

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتووی پارێزکار کاتیّ لەم فەرموودە ڕاستانە ورد دەبێتەوە کە چارەنووسی زۆربەی ئافرەتان دەست نیشان دەکات، هەمیشە هۆشیار دەبیّ لەوەی بکەوێتە ناو گوناهی بێئەمەکی و سپڵەیی و لەبیرکردنی سوپاس لە کاتی خۆشی و ئارام نەگرتن لە کاتی ناخۆشی، پەلە دەکات بۆ ئەو بەخشین و خێرەی کە پێغەمبەر ﷺ سەرجەم ئافرەتانی بۆ هانداوە،

به ئومێدی رزگارکردنیان لەم چارەنووسە ترسناکەی زۆربەی ئافرەتانی دوور لـە یـادی خـوا و بـێ ئاگا لە ڕۆژی دوایی لەوانەی ئەم خوڕەوشتە ناشیرینەیان لە خۆگرتووە. بەڵکو ئـافرەتی موسـڵمانی تێگەیشتوو دەبێتە نمونەی ڕیزلێنان بۆ مێردەکـەی و ئامـاژە بـە چـاکەکانی و گـەورەیی و ڕیـزی دەکات و لایەنە چاك و باشەکانی لێ بڵاودەکاتەوە. ئەمە ئەو ئەمەکداریەی ئافرەتی موسڵمانە کە ڕیز لە مافی مێردی دەگرێ و فەزڵ و چاکەی خاوەنەکەی لە یادناکات.

مێژوو لە ئەسمائی کچی عومەیس کە یەکێك بوو لە ئافرەتە مەزنەکانی ئیـسلام و پێـشڕەوانی کۆچبەران، کە خێزانی جعفر بن ابی تالیب ﷺ بوو، پاش مردنی جعفر بـووە هاوسـەری ابـوبکر الصدیق ﷺ ، پاش مردنی ابوبکر بووە هاوسەری عەلی ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە: جارێکیان هـەردوو کوڕەکەی ئەسماء محمد کوڕی ابوبکر و محمد کوڕی جعفر بەسـەریەك شـانازیان دەکـرد، هەریەکـە و دەیوت: من لە تۆ ڕیزدارترم، باوکم لە باوکی تۆ چاکترە، عەلی ﷺ بە ئـەسمائی وت: دادوەری لـە نێوانیاندا بکە، ئەسماء وتی: هیچ لاوێکم نەبینیووە لە جەعفەر باشتربێ، هیچ پیرێکیـشم نـەدیووە لە ابوبکر باشتربێ. عەلی وتـی: هیـچت بـۆ ئێمـە نەهێـشتەوە، وەئەگـەر بێجگـە لـەوەی وتـت شتێکیترت بوتایە ڕقم لێت دەبوویەوە، ئەسماء وتی: سێ کـەس ئەگەرچـی تـۆ نزمترینیـان بیـت، سوێند بەخوا هەرسێ چاك و پاك و باشن[1].

ئای لەو هۆشیارییە! لەو وەڵامە ژیرانە! لەو گوزارشتە زیرەکانە! کاتێ بۆ هەرسێ مێردی ڕیزی شایستەی خۆی دانا، عەلیشی ڕازی کرد، ئەگەرچـی لـەوان نزمتربـوو، بـەڵام هـەموویانی خـستە بازنەی چاکان و پاکان و باشان.

### لەگەڵ خەسووی چاکەکارە و ڕیز لە خزم و کەسی دەگرێت

یەکێك لە چاکەکانی ئافرەت لەگەڵ مێردی و یەکێ لـە مافـەکانی ئەوەیـە: ڕیـز لـە دایکـی مێردی بنێ و بە گەورەی بگرێ" چونکە ئـافرەتی موسـڵمانی تێگەیـشتوو لـە ئاینەکـەی دەزانـێ

[1] الطبقات الكبرى ٢٠٨/٧ ـ ٢٠٩.

گەورەترین مافی مرۆڤ لەسەر پیاو مافی دایکیەتی، هەرکاتێ ئافرەت پاڵپشتی مێردی بوو بۆ ڕیزلێنان لە دایکی و چاکەکردن لەگەڵی، بەوەی بە خۆشی ڕیزی لێبگرێ و چاکەی لەگەڵ بکات، ئەوا چاکەی لەگەڵ خودی خۆی کردووە، پاڵپشتی مێردی دەبێت لەسەر چاکەکاری و پارێزکاری و کردەوەی باش کە خودا لە قورئان فەرمانی پێکردوو، لە هەمان کاتدا دەبێتە ئافرەتێکی خۆشەویست لەسەر دڵی مێری، ڕیزلێنان و چاکەکاری ژنەکەی لەبەرچاو دەبێت بەرامبەر دایکی و کەس و کاری ـ بەتایبەتی دایکی ـ" چونکە هیچ لەوە فێنکتر نییە بۆ سەر دڵی پیاوی مەرد و چاکەکار لەوەی ببینێ پەیوەندی توندوتۆڵ و خۆشەویستی و ڕیزلێنان لە نێوان خێزانی و کەس و کاری گرێدراوە، بە پێچەوانەشەوە، هیچ شتێك لەوە ناخۆشتر نییە بۆ سەر دڵی پیاوی چاکەکار کە ببینێ ئەم پەیوەندییە پچراوە و هەڵوەشاوەتەوە، شەڕ و ڕق و تۆڵە و نیازی خراپ و پیلانگیران هەیە لە نێوان خێزان و خزم و کەس و کاری. خێزانی موسڵمان کە گوڵاوی باوەڕی بۆنکردووە، بیروهۆشی و ئەندامەکانی و دڵی بە ڕووناکی ئیسلام ڕۆشن بۆتەوە، زۆر دوورە لە خزانە ناو ئەم خوڕەوشتە نەفامیانە کە زۆربەی کات لەناو ژینگەی دوور لە ڕێنمایی خوا و ئاینەکەی هێلانە دادەنێ.

جاری واهەیە ژنی موسڵمان تاقی دەکرێتەوە بە خەسویەك یا دش یا شوبرایەك خوڕەوشتیان جوان نەبێ، لەم بارەدا لەسەری پێویستە بە ژیرانە و هۆشیارانە و زەردەخەنە و چاکەکردن بەرامبەر بە خراپە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، بەشێوەیەك هاوسەنگی لە پەیوەندییەکانیان ڕاگرێ، خۆی و ژیانی هاوسەرایەتی دووربگرێ لەهەر کارتێکردنێك کە بشکێتەوە سەری بەهۆی تێکچوونی ئەم هاوسەنگییە.

کەس واتێنەگات تەنها ئافرەتی موسڵمان داوای لێکراوە چاکەکار بێت لەگەڵ مێردی و چاودێری بکات و پێکەوە ژیانیان بە چاکە بباتەسەر و پیاو هیچی لەم ئەرکانە لەسەرنییە، وە ئەگەر خراپیش بێت یا کەمتەرخەم بێت گوناهی ناگات. ئەو ئیسلامە گەورەی پەیوەندی هاوسەرایەتی ڕێکخستووە مافی داناوە بۆ هەریەك لە ژن و لە پیاو، هەروا ئەرك و واجبیشی خستۆتە ئەستۆیان، ئەرك و واجبی ژن بەرامبەر بە مێردی و ڕیزلێنانی و چاودێریکردنی

لەبەرامبەر مافەکانیانە لەسەر مێردیان، ئەوانیش چەند مافێکن ڕێز و پلەوپایەی ئافرەت و کەسایەتیەکەی دەپارێزن لە شێواندن و فەرامۆشکردن یا سوکایەتی پێکردن یا ستەم. ئەم مافانەی ئافرەت واجبن لەسەر شانی پیاو، لەسەریەتی ڕیزیان لێبنێ و پابەندبێ پێیانەوە و بە جوانترین و تەواوترین شێوە بەرجەستەیان بکات.

یەکێ لە واجبەکانی پیاو بەرامبەر ژنەکەی ئەوەیە بەجوانی بەڕێوەی ببات، ئەم ئەرکەش نایەتەدی مەگەر پیاوێك لە بەڕێوەبردنی ماڵی و خێزانی سەرکەوتووبێت، بەهۆی ئەو خاسیەتە مەردانەییانەی کە لەلای ئافرەت خۆشەویستن" وەك بوونی کەسایەتیەکی بەهێز دوور لە توندڕەوی، نەرم و نیانی دوور لە لاوازی، خوڕەوشتێکی بەرزی نایاب، لێبوردەیی، چاوپۆشیکردن لە هەڵە و لەبیرچوونەوە، بەڕێوەبردنێکی ژیرانە و هۆشیارانە و لێهاتووانە بۆ ژیانی هاوسەرایەتی، دەستبلاوی و خەرجکردنێکی دوور لە زیادەڕۆیی و زیادەخەرجی، ڕیزگرتنی هەستی هاوسەری و نیشاندانی بەرپرسیاریەتی خۆی لەگەڵیدا لە بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵ، پەروەردەی منداڵ، هاوکاریکردنی لە دروستکردنی خێزانی موسڵمانی پایەبەرزی و بڵند، وەك چۆن ئیسلام دەیهەوێ.

### ئەوپەڕی خۆشەویستی دەنوێنێ بۆ مێردی و هەوڵی ڕازیکردنی دەدات

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو هەمیشە ئەوپەڕی خۆشەویستی دەنوێنێ بۆ مێردی، هەوڵدەدات ڕازی بکات و دڵی خۆش بکات، بە هیچ شتێك ژیانی لێ تاڵ ناکات، بەختەوەریەکەی لێناشێوێنێ، وشەی جوان دەئاخنێ بە گوێیدا، خۆی دەگرێتەوە لە قسە و گوفتارێك برینداری بکات و ئازاری بدات، هەواڵی خۆشی بۆ دەگێڕێتەوە، هەواڵی ناخۆشی لێدەشارێتەوە تا لە توانای دابێت، یا هەڵی دەگرێ بۆ کاتێکی گونجاو تا زۆر کاری تێنەکات، ئەگەریش هیچ چارەی نەبوو و هەر دەبووا لەکاتی خۆی هەواڵەکەی پێبڵێ، ئەوا شێواز و ڕێگای گونجاو هەڵدەبژێرێ بۆ چوونە ناو دڵی، لەگەڵ هەندێ پێشەکی تاوەکوو زۆر کاریگەری نەبێت لەسەر دەروونی. ئەمەش بە جوان بۆ هاتن و فراوانی هۆش و ژیری لە هەڵس و کەوت دەبێ کە پێویستە ئافرەتی بێدار خۆی پێبڕازێنێتەوە، بەڕاستی گەیشتن بەم پلەیە ئاستەنگە، تەنها کەمێك لە ئافرەتان پێیدەگەن.

ئوم سولەیم کچی میلحان گەیشتبوویە ئەم پلەیە، ئەنەس دەڵێ: ((کوڕێکی ئەبو تەڵحە لە ئـوم سولەیم مرد، ئوم سولەیم بە کەس و کاری وت: هەواڵی مردنی کوڕەکەی بە ئەبو تەڵحە مەڵێن تـا خۆم پێی دەڵێم. ئەنەس دەڵێ: ئەبو تەڵحە گەڕایەوە و ئوم سولەیمیش نانی ئێوارەی بۆ هێنا. ئـەبو تەڵحە نانی خوارد و ئاوی خواردەوە. وتی: پاشان ئـوم سـولەیم زۆر لـە جـاران جـوانتر خـۆی بـۆ ڕازاندەوە، ئەبو تەڵحەش لەگەڵی جوت بوو، کاتێ بینی تێربووە و دڵی ئۆقرەی گـرت، وتـی: ئـەی ئەبا تەڵحە، ئەگەر ماڵێك بە سپاردە شتێك لـە ماڵێـك دابنـێن، پاشـان داوای شـتەکەی خۆیـان بکەنەوە، ئایا بۆیان هەیە نەیدەنەوە؟ وتی: نەخێر، وتـی: دەی کوڕەکـەت مـردووە و ئـارامبگرە. وتی: ئەبو تەڵحە تووڕە بوو و وتی: لێم گەڕای تا لەشم پیس بوو، پاشان مردنی کوڕەکەم پێدەڵێی، ئەبو تەڵحە چووە لای پێغەمبـەر ﷺ و ئـەم هەواڵـەی پـێ ڕاگەیانـد، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ((خودا فەڕ و پیرۆزی بخاتە ئەو شەوەی بەسەرتان ڕابووری)) وتی: پاشان ئوم سولەیم دووگیان بوو، وتی: پێغەمبەر لە گەشتێك بوو ئوم سولەیمیشی لەگەڵدابوو، جا پێغەمبەر ﷺ باوی وابـوو کاتـێ لە غەزایەك دەگەڕایەوە ناو مەدینە بەشەو نەدەگەڕایەوە، لە مەدینە نزیکبوونەوە، ئوم سـولەیمیش ژانی منداڵبوونی لێهات، ئەبو تەڵحەش بەهۆی ئەوەوە بەندبوو، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت. وتی: ئەبو تەڵحە دەیوت: خودایە تۆ دەزانی من حەز دەکەم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچـم کاتـێ دەردەچـێ و لەگەڵی بێمەوە و بچمەوە ناو مەدینە کاتێ دەگەڕێتەوە، وە بەوەی دەیبینی وا بەندبووم. وتی: ئوم سولەیم دەڵێ: ئەی ئەبا تەڵحە، ژانەکەم نـەما، بـا بـڕۆین، ئنجـا دەرۆن، وتـی: کاتـێ گەیـشتنە مەدینە ژانی منداڵبوونی هاتەوە و کوڕێکی بوو، ئەنەس دەڵـێ: دایکـم پێـی وتم: ئـەی ئەنـەس، کەس شیری پێنەدا تا دەیبەیتە لای پێغەمبەری خواﷺ ، ئەنەس دەڵێ: کاتـێ بـەیانی بوویـەوە، هەڵمگرت و بردمە لای پێغەمبەر ﷺ ، بینیم ئامرازی داخکردنی ئاژەڵی پێیە، کاتێ منی بینـی فەرمووی: ((لەوانەیە ئوم سولەیم منداڵی بووبێ)) وتم بەڵێ، ئامرازەکانی داخکردنی دانـا. ئەنـەس وتی: منداڵەکەیم بۆ هێنا و خستمە ئامێزی، پێغەمبـەر ﷺ داوای هەنـدێ خورمـای کـرد، لـەناو دەمی خۆیدا جووی تا توایەوە، پاشـان خـستیە نـاو دەمـی منداڵەکـە، منداڵەکـەش زۆر بـەجوانی خورماکەی دەخوارد و دەیمژی، ئەنەس وتی: پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ((سـەیرکەن خۆشەویـستی

ئەنصار بۆ خورما چەندە)) ئەنەس وتی: پاشان دەستی هێنا بە ڕووخساری و ناوی نا عبداللە))
مسلم ١٦/١١.

سەیرە! چەندە بەرزە باوەڕت ئەی ئوموسولەیم! چەندە جوانە خۆڕازاندنەوەت و نیشاندانی ئەوینداریت بۆ مێردت! چۆن توانیت تاڵی پەژارەی مردنی جگەرگۆشەت بخۆیتەوە؟ چۆن دڵت خۆی ڕاگرت لە بەرامبەر ئاگر و داخی دابڕانی خۆشەویستت؟ لەو کاتەی زۆر بەئارامی و بە ئومێدی پاداشتی خوایی ئەم ساتانە لەگەڵ مێردت دەبەیتەسەر، بەم ئارامگرتن و چاك ڕەفتارکردنە لەگەڵ مێردت داوای پاداشتی خودا دەکەی؟! بەڕاستی ئەمە باوەڕی ڕاست و ڕەوا و قووڵە.

بێگومان خودا ڕاستی باوەڕی ئوم سولەیمی دەزانی، بۆیە لەسەر زاری پێغەمبەر ﷺ مژدەی بەهەشتی پێدرا، وەك دەفەرموویَ: ((چوومە بەهەشت، خشپەیەکم بیست، وتم: ئەمە کێیە؟ وتیان: (غُمیصاء) ە کچی میلحان، دایکی ئەنەس بن مالك)) مسلم ١٦/١١.

یەکێ لەو هەڵوێستە ژیرە خۆشەویستانە لە دەربڕینی ئەوینی ئافرەتی موسڵمان بۆ مێردەکەی: قسەی خاتوو عائشەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەی گەڕایەوە لای خێزانەکانی پاش ئەوەی یەك مانگ نزیکیان نەکەوتبوو، و فەرمووو بووی: ((دەبێ یەك مانگ نزیکتان نەکەوم)) بەهۆی سەختی دڵئێشانی لێیان. پاش ئەوەی ٢٩ ڕۆژ تێپەڕی، هاتە لای عائشە و لەوەوە دەستی پێکرد، خاتوو عائشە پێی وت: تۆ سوێندت خواردووە یەك مانگ نزیکمان نەکەوی، ئێمەش ئێستا لە شەوی بیست و نۆیەمینین، بە ژماردن بۆی ژمارد. جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مانگ هەیە ٢٩ ڕۆژە، ئەم مانگەش بیست و نۆ ڕۆژ بوو)) متفق علیه. فتح الباری ١١٦/٥ ومسلم ١٩٥/٧.

ئەم ژماردنەی عائشە گوزارشت لە پەیوەستی دڵی ژنە خۆشەویستەکەیە بە مێردی، شەو شەو چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەکرد، هەر لەم فەرموودەیە ئەوینداری کەمەندکێشبوونی دڵی مێرد بۆلای هاوسەرەکەی بەدی دەکرێت، چونکە دەبینین یەکەمجار لە عائشە خاتون دەست پێدەکات.

ئافرەتی موسڵمان ئارەزووو و حەز و سروشتی مێردی دەزانێ، کاردەکات لەسەر چاودێری کردنیان تا لە توانای دابێت، بەمەبەستی لەیەکگەیشتن و گونجان لە ژیانی هاوسەرایەتی و،

دەرکردنی بێزاری، هەر ئافرەتێکیش ژیر و هۆشیار بێت دەبێ وابکات، لە شورەیحی قازی و فـەقێ دەگێرنەوە کە ژنێکی هێنا لەبەرەی حنظلة، لە شەوی بوکێنی هەریەکەو دوو ڕکات نوێـژیان کـرد، نزا و پاڕانەوەی خێریان کرد، پاشان ژنەکە ڕووی کردە شورەیح و وتی: من ئافرەتێکی نامۆم، هـیچ شارەزاییەکم نییە بە خوڕەوشتی تۆ، جا ئەوەی حەزی لێ دەکەی بۆمی روون بکەرەوە تـا بیکـەم، ئەوەیشی پێت ناخۆشە تا لێی دوورکەومەوە، شورەیح دەڵێ: ٢٠ ساڵ ئـەو ژنـە لەگـەڵم مایـەوە، گلەییم لە هیچ شتێکی نەبوو، تەنها یەکجار نەبێ ئەویش خەتای من بوو و ستەمم لێکرد.

ئەمەیە ئەو ئافرەتە دڵنەرمە چاکەکارەی ئیسلام دەیهەوێ، چاودێری ماڵی دەکات، ئەمەکـدارە بۆ هاوسەرەکەی، بایەخ دەدات بە بەردەوامبوونی پێکەوە ژیانیان. هەر کاتێکیش ڕەشەبا بیـەوێت ئەم کەشەیان لێڵ بکات، پەلە دەکـات بـۆ خاوێنکردنـەوەی بـە ئـەوینی ڕاسـتەقینە و گونجـان و لەیەکگەیشتنێکی پڕ لە دانـایی، گـوێ لـە ڕاڕاییـەکانی شـەیتان و لـەڕێ لادانـەکانی دەروونـی خراپەکار ناگرێت و داوای جیابوونەوە ناکات" چونکە گرێبەستەی هاوسەرایەتی گەورەترە لەوەی بە ناکۆکیەك یا لەیەك نەگەیشتنێك گرێکانی بپـچڕێ، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((هـەر ئافرەتێك داوای تەڵاق بکات لە مێردەکەی بەبێ هیچ هۆکارێکی شەرعی، ئـەوا بـۆنی بەهەشـتی لەسەر حەرامە.الترمذي ٣٢٩/٢ وابن حبان ٤٩٠/٩

## هیچ نهێنییەکی نادرکێنێ و ئاشکرای ناکات

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار نهێنـی هاوسـەرەکەی دەپـارێزێ و ئاشـکرای ناکـات، ئـەوەی لـە نێوانیان ڕوودەدات لە کاری نهێنی لای هیچ کەسێك باسی ناکات" چونکە ئافرەتی موسڵمان لـەوە بەرزترە بێتە ئەو ئاستە نزمە و سەرشێتانە بچێتە ناو قسەی بێسـوود کـە زۆرتـر لـەناو ژینگـەی ئاست نزمەکات ئەم شتە بڵاوە، کات لەلای ئـەو زۆر لـەوە بـەرزترە لـەوەی لـەو کـردەوە نزمانـە خەرجی بکات کە تەنها کەسانی بێئیش و کار و ئامانج خۆیـانی پێـوە خـەریك دەکـەن" لێـرەوە ئافرەتی موسڵمان خۆی دووردەگرێ لـەم جـۆرە کەسـانە بێـت کـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((خراپترین پلەوپایەی کەسانێك لەلای خوا لە ڕۆژی دوایی پیاوێکە خۆی بۆ ژنەکەی واڵا دەکـات و ئەمیش خۆی بۆ واڵا دەکات و، پاشان یەکێکیان نهێنی ئەوەیتر ئاشکرا دەکات)) مسلم ٨/١٠.

باسـكردنی ئـەوەی لـە نێـوان پیـاو و ژن ڕوودەدات لـە ناشـیرینترین جـۆری ئاشـكراكردنی نهێنییەكانە، كە تەنها كەسانی خراپەكار و گوناهبار ئـەم كارانـە دەكـەن. ئاشـكراكردنی هەنـدێ نهێنیش هەیە بەم جۆرە خراپ و ناشیرین نییە، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئاشـكراكردنەكەی مەكروهـە و باش نییە" چونكە پاراستنی نهێنی خۆی لە خۆیدا لـە بەهاڕەوشـتیەكان و ڕەفتـارە جوانەكانـە، ئاشكراكردنیشی لە گوناه و نەنگی و خراپەكاریە و تەنها ئەوانەی خوا پاراستیویانە لـەم خراپەیـە رزگاریان بووە، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ نهێنییـەك لـەلای خـاتوو حەفـصە بـاس دەكـات، ئـەمیش دەیگوازێتەوە بۆ خاتوو عائشە، پاشان پیلانگێڕانی خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ ی بەدوادا دێـت لـە ماڵی پێغەمبەر، ئەمەش بووە هۆی پێغەمبـەر ﷺ یـەك مـانگ نزیكـی خێزانـەكانی نەكـەوێت بەهۆی سەختی دڵئێشانی لێیان. متفق علیه. لەم بارەوە خودا دەفەرموووێ: ﴿وَإِذ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَـى بَعضِ أزوَاجَهُ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأت بِهِ وَّأظهَرَهُ اللهُ عَرَّفَ بَعضَهُ وَأعرضَ عَن بَعضٍ فَلَمَّا نَبَّأهَـا بِـهِ قَالَـت مَن أنبَأكَ هَذَا قَالَ نَبَّأنِيَ العَلِيمُ الخَبِير. واتا: كاتێ پێغەمبەر ﷺ لەبارەی حەڕامكردنی ماریـە لـە خۆی لەلای حەفصەی باسكرد و پێی فەرمووو: لای كەس ئەم قسەیە مەدركێنـە، كاتـێ حەفـصە ئەم قسەیەی لـەلای هاورێكـەی یـا لـەلای خـاتوو عائـشە دركانـد، خـودا پێغەمبـەری ﷺ لـە ئاشكراكردنی ئەم نهێنییە ئاگادار كردەوە و پێغەمبەریش هەندێ لـەو نهێنییـە ئاشـكرابووەی بـە خاتوو حەفصە فەرمووو و هەندێكیشی پێ نەوت، كاتێ پێغەمبەر ﷺ بە خاتوو حەفصەی وت كە تۆ ئەم نهێنیەت لەلای خاتوو عائشە دركاندووە، حەفصە وتی: كێ ئەمەی پێ وتی؟ گومانی لەوە نەبوو خاتوو عائشە ئەم قسەیەی كردبێ، پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: خـودای زانـا و شـارەزا پێـی ڕاگەیاندووم﴾ التحریم: ٣.

پاشان خودا دەفەرموووێ: ﴿إن تَتُوبَا إلَى اللهِ فَقَد صَغَت قُلُوبُكُمَا وَإن تَظَاهَرَا عَلَيهِ فَـإنَّ اللهَ هُـوَ مَولاَهُ وَجِبرِيلُ وَصَالِحُ المُؤمِنِينَ وَالمَلاَئِكَةُ بَعدَ ذَالِكَ ظَهِيرٌ. واتـا: ئەی عائشە و حەفصە ئەگەر تەوبـە بكەن و پەشیمان ببنەوە بۆلای خوا ئەوا پێغەمبەریش دڵی مەیلی ئەوە دەكاتـەوە كـە پێـشتر لـە ماریە لە خۆی حەڕامكردبوو، ئەگەریش پیلانی لە دژ بگێڕن ئـەوا خـوا پاڵپـشت و سـەرخەرێتی، هەروا جبریل و باوەڕدارانی چاك و فریشتەكانیش سەرخەر و پاڵپشتینە﴾ التحریم: ٤.

پاشان خودا هەڵمەتێکیتری پڕ لە هەڕەشەی ترسناك دەکاتە سەریان بەوەی ئەگەر لەسەر ئەم جۆرە هەڵە و تاوانانە بەردەوامبن ئەو ڕێز و پلەوپایەی وەك بوونیان بە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ لە دەست دەدەن، کە دەفەرموووێ: ﴿عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبدِلَهُ أَزوَاجًا خَيرًا مِنكُنَّ مُسلِمَاتٍ مُؤمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبكارا. واتا: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ تەڵاقتان بدات ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ئەوا لە هاوسەری موسڵمان و باوەڕدار و ملکەچ و گەڕاوە و خواپەرست و ڕۆژووگر و بێوەژن بن هەروا کچ بن پێی دەبەخشێ لە جێی ئێوە﴾ التحريم: ٥.

لەم ڕووداوە ڕێنماییەکی تەواو هەیە بۆ ئافرەتی موسڵمان بە ناسینی بەهای پاراستنی نهێنی مێردی، هەروا کاریگەری ئەم پاراستنە لەسەر سەقامگیری دەروون و ویژدان و ماڵەکان. یەکێ لە بەخششە هەرە گەورەکانی لەسەر موسڵمانان بەتایبەتی و مرۆڤایەتی بەگشتی ئەوەبوو کە ژیانی تایبەتی و گشتی پێغەمبەر ﷺ وەك پەرتووکێکی کراوە خستە بەردەستی ئۆممەتەکەی و سەرجەم مرۆڤایەتی، تیایدا بەها و بنەماکانی ئەم بیروباوەڕە دەخوێنینەوە، جێبەجێکاریە کرداریەکانی لەسەر زەمینەی ژیان دەبینین، بۆیە دەیبینین هیچ نهێنییەکی شاراوە و ژێر پەردەیەکی تیانییە، بەڵکو لە هەرچی ڕووداو و کاروبار هەیە کە وەك باوە لە ژیانی خەڵکیدا هەیە و هەوڵی شاردنەوەی دەدەن تەنانەت خاڵە لاوازەکانی مرۆڤ کە لە ژێر دەستی خۆیدا نییە، هەر هەمووی لە قورئان و سونەت بە دەقی ئیسلامی بۆ خەڵکی نمایشکراوە، تاوەکوو لێوەی فێری ڕەوا و ناڕەوا و ڕاست و دروست لار و چەوت بن.

هاوەڵان دەیانزانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ هەر هەمووی بۆ خوا و بۆ پەیامەککەی بووە، ئایا دەشێ لایەنێکی تیایدا بپێچنەوە و بشارنەوە؟ هەرچی ڕووداوی گێردراوە هەیە لە ژیانی و ماڵی و خێزانەکانی، هەمووی جێبەجێکاری کرداریە لەوەی بە زمان فەرمانی پێکردون، بۆیە هاوەڵان زۆر بەوردی ژیانی پێغەمبەریان ﷺ بۆ خەڵکی گواستۆتەوە، هیچ شتێکی بچووك یا گەورەیان لە ژیانی ڕۆژانەی ئاسایی تێنەپەڕاندووە و هەموویان تۆمارکردووە و گواستوویانەتەوە، ئەمەش لایەنك بووە لە قەدەری خوا لە تۆمارکردنی ژیانی ئەم پێغەمبەرە هەڵبژێردراوە، یان تۆمارکردنی وردەکاری بیروباوەڕی ئیسلام بە پیادەکراوی لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ، ئەمە لە پاڵ ئەوەی قورئان

لەبارەی ژیانی ئەم مەزنە باس دەکات و تۆمارێکی هەمیشەییە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی هەتا ئەو کاتەی ئاسمانەکان و زەوی بمێنن.

## پاڵپشتی دەکات و بەشداری ڕاو بۆچوونەکانی دەکات

یەکێ لە سوننەتەکانی خودا لەم ژیانە ئەوەیە پیاو و ئافرەت بەیەکەوە هەڵسن بە ئاوەدانکردنەوەی ئەم گەردونە و هەڵسوڕاندنی کاروباری ژیان تیایدا، هیچ کامێکیان ناتوانێ دەستبەرداری ئەوەیتر بێت، بۆیە ڕێنماییەکانی ئیسلام هات فەرمانیکرد بە هاوکاریکردن لەلایەن هەردووکیانەوە" ئیسلام هانی پیاوی داوە لەسەر یارمەتی دانی ژنەکەی تا لە توانای دابێت، پێغەمبەریش ﷺ کە پێشەنگی سەرجەم موسڵمانانە، لە خزمەت و ڕاژەی خاوخێزانیدا بووە تا دەچووە نوێژ، وەك خاتوو عائشە باسی کردووە. فتح الباری ٢/١٦٢.

جا وەك چۆن لە ئیسلامدا پیاو هاوکاری ئافرەت دەکات لە کاروپیشە و بەڕێوەبردنی ماڵ، ئاوەهاش ئافرەت هاوکاری پیاو دەکات لە کاروباری جیهان و ژیان بە گفتوگۆ و ڕاوبۆچوون و کردار. وەك چۆن لە بەشەکانیتر باسی چەندین هاوکاری و بەشداریکردنی ئافرەتانمان کرد لە گۆڕەپانەکانی شەڕ و کوشتار...هتد.

هاوکاریکردنی ئافرەت لە ژیانی گشتی تەنها ئەوە نییە لە شەڕا پشتی پیاو بگرێ، بەڵکو لە ئاشتیشا پاڵپشتی کردووە بە ڕاو بۆچوونی دروست، مێژووش ناوی کۆمەڵێك لەو پیاوە گەورانەی ئیسلامی تیایە کە گوێبیستی پێشنیار و بۆچوونی ژنەکانیان بوونە، لەسەرووی هەموویانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەندێ جار کرداری کردووە بە ڕای خاتوو خەدیجە و ئوم سەلەمە و عائشە و ئەوانیتر لە خێزانەکانی، هەروا عبداللە بن الزبیر زۆر کرداری کردووە بە ڕاو بۆچوونەکانی ئەسمائی دایکی، الولید بن عبدالملك کرداری کردووە بە ڕاو بۆچوونی ژنەکەی (ام البنین کچی عبدالعزیز بن مروان)، هاروون الرشید زۆر بە قسەی زوبێدەی خێزانی کردووە، ....هیتر.

لەبەرئەوەی ئافرەتی موسڵمانی هۆشیار پەی دەبات بە قورسی ئەو بەرپرسیاریەتیەی ئیسلام خستوویەتە ئەستۆی، کاتێ فەرمانی پێکرد چاکەکاریێ لەگەڵ مێردی، هەروا دەرکی هەموو ئەو شتانە بکات کە سروشتە مرۆڤایەتیەکەی ڕازی دەکات، دڵی ئاو دەدات ، ویژدانی ئاسوودە

دەکات، چالاکی نوێدەکاتەوە، وای لێ دەکات بەتوانا بێت لە گەیاندنی پەیامەککەی لە ژیان، بۆیە هەرکاتێ پێویست بووبێ ڕای خۆی پێوتووە، دواناکەوێ لە پاڵپشتی کردنی، هانی دەدات، چەسپاو و خۆڕاگری دەکات، دڵنەوایی دەکات، بە پێشنیاری دروست ئاراستەی دەکات.

خاتوو خەدیجە دایکی باوەڕداران یەکەم نمونەی ئافرەتی کاریگەرە لە ژیانی مێردەکەی" بوخاری و مسلم لە خاتوو عائشە دەگێڕنەوە: ((دەستپێکردنی هاتنە خوارەوەی سروش بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ بە بینینی خەونی ڕاست بوو لە خەودا، هەر خەوێکی دەبینی وەك ڕۆژی رووناك دەهاتەجێ، پاشان گۆشەگیری لەلا خۆشەویستکرا، لە ئەشکەوتی حیرا چەند شەوێك بە ژمارە دەمایەوە و خواپەرستی دەکرد، بۆ ئەم مەبەستە توێشووی لەگەڵ خۆی دەبرد، پاشان کە خۆراکی تەواودەبوو دەگەڕایەوە لای خاتوو خەدیجە و هەندێکیتری لەگەڵ خۆی دەبرد، تا لەناکاو حەق و ڕەوای بۆ هات، ئەوەبوو لە ئەشکەوتی حیرا فریشتە (جبریل) هاتە لای، وتی: بخوێنە، فەرمووی: خوێندەوار نیم، فەرمووی: گرتمی و لە باوەشیا توند گوشیمی تا خەریك بوو گیانم دەرچێ، پاشان بەری دام، وتی: بخوێنە، وتم: خوێندەوار نیم، فەرمووی: دوبارە گرتمی و توند گوشیمی تا خەریك بوو گیانم دەرچێ، پاشان بەری دام و وتی: بخوێنە، وتم: خوێندەوار نیم، فەرمووی: سێ بارە گرتمی و گوشیمی تا خەریك بوو گیانم دەرچێ، پاشان بەری دام و وتی: ﴿إقرا بِاسمِ رَبِّكَ الَّذي خَلَقَ، خَلَقَ الإنسَانَ مِن عَلَق، إقرِا وَرَبُّكَ الأكرَمُ الَّذي عَلَّمَ بِالقَلَمِ، عَلَّمَ الإنسَانَ مَا لَم يَعلَم﴾، پێغەمبەر ﷺ بەم ڕووداوە گەڕایەوە، هەموو گیانی دەلەرزی، تا هاتە لای خاتوو خەدیجە و فەرمووی: دامپۆشن و لەناو جێگا بمپێچنەوە، دایان پۆشت تا ترسەکەی لەسەر لاچوو، پاشان بە خاتوو خەدیجەی فەرمووو: ئەرێ خەدیجە چیم بەسەر هاتووە؟ هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە و فەرمووی: زۆر لە خۆم ترسام، خاتوو خەدیجە وتی: نەخێر، مژدەت لێبێ، سوێند بەخوا خودا هەرگیز ریسوات ناکا، سوێند بەخوا تۆ پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنی، ڕاستگۆی، ئەرکی خەرجی هەژارانت گرتۆتە ئەستۆی خۆت، یارمەتی پیاوی هەژار دەدەی، ڕێز لە میوان دەگری، پاڵپشتی لە کاری حەق و ڕەوا دەکەی. ئنجا خاتوو خەدیجە بردیە لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کوڕی ئەسەد کوڕی عبدالعزی، کە ئامۆزای خاتوو خەدیجە بوو، برای باوکی، پیاوێك بوو لە سەردەمی نەفامی ببویە مەسیحی، دەیزانی بە عەرەبی بنووسێ، وە ئەوەندەی خودا ویستیبووایە بە عەرەبی ئینجیلی دەنووسیەوە، پیاوێکی

بەسالاچووبوو، چاوی کوێرببوو، خاتوو خەدیجە پێی وت: مامە گوێ لە کوڕەزات بگرە، وەرەقەی کوڕی نەوفەل وتی: ئەی کوڕەزام چی دەبینی؟ پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەوەی بینیبوی پێی ڕاگەیاند، وەرەقە پێی وت: ئەمە جبریلە کە بۆ موسی (علیه السلام) دابەزی، خۆزگە ئەو کاتە لاوێکی بەهێز دەبووم، خۆزگە ئەو کاتەی خزم و کەست دەرت دەکەن زیندوو دەبووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچی ئەوان دەرم دەکەن؟ وەرەقە وتی: بەڵێ، هەر پیاوێك بەوەی تۆ بێت ئیلا دوژمنایەتی دەکرێت، ئەگەر بگەمە ئەو ڕۆژە زۆر بەجوانی سەرت دەخەم و پشتت دەگرم)) فتح الباری ١/٢٣ ومسلم ٢/١٩٧.

لەم دەقەدا بەڵگەیەکی مەزن و بەهێز هەیە لەسەر تەواوەتی و لێهاتوویی خاتوو خەدیجەی هاوسەری مەزن و لەسەر ڕاو بۆچوونە تیرئەندازەکەی، پتەوی و هێزی کەسایەتیەکەی، چەسپاوی دڵەکەی، تێگەیشتنە گەورەکەی، دووربینییەکەی. هەرچی بەهاڕەوشتیەکانە لە پێغەمبەر ﷺ بینیبووی، هەرچی ڕەفتار و خوڕەوشتی جوانە بینیبووی، ئەمانە وایانکرد دڵنیابێت لەوەی پیاوێکی وەك محمد ﷺ خودا هەرگیز ڕیسوای ناکات و ناکەوێتە دەرەنجامی خراپ، وە بەهۆی ژیری و داناییەکەی زانی لە پشتەوەی ئەم بارودۆخە تازە کارێکی مەزن هەیە کە خودا پێغەمبەرەکەی بۆ ئامادە دەکات، بۆیە بە دەنگە بەسۆزەکەی مژدەی پێدا و متمانە و هێمنی و ئارامی و دڵنیایی خستە دڵی کاتێ وتی: ((مژدەت لێبێ ئامۆزا، چەسپاو و خۆڕاگر بە، سوێند بەوەی گیانی خەدیجەی بەدەستە ئومێد دەکەم تۆ پێغەمبەری ئەم ئوممەتە بیت)) السیرە ١/٢٥٤.

خاتوو خەدیجە بۆ پێغەمبەر ﷺ وەك وەزیرێکی ڕاستگۆ وابوو بۆ ئیسلام. ئەوەش بەسە بۆ ڕێز و پلەوپایەی خاتوو خەدیجە کە یەکەم کەس بووە باوەڕی بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە، پاڵپشتی کردووە و سەری خستووە، یارمەتی داوە، پشتگیری کردووە لەسەر بەرگەگرتن لە سەختترین جۆرەکانی ئازار و ئەشکەنجە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتای بانگەوازەکەی دوچاری بوویەوە، هەرچی بالگرانی و ئازار و مەینەتی و ماندوویێتی هەبووە لەگەڵی هەڵگرتووە.

ابن هشام لە سیرە دەڵێ: ((خەدیجەی کچی خوەیلد باوەڕی هێنا، باوەڕی هێنا بەوەی لەلای خواوە هێنای، پاڵپشتی کرد، یەکەم کەس بوو باوەڕی بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێنا،

پەیامەککەی بە ڕاست زانی، بەهۆی ئەم شاژنە بوو خودا ئەرکی سەرشانی پێغەمبەری سووك کرد. هەر شتێکی ببیستایە لە بەدرۆخستنەوە و ڕەتکردنەوەی پەیامەککەی کە دڵی پێی نیگەران بووایە، ئەوا خودا لەسەری لادەدا کاتێ دەگەڕایەوە لای خەدیجە، خاتوو خەدیجە ورەی بەرزدەکردەوە و باڵی سووك دەکرد، متمانەی پێدەبەخشی، کاری خەڵکی لەسەر سووك دەکرد، خودا سۆز و بەزەیی پێدابێتەوە)) السیرە ١/٢٥٧.

خاتوو خەدیجە ڕاستگۆترینی ئافرەتانە، بەڕاستی هەڵساوە بە ئەرکی باوەڕپێکردن، بۆیە خودا پاداشتی دەداتەوە وەك لە فەرمووودەی بوخاری و مسلم لە ابو هریرە هاتووە، دەڵێ: ((جبریل هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە خەدیجەیە دێت بۆلات، دەفرێکی پێیە پێخۆر یا خۆراك یا خواردنەوەی تیایە، کاتێ هاتە لات سەلامی خودا و منی پێڕابگەیەنە، وە مژدەی کۆشکێکی پێبدە لە مرواری، نە دەنگە دەنگ و گاڵە و نە ماندوویێتی و ئازاری تیایە)) متفق علیە. شرح السنە ١٤/١٥٥.

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو هۆشی دەخاتەگەڕ، لەکاتی پێویست و هەڵوێست وەرگرتندا بۆچوونی خۆی پێدەڵێ، کە لەوانەیە لەوکاتە لە هەموو کات زیاتر پێویستی بە کەسێك بێت ڕێنمایی بکات، بەمەش ئەم ئافرەتە چاکەیەکی گەورە لەگەڵ مێردی دەکات. ئەوەتا دایکی باوەڕداران ام سلمە لەگەڵ پێغەمبەرە ﷺ لە ساڵی شەشەمی کۆچی، لە گەشتەکەی بۆ مەککە بۆ ئەنجامدانی عومرە، کە لەم گەشتەدا بوو قورەیشی مەککە قەدەغەی پێغەمبەر ﷺ و یاوەرانی کرد لە چوونە ناو کەعبە، لە ئەنجامدا پەیمانی حودەیبیە بەسترا لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و قورەیش، بەپێی ئەم پەیمانە بڕیاردرا بۆ ماوەی ١٠ ساڵ شەڕ بوەستێنرێ و ئاشتی لە نێوانیاندا بێت، تیایدا خەڵك بە ئاسایشەوە بژین، کەس پەلاماری کەس نەدات....، وە ئەم ساڵیش موسڵمانان بگەڕێنەوە و نەچنە ناو مەککە...هتد، پێغەمبەر ﷺ بەهۆی دانایی و بەرچاو ڕۆشنییەکەی بە ڕێنمایی خوا دەیزانی ئەم پەیمانە کە بە ڕواڵەت ئاشتیەکی سلبیە بۆ موسڵمانان، خێر و سەرکەوتنی گەورەی تیایە بۆ موسڵمانان.

هەرچی هاوەڵەکانن، قورسایی و غەمێکی زۆر دایگرتن کاتێ دەقی پەیمانەکەیان خوێندەوە و بینیان زەوتکردنی مافیانی تیایە، وێڕای ئەوەی ئەوان سەرکەوتوو و زاڵن. عومەر ﷺ گوزارشتی کرد لە تورەیی هاوەڵان و هاتە لای ابوبکر ﷺ لێی پرسی: ئایا ئەو پێغەمبەری خوا نییە؟ ابوبکر وتی: بەڵێ، وتی: ئەی ئێمە موسڵمان نین؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەی ئەوان هاوبەش بریاردەر نین؟ وتی: بەڵێ، وتی: باشە بۆچی نزمایەتی و کەمایەتی نیشان دەدەین لە ئاینەکەمان؟ ئەبوبکر هۆشداری دایە و وتی: ئەی عمر، پابەندبە بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ" چونکە من گەواهی دەدەم کە پێغەمبەری خوایە، عمر وتی: منیش گەواهی دەدەم ئەو پێغەمبەری خوایە، پاشان عمر رۆیی و هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و هەمان پرسیاری کرد کە لە ابوبکری کردبوو، تا گەیشتە ئەوەی وتی: (ئەی لەبەرچی کەمایەتی و نزمی نیشان دەدەین لە ئاینەکەمان؟) پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوە: من پێغەمبەری خوام و سەرپێچی فەرمانی خوا ناکەم، خوداش وێڵم ناکات)) السیره ٣٣١/٣ وفتح الباری ٢٨١/٦ ومسلم ١٤١/٢.

لەوێ عمر هەستی بە هەڵەی خۆی کرد لە بەرهەڵستیکردنی بۆ ئەم پەیمانە، هەمووجار دەیوت: تا ئێستاش خێردەکەم و بەڕۆژوو دەبم و نوێژ دەکەم و کۆیلە ئازاد دەکەم لە بری ئەو کارە و ئەو قسانەی لەو رۆژە کردم، تا ئومێدم کرد ببێتە مایەی خێر بۆم. السیره ٣٣١/٣.

کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە واژووکردنی پەیمانەکە بوویەوە، فەرمانی کرد بە هاوەڵان هەڵسن و قوربانی بدەن، سەریان بتاشن، بەڵام تەنانەت یەك پیاویش هەڵنەستا، سێ جار ئەم فەرمانەی وتەوە. کەچی کەس وەڵامی نەدایەوە. پێغەمبەر ﷺ چووە لای ام سلمەی خێزانی و ئەمەی بۆ باسکرد. لێرە ژیری ام سلمە دەردەکەوێ کاتێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بڕۆ دەرەوە و قسە لەگەڵ کەس مەککە، تا حوشترەکەت سەردەبڕی و سەرت دەتاشی. پێغەمبەریش ﷺ بە قسەی ام سلمە کرداری کرد، کاتێ هاوەڵان ئەمەیان بینی، هەرکەسە و بە پاڵنان و بە پەلە هەڵسان و ئاژەڵیان سەربڕی، سەری یەکتریان دەتاشی، تا خەریك بوو لە خەفەت و مەراق و پەشیمانی هەندێکیان هەندێکیتریان بکوژن. زاد المعاد ٢٩٥/٣ والطبراني ١٢٤/٢.

پاشان موسڵمانان گەڕانەوە بۆ هۆشی خۆیان و دەرکی قووڵی تێڕوانینی پێغەمبەر ﷺ یان کرد لە بەستنی ئەم ئاشتینامەیە کە بوو بە سەرکەوتنێکی مەزن" چونکە ژمارەی ئەوانەی هاتنە ناو ئاینی خوا پاش ئاشتینامەی حودەیبیە زۆر زیاتربوون لەوانەی پێشتر موسڵمان ببوون. لە صەحیحی مسلم هاتووەن کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿إِنَّا فَتَحنَا لَكَ فَتحًا مُبِينًا﴾ کە ئەو فەتحە ئاشتینامەی حودەیبیە بوو، پێغەمبەر ﷺ ناردی بە شوێن عمر و بۆی خوێندەوە، عمر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم ئاشتینامەیە دەبێتە هۆی سەرکەوتن؟ فەرمووی: بەڵێ، ئنجا بە دڵخۆشی گەڕایەوە. مسلم ١٤١/١٢.

## هانی دەدات بۆ بەخشین و خەرجکردن لە پێناوی خوا

یەکێ لە پاڵپشتی کردنەکانی ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو بۆ مێردەکەی، هاندانیەتی لەسەر بەخشین لە ڕێی خوا، نەك هاندانی لەسەر زیادەخەرجی و ماڵ بە هەدەردان و خەرجکردنی لە شتی زیادە و بێسوود بۆ فیز و خۆهەڵکێشان، وەك چۆن ئەم دیاردەیە لەلای زۆر لە ئافرەتانی دوور لە ڕێنمایی خوا دەبینین.

لەبەرئەوەی هەمیشە ئافرەتی موسڵمان خێر و چاکە و سەرکەوتنی بۆ مێردەکەی دەوێت، هانی دەدات بۆ زۆر ئەنجامدانی کاری چاکە، باوەڕی بەوە هەیە کە لە پاڵنانی مێردەکەی بۆ کاری چاکە ڕێز و پلەوپایەی زیاد دەبێت لە دونیا و پاداشتی نەبراوەشی دەبێت لە ڕۆژی دوایی. یەکێ لە نمونەی ئەو هەڵوێستانە، هەڵوێستی ( دایکی دەحداحە) کاتێ مێردەکەی هاتەوە و پێی وت: کە ئەو ڕەزەی خۆی و منداڵەکانی تیا نیشتەجێن بەخشیویەتی بە ئومێدی بەروبووم و هێشووی بەهەشت (مسلم ٧/٣٣)، لەو کاتە وەڵامی ئەو ئافرەتە ئەوەبوو: کڕین و فرۆشتنەکەی بردەوە، کڕین و فرۆشتنەکەی بردەوە. لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((چەندە زۆرن ئەو هێشووانەی بۆ باوکی دەحداح دانراوە لە بەهەشت، چەندین جار ئەم قسەیەی دوپاتکردەوە)) احمد والطبراني (مجمع الزوائد ٣٢٤/٩).

## پاڵپشتی دەکات لە گوێڕایەڵی بوونی بۆ خوا

ئـافرەتی موسـڵمانی تێگەیـشتوو پاڵپـشتی مێردەکـەی دەکـات لـە شـێوە جۆربـەجۆرەکانی گوێڕایەڵی بوونی بۆ خوا، بەتایبەتی لە شـەونوێژکردن، بەمـە سـوودێکی گـەورەی پێدەگەیـەنێ" چونکە ئەو شتانەی دێنێتەوە یاد کە لێی بێ ئاگایە یان سستی لێ دەکات، ئەم کارە دەبێتە هـۆی ئەوەی هەردووکیان بچنە ژێر باڵی میهر و بەزەیی خواوە. بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: (( خودا ڕەحم بکات بەو پیاوەی لە شەوا هەڵسا و نوێژی کرد، خێزانەکەشی بـە ئاگاهێنـا و ئـەویش نوێژی کرد، ئەگەر هەڵنەستا ئاو دەپرژێنێ بە ڕووخساریدا، وە خودا ڕەحـم بکـات بـەو ژنـەی لـە شەوا هەڵسا و نوێژی کرد و مێردەکەشی بەئاگا هێنا و نوێژی کرد، ئەگەر هەڵنەستا ئاو دەپرژێنێ بە ڕووخساریدا)) ابو داود ١/٤٥ والحاكم ١/٣٠٩.

## دڵ و دەروونی پڕدەكات

لای ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر شاراوە نییە کە بەرزترین کردەوەی لە ژیان لـەپاش پەرستـشی خودا، سەرکەوتنیەتی لە چوونە ناو دڵی مێـردی، دڵ و دەروونـی پڕدەکـات، تـاوەکوو لـە نـاخی دەروونیدا هەست بکات دڵخۆشە بە هاوسەرێتی ئەم ئافرەتـە، لـە ژیانیـدا بەختـەوەرە، لەگەڵێـدا کامەرانە، لێرەوە ژیری خۆی بەکاردێنێ بۆ زانینی ئەو شێواز و هۆکارانەی کلـیلن و دڵـی مێـردی دەکەنەوە، بە سـانایی لێـی نزیـك دەبێتـەوە، لەسـەر عەرشـی دڵـی بـە بەختـەوەری و دڵنیـایی دادەنیشێ.

دەزانێ چاکترین ڕابواردن و خۆشی ژیانە لە هەستی پیاودا، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی.

بەڵام ئەگەر نەزانێ چۆن بچێتە ناو دڵی مێردی و دەروونی پڕبکات، ئەوا زۆربـەی جـار دەبێتـە سەرچاوەی بەدبەختی و پەژارە و ناخۆشی بۆ مێردی، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووی: ((سێ شـت مایەی بەختەوەری ئادەمیزادە، سێ شـتیش مایـەی بەدبەختیـەتی. لـە بەختـەوەری ئـادەمیزاد: ئـافرەتێکی چـاك و صـاڵحە، مـاڵێکی چـاك، ئـامرازی گواسـتنەوەی چـاك. لـە بەبەختیـەکانی ئادەمیزاد: ئافرەتی خراپ، ماڵی خراپ، ئامرازی گواستنەوەی خراپ)) احمد ١/١٦٨.

لەم ڕوانگەیەوە چاکەکاری ئافرەت لەگەڵ مێردی و چوونە ناو دڵی لە دینداریە" چونکە لەمەوە بێگەردی و پاراستنی پیاوی تیایە، هەروا بناغەی خێزان پتەو و توندوتۆڵ دەکات، مایەی بەختەوەرییە بۆ مێردی و منداڵەکانی.

کاتێ ئافرەت بە سروشتی خۆی حەزبکات دڵی پیاو داگیربکات، کە بەمە سروشتە مێیانەکەی ڕازی دەکات، تیایدا حەزی سەنج ڕاکێشان و کەمەندکێشکردنی تێراو دەکات، ئەوا ئافرەتی موسڵمان تەنها لە ئاست ئەم هۆکار و حەزانە ناوەستێ، بەڵکو لە ڕاکێشانی دڵی پیاوی ڕەزامەندی خوا بەدی دەکات" چونکە خودا چاکەکاری و ئەمەکداری لەگەڵ مێردی بە دینداری ئەژمارکردووە و لێپرسینەوەی لەسەرە، بۆیە سستی ناکات و هەوڵدەدات ئەوپەڕی خۆشەویستی بۆی نیشان بدات و خۆی لەلا خۆشەویست دەکات، بەهۆی ڕواڵەتی پاك و جوانی، گوفتاری ڕێك و شیرینی، مامەڵەی بەرز و شیاو.

## خۆی بۆ دەڕازێنێتەوە

ئافرەتی موسڵمان بە هەموو جۆرەکانی خشڵ و هۆکارەکانی خۆجوانکردن خۆی بۆ مێردی دەڕازێنێتەوە، بەجۆرێك جوان و قەشەنگ و ناسك خۆی نیشان بدات، چاوی مێردی شادبکات، خۆشی بخاتە دڵی، دەروونی پڕبکات لە بەختەوەری. ئافرەتانی چاکی بەرایی و خواپەرستان و قورئانخوێنان بەم شێوەیە بوون، لەسەرووی هەموویانەوە خاتوو عائشە و هیتر" (بەکرەی کچی عوقبە) هاتە لای خاتوو عائشە و لەبارەی خەنە لێی پرسی، خاتوو عائشە وتی: دارێکی بۆنخۆشە و ئاوەکەی خاوێن و پاکە. هەروا لەبارەی هاڵکێشانی موو لێی پرسی، خاتوو عائشە وتی: ئەگەر خاوەن مێرد بووی، ئەوا ئەگەر بکرێ چاوەکانت دەربێنی و لە جێگایدا هی جوانتر دابنێی، بیکە[1].

دەی با ئافرەتانی کەمتەرخەم و سست لە خۆڕازاندنەوەیان بۆ مێردیان ئەم ڕێنماییەی خاتوو عائشە ببیستن، با بزانن خۆڕازاندنەوەیان بە پلە یەك دەبێ بۆ مێردەکانیان بێت، نەك بۆ هاورێکانیان و دەستەخوشکان و چوونە دەرەوەیان، ئەو ئافرەتانەی سستن لە خۆجوانکردن بۆ

---

[1] أحكام النساء لابن الجوزي: ٣٤٣.

مێردەکانیان گوناهبارن" چونکە یەکێ لە واجب و ئەرکە گەورەکانی مێرد فەرامۆش دەکەن، لەوانەشە بەهۆی ئەم کەمتەرخەمیەیان مێردەکانیان لارە ڕێ بن و چاوبڕنە ئافرەتانیتر.

ئەو ژنەی مێردەکەی تەنها پرچێکی قژن، ڕووخسارێکی بزرکاو، جلێکی نارێکی لێ دەبینێ، خراپەکار و دەبەنگ و بێهۆشە، کەچی کاتێك مێوانی دێت یا دەچێتە ئاهەنگێك پەلە دەکات لە خۆجوانکردن و خۆرێکخستن، لەکاتێکا لە زۆربەی کاتەکانیدا شێوە و جوانییەکەی و ڕازاوەییەکەی بۆ مێردی فەرامۆشکردووە، بەڵام وا تێدەگەم ئافرەتی بێدار بە ئاینەکەی بەدوورە لەم کەمتەرخەمیە، چونکە چاکەکار و ئەمەکدارە بۆ مێردی، بێگومان چاکەکاری لەگەڵ مێرد لە دڵی ئافرەتی موسڵمانی خۆشەویست و ژیر کۆنابێتەوە لەگەڵ کەمتەرخەمی و فەرامۆشکردنی ماف.

یەکێ لە ڕێنمایی‌کانی ئەم ئاینە بۆ ئافرەتی موسڵمان ئەوەیە خۆی بۆ مێردی برازێنێتەوە، بەجۆرێك ئەوەی پێی خۆش نەبێ نەیبینێ" بۆیە لەسەری یاساغ کردووە بە جلی ڕەش و تازیەباری زیاتر لە سێ ڕۆژ بمێنێتەوە، مەگەر بۆ مێردی بێت، لەو کاتەدا ڕێگای دراوە ماوەی چوار مانگ و ١٠ ڕۆژ بە تازیەباری بمێنێتەوە، وەك هاتووە لەو فەرموودەیەی بوخاری گێراویتیەوە لە زەینەب کچی ام سلمە، وتی: چوومە لای زینب کچی جەحش خێزانی پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەی براکەی مردبوو، داوای گوڵاوی کرد و خۆی بۆنخۆشکرد، پاشان وتی: هیچ پێویستیەکم بە گوڵاو نەبوو، بەڵام گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەسەر مینبەر دەیفەرمووو: ((ناشێ بۆ ئافرەتێك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت زیاتر لە سێ شەو بە تازیەباری بمێنێتەوە تەنها بۆ مێردی نەبێت کە چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیەبار دەبێت)) فتح الباری ٤٨٤/٩.

**بەڕووی خۆش و سوپاسگوزارییەوە پێشوازی لێ دەکات**

یەکێ لە هۆکارەکانی خۆڕازاندنەوەی ئافرەتی موسڵمان بۆ مێردی: ڕووخۆشی و قسە خۆشی و شایی و بەزمە، دەبێ بەمانە هەموو ژیانی پڕبکات، وابکات بەختەوەر و دڵخۆش بێت، کە دەگەڕێتەوە ماڵ بە ڕوویەکی گەشاوە و خەندەیەکی جوان، وشەیەکی پاك و ناسك پێشوازی لێ دەکات، بەجۆرێك هەندێ لە غەمەکانی لەبیرباتەوە، ئەوەندەی لە توانا دابێت بە ڕووی خۆش و زەردەخەنەوە پێشوازی لێ دەکات، تا دڵی بۆ بەختەوەری و خۆشی ژیان بکرێتەوە، وشەی

سوپاسگوزاری و ئەمەکداری بە گوێیدا دەچرپێنێ لەو کاتانەی خێر و خۆشیەکی لێی دەستدەکەوێت یا دیاریەکی پێشکەش دەکات یا هەر شتێك شایانی سوپاسگوزاری بێت.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر ئەمەکدار و دانایەو نازانێ ناسوپاسگوزار و بێئەمەك بێت بەرامبەر هیچ کەسێك" چونکە ئاینەکەی دەیپارێزێ لە خزانە ناو ڕەفتاری ناشیرین و خراپ و نکۆڵی کردن لە چاکە و دان نەنان بە فەزڵ و چاکەی بەرامبەر، جا چۆن لەگەڵ مێردی خۆشەویستی و هاوڕێی ڕێگا و گەشتی درێژی وادەبێت؟!

لەم فەرموودەیە تێگەیشتووە کە دەفەرمووێ: ((سوپاسی خوای نەکردووە ئەوەی سوپاسی خەڵك نەکات)) البخاري في الادب المفرد ١/٣١٠. چۆن سوپاسی مێردی ناکات کاتێ ئەم فەرموودەیە دەبیسێ: ((خودا بەرەحمەت سەیری ئەو ئافرەتە ناکات کە سوپاسی مێردی ناکات، لە کاتێکا ناتوانێ دەستبەرداری بێت و بێ ئەو ژیان بەرێتەسەر)) الحاكم ٢/١٩٠.

### بەشداری خۆشی و ناخۆشیەکانی دەکات

لەو شتانەی ئافرەتی موسڵمان پێی دەچێتە ناو دڵی مێردی و دەروونی پڕدەکات: بەشداری کردنیەتی لە خۆشی و ناخۆشیەکانی، لە خەم و بەختەوەریەکانی.

بەشداری دەکات لە هەندێ ئارەزووو و کارەکانی ڕۆژانەی، وەك خوێندنەوە و وەرزش و گوێگرتن بۆ هەندێ گوفتاری بەسوود...هیتر، بەجۆرێك ئەو مێردە هەست بکات بەتەنیا نییە لە چێژی ئەو خۆشیانەی ژیان، بەڵکو هاوسەرێکی ئەمەکدار و خۆشەویست و ڕۆشنبیر ئەو کاسە پڕ لە خۆشیەی لەگەڵ دەنۆشێ.

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ چەندین جار پێشبڕکێی ڕاکردنی لەگەڵ خاتوو عائشە ئەنجامداوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر هاندانی ئیسلام بۆ بەشداریکردنی هەردووکیان لە خۆشیەکانی ژیان" چونکە ئەم بەشداریکردنە کاریگەری زۆرە لەسەر ئاودانی سۆز و خۆشەویستی هاوسەرێتی، پتەوکردنی پەیوەندیەکان، بەهێزکردنی ئەڵقەکانی.

وەك چۆن بەشداری دەكات لە خۆشیەكانی، ئاوەهاش بەشداری خـەم و ناخۆشـیەكانی دەكـات، پالپشتی دەكات بە وشەی جوان و خۆش و دلنەوایی‌كار، ڕاو بۆچوونی تیرئەنداز، ئەمانـە لـە پـالّ سۆزی ڕاستگۆیانەی دلّ.

## چاوی دەپاریزی لە بیجگە لە میردی

ئافرەتی موسلمانی پاریزكار چاوی دەپاریزێ لـە بیجگـە لـە میـردی. چـاوی نابریتـە پیـاوانی نامەحرەم، كرداردەكات بەم ئایەتە: ﴿وَقُـل لِلمُؤمِنَـاتِ يَغضُـضنَ مِـن أبـصَارِهِنَّ ...﴾. ئـەم چـاو پاراستنەی لە سەیركردنی پیاوی بیگانە، خاسیەتیكی خۆشەویستە لەلای پیاوان" چونكە بەلگەیـە لەسەر پاكی و بیگەردی هەست، ساغی و سەلامەتی بینایی و سپاردەكەی، بەلكو ئـەم خاسـیەتە لە جوانترین خاسیەتەكانی موسلمانی خاوینی بیگەردە" بۆیە خودا ئاماژەی پیكردووە كاتێ باسـی ئافرەتانی بەهەشـت دەكـات و باسـی خاسـیەتە خۆشەویـستەكانیان دەكـات لـەلای پیـاوان، كـە دەفەرمووێ: ﴿ فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرفِ لَم يَطمِثهُنَّ إنسٌ قَبلَهُم وَلاَ جَانٌّ. واتا: ئـافرەتی چـاوپاریزی تیایە كە بیجگە لە میردەكانیان سەیری پیاوی‌تر ناكەن و پیاوی‌تریان ناویت، ئەم ئافرەتانە پیـشتر نە ئادەمیزاد نە پەری دەستی لیٚ نەداون و لەگەلیان جوت نەبوونە﴾ الرحمن: ٥٦.

## باس و خاسیەتی ئافرەتی‌تری بۆ ناكات

یەكێ لە ڕەوشتەكانی ئـافرەتی موسـلمانی تیگەیـشتوو ئەوەیـە: باسـی (وەصـفی) ئافرەتـانی دەستەخوشك و خزم و كەسی ناكات بۆ میردی" چونكە پیغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((با ئـافرەت سەیری لەش و لاری ئافرەتی‌تر نەكات، پاشان بۆ میردەكەی باسـی بكـات، وەك بلیـی وا سـەیری دەكات)) فتح الباری ٣٣٨/٩. " چونكە ئیسلام دەیەویت ویژدانەكان سەقامگیر بن، دلەكان ئـارام بن، بیروهۆش و خەیالە ووروژینەرەكان سنوردار بن، تـا مـرۆڤ بەڕاسـتی و ئـارامی و دلنیـایی لـە ژیانیدا بڕوات، خەیالی حەساوە بیت، بە ئاسانی ئەو كار و ئەركانەی بۆی دروستكراوە ڕاپەڕینیٚ، بیروهۆشی سەرقالّ نەبیت بە شـتی پـوچ و بیٚواتـای شـتی باسـكراو، بـە بیروهۆشـی سەرشـیتانە ناكەویتە دوای خەیالی باسكراو، دەروونی ناشلەژینن و كردار و بـەهرەكانی پـەك ناخـات بـەهۆی قسەی زیادە و بیٚسوود كە لەوانەیە ڕاپیپیچیٚ بەرەو گومڕایی و خراپەكاری.

## ئارامی و حەسانەوەیی و دڵنیایی بۆ دابین دەكات

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر تەنها بە خۆڕازاندنەوە و بەشداریکردنی لە هیوا و ئارەزووو و کـار ناوەستێ، بەڵکو ئارامی و هێمنی و دڵنیایی لە ماڵ بۆ بەرقەرار دەكات، هـەروا هەوڵـدەدات لـە ماڵەكەیدا چاوی تەنها شتی ڕێك و پێك و خـاوێن ببینـێ، ڕێكخـستن و زەوق و سـەلیقە ببینـێ، منالّی خوڕەوشت جوان و پاك و خاوێن ببینێ، خوانی جوان و ڕازاوە ببینێ....تا دوایـی، ئەمانـە هەمووی دەچنە بازنەی چاكەكاری و ئەمەكداری لەگەڵ مێرد كە ئیسلام فەرمانی پێكردووە.

ئەوەش لەبیری ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو شاراوە نییە كە هاوسەرگیری یەكێكە لە ئایـەت و بەڵگە و نیشانەكان لەسەر دەسەلاّتی خوای گەورە، وەك دەفەرمووێ: ﴿وَمِن آيَاتِهِ أن خَلَقَ لَكُم مِن أنفُسِكُم أزوَاجًا لِتَسكُنُوا إلَيهَا وَجَعَلَ بَينَكُم مَوَدَّةً وَرَحمَةً. واتـا: یەكێ لە بەڵگە و نیـشانەكانی دەسەلاّتی خوای گەورە ئەوەیە لە خودی خۆتان هاوسەری بۆ هێنانە بوون تا لـەپاڵیا ئـارامبگرن و لە نێوانتان ئەوپەری خۆشەویستی و میهر و بەزەیی داناوە﴾ الروم: ٢١.

هاوسەرگیری پەیوەندی گیانە بە گیان لە قووڵترین پەیوەندیەكانی، كە خودا لە نێـوان دووگیانـا گرێی دەدات، تاوەكوو چێژی ئارامی و دڵنیایی و سـەقامگیری و خۆشـی و چـێژی حـەلاڵ بكـەن. ئافرەتیش تاكە شوێن و هۆكاری ئاسایش و حەسانەوەی پیاوە لە ماڵی هاوسـەرێتی خۆشەویـست، كە ئاوەدانە بە ئەویندارى دڵسۆز و سێبەری بەزەیی بەسـۆز. ئـافرەتی موسـڵمانی تێگەیـشتووش باشترین كەسە لەم واتا بەرزە تێبگات، باشترین كەسیـشە ئـەم واتایـە بەرجەسـتە بكـات لەسـەر زەمینەی ڕاستەقینەی ژیانێكی گەشاوە و بەختەوەر.

## لێبوردە و دڵنەرمە

ئافرەتی موسڵمان دڵنەرم و لێبوردەیە، لە هەڵـە و كـەم و كورتیـەكانی مێـردی ئەگـەر هـەبن دەبـورێ، ڕق و كینـە لـە دڵـی هـەڵناگرێ، زوو زوو كـەم و كوڕیـەكانی ناخاتـەوە یـاد، هـیچ خاسیەتێكیش ئەوەندەی دڵ نەرمی و لێبوردەیی دڵی پیاوی بۆ نابێتـەوە، وە هـیچ خاسـیەتێكیش ئەوەندەی شت لە دڵ هەڵگرتن و یادخستنەوەی خراپەكان و كەم و كوڕیـەكان دەرگـای دڵـی پیـاو داناخات.

ئافرەتی موسڵمان لەلای ئەم ئایەتە دەوەستێ: ﴿وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ. واتا: با لێبوردە بن و لە هەڵە و کەم و کوڕی خۆش بن، ئایا حەزناکەن خودا لێتان خۆش بێت﴾ النور: ٢٢. ئەو جۆرە ئافرەتە شایانی ئەوەیە لەسەر عەرشی دڵی مێردەکەی دانیشێ، هەر ئەمیش ئەو دروستکراوەیە بتوانێ دەروونی پڕبکات لە خۆشی و بەختەوەری و شادی.

## خاوەن کەسایەتیەکی بەهێز و دانایە

دیارترین ئەو شتانەی ئافرەتی موسڵمانی روناکبیر بە ئاینەکەی جیادەکاتەوە: هێزی کەسایەتی و پێگەیشتوویی بیروهۆش و ڕەفتاری ڕێك و ڕاستە. بەم خوڕەوشتانە ئافرەتی موسڵمان پێش شووکردن و پاش شووکردن خۆی دەڕازێنێتەوە" چونکە ئەمانە بەرهەمی تێگەیشتنێتی لە ئاینەکەی و پەیامەککەی.

**خاوەن کەسایەتیەکی بەهێزە لە قۆناغی هەڵبژاردنی هاوسەر**، ناتوێتەوە و لاواز نابێت لەبەردەم داخوازی دایك و باوکی ئەگەر لە حەق و ڕاستی لایاندا و ویستیان لە شتێك ناچاری بکەن ویستی لەسەرنییە. هەروا کەسایەتیەکەی لاواز نابێت بەرامبەر ئەو پیاوەی دێتە داوای، وێڕای ماڵ و پلەوپایەی بەرزی، ئەگەر خاسیەتەکان و مەرجەکانی مێردی موسڵمانی ڕاستەقینەی تیا دەستەبەر نەبوو.

دوای شووکردنیش هەر کەسایەتیەکەی بەهێزە، بەهۆی خوڕەوشتە جوان و ڕێك و پێکەکانی، گوێڕایەڵی بوونی بۆ مێردی. هێزی کەسایەتیەکەی بەتایبەتی لەوکاتە دەردەکەوێ کە کارێك پێویستی بە جیاکاریەك هەبێت پەیوەندی بە بیروباوەڕ و ئاینەکەی هەبێت. وەك هەڵوێستی ام سلیم کچی میلحان کە دەستگربوو بە ئاینەکەی کاتێ مێردەکەی لەسەر بێ باوەڕی مایەوە. هەروا چەسپاوی ام حبیبە لەسەر ئاینەکەی لەو کاتەی مێردەکەی لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە و بوو بە مەسیحی. ئەمجارە وەك سووربوونی بەریرە لەسەر جیابوونەوەی لەو مێردەی خۆشی نەدەویست.....

پاڵنەری سەرەکی ئەم ئافرەتە بەرزانە لەسەر دەستگرتن بە هەڵوێستە بەهێزەکانیان: سووربوون بوو لەسەر ساغی و سەلامەتی بیروباوەڕ و دواتر ڕازی کردنی خودا بوو. چونکە هەریەك لەوانە بەدوای حەڵاڵ دەگەڕا لە ژیانی هاوسەرایەتی، لە کەوتنە ناو حەڕام دەترسا ئەگەر زەماوەندی کرد لەگەڵ پیاوێك باوەڕی نییە بە ئاین و بیروباوەڕی، یان ئەگەر کەم و کورتی هەبێت لە مافی ئەو مێردەی خۆشی ناوێت یا ناتوانێ ژیانی لەگەڵ بەرێتەسەر. وە ئەگەر هێزی کەسایەتی و هەستی بەرزی دەروونی باوەڕداری نەبوایە، ئەوا ملکەچی فەرمانی مێردە گومڕاکەی دەبوو و لە ڕێچکە خوار و خێچەکانی گومڕایی ون دەبوو، یاخود کاسەی بەدبەختی و چارەڕەشی لەگەڵ ئەو مێردە دەخواردەوە کە دڵی نابێتەوە بۆ ژیان بردنەسەر لەگەڵی، جا لە هەمووکات و شوێنێکدا دەبێ ئەمە کاری ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بێ.

بەڵام هێزی کەسایەتی کە ئافرەتی موسڵمان پێوەی دەڕازێتەوە لای نادات لە خاسیەتە تایبەتیەکەی لە گوێڕایەڵی بوونی بۆ مێردی و بەچاکە ژیان بردنەسەر و ئەمەکداری و بەگەورەگرتنی، بەڵکو هێزی کەسایەتیەکەی وای لێ دەکات هاوسەنگ و دانا بێت لە گوفتار و ڕەفتاری لەگەڵ مێردی، سەرشێتی و لاری و سوکایەتی پێکردنی تیانییە، هەتا لە کاتەکانی توڕەبوون کە بێگومان ژیانی هاوسەرایەتی لێی بێبەش نییە، لەو کاتانەش ئافرەتی موسڵمان دان بەخۆیدا دەگرێت، هیچ هێما و قسەیەکی خراپی لێ دەرناچێ کە هەستی مێردی بریندار بکات، ئەمەیە کەسایەتی بەهێز و هاوسەنگ و میانڕەو.

سەیری خاتوو عائشە بکە لەکاتی توڕەیی و لەکاتی شێنەیی چەندە بەڕێز و ئەدەبە، کە پێغەمبەر ﷺ لێی تێبینی کردبوو، وەك خۆی لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی بە خاتوو عائشە: ((من دەزانم چ کاتێك لێم ڕازیت و چ کاتێك لێم توڕەی، خاتوو عائشە دەڵێ: جا لە کێ ئەمە دەزانی؟ فەرمووی: ئەگەر لێم ڕازی بیت دەڵێی: نا سوێند بە خوای محمد. وە ئەگەر لێم توڕە بیت دەڵێی: نا، سوێند بە خودای ئیبراهیم. خاتوو عائشە وتی: بەڵێ ڕاستە، سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا، تەنها ناوی تۆ ناڵێم)) مسلم ۲۰۳/۱۵.

**ئای لەو ئەدەبە بەرزە! ئای لەو خۆشەویستیە ساغە!**

هێزی کەسایەتی خاتوو عائشە لە ڕۆژی بوختانەکەی بۆی هەڵبەسترا لە هەموو کاتێك بەهێزتر دەردەکەوێ، ئەو بەڵایەی کە خودا کردیە تاقیکردنەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و سەرجەم ئوممەتی ئیسلام، تا کۆمەڵێك پێی بەرز بن و کۆمەڵێکیش پێی ریسوا بن، باوەڕدارانیش بەهۆیەوە باوەڕیان پتەوتر بێت، ستەمکارانیش تەنها زیانیان بۆ مایەوە.

لەم چیرۆکە هێزی کەسایەتی خاتوو عائشە دەردەکەوێ، لەگەڵ باوەڕە قووڵەکەی بە خوا و متمانەبوونی تەنها بە خوا کە پاکی و بێتاوانییەکەی ئاشکرابکات، ابن القیم لەم بارەوە دەڵێ: (( بۆ گشتگیرکردن و تەواوبوونی تاقیکردنەوە و بەڵایەکە پێویستی کرد بەوەی خودا ماوەی یەك مانگ سروش ڕابگرێ، لەم بارەیەوە هیچ شتێك لە سروش بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ دانەبەزی، تا ئەو حیکمەتەی خوا دەیەوێت تەواو بێت و بە تەواوترین شێوە دەربکەوێ، باوەڕدارانی ڕاستگۆ بەهۆیەوە باوەڕ و چەسپاویان زیاتر بێت لەسەر دادپەروەری و ڕاستگۆیی و گومانی باش بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی و ئال و بەیتی و بەندە ڕاستگۆکان، ئەمە لەلایەك، لەلایەکیتر دووڕووان تەنها درۆ و دووڕوویی زیاد بکەن، نهێنییەکانیان بۆ پێغەمبەر ﷺ و باوەڕداران ئاشکرا بێت، تاوەکوو ئەو پەرستشەی ویستراوە لە خاتوو عائشە و باوکی بەتەواوی و بێ کەم و کوڕی بێت و بەخششی خودایان لەسەر تەواوتربێت، وە تاوەکوو هەژاری و پێویستی و ویستیان بۆ خوا زیاتربێت، زیاتر ملکەچ بن بۆی و گومانی باشیان بە خوا هەبێ و ئومێدیان بەو بێ و ئومێدیان لە دروستکراوان بپچرا، بێ هیوابن لە سەرخستن و دەروکردنەوە لەسەر دەستی هەر دروستکراوێك بێت، جا ئەم پلەوپایەیە گەیشتە ئاستی خۆی کاتێ ئایەتی بێ تاوانییەکەی دابەزی، ابوبکر بە خاتوو عائشەی وت: هەڵسە لەبەر پێغەمبەر. عائشە وتی: سوێند بەخوا هەڵناستم بۆی و بێجگە لە خوداش سوپاسی کەس ناکەم، چونکە خودا بێ تاوانی منی دابەزاند.

هەروا یەکێ لە حیکمەتەکانی دانەبەزاندنی سروش، پاکتاوکرن و پوختەکردنی ئەم گرفتە بوو لە هەرچی نەنگ و گومان و کەم وکوڕی هەیە، دڵی باوەڕدارانیش لەم کاتانە زۆر بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی سروش بوون، پێغەمبەر ﷺ و ئال و بەیتی و ماڵی ابوبکریش و هاوەڵان و باوەڕداران لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیان بە سروش بوو، کاتێ دابەزی وەك بارانی ڕەحمەت بوو بۆ سەر زەوی

که چەندە پێویستیەتی، بۆیە جێگای خۆی گرت و دڵیان زۆر پێی شاد بوو، ئەم سروشە بەختەوەری بۆ هێنان، خۆ ئەگەر خودا لە ساتەکانی یەکەم سروشی دابەزاندبووایە، ئەم هەموو حیکمەتە و چەندانیتریش نەدەهاتە دی.

هەروا خودا ویستی وابوو پلەوپایە و ڕیزی پێغەمبەر ﷺ و ئال و بەیتی لەلای خۆی دەرخات، وە پێغەمبەر ﷺ لەو کێشەیە وەدەرنێ و خۆی سەرپەرشتی بەرگریکردن و وەڵامدانەوەی دوژمنان و ناحەزان بکات، بەشێوەیەك نەنگدار و ڕیسوایان بکات کە دەستی پێغەمبەر ﷺ و کاری ئەوی تیانەبێت، بەڵکو تەنها بە خۆی سەرپەرشتی هەموو ئەمانە بکات و تۆڵەی پێغەمبەر ﷺ و خاوخێزانی بکاتەوە. هەروا مەبەست لەم بوختانە ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ بوو، جا ناگونجێ هەر خۆی گەواهی پاکی بدات لەگەڵ ئەوەی دەشزانێ خێزای بێتاوان و پاکە و، هیچ کاتێك گومانی خراپی پێ نەبردووە، بۆیە فەرمووی: ((کێ سەرزەنشتم دەکات ئەگەر پاداشتی خراپەی پیاوێك بدەمەوە کە لەبارەی خاوخێزانم ئازارم دەدات، سوێند بەخوا بێجگە لە خێر هیچیترم نەزانیووە لە خاوخێزانم، وە باسی پیاوێکیان کردوە کە بێجگە لە خێر هیچیترم لێی نەزانیووە، لەگەڵ من نەبووایە هەرگیز نەدەهاتە ناو ماڵ و خاوخێزانم)). پێغەمبەر ﷺ هێندەی بەڵگە لەلابوو لەسەر بێتاوانی و پاکی خاتوو عائشە زیاتر لەوەی لەلای باوەڕداران بوو، بەڵام بۆ تەواوکرنی ئارامی و خۆڕاگری، سۆز و بەزەیی، گومانی باشی بە پەروەردگاری، متمانەی پێی، مافی ئەو پلە و پایانەی دا، تا ئەو کاتەی سروش دابەزی و دڵی پێ خۆشبوو، ڕیزی زیاتربوو، وە بۆ ئۆممەتەکەشی دەرکەوت کە چۆن خودا خۆی بەرگری لێ دەکات و سەرپەرشتی کاروبارەکانیەتی.

وە ئەگەر وردبینەوە لە قسەی خاتوو عائشە: (( سوێند بەخوا هەڵناستم بۆی و بێجگە لە خوداش سوپاسی کەسیتر ناکەم)) ئەوکاتە دەزانی زانیاری خاتوو عائشە لە چ ئاستێکدا بووە، هێزی باوەڕی چەندبووە، چۆن بەخششەکان دەگەڕێنێتەوە بۆلای خودا، لەم شوێنە تەنها خودا بە شایستەی ستایشی خۆی دەزانێ، یەکتاپەرستیەکەی تەنها بۆ خودایە، ئەوکاتە دەزانی هێز و ئازایەتی تا چ ڕادەیەك بووە! ئەم قسەیەی ئاماژەکردنە بە پاکی و بێتاوانییەکەی خۆی، واتا شتێکی وەهای نەکردووە پێویست بکات بە هەڵسان بۆی وەکوو کەسێك داوای زانستێك بکات و قووتابی بێت، وە لەبەر متمانەی تەواوی بە خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بۆی ئەم قسەیەی وتووە،

وەکوو ئاماژەیەك لەلایەن خۆشەویست بۆ خۆشەویستەکەی، کاتێ وای وت لەلای پێغەمبەر ﷺ زیاتر خۆشەویستبوو، ئەم خۆڕاگری و سەنگینییەی بۆ خودا بووە" چونکە خۆشەویسترین زاتە لەلای خاتوو عائشە و ئارامی لەسەر تورەبوونی ناگرێت. خاتوو عائشە بۆ ماوەی یەك مانگ دڵی هاوسەری خۆشەویستی لێ گۆڕا، کاتێ دوبارە ڕەزامەندی و ڕووکردنی لێ بینی، لەبەری هەڵنەستا و خۆشیەکەی دەرنەخست بە ڕەزامەندی و نزیکبوونەوەی، لەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستیەی بۆی، ئەمەش ئەوپەڕی خۆڕاگری و هێزە))[1].

بەڵێ، ئەمە ئەوپەڕی خۆڕاگری و سەنگینی و هێزی کەسایەتیە، جا ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر لە بەرامبەر مێردی خۆ بەکەمزانە، چاکەکار و ئەمەکدارە، خۆشەویستی و نەرمی بۆ دەردەبڕێ، گوێڕایەڵە، بەڵام کەسایەتیەکەی لەبەردەمی ناتوێتەوە، ئەگەرچی خۆشەویسترین خۆشەویست بێ، بەرزترینی هەموو کەس بێ لەلای تا خۆی لەسەر حەق بێت و دەستی گرتبێ بە پەتی بەتینی خوا، خاتوو عائشە بەرزترین نمونەی کەسایەتی ئافرەتی موسڵمانی شانازیکارە بە بیروباوەڕ و ئاینی نیشاندەدات، کە ڕاستەقینەیی پەرستنی بۆ خوا دەزانێ، دەزانێ ئەم پەرستشەی دەبێ تەنها بۆ خوا بێ.

کەس وا تێنەگات ئەم هەڵوێستەی خاتوو عائشە لوت بەرزی و خۆگرتنە لەوەی مێردی ڕازی بکات، بەڵکو سوود لە هەڵوێستی خاتوو عائشە وەردەگیرێ کە: ئەو عیززەت و بەرزییەیە ئیسلام بەخشیوویەتی بە ئافرەتی موسڵمان، ئەو ڕێزەیە کە سەرتاپێی گرتووە تا پابەند بێت بە شەرعی خوا و ئاینە ڕەواکەی و، پیادەی ڕێنماییەیە پڕ لە سوود و حیکمەتەکانی بکات، ئەمانە بوون هێز و بەرزی و ڕیز و دانایی بەخشی بە کەسایەتیەکەی.

ئیسلام هەموو مافێکی داوە بە ئافرەتی موسڵمان، ئەوپەڕی ڕیزی لێناوە، بەجۆرێك ئافرەتی ڕۆژئاوایی ئیرەیی (حەسودی) پێ دەبات ـ وەك چۆن پێشتر باسمان کرد ـ لە ساڵی ١٩٨٩ ڕۆژنامەی (الوطن الكويتية) لە نوال السعداوي پرسی: ئایا تۆ ئافرەتی ڕۆژئاوا بە پێشەنگ و سەرمەشق دەزانی بۆ ئەوەی چاویان لێ بکرێ؟ وتی: ((نەخێر، هەرگیز" چونکە ئافرەتی ڕۆژئاوایی

---

[1] زاد المعاد ٣/٢٦١ ـ ٢٦٤.

له هەندێك بوارا پێشكەوتووە، لە هەندێکیش دواکەوتووە، یاساکانی زەماوەند و هاوسەرگرتن لە ئەوروپا ستەم لە ئافرەت دەکەن، ئەمەش هۆکاری سەرهەڵدانی بزوتنەوەکانی ئازادکردنی ئافرەتە لەلایان، وە لە ئەمەریکا بزوتنەوەی زۆر بەهێز هەن، هەندێ جار دڕندانە و شەڕانگێزیشن)) پاشان وتی: ((ئاینی ئیسلام لە هەموو ئاینەکان زیاتر مافی ئافرەتی داوە، ڕێز و بەرزی بۆ مسۆگەرکردووە، بەڵام ئەوەی هەندێ جار ڕوودەدات ئەوەیە: پیاو وایکردووە هەندێ لایەنی ئەم ئاینەی تەرخانکردووە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی پیاوی باوکایەتی چینایەتی تیایدا پیاوان زاڵن بەسەر ئافرەتان)).

وا دەردەکەوێ لەم ستەمە باوکایەتیەی دکتۆرە السعداوی باسیکردووە کە بە هەندێ لە ستەمکردن دەشکێتەوە بۆ سەر ئافرەت، دەگەڕێتەوە بۆ نەفامی و نەشارەزایی ئەو جۆرە پیاوانە بە ڕێنماییەکانی ئیسلام و دووربوون لێی.

### لە سەرکەوتوترینی هاوسەرانە

ئەوانەی ڕابووری لە خوڕەوشتی ئافرەتی موسڵمانی بێدار و خاسیەتە فیکری و دەروونی و کۆمەلایەتی و ڕواڵەتیەکانی، دەرکەوت کە هاوسەرێکی سەرکەوتووە، لە هەموو هاوسەرێك سەرکەوتوترە، لە هەمووشیان خێر و فەڕی زیاترە بۆ پیاو.

چونکە بەهۆی تێگەیشتنی لەم ئاینە لەبارەی هەڵسان بە ئەرکەکانی مێردی، بەڕاستی دەبێتە باشترین هۆکاری ڕابواردن و خۆشی بۆ پیاو لە ژیانیدا، کاتێ دێتەوە ماڵ بە زەردەخەنەیەکی گەشاوە و سلاوێکی قەشەنگ پێشوازی لێ دەکات، وەکوو بەهار ڕووی تێدەکات و هەموو ژیانی دەڕازێنێتەوە بە گوفتاری خۆش، هێمای دڵنەوایی، ئاوڕدانەوەی لێهاتووانە، گاڵتەی خۆش، خۆڕازاندنەوەی جوان، شێوە و ڕواڵەتی سەرنج ڕاکێشەر، ماڵی ڕێك و پێك و خاوێن، قسە و گوفتاری مژدە ئامێزە، خوانی پڕ لە ئارەزووو، لە زۆربەی کاتەکانی لە جێگای ڕەزامەندی ئەودا دەبێت، خۆشی و بەختەوەری دەخاتە دەروونی.

بەڕاستی گوێڕایەڵە بۆی، چاکەکار و ئەمەکدارە، نەرم و نیانە، سوورە لەسەر ڕازیکردنی، نهێنی نادرکێنی، کاروباری لێ ناشێوێنی، لە کاتی تەنگانە بە ڕاو بۆچوونی تیرئەنداز پاڵپشتی دەکات و ئامۆژگاری دڵسۆزانەی پێشکەش دەکات، بە خۆشیەکانی دڵخۆش دەبێت، بە ناخۆشیەکانی خەفەتبار دەبێت، لە ڕواڵەت و ناوەڕۆکا چاو و دڵی تێردەکات، ژیانی پڕدەکات لە خۆشی و شادی، هانی دەدات لەسەر گوێڕایەڵی بوون بۆ خوا بە هەموو جۆرەکانییەوە، بە بەشداریکردنی لەگەڵی چالاکی دەخاتەبەر، چاکەکارە لەگەڵ دایك و باوکی و ڕێز لە خزم و کەسی دەگرێت، چاوی دەپارێزێ لە پیاوی بێگانە، بەرزترە لەوەی قسەی پڕوپوچ و بێ مانا و ناشیرین بکات، سوورە لەسەر دەستەبەرکردنی هێمنی و بێ دەنگی و ئارامی و دڵنیایی و سەقامگیری بۆ مێردی و منداڵەکانی، ئنجا کەسایەتی بەهێزە دوور لە وشکی و سروشت ناخۆشی، هەست ناسکە دوور لە نزمی و لاوازی، ئەوەی بەرامبەری ناچاردەکات ڕێزی بگرێت، لێبوردە و نەرم و نیانە، خراپە لەبیر دەکات، ڕق و کینە وەلا دەنێت.

لێرەوە هاوسەری موسڵمان بەڕاستی دەبێتە سەرکەوتوترین هاوسەر، دەبێتە بەخششی هەرەگەورەی خودا بۆ پیاو، دەبێتە ڕابواردن و خۆشیەك کە هیچ خۆشیەکیتر نایگاتێ، ڕاستی فەرمووە پێغەمبەر ﷺ: (( دونیا ڕابواردن و خۆشیە، وە چاکترین ڕابواردن و خۆشی ئافرەتی صاڵحەیە)) مسلم ١٠/٥٦.

## ٥. ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ منداڵەکانی

### دەستپێک

بێگومان منداڵ گلێنەی چاوی مرۆڤە، سەرچاوەی بەختەوەریە، ڕۆشنایی ژیانە، بەوانەوە ژیان خۆش و بەتام دەبێت، رزق پەیدا دەبێت، هیواکان بەوانەوە گرێ دەدرێن و دەروونەکان دڵنیا دەبن. ئەگەر پیاو لە منداڵەکانیدا پاڵپشتی و یارمەتی و کۆمەکی و زیادە و هێز بەدی بکات، ئەوا دایک هیوای ژیان و دڵنەوایی و خۆشی دڵ و ڕووناکی ژین و مسۆگەربوونی داهاتووو بەدی دەکات. ئەمانەش هەموو پەیوەستن بە چاك پەروەردەکردنی منداڵەکان، ساغی دروستکردنیان و ئامادەکردنیان بۆ ژیان، بەجۆرێك ببن بە تاکێکی بنیاتنەر و چالاك، خێریان بگەرێتەوە بۆ دایك و باوك و کۆمەڵگە و خەڵکی بەگشتی. بەمەش دەبنە ئەو جۆرەی خودا دەیەوێت، وەك دەفەرموووێ: ﴿الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا.... واتا: ﴿ ماڵ و منداڵ مایەی جوانی و خۆشبەختی ژیانی دونیان...﴾ الكهف: ٤٦.

بەڵام ئەگەر پەروەردەیان فەرامۆشکرا، کەسایەتیان بەخراپی دروستکرا، ئەوا دەبنە باڵگرانی لەسەر دایك و باوك و شەڕ و زیانێکی گەورە لەسەر کۆمەڵگە و خەڵك.

### پەی دەبات بە بەرپرسیاریەتیە گەورەکەی لە ئاست منداڵەکانی

ئافرەتی موسڵمانی ژیر دەزانێ بەرپرسیاریەتی ئەو لە پەروەردەکردنی منداڵ و دروستکردنی کەسایەتیان گەورەترە لە بەرپرسیاریەتی باوك، لەبەر نزیکی منداڵ لە دایکی و بەسەربردنی زۆربەی کاتیان لەگەڵی، وە لەبەر زانینی وردی دایکیان بە هەموو بار و جوڵانەوەیەکیان لە قۆناغی پێگەیشتن و هەرزەکاری ترسناك لە ژیانی عەقلی و سۆزی و هەڵس و کەوتیان.

لێرەوە ئافرەتی موسڵمان دەرکی بەرپرسیاریەتی تەواودەکات لە پەروەردەکردنی منداڵەکانی کە خوا گوزارشتی لێکردووە و دەفەرموووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ قُواْ أَنفُسَكُم وَأَهْلِيكُم نَارًا وَقُودُهَا

النَّاسُ وَالحِجَارَةُ.... واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سوتەمەنییەکەی مرۆڤ و بەردە...﴾ التحريم: ٦.

بەم پێیە دایك و باوکی بەرپرسیارکردووە لە پەروەردەکردنی منداڵەکان ـ بەتایبەتی دایك ـ بە پەروەردەیەکی ئیسلامیانەی ورد، نەش و نماکردنیان لە کەشێکی چاك و گونجاو، کە دامەزراو بێت لەسەر بناغەی بەهاڕەوشتیەکان، وەك مامۆستا و پێشەوامان پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((بەڵکو من نێردراوم تا بەهاڕەوشتیەکان تەواو بکەم)) البخاري في الادب المفرد ١/٣٧١.

هەروا زاناکان لەبارەی گەورەیی بەرپرسیاریەتی دایك و باوك بەرامبەر منداڵەکانیان و پەروەردەکردنیان بەشێوەیەکی شایان بە موسڵمانی پارێزکار، دەڵێن: هەر ماڵێك ئەم وتەیەی پێغەمبەر ﷺ ببیستێ: ((فەرمان بکەن بە منداڵەکانتان تا نوێژ بکەن لەو کاتەی تەمەنیان حەوت ساڵانە، وە لەسەر نوێژنەکردن لێیان دەن لەو کاتەی تەمەنیان دە ساڵانە)) احمد ٢/١٨٧ وابو داود ١/١٩٣، هەر ماڵێك ئەم فەرموودەیەی تێدا دوبارەبێتەوە و دایك و باوکیش پەلە نەکەن بۆ پیادەکردنی بە جوانترین شێوە، ئەوا ئەو ماڵە گوناهبار و کەمتەرخەمن، دایك و باوك لەسەر ئەم کەمتەرخەمی و فەرامۆشکردنە لەبەرامبەر خودا بەرپرسیار دەبن.

چونکە ئەو ماڵەی خێزانی تیا دەژی کۆمەڵگەیەکی بچووکە تیایدا دەروون و ئارەزوواتی تاکەکانی دادەڕێژرێتەوە، بیروهۆش و حەز و زەوقیان دروست دەبێت، لەو کاتەی هێشتا منداڵن و ئامادەنە بۆ وەرگرتنی وتەی ڕاست و ڕێنمایی و ئاڕاستەی دروست، لەم ڕوانگەوە ئەرکی دایك و باوك لەناو خێزان زۆر گەورە و ترسناکە لە داڕشتنەوەی دەروون و ئارەزوواتی کچان و کوڕانیان و چەسپاندن و ئاڕاستەکردنی هەنگاوەکانیان ڕووەو ڕێگای ڕاست و کردەوەی چاك.

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو هەمیشە پەی بردووە بە بەرپرسیاریەتیەکەی لە پەروەردەکردنی منداڵەکانی، زۆر لێهاتووبووە لە دروستکردنی پیاوان و کارتێکردنیان و گەیشتنە دڵیان و چاندنی بنەمای بەرز و جوان لە دەروونیان، بەڵگەش لەسەر ئەم قسانە ئەوەیە کە ئافرەتی بێداری چاك زۆر باشتر و چاکتر لە پیاوان منداڵیان پێگەیاندووە، تەنانەت پیاوێکی مەزنی ئەم ئوممەتە نادۆزیەوە کە

ڕکابەری سەختیەکانی ڕۆژگاریان کردووە و نێوچەوانی ڕووداوەکان بۆ پیاوەتیان ملکەچبووە، ئیلا دەبینی لەو هەموو پاڵەوانەتیە قەرزاری دایکی یان ژنەکەیەتی. ئەوە (زبیر بن العوام)ە قەرزاری دایکە مەزنەکەیەتی (صفیە کچی عبدالمطلب) کە سروشت و خاسیەتە جوانەکانی خۆی تێدا ڕواندووە.

عبداللە و المنذر و عروة کوڕانی زبیر بەرهەمی ماندووبوون و خوڕەوشتی ئەسمائی کچی ئەبوبکرن، کە هەریەکەیان شوێنەواری هەمیشەیی و پلەوپایەی سوپاسکراو و باسکراوی هەیە.

عبداللە کوڕی جعفر ﷺ گەورەی سوارچاکانی عەرەب و چاکترینی لاوەکانیەتی، هەر لە منالیەوە لە باوکی بێبەش بووە، دایکەکەی (ئەسمائی کچی عومەیس) لە باوەشی گرتووە، لە بەهارەوشتیەکان و ڕەفتارە چاکەکانی خۆی پێ بەخشیووە کە بەم خوڕەوشت و ڕەفتارانە ئەسما بوویە یەکێك لە ئافرەتە هەمیشە زیندووەکانی ئیسلام.

معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان، لە دایکەکەی هند کچی عوتبە هێزی کەسایەتی و ڕۆشنایی هزری وای وەرگرتووە کە لە باوکی دەستی نەکەوت، کاتێ هند نیشانەکانی زیرەکی و ژیری لە کوڕەکەی تێبینی کرد کە هێشتا منالّ بوو، پێیان وت: ئەگەر ئەم کوڕەت بژیێ دەبێتە گەورەی قەومەککەی، هند وتی: مەرگی ببینم و شینی بۆ بکەم ئەگەر نەبێتە گەورەی هۆزەکەی.

لەکاتێکا معاویە نەیتوانی ئەو سیاسەت و دانایی و دووربینییەی هەیەتی بیچەسپێنێ لە کوڕەکەی و جێنشینەکەی یەزید" چونکە دایکی ئافرەتێکی دەشتەکی سادە و ساکار بوو، معاویە تەنها لەبەر جوانییەکەی و هۆز و عەشیرەتەکەی خواستبووی.

هەروا برای معاویە (زیاد بن ابی سفیان) کە نمونەی زیرەکی و ژیری ودانایی بوو، نەیتوانی ئەم ڕەوشتە جوانانەی لە کوڕەکەی عبداللە بچێنێ، دواتر کوڕێکی دەبەنگ و گێل و بێهۆشی لێدەرچوو" چونکە مەرجانەی دایکی ژنێکی فارسی بووە، ئەو بەهرانەی پێنەبووە شایانی بکات ببێتە دایکی پیاوێکی مەزن.

هەروا مێژوو باسی دوو پیاوی گەورەمان بۆ دەکات لەبەرەی ئومەییە، یەکەمیان: عبداللە بن مروان کە ناسراوبوو بە دەستڕۆیی و ژیری و دانایی و لێهاتوویی، دایکەکەی ناوی (عائشەی کچی موغیرە کوڕی ابن العاص کوڕی ئومەییە) کە ئافرەتێك بوو ناسراوبوو بە بەهێزی کەسایەتی و ئەوپەڕی ویست و عەزیمەت و دڵ بێدار و ژیر. دووەمیان: عمر بن عبدالعزیز پێنجەمین جێنشینی ڕاشیدین کە ناسراوبوو بە دادپەروەری و خێر و چاکە و پارێزکاری، دایکەکەی (دایکی عاصم بن عمر بن الخطاب) بووە کە ڕێزدارترینی ئافرەتی ئەو کاتە بووە و خاوەنی جوانترین و تەواوترین خوڕەوشت و ڕەفتار بووە، دایکی ئەم ئافرەتەش ئەو ئافرەتە خواپەرستە پارێزکارەیە کە عمر خواستی بۆ عاصمی کوڕی چونکە ڕاستگۆیی و دامەزراوی تیا بەدیکرد لەو ڕۆژەی ڕازی نەبوو ئاو تێکەڵی شیر بکات وەك چۆن دایکی داوای لێکرد، لە ترسی هەستکردنی بە چاودێری خودا لەسەری.

وە ئەگەر ڕووبکەینە ئەندەلس ئەو پیاوە مەزنە پڕ لە ئاوات و هیوایە دەبینین (عبدالرحمان الناصر) ئەمیری باوەڕداران، بە هەتیووی گەورە دەبێ بۆ ئەوەی دەوڵەتی مەغریب دابمەزرێنێ، کە شاکانی ئەوروپا و پادشاکانی ملیان بۆ کەچکرد و ڕوویکردە پەیمانگا زانستیەکان کە زاناکانی ئۆممەت و بیریارانی تیابوو و بەشێکی گەورە بوو لە ژیاری ئۆممەتی ئیسلامی جیهانی. ئەگەر بەدوای نهێنی مەزنی ئەم پیاوەدا بگەڕێین، ئەوا دایکە مەزنەکەی دەدۆزینەوە کە زانی چۆن گیانی دامەزراوی و مەزنایەتی و چاوبڕینە هیوا و ئاوات لە دەروونیدا بچێنێ.

دوو ئافرەتیتری مەزن لە سەردەمی عەباسی، گیانی بەرزی و تێگەیشتن و سەرکەوتنیان خستە دەروونی کوڕەکانیان، یەکەمیان: دایکی جعفر بن یەحیایە، وەزیری خەلیفە هاروون الرشید. دووەمیان: دایکی پێشەوا شافعیە کە باوکی خۆی نەبینیووە" چونکە لەو کاتەی ئەو شیرەخۆر بووە باوکی مردووە، دایکی سەرپەرشتی پەروەردە و چاودێریکردنی کردووە.

بەوەندە وازدێنین وێڕای ئەوەی نمونەیترمان زۆرن لەو ئافرەتە مەزنانەی توانیویانە بەهارڕەوشتیەکان و حەزی سەرکەوتن و ڕەفتار و ڕەوشتی جوان لە دڵی منداڵەکانیان بڕوێنن.

## سەرکەوتوترین شێواز دەگرێتەبەر بۆ پەروەردەکردنیان

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو دەچێتە ناو ناسینی سروشتی دەروونی منداڵەکانی، جیاوازی حەز و زەوقیان لەبەرچاو دەگرێ، بەچاکی دەچێتە ناو دەروونیان، لەناو جیهانە پاك و بێگەردەکەیان دێ و دەچێ، تاوەکوو بنەما بەرز و ڕەوشت و ڕەفتارە بەرزەکانیان تیا بڕوێنێ، بەهرەمەندترین و ژیرانەترین شێواز هەڵدەبژێرێ بۆ پوختەکردنی دەروونیان.

هەر بە سروشتی خۆی کەسایەتی دایك نزیکە لە کەسایەتی منداڵەکان و خۆشەویستە لەلایان، سەرنج ڕاکێشەرە بۆیان، دڵ و دەروونیان بۆی دەبێتەوە" بۆیە هەرچی خەیاڵ و هەستێك هەبێت لای دایکیان باسی دەکەن، ئەمیش ڕوودەکاتە ئاڕاستەکردنیان و پوختەکردنی سروشت و هەستیان، لەمەدا ئاستی بیروهۆش و گونجانی کات لەبەرچاو دەگرێ، ئەم ئاڕاستەکردنە هەندێ جار بە یاریکردن و گاڵتە و گەپ ئەنجامدەدا، هەرچی هێما و گوزارشتی خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی هەیە بە گوێیاندا دەچرپێنێ، بەمەش زیاتر دایکیان خۆش دەوێت و ڕوودەکەنە ڕێنمایی و ئامۆژگاریەکانی، لە ناخەوە ملکەچ دەبن بۆ فەرمان و ڕاسپاردەکانی، جیاوازی زۆرە لە نێوان گوێڕایەڵیەکی ڕاستگۆیانەی هەڵقوڵاوی نێو دڵ لەگەڵ گوێڕایەڵیەکی ساختەیی دامەزراو لەسەر سەرەکۆنە کردن و توند و تیژی و دەستبەسەر داگرتن و ناچارکردن و زۆرەملێ، ئەمەی یەکەمیان گوێڕایەڵیەکی هەمیشەیی و پتەو و بەرهەمدار دەبێت، ئەوەی دووەمیشیان گوێڕایەڵیەکی کاتی و لاواز و بێبەر دەبێت و خێرا لەگەڵ نەمانی هێز و دەسەڵات و توندی و زۆرەملێکە ئەمیش نامێنێ.

## وا دەکات هەست بە خۆشەویستی و سۆزی بکەن

لای ئافرەتی موسڵمانی ڕووناکبیر شاراوە نییە کە منداڵ پێویستی بە ئامێزی نەرم و گەرم و خۆشەویستیەکی قووڵ و گشتگیر و سۆزێکی زۆر ڕاستگۆ هەیە، تا بە دەروونێکی ساغەوە گەشە بکەن، دوور لە نەخۆشی و دڵەڕاوکێ و خەمۆکی، بە گەشبینی دەروونیان ئاو بدرێت، دڵیان پڕبێت لە متمانە، هزریشیان بە هیوا و ئاوات و چاوبرینە داهاتووو، لێرەوە دایك وادەکات لە هەموو

بۆنەیەك منداڵەكان هەست بە خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی بكەن كە هەڵدەقوڵێ لە دڵە گەورەكەی و ژیانیان نقومی خۆشی و شادی دەكات، دەروونیان پڕدەكات لە متمانە و دڵنیایی.

ئافرەتی موسڵمانی پارێزكار بەسۆز و بەزەییە بەرامبەر بە منداڵەكانی" چونكە میهر و بەزەیی خورەوشتێكی بنەڕەتی ئیسلامە و پێغەمبەر ﷺ بەگوفتار و كردار هانی داوین لەسەری، وەك ئەنەس ؓ بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ((كەسم نەبینیووە لە پێغەمبەر ﷺ بە بەزەیی و میهرتر بێ بەرامبەر منالان، وتی: ئیبراهیمی كوڕی لەلای چەند شیردەرێك دانابوو لە مەدینە تا شیری پێ بدەن، هەمووجار دەڕۆیشت و ئێمەشی لەگەڵدابوو دەچووە ماڵەكە و ئیبراهیمی هەڵدەگرت و ماچی دەكرد، پاشان دەگەڕایەوە)) مسلم ١٥/٧٥.

هەروا ئەنەس ؓ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەر ﷺ هەرچەندجار بەلای منالان تێپەڕبووایە زەردەخەنەی بە ڕوویان دەكرد و سەلامی لێیان دەكرد. متفق علیه. شرح السنه ١٢/٦٤.

یەكێ لە وتە پەروەردەییە هەمیشە زیندووەكانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (( لە ئێمە نییە كەسێ بەزەیی نەیەتەوە بە بچوكەكانمان و ڕیز و مافی گەورەكانمان نەزانێ)) احمد ٢/١٨٥ والحاكم ١/٦٢.

ابو هريره ؓ دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ حەسەنی كوڕی عەلی ماچكرد، ئەقرەعی كوڕی حابس وتی: من دە منداڵم هەیە تا ئێستا یەكێكیانم ماچ نەكردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێ بەزەیی بە خەڵك نەیەتەوە خودا بەزەیی پیا نایێتەوە)) متفق علیه. شرح السنه ١٣/٣٤.

ڕۆژێكیان دەشت نشینێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئایا ئێوە منداڵەكانتان ماچ دەكەن؟ ئێمە ماچیان ناكەین. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جا چی بكەم كە خودا ڕەحم و بەزەیی لە دڵی تۆ دەركێشاوە؟)) فتح الباری ١٠/٤٢٦.

خاتوو عائشە دەڵێ: ((هەركاتێ فاتیمە بهاتایە لای پێغەمبەر ﷺ لەبەری هەڵدەستا و بەخێرهاتنی دەكرد، ماچی دەكرد، لە جێگای خۆی دایدەنیشاند. وە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بچووبایە لای فاتیمە، فاتیمە لەبەری هەڵدەستا و دەستی دەگرت و بەخێرهاتنی دەكرد، ماچی

دەکرد، لە شوێنی خۆی دایدەنیشاند. فاتیمە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ لەو نەخۆشییەی بەهۆیەوە کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر ﷺ بەخێرهاتنی کرد و ماچی کرد)) فتح الباری ١٣٥/٨ وابو داود ٤٨٠/٤.

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بە ژنانی قورەیش دەکات و بە چاکە ناویان دەبات" چونکە گرنگی و بایەخیان داوە بە منداڵ و بە مێرد لەو فەرمووودەیەی بوخاری لە ابو هریرە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: (( ژنانی قورەیش چاکترین ئافرەتن سواری سەرپشتی حوشتر بوونە" چونکە زۆر بەسۆز و بەزەیین لەسەر منداڵ، لە هەموو ژنان زیاتر چاودێری دەستکەوت و ماڵی مێردیان دەکەن)) فتح الباری ٤٧٢/٦.

ئافرەتی موسڵمانی بێدار بە ئاینەکەی کاتێ لەبەردەم ئەم فەرمووودانە دەوەستێ ناتوانێ دڵ ڕەق و توند و تورە بێت لەبەرامبەر منداڵەکانی، ئەگەرچیش خۆی بە سروشت توند و تورە و ووشك بێ" چونکە ئەم ڕێنماییانە دەبێت بگەنە دڵی دایك و کانی سۆز و بەزەیی تیا هەڵقوڵێنن" چونکە وەك شاعیر خطاب بن المعلّى (الحماسة لأبي تمام ١٦٧/١) دەڵێ:

إنما أولادنا بيننا أكبادنا تمشي على الارض

إن هبت الريح على بعضهم تمتنع العين من الغمض

واتا:

بەڕاستی منالأنمان جگەرمانن لەسەر زەوی دەڕۆن ئەگەر بایەك لەسەر هەندێکیان هەڵبکات خەو لە چاو قەدەغە دەکات.

بۆیە دەبێت دایك و باوك بارانی خۆشەویستی و بەزەیی بن، سەرچاوەی سۆز و چاودێری بن، شەپۆڵی بایەخدان و فیداکاری و لە باوەشگرتن بن.

بێگومان ئەو سۆزەی دایکی موسڵمان هەستی پێدەکات بەرامبەر منالەکانی لە گەورەترین هۆکارەکانی بەختەوەریە لە ژیان، هەر ئەوەشە ئافرەتی ڕۆژئاوایی لە دەستی چووە، کە ژیانی

مادیەت هەڵیمژیووە، کاروباری بەردەوامی ڕۆژانە ماندووی کردووە، بەمەش ئەم هەستە خێزانییەی لە دەستداوە، گوزارشتی هەموو ئەوانە خاتوو (سلمی الحفار لە ڕۆژنامەی ـ الايام المشقيه لە ١٩٦٢/١/٣) دەیکات کە یەکێ بووە لە ئەندامی بزوتنەوە ئافرەتیەکان لە وڵاتی شام پاش سەردانەکەی بۆ ئەمریکا، دەڵێت: (( بەڕاستی جێی داخە ئافرەت بڵندترین بەخششێ کە سروشت[1] پێی داوە لە دەستی بدات ـ مەبەست پێی سروشتە مێیانەکەی پاشان بەختەوەریەکەی ـ" چونکە کاری بەردەوام و شەکەتی (باخچە بچووکەکانی) لە کیس بردووە، کە پەناگەی سروشتیە بۆ هەریەك لە پیاو و ئافرەت بەبێ جیاوازی، کە خونچەکانی ناپشکوێن، گوڵاوی پەرش نابێت بەبێ دایك و سەرپەرشتی ماڵ. جا لە ماڵ و لە ئامێزی خێزاندا بەختەوەری کۆمەڵگە و تاك هەیە، بەهرە و خێر و داهێنان دەستدەکەوێت)).

## یەکسانی دەکات لە نێوان کوڕەکانی و کچەکانی

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر یەکسانی دەکات لە نێوان کچەکانی و کوڕەکانی و دادپەروەری دەکات لە هەموو کاروباریان، هیچیان لەسەر هیچیان بەرزتر و گەورەتر ناگرێت بەهۆی زانینی بە ناپەسندی ئەم ڕەفتارە لە یاسای ئیسلام، وە لەبەرئەوەی ئەم خوڕەوشتە کاریگەری خراپی دەبێت لەسەر دەروونی منداڵ کاتێ دەبینێ براکەی لەو بەرزتر دەگیرێ" چونکە ئەو منداڵەی هەست بە یەکسانی نەکات لە نێوان خۆی و خوشك و براکانی ئەوا بە ڕاڕایی و گرێدراوی و نەکراوەیی و قینەوە گەورە دەبێت، ئێرەیی و ڕق و قینە دڵی دەخوات. بە پێچەوانەوەش ئەو منداڵەی هەست بە یەکسانی دەکات بەشێوەیەکی تەندروستی وپاك و دوور لە بیری کەم و کورتی و نزمی گەشە دەکات، دوور لە ڕق و کینە و ئێرەیی و شت لە دڵ هەڵگرتن، دەروونی پڕ دەبێت لە گەشبینی و ڕەزامەندی و خۆشەویستی و لێبوردەیی، هەر ئەمەشە ئیسلام دەیهەوێت لە دایکان و باوکان و هانیان دەدات لەسەری.

بوخاری و مسلم و هیتر لە نوعمان کوڕی بشیر ﷺ دەگێڕنەوە، کەوا باوکی هێنایە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من کۆیلەیەکم بەخشیوە بەم کوڕەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا

[1] بەڵکوخودا بەخشەرە نەك سروشت، ئەم گوزارشتەش یەکێکە لە شوێنەوار و کاریگەریەکانی بە ڕۆژئاوابوون.

هەموو کوڕەکانت بەهەمان شێوە پێت بەخشیون؟)) وتی: نەخێر، فەرموو: (( دە بیگەڕێنەوە)). لە گێرانەوەیەکیتر دەفەرموووێ: ((ئایا ئەمەت لەگەڵ هەموو کوڕەکانت کردووە؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((لەخوا بترسن و دادپەروەری بکەن لە نێوان منالەکانتان)) جا باوکم صەدەقەکەی گێڕایەوە. لە گێرانەوەیەکیتر پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((ئەی بشر کوڕیترت هەیە بێجگە لەمە؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((بۆ هەموویانت بەخشیووە وەکوو بۆ ئەمەت بەخشیووە؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((دەی مەمکە بە گەواهیدەر" چونکە من گەواهی لەسەر ستەم نادەم)) پاشان فەرمووی: ((ئایا حەز دەکەن هەموویان وەك یەك بەرامبەرتان چاکەکار بن؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((کەواتە" نا نەخێر بۆ ئەم گەواهیدانە)) متفق علیه. شرح السنه ٢٩٦/٨.

لەم ڕوانگەیەوە ئافرەتی موسڵمان دادپەروەر دەبێ لەگەڵ هەموو منالەکانی، هیچیان لەسەر هیچیان بەرزتر ناگرێ، چ لە خەرجی چ لە دیاری و بەخشین و مامەڵە، بەم جۆرە دڵی هەموویان بۆی دەبێتەوە، نزای خێری بۆ دەکەن، دەروونیان پڕ دەبێت لە ئەمەکداری بۆی و لە ڕێز و گەورەییەکەی.

## لە سۆز و چاودێریەکەی جیاوازی ناکات لە نێوان کچ و کوڕ

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ لە سۆز و چاودێری جیاوازی ناکات لە نێوان کوڕەکانی و کچەکانی، وەك هەندێ لەو ئافرەتانەی کاریگەری و شوێنەواری نەفامی لەسەریان ماوە ئەم کارە دەکەن، بەڵکو بەیەك چاوی سۆز و بەزەیی و دادپەروەری و چاودێری سەیری کچان و کوڕانی دەکات، لەکاتێکا دەزانێ منالّ بەخششی خوایە، ئەم بەخششەش چ کچ بێ چ کوڕ لادان و گۆڕین و ڕەتکردنەوەی بۆ نییە، وەك دەفەرموووێ: ﴿ يَهَبُ لِمَن يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَاءُ الذُّكُورَ، أَو يُزَوِّجُهُم ذُكرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجعَلُ مَن يَشَاءُ عَقِيمًا، إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ. واتا: خودا ڕەگەزی مێ دەبەخشێ بەوەی بیەوێت وە ڕەگەزی نێریش دەبەخشێ بەوەی بیەوێت، یان لە هەردوو ڕەگەز دەبەخشێ هەندێکیش هیچی پێ نابەخشێ و بێ وەجاغ دەبێت، بەڕاستی خودا زانا و بەتوانایە﴾ الشوری: ٤٩، ٥٠.

ئەو پاداشتە مەزنەش لای ئافرەتی موسڵمانی ژیر شاراوە نییە کە خودا ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسەی کچان بەجوانی پەروەردە بکات، بوخاری ومسلم لە خاتوو عائشە دەگێرنـەوە، وتوویـەتی: ((ئافرەتێك هاتـە لام و دوو کـچی پـێ بـوو، داوای شـتی لێکـردم، منـیش بێجگـە لـە دەنکـە خورمایەك هیچیترم نەبوو، دەنکە خورماکەم پێیدا، دایکەکە دەنکە خورماکەی کردە دوولـەت و دای بە هەردوو کچەکەی، بەخۆشی هیچی لێنەخوارد، پاشـان هەڵـسا بـە خـۆی و دوو کـچەکەی رۆیشتن، جا پێغەمبەر ﷺ هاتەوە ماڵەوە، منیش ئەم ڕووداوەم بۆ گێڕایـەوە، ئـەویش فـەرمووی: ((هەر کەسێ بە کچان تاقیکرایەوە و جوان پەروەردەی کردن بۆی دەبنە پەرژین لە ئـاگری دۆزەخ)) متفق علیه. شرح السنه ٦/١٨٧.

لە گێڕانەوەیەکیتری مسلم هاتووە، خاتوو عائـشە وتـی: ((ئـافرەتێکی هـەژار هاتـە لام دوو کچی خۆی پێبوو، منیش سێ دەنکە خورمام دایە، هەریەکەو دەنکێکیدا بە هـەردوو کـچەکەی، دەنکەکەیتریشی بەرزکردەوە بۆ دەمی تابیخوات، بەڵام کچەکانی داوایـان کـرد، بۆیـە ئەمیـشی کردە دوولەت و دای پێیان، منیش زۆر سەرسـام بـووم بـەم کـارە، ئەمـەم لـەلای پێغەمبـەر ﷺ باسکرد، پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: ((خـودا بـەهۆی ئـەم کـارە بەهەشـتی بـۆ مـسۆگەرکرد، یـا فەرمووی: گەردنی لە ئاگر ئازادکرد)) مسلم ١٦/١٧٩.

ابو هریره ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێ سـێ کـچی هـەبێت و ئـارامبگرێ لەسەر سەختی و ناخۆشی و خۆشیەکانیان، خودا دەیخاتـە بەهەشـت بـەهۆی سـۆز و بەزەییەکـەی بۆیان، پیاوێك وتی: ئەگەر دوو کچ بێ، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەگەر دوو کچیش بێت، پیاوێکیتر وتی: ئەگەر یەك کچ بێ، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەگەر یەك کـچیش بێـت)) احمد ٢/٣٣٥ والحاكم ٤/١٧٦.

ابن عباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ((هەرکەسـێك خێزانەکـەی کـچێکی ببێـت و زیندەبەچاڵی نەکات و سـووك و ڕیـسوای نـەکات، کوڕەکـەی بەسـەر زاڵ نـەکات و بـە بـەرزتری نەگرێت، خودا بەهۆیەوە دەیخاتە بەهەشت)) الحاكم ٤/١٧٧.

بەزەیی پێغەمبەر ﷺ تادێ بەرفراوانتر دەبێ و لەپاڵ کچان خوشکانیش دەگرێتەوە، وەك ابی سعید الخدری لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: ((هەرکەسێ سێ کچ یا سێ خوشکی هەبێت و لەگەڵیان چاك و باش بێت، مسۆگەر دەچێتە بەهەشت)) البخاری فی الادب المفرد ١٦٢/١.

لە گێڕانەوەی تەبەڕانی: ((هەرکەسێ لە ئۆممەتی من سێ کچ یا سێ خوشکی هەبێت، سەرپەرشتیان بکات تا دەگەنێ، مسۆگەر لە بەهەشت لەگەڵ من ئاوەهایە، پەنجەی شەهادە و ناوەڕاستی بەیەکەوە نووساند)) الطبراني (مجمع الزوائد ١٥٧/٨).

جا چ دایکێکی ژیر و سەنگین هەیە ئاخ و ئۆف بکات لە پەروەردەکردنی کچ، یان کوڕەکانی لەسەر بەرزتر بگرێ، لەکاتێك گوێبیستی ئەم فەرموودانە دەبێت کە بەم شێوەیە بەگەورە باسی پەروەردەکردنی کچان دەکات، بۆ ئەو کەسەش پەروەردەیان دەکات بەجوانی و باش دەبێت لەگەڵیان بەهەشتێکی ئامادەکردووە کە پانتایی ئاسمانەکان و زەوییە و دەبێتە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ.

کچ لە خێزانی موسڵمان و لە کۆمەڵگەی ئیسلامی تێگەیشتوو پارێزراو و خۆشەویست و ڕێزدارە، هەمیشە لەلایەن دایکی یان باوکی بەتایبەتی دایکی ئامێزی گەرم و پاراستنی تەواوی بەدی دەکات، چاودێری گشتی دەکرێ تا لە ماڵی باوکی بێت یا لە ماڵی براکانی، یا هەرکەسێك لەوانەی سەرپەرشتی دەکەن، جا چ شووی کردبێ یا نەیکردبێ" چونکە ئیسلام ژیانێکی سەربەرز و بێ‌پێویستی بۆ دابینکردووە و مسۆگەرکردووە، پاراستوویەتی لە ژیانی سەختی و نزمایەتی و پێویستی و گومڕایی، لەوانەی ئافرەتانی کۆمەڵگە مرۆڤایەتیەکانی دوور لە ئاینی خوا دوچاری دەبنەوە" لەو کۆمەڵگانە دەبینی هەرکاتێ کچ بووە ١٨ ساڵ لە باوەشی گەرمی دایك و باوکی دێتەدەر و ڕووبەڕووی ژیانی دژواری مادیەت دەبێتەوە، کە پڕە لە سەختی و مەترسی، لەکاتێکا زۆر پێویستی بە پاراستن و سۆز و چاودێری و پەنا هەیە.

ئەمە ئەو جیاوازییە بەرفراوانەیە لە نێوان یاسا و شەرعی خودا کە هاتووە بۆ بەختەوەری مرۆڤ، لەگەل یاسا و شەرعی مرۆڤی کەم و کورت کە بەهۆیەوە مرۆڤ بەدبەخت بووە. بۆیە نامۆ نییە کە ببینین لە ڕۆژئاوا لە ئەنجامی ئەم شەرع و دەستوورە مادیە کۆمەڵێك لە کچانی لارەڕێ و سەرلێ شێواو هەن، هەروا کۆمەڵێك لە دایکانی پێهەڵخلیسکاوی بێشوو لە کچانی چارەڕەش و وێڵ، بەداخەوەش ژمارەی ئەم جۆرێنە ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادە دایە.

## نزا و پاڕانەوەی خراپ لە منالەکانی ناکات

ئافرەتی موسلمانی بێدار نزای خراپ لە منالەکانی ناکات، وەك ملکەچیەك بۆ فەرمانی پێغەمبەر ﷺ کە لە فەرموودە درێژەکەی جابر ﷺ دەیگێڕێتەوە، دەفەرمووێ: ((نزا مەککەن لە خۆتان، نزا مەککەن لە منالەکانتان، نزا مەککەن لە سامان و مالتان، نەبادا لەگەل ئەو ساتە یەکبگرێتەوە کە تیایدا نزا و پاڕانەوەکانتان وەلام دەدرێنەوە و گیرا دەبن)) مسلم ۱۸/۱۳۹.

چونکە نزاکردن لە منال باوێکی چاك و خورەوشتێکی پەسندنییە، وە هەر ئافرەتێك لەکاتی تورەیی نزای کردبێ مسۆگەر پەشیمان بۆتەوە لەو کاتەی تورەیی بەریداوە و هاتۆتەوە هۆش خۆی، وا تێناگەم دایکێك کە بیری ڕووناك بێ بە ڕێنمایی ئاینەکەی خۆی لەبیرکات و هاوسەنگی لە دەستبدات و نزا لە منالەکانی بکات، ئەگەرچی نارەحەتی زۆریان لێببینێ" چونکە پێی خۆش نییە بخزێتە ناو کێشەیەك کە ئافرەتانی تورە و هەلچوو و سەرشێت دەکەونە ناوی.

## ئاگادارە لە هەرچی کاردەکاتە سەر دروستبوون و ئاراستەکردنیان

ئافرەتی موسلمانی چاوکراوە لەسەر منالەکانی، چاودێری جوولە و چالاکی و ئارەزووو و حەزی منالەکانی دەکات، دەزانێ چی دەخوێننەوە و چی دەنووسن و کێ دەکەن بە هاوڕێ و لەکاتی دەست بەتالیش دەچنە کوێ، ئەمانە هەموو دەزانێ لەکاتێك منالەکانی هەست بەم چاودێرییە ناکەن، هەرکاتێك ببینێ لاری لە ڕاوبۆچوون یا تێڕوانین یا خوێندنەوە یا ئارەزووو، یا پەیوەستبوون بە هاوڕێیەکی خراپ، یا چوونە جێگای ناپەسند، یا خوگرتن بە هەندێ باو وەك جگەرەکێشان و هیتر، یا هەندێ یاری خراپ و یاساغ ئەنجامبدەن کە پێچەوانەی ڕەفتاری موسلمانە و کات دەکوژێ و ووزە بەهەدەر دەدات و ڕایاندێنێ لەسەر دەست بەتالی و شتی پڕوپوچ....، هەرکاتێك

دایك هەستی بە شتێك لەمانە کرد لە منالەکانی، خێرا دەچێتە سەر ڕاستکردنەوەی ئەم لاریە و گێڕانەوەیان بۆ سەر ڕێگای ڕاست بە شێوازێکی نەرم و نیانی ودانایی دڵ دامەزراویەوە، بەژیرانە و بە ڕاست و ڕێك ئاڕاستەیان دەکات بۆ ڕاستی، دایك زۆر زیاتر لە باوك دەتوانێ ئەم کارە بکات بەهۆی نزیکی لە منالەکان و مانەوەی لەگەڵیان کاتێکی درێژتر، هەروا منالٌ زیاتر لەلای دایکی دڵی دەکاتەوە و هەندێ شتی لەلا باس دەکەن کە لەلای باوك باسی ناکەن، لێرەوە بەرپرسیاریەتی دایك دەردەکەوێ لە پەروەردەکردنی چاکی بۆ منالەکانی، دروستکردنیان بە شێوەیەکی ساغ و دروست، داڕشتنەوەی کەسایەتیان بە جۆرێ گونجاو بێت لەگەڵ بنەماکانی ئیسلام و بەهاو باوەکانی.

چونکە هەموو منالێك لەسەر خۆڕسکی ئیسلامەتی لە دایك دەبێ، هەر دایك و باوکە دەبنە هۆی بە جوولەکەکردنی یا بە گاورکردنی یا بە مەجوسیکردنی (ئاگر پەرست) وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمووودەی ڕاستی بوخاری باسیکردووە.

دایك و باوك کاریگەریەکی زۆریان هەیە لەسەر داڕشتنەوەی بیروهۆشی منالٌ و دروستکردنی کەسایەتی و پەروەردەکردنی دەروونیان، بەهۆی هۆکارە پەروەردەییە کاریگەرەکان لەسەر کەسایەتییەکەی لەو کاتەی منالە تا گەورە دەبێت. ئەو پەرتووکەی منالان بەردەوام لێیدەخوێننەوە پێویستە هزری بکاتەوە، دروستکاربێ بۆ دەروونیان لەسەر بنەمای بەهاڕەوشتیەکان، خۆراك بدات بە کەسایەتیەکەیان بەهۆی پێشەنگی بەرز و نمونە و سەرمەشقی بڵند، نەك ببێتە هۆی لەناچوونی عەقڵ و بیریان، تێکدانی خۆڕسکیان و هەرچی پشکۆی خێر هەیە لە دەروونیان بیکوژێنێتەوە....

ئارەزووو و هیواش پێویستە گەشە بدات بە لایەنی خێر لە دەروونیان نەك لایەنی شەڕ، پشکۆی ڕەوا و ڕاستی لە دڵیان دابگیرسێنێ نەك درۆ و پوچەڵی و ئەفسانە، پەروەردەی زەوق و حەزی دروست بنیات بنێ نەك هی نەخۆش و ناتەواو.

برادەریش پێویستە بەرەو بەهەشت بیبات نەك بەرەو ئاگر، ڕێنمایی بكات بۆ حەق نەك بۆ ناڕەوا، ئاڕاستەی بكات بۆ تێگەیشتن و بەرزی و سەركەوتن و خێر و چاكە نەك بۆ گومڕایی و نزمی و بێهیوایی و خراپەكاری، چەندین هاوڕێ هەبوونە هاوڕێكەی خۆی بەرەو خراپە و هەڵدێری شەڕ و گێژاوەی نزمی بردووە، لە كاتێكا باوكان و دایكان لە منداڵەكانیان بێ ئاگان.

بەم شێوەیە چاوی دایك هەردەم كراوەیە لەسەر منداڵەكانی لە پەروەردەكردنیان و ئاڕاستەكردنیان، تێبینی پەرتووك و گۆڤار و هاوڕێ و ئارەزووو و قووتابخانە و مامۆستا و یانە و هۆكارەكانی ڕاگەیاندن دەكات و هەرچیەتر كاریگەری هەبێت لەسەر دروستكردنی كەسایەتی منداڵەكانی و پەروەردەكرنی هۆش و دەروون و بیروباوەڕیان، لەكاتی پێویستیش تێكەڵ دەبێت بە سلبی بێ یان ئیجابی، یان بەكۆمەكی باوك ئەگەر پێویستی كرد، شێوازی تۆكمە و سەركەوتوو هەڵدەبژێرێ كە دروستی كرداری پەروەردەكردنی منداڵەكان مسۆگەر دەكات و لە ڕێگر و نادروستی و كاردانەوە دەیپارێزێ.

چەندین خێزان هەنە بەهۆی دایكە ژیر و بێدار و تێگەیشتووەكەی كە پەی بردووە بە بەرپرسیاریەتیەكەی بەرامبەر منداڵەكانی، لە پەروەردەكردنی منداڵەكانی سەركەوتوو بووە، بەباشترین شێوە هەڵساوە بە ئەركی خۆی، بەهۆیەوە منداڵی وای پێگەیاندووە كە بەخێر گەڕاوەتەوە سەر دایك و باوك و كۆمەڵگە و خەڵكی.

وەچەندین خێزان هەنە سستیان كردووە لە پەروەردەكردنی منداڵەكانیان" لەبەرئەوەی دایكەكە پەینەبردووە بە بەرپرسیاریەتیەكەی بەرامبەر منداڵەكانی و فەرامۆشی كردون، دواتر بوونەتە مایەی بارینی خراپە و دەرەنجامی دژوار بۆ دایك و باوك و كۆمەڵگە و خەڵكی.

هەرگیز منداڵ نابێتە پارچەیەك لە خراپە ئەگەر دایك و باوك بەتایبەتی دایك بەرپرسیاریەتی و ئەركی خۆیان بزانن بەرامبەر منداڵەكانیان، وە بە باشترین شێوە هەڵسابن بە پیادەكردنی ئەم بەرپرسیاریەتیە.

**بەها ڕەوشتیەکانیان تیادا دەڕوێنێ**

ئـافرەتی موسـڵمان هەوڵـدەدات بەهاڕەوشـتیەکانی وەك خۆشویـستنی دەوروبـەر، پەیوەنـدی خزمایەتی، دڵنەوایی‌کردنی لاوازان، ڕێزگرتنی گەورە، بەزەیی بۆ بچووك، حەزکردن بە کاری خێر، ڕاستگۆیی لە گوفتار و کردار، بەجێ‌گەیاندنی بـەڵێن، دادپـەروەری لـە بڕیـاردان....و هی‌ـتر لـە ڕەفتاری جوان و پەسند لە دەروونی منالّکانیدا بڕوێنێ.

ئـافرەتی موسـڵمانی ژیـریش دەزانـێ چـۆن بـچێتە نـاو نـاخی دەروونـی منالّـەکانی و ئـەم خوڕەوشتانەیان تیا بڕوێنێ بە بەکارهێنانی باشترین و ژیرانەترین شێواز، وەك پێشەنگێکی چـاك و خۆشەویست بەچاکە تێکەڵ بێ و چاك مامەڵە بکات، بـەزەیی و نـەرمی و خـۆڕاگری و خۆبەکـەم زانین و لێبوردەیی و خۆشەویـستی و سـۆز و گرنگی‌ـدان و هانـدان دەرخـات، لەگـەڵ یەکـسانی و دادپەروەری و ئامۆژگاری و ئاڕاستەکردن و ڕێنمایی بەشـێوەیەکی نـەرم دوور لـە لاوازی، تۆکمـە دوور لــە تونــدڕەوی، گفتوگــۆ و لێپرســینەوە و بەدواداچــوونەوەی دوور لــە بێــزاری، هــەروا چاوپۆشی‌کردن لە هەندێ هەڵە بەبێ زیان پێ‌گەیاندن، بەم جۆرە منالّەکان بە شێوەیەکی دروست و ڕێك پەروەردە دەبن، هۆشیان کراوە و بیریان پێگەیشتوو دەبێت، صالح و چاك و ئەمەکدار دەبـن، لەسەر بەخشین بەتوانا و بەهێز دەبن، ئامادە و دەست وبرد دەبن لە بیناکردن و ئاوەدانکردنەوە لـە بوارە هەمەجۆرەکانی ژیان، جێی سەرسوڕمانیش نییە کە پـەروەردەی دایکـی موسـڵمان باشـترین بەرهەمی هەبێت" چونکە دایك قووتابخانەی یەکەمە لە پەروەردەکردنی گەلان، یەکەم مامۆسـتایە بۆ بەهرەداران و بنیاتنەرانی ژیاری، وەك حافظ ابراهیم[1] دەڵێ

الأم مدرسة إذا أعددتها     أعددت شعبا طيب الاعراق

الام استـاذ الاساتذة الالى     شغلت مآثرهم مدى الآفاق

واتا: دایك قوتابخانەیەکە ئەگەر ئامادەی بکەی ئەوا گەلێکی خاوەن ڕەچەڵەکێکی چـاك و بـاش ئامادە دەکەی....

---

[1] ديوان حافظ ابراهيم: ٢٨٢ ط دار الكتب المصرية.

## ٦ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ بووك و زاواکانی

### أـ لەگەڵ بووکەکانی

**تێڕوانینی بۆ بووکەکەی**

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بە ڕێنمایی ئاینەکەی و ڕازاوە بە خوڕەوشتە بەرزەکانی وەك کچی خۆی دەڕوانێتە بووکەکەی، کە قەدەر ڕایکێشاوە تا ببێتە هاوسەری کوڕەکەی و بۆتە یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی. هەروەها بووکێك ئەگەر لەسەر بەها و بنەماکانی ئیسلام پەروەردە بووبێ وەك دایکی خۆی دەڕوانێتە خەسووی، پاش ئەوەی ماڵی دایك و باوکی جێهێشتووە و هاتۆتە ماڵی هاوسەرایەتی نوێ.

**بووکێکی باش هەڵدەبژێرێ**

هەریەك لە پیاو و ئافرەت لە هەوڵی ئەوەدایە پێش بە ئەنجامگەیاندنی پرۆسەی هاوسەرگیری یەکێك هەڵبژێرێ خاوەن ئاین و خوڕەوشت و پەروەردەیەکی دروست و دامەزراو و ناوبانگی باشی هەبێت.

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو کاتێ کچێك بۆ کوڕەکەی دەخوازێت، بەدوای کچێکی شایان دەگەڕێ بۆی، هەمیشە بەو جۆرە بیردەکاتەوە کە کچێکیتر بۆ خێزانەکەی زیاد دەکات، وەکوو ئەوان ڕێز و خۆشەویستی پێدەدات، وەکوو ئەوان ئەرك و کاری خۆی دەبێت لە چوارچێوەی خێزانێکی گەورە، ئومێدی سەرکەوتن و بەختەوەری و دامەزراوی و سەقامگیری بۆ دەخوازێ لە ژیان، بۆیە تەنها بەدوای جوانی ڕووخسار و شێوە و لەش و لاری سەرنج ڕاکێشەر داناگەڕێت، بەڵکو لە پاڵ ئەمانە و پێش هەموویان بەدوای ئاینێکی دروست، خوڕەوشتێکی جوان، کەسایەتیەکی هاوسەنگ و سەنگین دادەگەڕێ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێ: ((ئافرەت بۆ چوار شت دەخوازرێ: بۆ ماڵی، بۆ بنەماڵە و ناوبانگی، بۆ جوانییەکەی، بۆ ئاینەکەی، تۆ خاوەن ئاینەکە هەڵبژێرە، ئەی خاك بەسەر)) متفق علیه. شرح السنه ٨/٩.

## ڕێز لە ڕاستی بوونی لە ماڵی هاوسەرایەتی دەگرێ

لە ڕوانگەی ئەم تێڕوانینە ژیرانە لەمەڕ بووك و بوونی لەناو ماڵی هاوسەرایەتی و شوێن و جێگای بووك لە نێوان تاکەکانی خێزانی نوێ کە بووك دەگوێزرێتەوە بۆی، مامەڵەی چاك لەلایەن خەسوو بەرامبەر بووك سەرچاوە دەگرێ، دادپەروەری سەرهەڵدەدا، یەکسانی و دانایی زاڵ دەبێ بەسەر هەڵوێست و ڕەفتار و کردار و کاردانەوەکانی.

هەرگیز خەسووی پارێزکار و تێراو لە ئەدەبی ئیسلامی و بنەماکانی، خەیاڵی ئەوە ناکات کە بووکەکەی کوڕەکەی لێ زەوتکردووە، کە چەندین ساڵە ئەو بەخێوی دەکات و شەو و ڕۆژی لەپێناو پەروەردەکردنی خەرجکردووە، تا ئەو کاتەی بووە پیاو و کەوتە سەردەست و بازووی خۆی و تواناى بەخشین و خەرجکردن و فیداکاری پەیداکرد، بووکەکە دەیباتە هێلانەی بەختەوەری و ئەمیش لەم کەشە ئارامە و گوڵاوپرژێنە دایکی و ماندووبوونی چەند ساڵەی و شەونخونییەکانی لەبیر دەکات! ئەم خەیاڵە شەڕانییە نایێ بە مێشکی ئافرەتی موسڵمانی چاکەخواز" چونکە سونەتی خودا دەزانێ لە ژیان، دەزانێ کە ئەو کوڕەی بە شیری ئیسلام پەروەردەی کردووە هەرگیز ژنە جوانەکەی ناتوانێ دایکی لەبیرباتەوە، ئەو بووکەش کە خۆی لە نێوان کچانی باوەڕداری پاك هەڵیبژاردووە ڕازی نابێت ئەم بێئەمەکی و خراپەکارییە لە مێردەکەی ڕووبدات بەرامبەر دایکی، لەکاتێکا ئیسلام حەڕامی کردووە.

ئەگەر خەسوو هەستی غیرەی بۆ دروستبوو لەبەرامبەر بووکەکەی لە ساتەکانی لاوازی مرۆڤ، پەنا دەباتەبەر ئاینەکەی و تەقوا و لە خواترسانەکەی و ئەم هەستە ڕقاوییە لە خۆی دووردەخاتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ ڕابوونە باوەڕی و تەقواکەی و تێڕوانینی ڕاست و دروستی بۆ بووك، ئەمەش بیروبۆچوون و کاری باوەڕدارانە کاتێ شەیتان بیەوێت دەستیان لێبوەشێنێ، وەك خودا دەفەرموووێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَواْ إِذَا مَسَّهُم طَائِفٌ مِنَ الشَّيطَانِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُبصِرُونَ. واتا: ئەوانەی لە خوا دەترسن کاتێ دوچاری ڕاڕایی (وەسوەسە) ی شەیتان دەبنەوە تەوبە دەکەن و فەرمانی خودا دێننەوە یادی خۆیان و ئەوکاتە بەرچاو ڕۆشن دەبن و سەرپێچی شەیتان دەکەن و ملکەچی فەرمانی خوا دەبن﴾ الاعراف: ٢٠١.

لێرەوە هاوسەنگی لە ژیانی خێزانی نێوان بووك و خەسوو و مێرد دروست دەبێ، بەمەش کارەکان بە ئاڕاستەی سروشتی خۆیان دەڕۆن کە ئارەزووات و حەز و گومڕاییەکان کاریان تێناکات، بەڵکو کارتێکەریان هۆش و ژیری و دانایی و ڕێنماییەکانی ئاین دەبێت.

## ئامۆژگاری دەکات و تێکەڵی تایبەتمەندیەکانی نابێت

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکاری تێگەیشتوو هەر لەیەکەم ساتی هێنانی بووکەکەی ئەوەی لەبەرچاوە کە بووکەکەی مافی خۆیەتی ژیانی هاوسەرایەتی بە هەموو ڕەهەند و واتاکانی بژێیت تا لە چوارچێوەی حەلاڵ دابێت و لە سنووری شەرع لاینەدابێت، بۆ کەسیش نییە تێکەڵی تایبەتمەندیەکانی نێوان ژن و مێرد بێت، مەگەر پێویستیەکی زۆر هەبێت، ئەمەش لە بازنەی ئەو ئامۆژگارییە دەبێت کە لە هەموو موسڵمانێك داواکراوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویّ:((ئاین ئامۆژگاریکردن و دڵسۆزییە...)) مسلم ٣٧/٢.

بە شێوازێك ئەم کارە دەکات وەك چۆن لەگەڵ کچەکەی خۆی بیکات، چۆن دەیەوێت کچەکەی ژیانێکی هاوسەریانەی هێمن و بەختەوەر و سەربەخۆ و بژێیت لە هەموو لایەنەکانی، کەس بەهۆی تێکەڵبوونی لە تایبەتمەندیەکانی ژیانی لێ تاڵ نەکات، بەهەمان شێوەش بەبێ جیاوازی بۆ بووکەکەشی دەبێ پێی خۆش بێت.

## چاکەکارە لەگەڵ بووك و ڕەفتاری باشە لەگەڵی

خەسووی موسڵمانی تێگەیشتوو لەگەڵ بووکی چاکەکارە و ڕێزی لێدەنێ و ڕەفتار و مامەڵەی باشە لەگەڵی، وای لێ دەکات هەست بە خۆشەویستی و ڕێزی بکات، گوێ لە ڕاوبۆچوونەکانی دەگرێت، هەر ڕاوبۆچوونێکی دروستبوو کاری پێدەکات و دەستخۆشی لێ دەکات، ئەوەشی هەڵە و چەوت بێ بە نەرم و نیانی بۆی ڕاست دەکاتەوە، لەم کارانەشی پابەند دەبێ بە ژیری و دادپەروەری و چاکەکاری، بڕیارێك دەدات وەك ئەو بڕیارەی لەسەر کچەکەی دەیدا ئەگەر لە شوێنی بووایە و بۆچوونی خۆی دەربڕیبووایە، خودا دەفەرموویّ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللَّهَ

وَقُولُواْ قَولاً سَدِيدًا. واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و قسە و گوفتاری ڕێك و دروست و گونجاو بکەن﴾ الاحزاب: ٧٠.

ئەمەش لە بیرناکات ماوە ماوە وا نیشان بدات کە لە ناخی دەروونیدا بەختەوەرە کاتێ کوڕەکەی دەبینێ لەگەڵ ژنەکەی بەختەوەرە، بەمە جوانترین و ناوازەترین هەست دەخاتە دەروونی کوڕەکەی و بووکەکەی، هەروا لە بۆنەکان بووکەکەی وەکوو کچەکانی لەگەڵ خۆی دەبات و وا دەکات هەست بکات کە یەکێکە لەوان، بەڵکو ئەندامێکی خۆشەویستە لە ئەندامانی خێزانەکەی لەوەتەی هاتۆتە ناو هێلانەی هاوسەرایەتی و لەگەڵ کوڕە خۆشەویستەکەیان زەماوەندی پێکراوە.

بەم شێوەیە خەسوو لەلای بووك خۆشەویست دەبێ" چونکە سەلماندوویەتی کە بووکەکەی لەلای خۆشەویستە، بە پێچەوانەی ئەوەی دەیبینین لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکانی دوور لە ڕێنمایی خوا کە پڕە لە ڕق و کینە و پیلان و ناکۆکی لە نێوان بووك و خەسوو، تا وای لێهاتووە ئەم دوژمنکارییەی نێوانیان بۆتە باوێك و دیاردەیەکی زاڵی نێو کۆمەڵگە، کە پەند و گۆرانی لەسەر تراوە، وەك بڵێی ئەو دوژمنکاریە شتێکی باو و ئاسایی و چاولێکەرییە و کەس لێی دەرباز نابێت! بەڵام هیچ لەو دوژمنکاریە ڕوونادات ئەگەر هەریەك لە بووك و خەسوو دان بنێ بە مافی ئەوەیتر لە ژیان و لەو ئاستەش بوەستایە کە فەرمانی وەستانی تیا دراوە وەك چۆن ئیسلام نەخشەی بۆ کێشاوە" بۆیە ئەم دوژمنکارییە لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی هۆشیار و ڕووناکبیر نەماوە، لەوانەی دەستگرن بە ئاینی خوا و پابەندن بە بڕیار و بنەما و دەستوورەکانی.

### دانا و دادپەروەرە لەکاتی بڕیاردانی لەسەر بووکەکەی

جاری وادەبێ خەسوو گرفتار دەبێ بە بووکێکی خاوەن ڕەوشتی خراپ، یان مامەڵەی خۆش نییە و توند و وشکە، لێرەوە پێویستی هۆشیاری و دانایی و چاکەکردن بەرامبەر بە خراپە دەردەکەوێ کە پێویستە لە خەسوودا هەبێت، وەك خودا دەفەرموووێ: ﴿ وَلاَ تَستَوِي الحَسَنَةُ وَلاَ السَّيِّئَةُ اِدفَع بِالَّتِي هِيَ أحسَنُ فَإذَا الَّذِي بَينَكَ وَبَينَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيم، وَمَا يُلَقَّاهَا إلاَّ الَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّاهَا إلاَّ ذُو حَظٍ عَظِيمٍ. واتا: چاکە و خراپە وەك یەك نییە، خراپە لادە بەوەی چاکترە بەهۆی دانایی و لێبوردەییت ئەوکاتە ئەوەی دوژمنکاریت لەگەڵی هەیە دەبێتە دۆستێکی دڵسۆز و نزیك

و خۆشەویست و پاڵپشت، ئەو پلەوپایەیەش تەنها کەسانی ئارامگر و خۆڕاگر پێی دەگەن کە خاوەنی بەش و بار و بەختێکی گەورە و مەزنن و چاکەکارن﴾ فصلت: ٣٤، ٣٥.

یەکێ لە هۆکارەکانی لادانی خراپە بە چاکە ئەوەیە کە خەسوو سلبیاتی بووکەکەی و هەڵەکانی تا لە توانای دابێت لە کوڕەکەی بشارێتەوە، خۆی بەجیا و بەتەنها بووکەکەی ئامۆژگاری بکات، سووربوونی خۆی بۆ بووکەکەی دووپات بکاتەوە لەسەر بەردەوام مانەوەی ماڵەکەی ئاوەدان بێت بە خێر و خۆشەویستی و کردەوەی چاکە، بەردەوام ئامۆژگاری دەکات تا ڕزگاری دەبێت لە سلبیاتەکانی یان لەسەری سووك دەکات، بەم شێوەیە بووك هەست دەکات کە خەسووەکەی دەستە خوشکێکی خۆشەویست و دڵسۆزە بۆی، نەك دوژمنێکی ڕقەکار و پیلانگێر کە هەموو لایەنەکانی چوارچێوەی ژیانی لێ گرتبێ.

ئەگەر خەسووی موسڵمانی پارێزکار ستەمێکی بینی لە کوڕەکەی بۆ سەر بووکەکەی، ئەوا لە بڕیاردانی پابەند دەبێ بە دادپەروەری" چونکە تەقوا و لەخوا ترسانەکەی دەیگێڕێتەوە لەوەی لایەنگیری کوڕەکەی بکات لەکاتێکا لەسەر حەق نییە، دەستی ناگرێ لەسەر ستەم، وەك خودا دەفەرموویێ: ﴿ وَإِذَا قُلتُم فَاعدِلُواْ وَلَو كَانَ ذَا قُربَى... واتا: قسەی حەق بڵێن ئەگەر لەسەر خزم و نزیکیش بێ...﴾ الانعام: ١٥٢.

هەروا دەفەرموویێ: ﴿ وَإِذَا حَكَمتُم بَينَ النَّاسِ أن تَحكُمُواْ بِالعَدلِ....واتا: ئەگەر دادتان کرد لەنێوان خەڵکی دادپەروەرانە بڕیاربدەن...﴾ النساء : ٥٨.

جا ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو کە وردەبێتەوە لەم ئایەتانە هەرگیز ناکەوێتە گوناهی ستەمکردن، هەمووکات دادپەروەرانە بڕیاردەدات، ئەگەرچی بڕیارەکە لە بەرژەوەندی بووکەکەی و لە دژی کوڕەکەی دابێت.

## ب ـ لەگەڵ زاواکانی

### تێڕوانینی بۆ زاوا

تێڕوانینی خەسووی موسڵمانی ڕۆشنبیر بۆ زاوای جیاوازی نییە لەگەڵ تێڕوانینی بۆ بووکەکەی، وەك چۆن وەکوو کچی دەڕوانێتە بووکەکەی ئاوەهاش وەکوو کوڕی دەڕوانێتە زاوای، وەك چۆن دەیەوێت کوڕەکەی لە هەموو کەس باشتر بێت، ئاوەهاش حەز دەکات زاواکەی لە هەموو کەس باشتر بێت.

### زاوای باش هەڵدەبژێرێ

کوڕێك هەڵدەبژێرێ بە زاوای خۆی کە خاوەن ئاین و خوڕەوشت و ناوبانگی پەسند بێت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەگەر کەسێك هاتە خوازبێنی کچەکانتان و لە ئاین و خوڕەوشتی ڕازی بوون، کچەکانتانی بدەنێ، ئەگەر وانەکەن فیتنە و گەندەڵیەکی بەرفراوان لەسەر زەوی بلاودەبێتەوە)) الترمذي ٢/٢٧٤ وابن ماجه ١/٦٣٣. ئافرەتی موسڵمان ناخەڵەتێ بە شێوە و ڕواڵەتی جوان و بەرچاو یا پلەوپایە و ماڵی زۆر" چونکە دەزانێ بە زەماوەندی کچەکەی لەم کوڕە کوڕێکیتر دێتە ڕیزی کوڕەکانی کە شەرەف و شکۆ و ئابڕو و بەختەوەری کچەکەی پێ دەسپێرێ، کەسێکیش خاوەن ئاین و خوڕەوشتی جوان و مەردایەتی و بەهاڕەوشتیەکان نەبێت ناتوانێ ئەو بنەڕەتانە لە کچەکەیان بپارێزێ.

### ڕێزی لێدەگرێ و چاکەکارە لەگەڵی

سەیرنییە زاوا جێگای ڕێز و لەبەرچاوگرتنی خەسوو بێ، لەکاتی بۆنەکان وا دەکات هەست بکات تاکێکە لەم خێزانە کە بۆتە مێردی کچەکەیان، پێویستە هیوای بەختەوەری و سەرکەوتن بۆ زاوا و بۆ کچەکە بخوازن لە ژیانی درێژی بەیەکەوەیان، ئەو زاوایە دەبێ شایانی ئەوەبێ دڵنیا بن لێی لەسەر پاراستنی ئابڕوی کچەکەیان و هێنانەدی ئاوات و حەزەکانی، هەروا خەسوو دەبێ وا بکات ئەم زاوایە هەست بکات کە ئەو دایکی دووەمیەتی، لەکاتی پێویست ئامۆژگاری دەکات، هەوڵدەدات هۆکارەکانی بەختەوەری بۆ زاوا و بۆ کچەکەی و مناڵەکانی دابین بکات.

### پاڵپشتی کچەکەی دەکات تاوەکو هاوسەرێکی چاک بێت لەگەڵ مێردی

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو هەر بەوە ناوەستێ ئامۆژگاری کچەکەی بکات لەسەر سوودگەیاندن پێی لە کاروباری ماڵ و مێرد و منداڵەکان، بەڵکو هەردەم چاوەکانی کچەکەی دەکاتەوە لەسەر هەرشتێك مایەی بەختەوەری و دڵخۆشی مێردەکەی تێدابێت، هانی دەدات لەسەر هەڵسان بە ئەرکەکانی مێرد و خێزان بە جوانترین شێوە، ئەگەر لە کچەکەی شتێك ببینێ لە کەمتەرخەمی و سستی و فەرامۆشکردن، خێرا ئامۆژگاری دەکات و ئاڕاستەی دەکات و یارمەتی دەدات بۆ لادانی ئەم کەم و کورتییە، بەجۆرێك کەلێنێك لە کچەکەی جێناهێڵێ بەهۆیەوە لەلای مێردی بێ ڕێز بێت یا لەبەرچاوی کەم بێت. خەسووی ڕووناکبیر ئەوە لە یاد ناکات کە ماوە ماوە ئاماژە بکات بە چاکە و لایەنە باشەکانی زاواکەی، زوو زوو ئەم چاکانە دەخاتەوە یادی کچەکەی تا زیاتر پەیوەست بێت پێی و خۆشەویستی بۆی زیاتر بێت و ڕازی بێت بەو بەشەی خودا بۆی بڕاندۆتەوە، بەمەش دەبێتە چاکترین پاڵپشت بۆ کچەکەی لە دەستگرتنی بە ژیانی هاوسەرایەتی و بەردەوامبوونی و بڵاوکردنەوەی بەختەوەری و خۆشی لە کەشەکەیدا.

### دادپەروەرە و لەسەر ناحەق لایەنگیری کچەکەی ناکات

خەسووی موسڵمان پابەندە بە دادپەروەری لە هەڵوێست و بڕیارەکانیدا لەو کاتانەی ئەگەر لەیەك نەگەیشتن یا ناکۆکیەك لەنێوان کچەکەی و زاواکەی ڕوویدات، یاخود کەم و کورتیەك ببینێ لە کچەکەی کە ببێتە هۆی شێواندنی چاکەکاریەکەی بۆ مێردی، یا ئەرکەکانی یا پاراستنی حەز و ئارەزووە شەرعیەکانی، ئەوکاتە لایەنگیری کچەکەی ناکات، وشەی حەق و دادپەروەری دەڵێ، وەك خودا دەفەرمووێ لە سورەتی الانعام: ١٥٢ (پێشتر ڕاڤەکراوە). هەروا کە دەفەرمووێ لە سورەتی الاحزاب: ٣٤ (پێشتر ڕاڤەکراوە).

ئەگەر لاربوونەوەی بینی لە کچەکەی بە سووکایەتیکردن بە مێردەکەی یا زیادەخەرجی، ئامۆژگاریکردنیش سوودی نەبوو، ئەوا قسەی حەق دەکات و بۆ کچەکەی ڕوون دەکاتەوە کە هەڵەیە و لە سنووری شەرع تێپەڕیووە، وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُواْ لَم يُسرِفُواْ وَلَم

يَقتُرُواْ وَكَانَ بَينَ ذَالِكَ قَوَامًا. واتا: بەندەكانی ڕاستەقینەی خوا ئەوانەن كاتێ دەبەخشن زیادەخەرجی یا دەرچوون لە فەرمانی خوا ناكەن و میانگیرن﴾ الفرقان: ٦٧.

ئەگەر لە كەسایەتی كچەكەی هێزێكی زاڵ و ستەمكاری بینی كە لە ڕێز و پایەی مێردی كەم دەكردەوە، ئەوا بە ڕاشكاوی كچەكەی تێدەگەیەنێ كە پیاو سەرپەرشتیار و سێبەر و پەنای ئافرەتە، خودا دەفەرمووێ: لە سورەتی النساء: ٣٤ (پێشتر ڕاڤەكراوە).

ئەم سەرپەرشتیەی پیاو بۆ ئافرەت دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆكاری بنەڕەت كە نابێت ئافرەت هەرگیز لەبیری بكات، ئەوانیش: ١) بەهۆی فەزڵی زیاتری پیاو لە ڕووی دروستبوونییەوە بەسەر ئافرەت. ٢) بەهۆی خەرجی گرتنە ئەستۆ ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيهِنَّ دَرَجَةٌ..﴾.

خەسووی موسڵمانی ژیر و پارێزكار لە هەڵوێست و بڕیاری دادپەروەرانەی لە نێوان كوڕی و زاوای جیاوازی ناكات، وەك چۆن حەز دەكات كوڕەكەی سەرپەرشت و بەرێوەبەری بووكەكەی بێت و ڕێرەوی ژیانی هاوسەرایەتیان بە پیاوانە و مەردانە و خۆڕاگرانە و دانایانە بەرێوە ببات، بەهەمان شێوەش بۆ زاواكەی حەز دەكات و ئاوات دەخوازێ، ئەگەرچی هەندێ جار كەمێك توندیش بینیبێ لە زاواكەی بەرامبەر كچەكەی" چونكە سەرچاوەی ژیری و دادپەروەری ئەمە دەخوازێ لە ئافرەتێك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە.

وەك چۆن خەسووی موسڵمان زیادەخەرجی پێ خۆش نییە لە بووكەكەی، ئەگەر زیادەخەرجی بكات، بەهۆی ئەوەی دڵی بە كوڕەكەی دەسوتێ، بەهەمان شێوە ئەگەر كچەكەی زیادەخەرجی بكات و سنور تێپەڕێنێ تەمێی دەكات بۆ ئەوەی دادپەروەری و یەكسانی پیادە بكات.

### دانا و ژیر و لێهاتووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی گرفتەكان

هەندێ جار زاوا خاوەنی بیروبۆچوونێكی تایبەتی دەبێت كە ژنەكەی و خەسوەكەی بە دڵیان نابێت، یاخود سروشتێكی تایبەتی هەیە لەگەڵ سروشتی ئەوان ناگونجێ، لێرەوە لەیەك دووركەوتنەوە و ناكۆكی ڕوودەدات، ئەركی خەسووی موسڵمان لێرە ئەوەیە ژیرانە بچێ بۆ زاواكەی

و دانایی بەکاربێنێ، تێگەیشتوو بێت و هۆشیارانە خۆی بگەیەنێتە دڵ و تێڕوانینی زاواکەی، وە بۆ ئەوەی بگاتە مەبەست پابەند دەبێ بە ئارامگرتن و خۆڕاگری و چاك ڕەفتارکردن و بێزار نەبوون.

زۆر هۆشیارە و سلبیاتی زاواکەی بۆ کچەکەی گەورە ناکات، بەڵکو تا لە توانای دابێت لەسەری سووك دەکات، هەوڵدەدات بە شێواز و هۆکاری شەرعی و حەکیمانە چارەسەری ئەم سلبیاتانە بکات، لەکاتێکا ئەگەر ئەم سلبیاتانە کەلێنێك و پەڵەیەك نەبن لە کەسایەتی زاواکەی لە ڕووی ئاین و خورەوشتەوە، وە هێندە ترسناك نەبێ ببێتە هۆی داڕوخانی ژیانی هاوسەرایەتی.

بەم شێوەیە خەسووی موسڵمانی ڕووناکبیر دەبێتە مایەی خێر و فەڕ و پیرۆزی بۆ کچەکەی و زاواکەی، کۆڵەگەیەکی چەسپاویش دەبێت لە کۆڵەگەکانی ژیانی هاوسەریان، بەهۆی دادپەروەری و پارێزگاریەکەی بەڵگە دەدات بەدەستەوە کە دایکی دووەمە بۆ زاواکەی نەك دوژمنێکی باو، وەك چۆن ئەم تێڕوانینە بڵاوە لە نێوەندە نەفام و دواکەوتووەکان، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دەرەنجامی خراپ پیادەکردنی موسڵمانان بۆ فەرمانەکانی ئاین و کەمتەرخەمیە لە پابەندبوونیان بە خورەوشتی ئیسلامی و بنەماکانی.

ئێستا با قەبارەی ئەو بەختەوەری و خۆشیە گەورەیە بێنینە بەرچاومان کە ئەو دوو خێزانە (خێزانی کوڕەکەی و خێزانی کچەکەی) هەستی پێدەکەن لەگەڵ ئەم خەسووە باوەڕدار و پارێزکار و تێگەیشتووە، کاتێك ئەم خەسووە بۆتە هاوڕێیەکی خۆشەویست بۆ زاوا و بۆ بووك، ئەم خۆشەویستیەی بۆتە مایەی بەختەوەری هەردوو خێزان.

بەڕاستی ئەم خەسووە بەهۆی دانایی و پارێزکاری و دادپەروەریەکەی و ڕەفتاری چاکی لەگەڵ زاوا و بووکی، کەشێکی بەختەوەر و خۆشی دابینکردووە بۆ ژیانی کچەکەی و کوڕەکەی، بێگەردی و حەسانەوە و دڵنیایی بەرپاکردووەو هەردوو خێزانی بە سوودە گشگیر و بەرفراوانەکەی گرتۆتەوە، ئەم سوودەش بە پلە یەك دەگەڕێتەوە بۆ کوڕەکەی و کچەکەی پێش بووك و زاواکەی.

## ٧ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ خزم و کەس و کاری

### ئافرەتی موسڵمان و کەس و کاری

ئافرەتی موسڵمانی ڕووناکبیر و شارەزا بە ئاینەکەی دەزانێ خزمانی مافیان لەسەری هەیە، داوای لێکراوە ئەم پەیوەندییە بگەیەنێ و چاکەکاربێ لەگەڵیان.

### ڕیزگرتنی ئیسلام لە خزمایەتی

ئیسلام ڕیزێکی ناوازەی ناوە لە خزمایەتی، کە بێجگە لە ئیسلام هیچ ئاین و شەریعەت و دەستور و فەلسەفەیەکیتر نەیناسیووە" بۆیە موسڵمانی سەبارەت بە خزمایەتی و گەیاندنی ئەم پەیوەندییەی لەلا خۆشەویستکردووە، زۆر بە توندیش هەڕەشەی کردووە لەوانەی نکۆڵی لێدەکەن و دەیپچڕێنن، بوخاری لە ابو هریرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((خودا دروستکراوانی دروستکرد، کاتێ لە دروستکردنیان بوویەوە، خزمایەتی (الرحم) هەڵسا و وتی: ئەمە شوێنی پەناگرتەیە بە تۆ لە پچڕاندنی ئەم پەیوەندییە. خودا فەرمووی: بەڵێ، ئایا ڕازی دەبێت پەیوەندیم لەگەڵ ئەو کەسە بگەیەنم کە پەیوەندی تۆ دەگەیەنێ و لەگەڵ ئەوەش بیپچڕێنم کە پەیوەندی لەگەڵ تۆ دەپچڕێنێ؟ وتی: بەڵێ، خودا فەرمووی: دەی ئەمە با بۆ تۆ بێت))، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر دەتانەوێ ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿ فَهَل عَسَيتُم إن تَوَلَّيتُم أن تُفسِدُواْ فِي الأرضِ وَتُقَطِّعُواْ أرحَامَكُم، أولآئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللهُ فَأَصَمَّهُم وَأعمَى أبصَارَهُم. واتا: وا تێ‌مەگەن لە سزای ئێمە دەربازتان دەبێت کاتێ پشت هەڵکەن لە پەیامی ئێمە و گەندەڵی لە زەوی بڵاوبکەنەوە و پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنن، ئەو جۆرانە خودا نەفرەتی لێکردون و گوێی لە بیستنی حەق کەڕکردوون و چاوی هۆشی نابیناکردون﴾ متفق علیە. شرح السنە ١٣/٢٠.

ئایەتی قورئان پەیتا پەیتا هات و جەختی کردەوە لەسەر شوێن و پلەوپایەی پەیوەندی خزمایەتی لە ئیسلام، پاڵ دەنێ بۆ چاکەکردن لەگەڵ خزمان و هۆشداری داوە لە پچڕاندنی و

خراپەکاری بەرامبەری، وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَاتَّقُواْ اللَّهَ الَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ... واتا: لەو خوایە بترسن کە بەهۆیەوە داوادەکەن و، خۆتان بپارێزن لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی﴾ النساء : ١.

لێرە خودا فەرمان بە تەقوا دەکات، ستایشی گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی کردووە و بە گەورەی گرتووە و جەختی کردووە لەسەر پلەوپایە و گرنگیەکەی، و هانی زوتر گەیاندن و چاکەکرنی داوە لەگەڵی. بۆئەوەی یادی خزمایەتی زیندوو و بەردەوام بێت لە هەستی موسڵمان، خودا لە زۆر ئایەت فەرمانی بە گەیاندن و چاکەکاری کردووە پاش باوەڕبوون بەخوا و چاکەکاری لەگەڵ دایك و باوك، دەفەرمووێ: ﴿ وَقَضَى رَبُّكَ ألاَّ تَعبُدُواْ إلاَّ إيَّاهُ وَبالوَالِدَينِ إحسَانًا﴾ الاسراء: ٢٣ پێشتر ڕاڤەکراوە. پاش کەمێك دەفەرمووێ: ﴿ وآتِ ذَا القُربَى حَقَّهُ وَابنَ السَبِيلِ وَلاَ تُبَذِّر تَبذِيرًا. واتا: مافی خزم و نزیکت بدە لەگەڵ مافی هەژار و ڕێبوار و زیادەڕۆیی مەککە لە خەرجی﴾ الاسراء :٢٦. گەلێکیتر ئایەت هەنە لە بارەی خزمایەتی و گەورەییەکەی....

پلەوپایەی چاکەکاری لەگەڵ خزم لەپاش پلەوپایەی دایك و باوك هاتووە" چونکە قورئان لە ڕێنماییکانیدا پلە بە پلە دێتە خوارەوە لە بەرزەوە بۆ نزمتر، بەهۆیەوە پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکان روون دەکاتەوە و پلەیان دەست نیشان دەکات، لە دایك و باوك دەست پێدەکات پاشان خزم و کەس پاشان هەتیو و هەژار و ڕێبوار و دراوسێ، کە لەوێ بازنەی گۆڕپانی چاکەکاری بەرفراوانتر دەبێت و سەرەتا نزیکان پاشان ئەوانەی لە خوارتر دێن دەگرێتەوە تا دەگاتە هەموو خاوەن پێویستیەکان لە خێزانی مرۆڤایەتی گەورە، ئیسلام لەو قۆناغبەندیەدا حەز و ئارەزووی مرۆڤایەتی لەبەرچاوگرتووە و بەوە دەستی پێکردووە کە لەپێشترە بۆی بە چاکەکردن لەگەڵی، وەك پیادەکردنێك بۆ بەرنامەی ئیسلام لە ڕێکخستنی کۆمەڵگەی ئیسلامی، کە وایکردووە سەرپەرشتی کۆمەلایەتی لە چوارچێوەی خێزانەوە دەست پێبکات، پاشان فراوانتر دەبێت بۆ بازنەی خزمایەتی، پاشان دەچێتە ناو بازنەی کۆمەلایەتی بەبێ زۆرە ملێ تەنها بۆ ئاسانکاری، بەمەش دامەزراوی و سۆز دەرخستن و بەزەیی بەیەك داهاتن لەنێوان ئادەمیزادەکان جێبەجێ دەکات، تا خۆشی و گەشبینی و بەختەوەری لە ژیان بلاوببێتەوە.

یەکێ لەو ڕێزانەی ئیسلام بەخشیوویەتی بە خزمایەتی وایکردووە پەیوەنییەکە یەکێ بێ لە بنەما سەرەتاکانی ئیسلام و بنەڕەتە گەورەکانی ئەم ئاینەی بۆ مرۆڤایەتی هێناویەتی، ملکەچبوونی پێغەمبەر ﷺ بۆ فەرمانی خوا وەك ڕوونکردنەوەیەك بوو بۆ بنەما و بنچینەکانی ئەم ئاینە نوێیە و ڕێنماییەکانی، و وایکردووە ئەو ڕێزەی بە خزمایەتی دراوە ببێتە دیارترین و ڕوونترینی ڕێنمایی و فەرمانەکانی ئەم شەریعەتە پیرۆزە، ئەم شتە دەبینین لە فەرمووودە درێژەکەی ابی سفیان لەگەڵ هرقل، کاتێ هرقل لە ابی سفیانی پرسی: پێغەمبەرەکەتان فەرمانی چیتان پێدەکات؟ وتی: ((دەڵێ: تەنها الله بپەرستین، هیچ هاوبەشێکی بۆ بریارمەدەن، وازبێنن لەوەی باب و باپیرانتان دەیانوت، فەرمانمان پێدەکات بە نوێژکردن، ڕاستگۆیی، داوێن پاکی، گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی)) متفق علیه. ریاض الصالحین: ٥١.

پەیوەندی خزمایەتی لە ڕیزی ڕێنمایی گەورەکانیتری ئەم ئاینە بێگەردە هاتووە وەك یەکتاپەرستی و نوێژکردن و پابەندبوون بە ڕاستگۆیی و داوێن پاکی. لێرەوە پەیوەندی خزمایەتی دەبێتە دیارترین جیاکەرەوەکانی ئەم ئاینە کە ئەبوسفیان چرپاندی بە گوێی هرقل لەو کاتەی یەکەمجارە لەبارەی ئیسلام پرسیار دەکات و دەیەوێت لە گرنگترین ئەو شتانە تێبگات کە هێناویەتی.

هەروا لە فەرمووودەی درێژی (عەمرو بن عەبەسە) کە کۆمەڵێك لە ئادابەکانی ئیسلامی لە خۆگرتووە، تیایدا دەڵێ: لە مەککە هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ ـ لە سەرەتای پێغەمبەرایەتی ـ و پێم وت: تۆ کێی؟ فەرمووی: ((پێغەمبەرم)). وتم: چ پێغەمبەرێك؟ فەرمووی: ((نێردراوی خودام)). وتم: بەچی تۆی ناردووە؟ فەرمووی: ((ناردمێتی بە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، شکاندنی بت و پەرستراوی بێجگە لە الله،وە بە پەرستنی الله بە تەنها و هیچ هاوەڵێکی بۆ بریار نەدرێ...)) مسلم ١١٥/٦. ئنجا لەبەر گرنگی پەیوەندی خزمایەتی دەبینین پێغەمبەر ﷺ لە پێشەوەی بنەما و بنچەکانی ئیسلام باسیکردووە.

له ابی ایوب الانصاری هاتووه: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کارێکم پێ بڵێ بمخاتە بەهەشت، فەرمووی: ((تەنها الله بپەرستە و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدە، نوێژەکانت بکە، زەکات بدە، پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنە)) متفق علیه. ریاض الصالحین:١٩٥.

چەندە مەزنە پەیوەندی خزمایەتی! چەندە سەنگین و قورسە لە تەرازووی کردەوە چاکەکانی مرۆڤ! ئەوەتا لەگەڵ پەرستنی خوا و یەکتاپەرستی و نوێژ و زەکات هاتووە، کەواتە لە کردەوە هەرە بەرزە چاکەکانە کە خاوەنەکەی دەخاتە بەهەشت و لە ئاگر دەیپارێزێ.

ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس حەزبکات رزق و رۆزی فراوان بێت، تەمەنی درێژ و بە فەڕ بێت، با پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێ)) متفق علیه. شرح السنە ١٩/١٣.

ابن عمر ﷺ دەیوت: ((هەرکەسێ لە پەروەردگاری بترسێ و پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێ، مردنی دوادەکەوێت، ماڵی زۆر دەبێت، کەس و کاری خۆشی دەوێن)) البخاری فی الادب المفرد ١٤٠/١.

گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی وەك چۆن لە پیاو داواکراوە ئاوەهاش لە ئافرەت داواکراوە، فەرمانەکە ئاڕاستەی مرۆڤی موسڵمان کراوە چ پیاو بێ چ ئافرەت، وەکوو ئەرکە شەرعیە گشتییەکانیتر. لەم ڕوانگەوە ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار ڕاسگۆیانە و گەرم و گوڕانە ڕوودەکاتە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، ئەرك و کار و سەرقاڵیەکان و بەرپرسیاریەتیەکان هەرچەندە زۆر بن لە گەیاندنی ئەم پەیوەندییە داینابڕن.

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو دەزانێ گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی مایەی خێر و فەڕە بۆ رزق و تەمەنی، میهر و سۆزێکی خواییە کە لە دونیا و دوارۆژ دەیگرێتەوە، هەروا مایەی دەستکەوتنی خۆشەویستی خەڵك و ناوبانگی باشە، بە پێچەوانەوە پچڕاندنی ئەم پەیوەندییە دەبێتە هۆی بەدبەختی و بەلا و رق لێبوونەی خوا و خەڵك، بەهۆیەوەش لە بەهەشت دووردەکەوێتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ناچێتە بەهەشت کەسێك پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێ)) متفق علیه. شرح السنە ٢٦/١٣.

ئافرەتی موسڵمان دەبێ بزانێ ڕەحمەتی خوا قەدەغە دەکرێ و دەگیرێتەوە لەو کەسەی پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێ، میهر و بەزەیی خوای بەسەریدا نابارێ، تەنانەت بەسەر ئەو کۆمەڵ و گەلەش داناباریٚ کە کەسێکی تیابێت ئەم پەیوەندیەی پچڕاندبێ. وەك هاتووە لە فەرموودەی بوخاری لە الادب المفرد ١/١٤٤ کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ڕەحمەت و میهری خودا داناباریٚتە سەر کۆمەڵ و گەلێك کەسێکی تیابێت پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندبێ)).

بۆیە ابو هریرە لەیەکێ لە کۆڕەکانیدا لە شەوەکەی ڕۆژی پێنج شەممە واتا شەوی هەینی وتی: سورم لەسەر ئەوەی هەرکەسێك پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندووە لە نێومان هەڵسێ. بەڵام کەس هەڵنەستا، سێ جار ئەمەی دوبارە کردەوە، پاشان کوڕێك هەڵسا چووە لای پورێکی کە چەندین ساڵ بوو سەردانی نەدەکرد، کاتێ لێی چووە ژوورەوە، پوری وتی: ئەوە چی تۆی هێنایە سەردانی من برازاکەم؟ وتی: گوێم لە ابو هریرە بوو واو وای دەوت، وتی: دەبگەڕێوە لای و لێی بپرسە لەبەرچی وای وتووە؟ ابو هریرە وتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ((کردەوەکانی مرۆڤ هەموو ئێوارەیەکی ڕۆژی پێنج شەممەی شەوی هەینی دەخرێتە بەردەستی الله، کردەوەی کەسێك وەرناگیرێ کە پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندووە)) البخاری فی الادب المفرد ١/١٤٢.

بەڕاستی ئەمە بەڵایەکی گەورەیە دوچاری ئەو کەسە دەبێتەوە کە پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێ، کاتێ نزا دەکات گیرا نابێت، کار و کردەوەکانی بەرز نابێتەوە، بەدوای ڕەحمەتی خواوەیە کەچی ڕەحمەتی خوا لێی دووردەکەوێتەوە، لەم ڕوانگەیەوە هەرگیز نابێ ئافرەتێك ئیسلام تێکەڵی دڵی بووبێ پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێ.

ئافرەتی باوەڕدار بە خوا و بە ڕۆژی دوایی خۆی لەم گوناهە دەپارێزێ" چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هیچ گوناهێك لە ستەمکردن و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی شایانتر نییە کە خودا سزای خاوەنەکەی پێش بخات لە دونیا لەگەڵ هەڵگرتنی بۆی بۆ دواڕۆژ)) رواه احمد ٥/٣٨ وابن ماجه ٢/٣٧. لەبەرئەوەی پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و ستەمکردن لەیەك ئاستن بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەیەك فەرمایشتدا کۆیکردۆتەوە، وەك جەختکردنێك لەسەر پەیوەندی بەتین لەنێوان

پچڕاندنی ئەم پەیوەندییە و ستەمکردن. جا چ ستەمێك دژوارترە لە لەیەك ترازاندنی زنجیرەی خزمایەتی و پچڕاندنی گرێکانی خۆشەویستی لەنێوان کەس و کار و نزیکان؟!.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((خزمایەتی (الرحم) سکاڵا دەکات لەلای خودای میهرەبان و دەڵێ: خوایە من ستەمم لێکراوە، خودایە منیان پچڕاندووە، خودایە من وا...، خواش وەڵامی دەداتەوە: ئایا ڕازی دەبیت پەیوەندیم بپچڕێنم لەگەڵ ئەوەی پەیوەندیت دەپچڕێنێ و بیگەیەنم لەگەڵ ئەوەی دەتگەیەنێ؟)) البخاری فی الادب المفرد ١٦٤/١.

لە فەرموودەیەکی قودسیدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: خودا دەفەرموووێ: ((من میهرەبانم، من خزمایەتی (الرحم)م دروستکردووە، لە چاوگی ناوی خۆم ناوم لێناوە، هەرکەسێ بیگەیەنێ دەیگەیەنم، هەرکەسێکیش بیپچڕێنێ دەیپچڕێنم)) البخاری فی الادب المفرد ١٣٢/١.

لەم دەقانە جەختکردنێکی ئاشکرا هەیە لەسەر ئەوەی کەسێك پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێ بەختەوەر و خۆشەویست و ڕێزدارە و چێژی ڕەزامەندی و ڕەحمەتی خوا دەکات. کەسێکیش ئەم پەیوەندییە بپچڕێنێ بەدبەخت و چارەڕەش و دابڕاوە لە پەروەردگاری و بێبەشە لە لێبووردن و ڕەزامەنییەکەی.

## ئافرەتی موسڵمان بەپێی ڕێنمایی ئیسلام پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنێ

ئافرەتی موسڵمانی ڕووناکبیر هەمیشە پەیوەندی هەیە لەگەڵ خزمانی، هیچ سەرقاڵیەك و ئەرکێکی دایکایەتی و ماڵ لە گەیاندنی ئەم پەیوەنییە بێ ئاگای ناکات، کاتی سەردانەکانی ڕێك دەخات بەپێی پلەبەندی لە ئیسلام لە نزیکترینیان دەست پێدەکات، سەرەتا سەردانی دایکی دەکات، پاشان باوکی، پاشان ئەوانیتر لە نزیکەوە تا بەرەو خوارتر، پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کێ لەپێشترە بە چاك هاوڕێتیکردنی؟ فەرمووی: ((دایکت، پاشان دایکت، پاشان دایکت، پاشان باوکت، پاشان ئەوانەی لە خوارترن)) متفق علیه. ریاض الصالحین: ١٨٩.

ئافرەتی موسڵمان: چاکەکردن لەگەڵ خزمان و نزیکان دوو پاداشتی هەیە، پاداشتی خزمایەتی و پاداشتی خێرکردن، ئەگەر ئافرەت دەوڵەمەندبوو با یارمەتی ئەوانە بدات کە پێویستیان بە یارمەتییە، بەمەش ئەو دوو پاداشتە دەباتەوە و دڵی خزمانیشی پڕدەبێت لە خۆشەویستیەکەی، هەر ئەوەشە ئیسلام هانمان دەدات لەسەری و پێغەمبەریش ﷺ بانگەوازی بۆ دەکات، وەك لەو فەرموودەیەی زینب خێزانی عبدالله بن مسعود دەیگێڕێتەوە کە پێشتر ئاماژەمان پێکردبوو.

هەروا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خێر بە هەژار خێرێکە، وە بە خزم دوو خێرە: صەدەقە و گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتیە)) الترمذي ٢/٨٤.

لە صحیحی بوخاری هاتووە، مەیمونەی کچی حارث دایکی باوەڕداران، هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئەم کەنیزەکەی خۆی ئازادکردووە بێ ئەوەی مۆڵەت وەرگرێ. جا کاتێ نۆرەی شەوی مەیمونە هات بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا زانیوتە کەنیزەکەی خۆم ئازادکردووە؟ فەرمووی: ((واتکردووە؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((ئەگەر بتبەخشیبووایە خاڵوانت پاداشتت گەورەتر دەبوو)) متفق علیه. شرح السنه ٦/١٩٥.

پێغەمبەر ﷺ لە هەموو دەرفەت و بۆنەیەکدا جەختی دەکردەوە لەسەر لە پێشتربوونی نزیکان بە چاکەکردن لەگەڵیان، کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبوون.... واتا: ناگەنە پلەی چاکەکاری ڕاستەقینە تا نەبەخشن لەو شتانەی لاتان خۆشەویستە...﴾ ال عمران: ٩٢، ابو تەڵحە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خودا دەفەرمووێ: ﴿ لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبوون...﴾ وە خۆشەویسترینماڵم لەلای من (بیرحاء)ە - بیرحاء باخێکی خورما بوو- ئەوە کردمە صەدەقە بۆ خوا بەئومێدی چاکەکەی و هەڵگرتنی بۆم لەلای خوا، دەی ئەی پێغەمبەری خوا، چۆنی بەباش دەزانی هەڵس و کەوتی پێبکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمە ماڵێکی پڕ لە قازانجە، ئەمە ماڵێکی پڕ لە قازانجە، وە ئەوەی وتت بیستم، من وای بەباش دەزانم کە بیدەیتە نزیکانت، ابو تەڵحە وتی: وا دەکەم ئەی پێغەمبەری خوا، جا ابو تەڵحە دابەشیکرد بەسەر نزیکانی و ئامۆزایانی)) متفق علیه. شرح السنه ٦/١٨٩.

پێغەمبەر ﷺ لە ڕێی ڕێنماییەکانی چوویە ناو ناخی ڕۆژگار، کاتێ ئامۆژگاری هاوەڵانی کرد سەبارەت بە خەڵکی میصر لەو فەرموودەیەی مسلم گێڕایتیەوە: ((ئێوە میصر رزگار دەکەن، خاکێکە قیراط دراویانە، کاتێ ڕزگارتان کرد، لەگەڵ خەڵکەکەی چاکەکار بن" چونکە خاوەن پەیمان و خزمی ئێمەن. یا فەرمووی: خاوەن پەیمان و خەزورانی ئێمەن)) مسلم ١٦/٩٧. زاناکان لە ڕاڤەکردنی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێن: خزمایەتیەکە بەهۆی ئەوەیە کە هاجەرەی دایکی اسماعیل لەوانە، خەزورایەتیەکەش بەهۆی ئەوەیە کە ماریەی دایکی ابراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ لەوانە.

کاتێ ئافرەتی موسڵمان گوێبیستی ئەم ڕێنمایی بەرزەی پێغەمبەر ﷺ دەبێت، زیاتر ڕوودەکاتە خزمانی، خۆشەویستی و سۆزی بێوێنەیان پێشکەش دەکات، بەردەوام سەردانیان دەکات و چاکەیان لەگەڵ دەکات.

## پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنێ ئەگەرچی ناموسڵمانیش بن

ئافرەتی موسڵمان سەیری ڕێنمایی ئاینەکەی دەکات، دەبینێ بەهۆی لێبوردەیی و هەستە مرۆڤایەتیەکەی زیاتر شکۆدار دەبێ کاتێ ئامۆژگاری دەکات بە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ خزم و کەس ئەگەرچی ناموسڵمانیش بن، لەو فەرموودەی عبدالله بن عمر بن العاص ﷺ دەیگێڕێتەوە، وتی:گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو بەئاشکرا و بێپەردە دەیفەرمووو: ((بەرەی فلانە کەس خۆشەویست و پاڵپشتی من نین، بەڵکو خۆشەویست و پاڵپشتی من خوا و باوەڕدارانی چاکن، بەڵام پەیوەندی خزمایەتیان لەگەڵمدا هەیە و منیش دەمەوێت بە چاکە و بەو شێوەی شایستەیە بیگەیەنم)) متفق علیه. شرح السنه ١٢/٢٩.

کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَأَنذِر عَشِيرَتَكَ الأَقرَبِين. واتا: خزمە نزیکەکانت هۆشداربکەوە و بیانترسێنە﴾ الشعراء : ٢١٤، پێغەمبەر ﷺ بانگی قوڕەیشی کرد، ئەوانیش کۆبوونەوە، بەگشتی و بەتایبەتی بانگیکردن و فەرمووی: ((ئەی بەرەی کەعب بن لوئەی، خۆتان لە ئاگر رزگاربکەن. ئەی بەرەی مورە بن کەعب، خۆتان لە ئاگر رزگاربکەن. ئەی بەرەی عەبد شەمس، خۆتان لە ئاگر رزگاربکەن. ئەی بەرەی عەبد مەناف، خۆتان لە ئاگر رزگاربکەن. ئەی بەرەی هاشم خۆتان لە ئاگر

رزگاربکەن. ئەی بەرەی عبدالمطلب، خۆتان لە ئاگر رزگاربکەن. ئەی فاتیمە، خۆت لە ئاگر رزگاربکە" چونکە من لەلای خوا بۆ ئیوە هیچ شتێکم پێناکرێ و دەسەلاتم نییە، تەنها ئەوەنەبێ ئێوە خزم و نزیکی منن و منیش وەکوو شایستەیە ئەم پەیوەندییە دەگەیەنم و مافی خۆی دەدەم)) مسلم ٧٩/٣.

ئەم رێنماییانە چووبوویە ناخی گوێی موسڵمانان و جێگای خۆی لەناو دڵیان کردبوویەوە" بۆیە ابن عبدالبر لە (الاستیعاب) وە ابن حجر لە ( الاصابە) دەگێرنەوە کە کەنیزەکێکی صەفیەی دایکی باوەڕداران هاتە لای (عمر ﷺ ) ئەمیری باوەڕداران و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، صەفیە ڕۆژی شەممەی خۆش دەوێت و سەردانی جولەکەش دەکات. عمر ﷺ ناردی بە شوێن صەفیە و لەم بارەوە لێیپرسی، ئەمیش وەلامی دایەوە: هەرچی شەممەیە ئەوا خۆشم نەویستووە لەو کاتەوەی خودا بۆی گۆڕیومەتەوە بە ڕۆژی هەینی، وە هەرچی جولەکەشە ئەوا پەیوەندی خزمایەتیم لەگەڵیان هەیە و پەیوەندیەکە دەگەیەنم، پاشان ڕوویکردە کەنیزەکەکەی و لێیپرسی سەبارەت بەو پاڵنەرەی وای لێکردووە ئەم درۆیە بکات؟ کەنیزەکەکە وەلامی دایەوە: شەیتان ئەم کارەی پێکردم! وەلامی صەفیەش ئەوەبوو: بڕۆ تۆ ئازادی[١].

لێرەوە ئافرەتی موسڵمان دەبینێ کە شەوقی سۆزی مرۆڤایەتی لە دڵی موسڵمانێك دانابڕێ کە شایەتی دابێ، بەڵکو لێیەوە دەپرژێتە سەر هەموو خزمێك و مافی خۆی دەداتێ بەچاکە، ئەگەرچی ناموسڵمانیش بن. ئەو گوزارشتەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموووێ: ((غیر ان لکم رحما سابلها ببلالها)) واتا: ((تەنها ئەوە نەبێ ئێوە خزم و نزیکی منن و منیش دەمەوێت ئاودێری بکەم و مافی خۆی بدەمێ)) لە لوتکەی ڕەوانبێژی عەرەبییە، کاتێ پەیوەندی خزمایەتی چوواندووە بە زەوی، بە گەیاندنی و چاکەکاری لەگەڵیان ئاوەدەرێ و خۆشەویستی وسۆز دێتە بەرهەم. بە پچڕاندنی و پشت لەیەککردن ووشك دەبێ وتەنها ڕق و وشکی بەرهەم دێنێ. مرۆڤی موسڵمانی ڕاستەقینە ساز و خۆشەویستە لەلای خەڵکی" چونکە خەڵکی تیایدا بەرجەستەبوونی بەهارەوشتەکان و خاسیەتە چاکەکان بەدی دەکەن.

---

[١] الاستیعاب ١٨٧٢/٤، وابن حجر في الاصابة ١٢٧/٨.

ئیسلام هانی چاکەکردنی داوە لەگەڵ دایك و باوك، ئەگەرچی بێ باوەڕیش بن، هەروا هانی چاکەکردن دەدات لەگەڵ خزمان ئەگەرچی بەهەمان شێوە بێ باوەڕ بن، لە ڕوانگەی لێبووردەیی مرۆڤایەتی و ئەو سۆزەی کە ئەم ئاینە بۆ هەموو خەڵکی هێناوە، کە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا أرسَلنَاكَ إلاَّ رَحمَةً لِلعَالَمِينَ. واتا: ئێمە تۆمان تەنها وەکوو میهر و رەحمەتێك ناردووە بۆ هەموو جیهان﴾ الانبیاء :١٠٧.

## لە واتا بەرفراوانەکەی پەیوەندی خزمایەتی تێگەیشتووە

ئافرەتی موسڵمان دەزانێ ڕووەکانی گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی زۆرن، بوارەکانی بەرفراوانە، شێواز و ڕواڵەتەکانی جۆراوجۆرە: جارێ بە بەخشینی پارە دەبێت بۆ لادانی هەژاری و پڕکردنەوەی پێویستی و لادانی بەلا، یا بە سەردانێکی پڕ لە سۆز دەبێت کە پەیوەندییەکانی خزمایەتی بەهێز دەکات و کانی خۆشەویستی دەتەقێنێتەوە، هەندێ جار بە وشەیەکی چاك و زەردەخەنەیەکی پڕ لە سۆز و پێشوازیەکی گەرم دەبێت، یا بە ئامۆژگاری و دڵسۆزی و فیداکاری دەبێت، هەروا گەیاندنی ئەم پەیوەندییە بە کاریتری خێر و چاکە دەبێت کە سۆزی مرۆڤایەتی پتەودەکات و هەستی بەیەکەوە ژیان و بەزەیی و گونجان و خۆشەویستی و سۆز لەنێوان خزمان گەشە پێدەدات.

بۆ ئەم مەبەستانە ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ هاندەرە لەسەر بەردەوامبوونی ئەم پەیوەندییە، ئەگەرچی لە سادەترین شێوە و کەمترین خەرجی دابێت، وەك دەفەرمووێ: ((ئاودێری خزمایەتیتان بکەن ئەگەر بە سەلامکردنیش بێت)) البزار ٢/٣٧٣.

## پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنێ ئەگەرچی ئەوان سەردانی نەکەن

ئەو ئافرەتە موسڵمانەی کە گیانەکەی تێراوبووە لە ڕێنمایی ئەم ئاینە ڕەوایە پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنێ ئەگەرچی ئەوان بیپچڕێنن، هەرگیز وەکوو ئەوان مامەڵە ناکات کاتێ سەردانی بکەن سەردانیان بکات و کە سەردانی نەکەن سەردانیان نەکات" چونکە ئافرەتی موسڵمان هەردەم پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنێ و مەبەستیشی دڵسۆزیە بۆ خوا و دەستکەوتنی پاداشتە و، چاوەڕوانی بەرامبەر نییە، یان بۆئەوەی سەردانی بکەنەوە، بەمەش بەهۆی کردار و

ڕەوشتەکەی نمونەیەکی بەرز لە ڕەوشتی بڵندی مرۆڤایەتی دێنێتەوە کە ئیسلام هەمیشە سووربووە لەسەر ڕەگ داکوتانی لە ناخی موسڵمانان. گەیشتن بەم ئاستە کارێکی ئەستەمە تەنها بۆ ئەوانە نەبێت خودا ڕێنمایی کردون و دەروونیان ملکەچبووە بۆ ڕەزامەندی خودا، ئەم جۆرە ئافرەتە موسڵمانە بەرزانە کردار بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، کە دەفەرمووێ: ((بەو کەسە ناوترێ پەیوەندی خزمایەتی گەیاندووە کاتێ سەردانی بکەن سەردانیان بکاتەوە، بەڵکو ئەو کەسە پەیوەندی خزمایەتی گەیاندووە کاتێ پەیوەندی لەگەڵ دەپچڕێنن، ئەم سەردانیان دەکات و پەیوەندییەکە دەگەیەنێ)) فتح الباری ١٦/٤٢٣.

ئەمەیە ئەو خوڕەوشتە بەرزەی مرۆڤایەتی کە ئیسلام دەیەوێ پیاو و ئافرەتی موسڵمان بیگاتێ لە مامەڵەی لەگەڵ خزمان. پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من خزمانێکم هەن سەردانیان دەکەم و سەردانم ناکەن، چاکەیان لەگەڵ دەکەم خراپەم لەگەڵ دەکەن، بەرامبەریان نەرم و نیانم، بەرامبەرم نەفام و نەزانن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر وەك چۆن دەڵێی وابیت، ئەوا وەك ئەوە وایە گڵی گەرمیان دەرخوارد بدەی، وە لەلایەن خواوەش پشتگیری و یارمەتی دەرت دەبێ لەسەریان تا لەسەر ئەم بارە بمێنی)) مسلم ١٦/١١٥.

ئای لە خزمایەتی! چەندە قورسە کێشی گەیاندنی ئەم پەیوەنییە لە تەرازووی بەندەی باوەڕدار! چەندە بەدبەختن ئەوانەی نکۆڵی لێدەکەن! ئەوانەی پەتی خۆشەویستیەکەی دەپچڕێنن! چەندە مەزنە پاداشتی ئەوەی دەیگەیەنێ و ئارام دەگرێ لەسەر مامەڵەی وشك و پچڕانی خزمانی بەرامبەری! بەجۆریك خوا بە پشتیوانی خۆی کۆمەکی دەکات و بەسەریانی زاڵ دەکات و دڵی پڕدەکات لە ئارامگرتن بەرامبەر بە ئەزیەتەکانیان، سەقامگیر و خۆڕاگری دەکات لەسەر بەردەوام دەستگرتنی بەم خوڕەوشتە مرۆڤایەتیە ناوازەیە.

لێرەوە ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ لە هەموو کاتێك پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنێ و نایپچڕێنێ. بە ئومێدی بەردەوامبوونی میهری خوا لەسەری، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (( خزمایەتی (الرحم) نووساوە بە عەرشی خودا و دەڵێ: هەرکەسێ بمگەیەنێ، خودا پەیوەندی لەگەڵ

بگەیەنێ، وە هەرکەسێ بمپچڕێنێ، خودا پەیوەندی لەگەڵ بپچڕێنێ)) متفق علیه. ریاض الصالحین: ١٩١.

## ٨ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ دراوسێکانی

### ئافرەتی موسڵمان چاکەکار و بەسۆزە بۆ دراوسێکانی

یەکێ لە خوڕەوشتەکانی ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بە ڕێنمایی ئاینەکەی، کە پابەندە بە پەتە بەتینەکەی، ئەوەیە: لەگەڵ دراوسێکانی چاکەکار بێت و گرنگی و بایەخ بدات بە کاروباریان.

### ڕێنمایی ئیسلام بە چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ بەرجەستە دەکات

ئافرەتی موسڵمان تێگەیشتووە لە ڕێنمایی بەرزی ئیسلام لە هاندانی گەرم و گوڕی و ئامۆژگاری توندی سەبارەت بە دراوسێ، تەنانەت پلەوپایەیەکی وای بۆ داناوە لە پایەکانی پەیوەندییە مرۆییەکان کە پێشتر مرۆڤایەتی لە هیچ ئاینێکیتر نەیناسیووە، وەك خودا دەفەرموووێ: ﴿وَاعبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشرِكُواْ بِهِ شَيئًا وَبِالوَالِدَينِ إِحسَانًا وَبِذِي القُربَى وَاليَتَامَى وَالمَسَاكِينِ وَالجَارِ ذِي القُربَى وَالجَارِ الجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بَالجَنبِ وَابنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَت أَيمَانُكُم.... واتا: ﴿تەنها الله بپەرست و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار مەدەن و لەگەڵ دایك و باوکانتان چاکەکار بن هەروا لەگەڵ خزم و نزیکان و هەتیوان و کەم دەرامەتان و دراوسێی خزم و دراوسێ ناخزم و هاوڕێی گەشت لە کاری چاکە و ڕێبوار و ئەو کۆیلانەی لە ژێر دەستتانن ...﴾ النساء: ٣٦

لەم ڕوانگەیەوە هەرکەسێك لەتەك مرۆڤی موسڵمان بێت مافی دراوسێیەتی لەسەرە، ئەگەرچی پەیوەندی خزمایەتی یا ئاینی لە نێوانیاندا نەبێت، لەمەشەوە ڕیزلێنانی دراوسێ و بەرزراگرتنی پەیوەندی دراوسێتی لەشەرعی ئیسلامی شکۆدار بەدی دەکرێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((جبریل ـ ع ـ لەبارەی دراوسێ هێندە ڕایسپاردم تا وامزانی میراتی لێدەگرێ)) متفق علیه. شرح السنه ١٣/٧١.

ئەمە ئەو پلەوپایە بەرزەیە کە دراوسێ ناسیویەتی لە شەرعی ئیسلام" بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو بۆنەیەك فەرمانی دەکرد بە چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ. ابو امامە ﷺ دەڵێ: ((گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، کە لەسەر حوشترە لوت بڕاوەکەی بوو لە حەجی ماڵئاوایی، دەیفەرموو: سەبارەت بە دراوسێ ڕاتاندەسپێرم، زۆر ئەوەی دوبارە کردەوە، تا وتم: میراتی لێدەگرێ)) الطبراني (مجمع الزوائد ١٦٥/٨).

هەروا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با چاکەکار بێ لەگەڵ دراوسێکەی، وە هەرکەسێ باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانی بگرێ، وە هەرکەسێ باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی خێر بکات ئەگەر نا با بێ دەنگ بێ)) متفق علیه. ریاض الصالحین: ١٨٥.

لە گێڕانەوەیەکیتری بوخاری: ((هەرکەسێ باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێکەی نەدات...)) فتح الباری ٤٤٥/١٠.

دەبینین لە سەرەتای ئەم فەرموودانەوە ڕایسپاردین بە چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ، وە ئەم چاکەکارییە بە نیشانەیەك لە نیشانەکانی باوەڕبوون بەخوا و بە ڕۆژی دواییە و بەرهەمێکە لە بەرهەمە چاکەکانی.

## ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ دراوسێکانی پێی خۆشە

ئافرەتی موسڵمانی بێدار دڵنەرمە، سنگ فراوانە، سروشت خۆشە، دراوسێی خۆش دەوێت، زۆر هەستیارە لە هەرچی ئەزیەتیان بدات یا ڕێزیان بریندار بکات یا ئازاریان پێبگەیەنێ، خێری بۆ دەوێن وەك چۆن خێری بۆ خۆی دەوێت، بە خۆشیەکانیان دڵخۆشە، بە ئازاریان دڵتەنگە، لەم فەرموودەیە باش تێگەیشتووە کە دەفەرمووێ: ((کەسێکتان باوەڕناهێنێ تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت)) متفق علیه. شرح السنه ٦٠/٣٠.

له گێڕانەوەیەکی مسلم لە ئەنەسەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە بەندەیەك باوەڕناهێنێ تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ دراوسێکەشی یا فەرمووی بۆ براکەشی پێی خۆش بێت)) مسلم ١٧/٢.

ئافرەتی موسڵمان لە یادی ناچێت ماوە ماوە بەخشین و دیاری پێشکەش بە دراوسێکانی بکات، یان هەندێ لەو چێشتەی بۆ بنێرێ کە بۆنی بۆیان دەچێت و دەزانێ ئەوان لە توانایان نییە وەك ئەم چێشتە ئامادە بکەن، تاوەکوو ئەو گونجانە کۆمەڵایەتیە بێتەدی کە پێغەمبەر ﷺ هانی داوین لەسەری لە فەرمووودەی ابا ذر ﷺ کە دەفەرمووێ: ((ئەی ئەبا ذر ، ئەگەر شلەیەکت لێنا ئاوەکەی زۆربکە و بۆ دراوسێکەشتی بنێرە)) مسلم ١٧٢/٦.

له گێڕانەوەیەکیتر: ((ئەگەر شلەیەکت لێنا ئاوەکەی زۆر بکە، پاشان سەیری ماڵی دراوسێت بکە و بە چاکە هەندێکیان بۆ ببە)) مسلم ١٧٢/٦.

ئافرەتی موسڵمانی دینداری ویژدان زیندوو بەرگە ناگرێ ببینێ دراوسێکەی نەبوون و کەم دەرامەتن و دەستیان بۆ درێژ نەکات، یا شتێك لە خۆراك و پێویستیتریان بۆ بنێرێ، بەتایبەتی ئەگەر بە خۆی هەبوون و دەوڵەمەندبوو و خودا لە بەخشش و خۆشیەکانی ژیانی پێدابوو، لەکاتێکا ئەم فەرمووودەیە دەبیسێ: ((باوەڕی بە من نەهێناوە ئەوەی بە سکی تێرەوە بخەوێ لەکاتێکا دراوسێکەی لە تەنیشتیەوە برسیەیە، وە ئەویش بە حاڵی دەزانێ)) الطبراني والبزار (مجمع الزوائد ١٦٧/٨).

وە: ((باوەڕی تەواو ناهێنێ ئەوەی بەخۆی تێرە و دراوسێکەی برسیەیە)) الطبراني وابو يعلى (مجمع الزوائد ١٦٧/٨).

### بەپێی توانای خۆی لەگەڵ دراوسێکانی چاکە دەکات

ئافرەتی موسڵمان چاکە لەگەڵ دراوسێی دەکات ئەگەر بە شتێکی کەمیش بێت، وە لەبەر فیز و شەرم خێری کەم ناگێڕێتەوە بەبیانووی ئەوەی بڵێیت: جوان نییە ئەو شتە کەمەی پێببەخشم تا ئەوکاتەی شتێکی گونجاوتر و زۆرتر دەبەخشم، بەمەش دراوسێکەی لەو خێرە بەردەستە بێبەش

دەكات بەئومێدی خێرێكی زۆری چاوەڕوان كە لەوانەیە هەر بەدەستی نەكەوێت و دەرفەتی خێرەكەشی لە كیس دەچێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەی ئافرەتانی موسڵمان: خێركردن بە دراوسێ بەكەم مەزانن با لەقە سمی مەڕێكیش بێت)) متفق علیە. شرح السنە ١٤١/٦.

خوای گەورەش دەفەرموووێ: ﴿ فَمَن يَعمَل مِثقَالَ ذَرَّةٍ خَيرًا يَرَه. واتا: هەركەسێ یەك تۆسقاڵ چاكە بكات پاداشتەكەی وەردەگرێتەوە﴾ الزلزلە: ٧.

هەروا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((خۆتان لە ئاگر بپارێزن ئەگەر بە لەتە خورمایەكیش بێت، ئەگەر ئەوەشتان نەبوو ئەوا بە قسەیەكی چاك)) متفق علیە. شرح السنە ١٤١/٦.

لەم فەرمایشتانە ئەوەش تێدەگەین ئەو دراوسێیەی خێری پێدەكرێ ئەگەر شتێكی كەمیش بێت، باش وایە لەبەرچاوی بێت و سوپاسی خاوەنەكەی بكات" چونكە بە سوپاسكردن لەسەر چاكە خۆشەویستی و دڵسۆزی لە نێوان دراوسێكان بڵاودەبێتەوە، سۆز و بەزەیی لە ژیانیان گەشە دەكات، لەپاڵ ئەمانەوە سوپاسگوزاری ڕەوشتێكی ڕەسەنی ئیسلامیە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((كەسێ سوپاسی خەڵك نەكات سوپاسی خوای نەكردووە)) البخاری فی الادب المفرد ٣١٠/١.

ئیسلام ویستی خۆشەویستی و سۆز لە نێوان دراوسێكاندا بڵاوبكاتەوە، وە ڕێگاكانی گەیشتنی مرۆڤ بۆ ئەم خۆشەویستی و سۆزە زۆرن، وەك: دیاری پێشكەشكردن" بۆیە پێغەمبەر ﷺ جڵەوگیری كردووە لە ئافرەت لەوەی دیاری ناردن بۆ دراوسێ یا وەرگرتن لێی بەكەم بزانێ" چونكە ئافرەت لەو جۆرە هەڵوێست و بۆنانەدا هەستیارە، كە لەوانەیە كاریگەری هەبێ لەسەر دەروونی بەرامبەر بە دراوسێكانی، بەمەش سەرنجی ئافرەتی موسڵمان ڕادەكێشێ بۆ لای ئەوەی گرنگە لە دیاری مانا مرۆڤایەتیە بەرزەكەیەتی نەك مانای مادی و ڕواڵەتی دیاریەكە، ئافرەتی موسڵمانیش نابێ بێ ئاگا بێت لەم واتا مرۆڤایەتیە، ئەو دیاریەی پێشكەش بە دراوسێكەی دەكات یان

پێشکەشی دەکرێت بە بچوکی نەزانێت" چونکە لە دیدی ئیسلام ناوەرۆك لەپێشترە لە ڕواڵەت و مادیات.

## چاکە لەگەڵ دراوسێکانی دەکات ئەگەرچی موسڵمانیش نەبن

ئافرەتی موسڵمان تەنها بەوە ناوەستێ چاکە لەگەڵ دراوسێی خزم یا موسڵمانی بکات، بەڵکو چاکە لەگەڵ دراوسێی ناموسڵمانیش دەکات، ئەمەش بەپێی ڕێنماییە بەرزەکانی ئیسلامە لە لێبوردەیی و چاکەکردن لەگەڵ هەموو خەڵك بە جیاوازی ئاین و بۆچوونەکانیان، بەمەرجێك ئەگەر مایەی ئازار و دەست درێژی نەبن بۆ سەر موسڵمانان، خودا دەفەرموووێ: ﴿ لاَ يَنهَاكُمُ اللهُ عَنِ الَّذِينَ لَم يُقَاتِلُوكُم فِي الدِّينِ وَيُخرِجُوكُم مِن دِيَارِكُم أن تَبَرُّوهُم وَتُقسِطُواْ إلَيهِم إنَّ اللهَ يُحِبُّ المُقسِطِين. واتا: خودا قەدەغەتان ناکات لەوەی چاکەکار و دادپەروەر بن لەگەڵ ئەوانەی بێ باوەڕن، ئەوانەی لەسەر ئاین لە دژتان نەجەنگاون و لە ماڵ و وڵاتی خۆتان وەدەریان نەناون، بەڕاستی خودا دادپەروەرانی خۆش دەوێت﴾ الممتحنە: ٨.

لەم ڕوانگەیەوەبوو عبدالله بن عمر ئەگەر مەڕێکی سەربڕیبوایە لە خزمەتکارەکەی دەپرسی: ((ناردت بۆ دراوسێ جولەکەکەمان؟ ناردت بۆ دراوسێ جولەکەکەمان؟ چونکە من گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ((جبریل سەبارەت بە دراوسێ هێندە ڕایسپاردم تا وامزانی میراتی لێدەگرێ)) متفق علیە. شرح السنە ١٣/٧.

چەندە بەرفراوانە بەزەیی ئیسلام بە خەڵکی! چەندە نەرم و نیانە لە چاودێریکردنی ئەوانەی لەژێر سێبەری هێمن و ئاسایشی دەژین! مێژوو گەواهی دەدات کە خاوەن پەرتووکە ئاسمانییەکان زۆر بە ئاسایش و هێمنی و دڵنیا بوون لە خۆیان و ئابڕو و ماڵ و سامان و ئاینیان ژیاون لەتەك دراوسێ موسڵمانەکانیان لە زۆربەی خاکە ئیسلامیەکان، چێژیان وەرگرتووە لە چاك دراوسێتی کردنی موسڵمانان بۆیان و ڕیز لێگرتنیان و مامەڵەی جوان و ئازادی بیروبۆچوونیان، ئەوەتا کەنیسە دامەزراوەکانیان لە دێرزەمانەوە لە گوندی موسڵمانان لەسەر لوتکەی چیاکان هەر ماوە،

له دەوروپـشتیان بـه هـەزاران موسـڵمانی لێیـه، کـه دەورەیـان داون بـه چـاودێری و پاراسـتن و چاکەکردن و دادپەروەری و دراوسێتی کردن بەچاکە.

## له چاکەکردنیدا دراوسێ نزیکەکان پێش دەخات پاشان ئەوانیتر

ئافرەتی موسڵمان بێئاگا نییه لەو ڕێکخستنه وردەی ئیـسلام داینـاوه لـه چـاکەکردن لەگـەڵ دراوسێ، کاتێ ڕایسپاردووین به چاکەکردن لەگـەڵ دراوسـێ بـەپێی نزیکیـان لێمـان، ئەمـەش بـه لەبەرچاوگرتنی هێزی پەیوەندی لـه نێـوان دوو دراوسـێی بەیەکـەوه نووسـاو، کـه وەك بـاوه زۆر هەستیارن بەرامبەر یەکتر، تاوەکوو بەهۆیەوه خۆشەویستی و سۆز بەردەوام بێت له نێوانیاندا...، خاتوو عائشه وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، دوو دراوسـێم هەنـه، بـۆ کامـەیان دیـاری و شـت بنێرم؟ فەرمووی: ((بۆ ئەوەیان دەرگای له تۆ نزیکتره)) البخاری فی الادب المفرد ١٩٨/١.

ئەمه ئەوه ناگەیەنێ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ دراوسێ دوورەکان چاکه نەکات، بـەڵکو هەرچـی له چوارچێوەی ماڵیدا دەورەی دابـێ لـه دراوسـێی چـاك دەچـێته بازنـەی دراوسـێیەتی و مـافی دراوسێی لەسەر هەیه، ئەوەی پێشتر له فەرمووودەکـه باسـکرا تـەنها ڕێکخـستنێکی ئیـسلامیه تیایدا پێغەمبەر ﷺ هەستی دەروونی دراوسێی هەرەنزیکی لەبەرچاوگرتووه، ئەمیش بـەهۆی زۆر بەسەریەکداچوون و مامەڵەی پێکەوه و بوونی خۆشەویستی له نێوانیاندا.

## ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ باشترین دراوسێیه

شتیکی ئاساییه ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆی بێدار به ئاینەکەی باشترین دراوسـێ بێـت لـەناو کۆمـەڵگه" چونکه چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ ڕەوشـتێکی ڕەسـەنی ئیـسلامی قووڵـه لـه ویـژدانی ئافرەتی موسڵمان که پـەروەرده بـووه لەسـەر خورەوشـتی ئیـسلامی بـەرز، وەك پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمووێ: ((چاکترین هاوڕێ لەلای خوا باشترینیانه بۆ هاوڕێکەی، وه باشترین دراوسێ لـەلای خوا باشترینیانه بۆ دراوسێکەی)) الترمذي ٢٢٤/٣.

هەروا پێغەمبەر ﷺ دراوسێی بەیەکێ لە هۆکارەکانی بەختەوەری داناوە کە دەفەرموووێ: (( یەکێ لە هۆکارەکانی بەختەوەری موسڵمان لە دونیادا دراوسێی چاك و ماڵ و خانوویەکی فراوان، وە ئامرازی گواستنەوەی خۆش و باش)) الحاکم ٤/١٦٦.

پێشینەی چاك بەهای دراوسێی چاکیان دەزانی، بەیەکێ لەو بەخششانەیان هەژمار دەکرد کە بە پارە هەڵناسەنگێنرێ، یەکێ لەو دەستکەوتانەیە کە هیچ دەستکەوتێکی دونیا هاوشانی نابێت، مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە دراوسێی (سعد بن العاص) ١٠٠٠٠٠ درهەمی زیاتر درایە لەسەر نرخی خانووەکەی، پاشان بە کڕیاری وت: ئەمە نرخی خانووەکەمە، ئەی بەچەند دراوسێتی سەعیدم لێدەکڕی؟ کاتێ سعید ئەم قسەیەی پێگەیشتەوە نرخی خانووەکەی نارد بۆ دراوسێکەی و لە خانووەکەش هێشتیەوە.

ئەمە لاپەڕەی درەوشاوەی دراوسێی چاکە، دەبێ لاپەڕەی دراوسێی خراپ چۆن بێ؟

## دراوسێی خراپ و لاپەڕەی ڕەشی

دەقە ڕاستەکان جەخت دەکەنەوە لەسەر ڕەشی و تاریکی و پۆخڵی لاپەرەی دراوسێی خراپ، ئافرەتی موسڵمانیش کاتێ سەیری ئەم لاپەڕانە دەکات لە ترسی ئەو ئاکامە خراپانەیان دەروونی دەهەژێ و هەستی پڕ دەبێت لە ڕق و دوورکەوتنەوە لەم جۆرە خاسیەتانە.

## دراوسێی خراپ لە بەخششی ئیمان داماڵراوە

ئەمە بەسە بۆ بەدبەختی و چارەڕەشی دراوسێی خراپ کە داماڵرێ لە نیعمەتی ئیمان، گەورەترین و دیارترین نیعمەت لە ژیانی مرۆڤ. پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتیدا بەتەواوی جەختی لەسەر کردۆتەوە و هیچ نەرمیەك و پاشگەزبوونەوەی تیانییە،کە دەفەرموووێ: ((سوێند بەخوا باوەڕناهێنێ، سوێند بەخوا باوەڕناهێنێ، سوێند بەخوا باوەڕناهێنێ، وترا: کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((ئەو کەسەی لە خراپە و شەڕی دراوسێکەی دڵنیا (ئەمین) نەبێ)) متفق علیه.

لە گێڕانەوەی مسلم هاتووە: ((ناچێتە بەهەشت ئەوەی دراوسێکەی دڵنیا نەبێ لە شەڕ و خراپەی)) مسلم ٢/١٧.

چەندە تاوانێکی گەورەیە کاتێ مرۆڤ دەکەوێتە خراپەکاری لەگەڵ دراوسێی و بەهۆیەوە لە بەخششی ئیمان دادەماڵرێ و بێبەش دەبێ لە چوونە بەهەشت!!

کاتێ ئافرەتی موسڵمانی بێگەرد ئەم دەقانە دەخوێنێتەوە هەرگیز بە مێشکی دانایەت لەهەرچ بارودۆخێك بێت خراپە لەگەڵ دراوسێی بکات" چونکە خراپەکاری لەگەڵ دراوسێ و پیلانگێران بۆ یەکتری و دەنگ دابڕین و دووبەرەکی لەگەڵیان لە گوناهی بچووك نییە، بەڵکو لە گوناهە گەورەکانە و ئیمانت لە کیس دەبات و هەڕەشە لە چارەنووسی دوارۆژت دەکات، ئایا هیچ بەڵایەك هەیە گەورەتر بێ لە نەمانی ئیمان و لە دەستدانی دوارۆژ کە دڵی ئافرەتی موسڵمانی بۆ راچڵەکێ و دەروون و بوونی بۆ بهەژێ؟

## دراوسێی خراپ ئافرەتێکە کاروکردەوەی بە هەدەر چووە

جا ئەگەر وەك ڕابوورد دراوسێی خراپ باوەڕی لە دەستبدات، ئەوا بەڕاستی ئافرەتێکە کاروکردەوەکانیشی بەهەدەر ڕۆییووە، لەپاش ئەو بڕیارەوە هیچ کردەوەیەك سوودی بۆ نابێت و هیچ کارێکی چاکەی بەرزنابێتەوە تا بەردەوام و سووربێت لەسەر ئازاردانی دراوسێکەی" چونکە کردەوە چاکەکان لەسەر بنەمای باوەڕبوون بەخوا دادەمەزرێ، باوەڕبوونیش بەخوا تەنها وشەیەك نییە بە زمان بوترێ، بەڵکو پیادەکردنێکی وردە بۆ ئەو شتانەی خوا داوای دەکات لە بەندەکانی. جا ئەگەر ئافرەتێك بەهۆی خراپی لەگەڵ دراوسێکەی و بەردەوام ئازاردانی باوەڕ لە دەستبدات، با ئیتر بەنیازی ئەوە نەبێ خودا هیچ کردەوەیەکی چاکی لێوەرگرێ هەرچەندە گەورەش بێ، بەڵکو کردەوەکانی بەهەدەر دەچن و شوێنەوار و کاریگەریان نامێنێ، ئەگەرچی شەو و ڕۆژیبشی لەو کردەوانە خەرج کردبێ!!

بە پێغەمبەر ﷺ یان وت: ئەی پێغەمبەری خوا، فلانە ئافرەت شەونوێژ دەکات، بەڕۆژیش بەڕۆژوو دەبێت و ئاوا دەکات، وە خێر و صەدەقە دەکات، بەڵام بە زمانی

دراوسێکانی ئازاردەدات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هیچ خێرێکی پێوە نییە و لە کۆمەڵی دۆزەحە)) وتیان: فلانە ئافرەتیش نوێژە فەرزەکان دەکات، پارچە پەنیر دەکاتە خێر، بەلام ئازاری کەس نادات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو ئافرەتە لە کۆمەڵی بەهەشتە)) البخاري في الادب المفرد ١/٢١٠.

هەروا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((سێ کەس لەوانەی مایەپووچ و بێبەرهەمن: پێشەوایەك ئەگەر چاکەی لەگەڵ بکەی سوپاست نەکات، ئەگەر خراپەشی لەگەڵ کرا خۆش نەبێ و نەبووریێ، وە دراوسێی خراپ ئەگەر خێر و چاکەیەکت لێ ببینێ دەیشارێتەوە، وە ئەگەر شەڕ و خراپەیەکیش ببینێ بڵاوی دەکاتەوە، هەروا ئافرەتێکیش ئەگەر لەگەڵی بیت و لە بەرەو ڕووی بێت ئازارت دەدات، ئەگەریش لێی ونبووی و دیارنەبووی ناپاکیت لەگەڵ دەکات)) الطبراني ١٨/٢٦٨.

بەم شێوەیە دەقەکان یەك لەدوای یەك دێن و وێنەی ناشیرینی دراوسێی خراپ دەکێشن کە دەروونی ئافرەتی موسڵمانی بێگەرد لێی هەراسان دەبێت، وە زۆر ئاگادار و بێدارە لە کەوتنە ناو گوناهی خراپەکردن لەگەڵ دراوسێ و زۆر دوورە لەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە دراوسێی خراپ، یا ناکۆکی و دوژمنایەتی، یا ئێرەیی و پیلانگێران هەبێت لە نێوان ئەم و دراوسێکانی" چونکە هەردەم ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ی لە گوێیدا دەزرنگێتەوە کە دەفەرموووێ: ((یەکەم دوو نەیار کە لە ڕۆژی قیامەت بەرامبەری یەکتر دەگرن دوو دراوسێنە)) رواه احمد والطبراني (مجمع الزوائد ٨/١٧٠).

## کەمتەرخەمی ناکات لە چاکەکردن لەگەڵ دراوسێکانی

ئافرەتی موسڵمان تەنها بەوە ناوەستێ خراپە نەکات لەگەڵ دراوسێکانی، بەڵکو هەمیشە دەستپێشخەرە بۆ چاکەکاری لەگەڵیان تا لە توانای دابێت، لەکاتی پێویست کەمتەرخەمی ناکات لە چاودێریکردن و ڕێزگرتن و چاکەکردن لەگەڵیان، لەترسی ئەو هەڕەشەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموووێ: ((چەندین دراوسێ لە ڕۆژی دوایی بەستراوە بە دراوسێکەی و، دەڵێ: پەروەردگارا"

ئەمە دەرگای بەرووی مـن داخـست، چـاکە و خێـری لـەمن گرتـەوە)) البخـاری فی الادب المفـرد ١/٢٠٠.

موسڵمان لە تێڕوانینی ئیسلام بینایەکی بەرز و تۆکمەیە وخشتەکانی ڕۆڵەی ئەم ئۆممەتەن، هەر خشتەیەکیش پێویستە یەکگرتوو و تۆکمە بێت و زۆر بەتوندی بـە خـشتەی تەنیـشتی نووسـابێ، تاوەکوو بینایەکی توندوتۆڵ و بەهێز و خۆڕاگر دەستەبەربێت، ئەگەرنا دوچاری هەراسان و ڕووخـان و کەوتن دەبێتەوە.

پاشـان ئیـسلام ئـەو خـشتانەی دەورەداوە بـە شـورایەکی بـەهێز لـە توێـشووی گیـان، بـۆ پارێزگاریکردن لە یەکگرتوویی و چەسپاوی و بەرگریەکەی، تا بینای موسـڵمانان هەمیـشە بـەهێز بێت، هیچ هۆکارێك کاری تێنەکات، وەك دەفەرمووێ: ((باوەڕدار بۆ بـاوەڕدار وەك بینـا وایـە، هەندێکی ئەوەیتری ڕاکێشاوە و توندکردووە)) متفق علیە. شرح السنە ١٣/٤٧.

هەروا دەفەرمووێ: ((وێنەی باوەڕداران لە ئەویندارى و بەزەیی و سۆزیان بۆ یەکتری وەك یـەك جەستە وایە، کاتێ ئەندامێکی دێتەئێش، هەموو جەستە بۆی بەئاگا دەێت و شەونخونی بۆ دەکات و تای لێ دێت)) متفق علیە. شرح السنە ١٣/٤٦.

ئاینێك بەم شێوە سەیرە سووربێت لەسەر یەکگرتنی تاکەکانی زۆر پێویسترە کە پەیوەندی نێوان دراوسێکان توندوتۆڵ بکات و دایمەزرێنێ لەسەر بناغەیـەکی چەسـپاو لـە ئەویـنداری و چـاکە وگونجان و مامەڵەی باش.

## ئارام دەگرێ لەسەر ئازار و کەم و کورتیەکانی دراوسێ

شتێکی نامۆنییە ئافرەتی موسڵمانی روناکبیر بە ئاینەکەی ئارامبگرێ لەسەر ئازار و ئەزیەتی دراوسێکانی، بەرامبەر بە خراپەکانیان خراپە ناکاتەوە، کاتێ خاسیەتێکی ناپەسـندیان لێـدەبینێ هەڵناچێ و تورە نابێت، هەرگیز هەڵە و کەم و کورتیەکانیان بۆ ناژمێرێ و بە چاویان دانـاداتـەوە، بەڵکو فشار دەخاتە سەر دەروونی و لێیان دەبورێ، پاداشـتی ئـەم دان بەخۆداگرتنەشـی لـە خـوا

چاوەڕوانە، دڵنیایە لەوەی پاداشتی ئەم هەڵوێستەی لەلای خودا ون نابێت، بەڵکو لەلای خودا زیاتر خۆشەویستی دەکات و ڕەزامەندی دەست دەکەوێت، بەگوێری ئەم فەرمووودەیەی ابو ذر دەیگێڕێتەوە لەو کاتەی دەگات بە مطرف بن عبدالله کە پێی وت: ((ئەی ئەبا ذر باس و خواسی تۆم پێگەیشتووە زۆر تامەزرۆی دیمانەت بووم، وتی:لەپێناوی خوای گەورە! دەی ئەوا پێم گەیشتی.وتم: فەرمووودەیەکم بۆ بڵێ لە پێغەمبەر ﷺ ت بیستبێ، وتی: ((خودا سێ کەسی خۆش دەوێت و ڕقیشی لە سێیە)) وتی: واش تێناگەم درۆ بە زمانی پێغەمبەر ﷺ بکەم، وتم: ئەو سێیە کێن کە خودا خۆشی دەوێن؟ وتی: ((پیاوێك بە خۆڕاگریەوە تێکۆشان دەکات لەپێناوی خوا بەئومێدی پاداشتی خوایی و دەجەنگێ تا دەکوژرێ، ئێوەش لە قورئانەکەتان دەیخوێننەوە، پاشان ئایەتەکەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنيَانٌ مَرصُوص﴾ واتا: ﴿بەڕاستی خودا ئەوانەی خۆش دەوێت کە لەپێناویدا دەجەنگن یەك ڕێز بن وەك بینایەکی تۆکمە و توند﴾ وتم: پاشان کێ؟ وتی: ((پیاوێك دراوسێیەکی خراپی هەیە و ئازاری دەدا، ئەمیش ئارامدەگرێ تا خودا لە کۆڵی دەکاتەوە بە ژیان یا بە مردن...)) احمد والطبراني (مجمع الزوائد ١٧١/٨).

یەکێ لە خورەوشتەکانی ئافرەتی موسڵمان کە ئیسلام پەروەردەی کردووە و هەستی پێگەیاندووە ئەوەیە ئارامبگرێ لەسەر ئەزیەتی دراوسێی تا لە توانای دابێت و بەرامبەر ئەزیەتەکانیان چاکە بکات، بەمەش نمونەی هەرە بەرزدێنێتەوە لەسەر چاك ڕەفتارکردن لەگەڵ دراوسێ، هەروا ڕەگی خراپەکاری و ناکۆکی و ڕق و کینە لە دەروونیان دەردەکێشێ، لەسەرووی هەمووشیانەوە ملکەچی فەرمایشتی پێغەمبەرﷺ دەبێت کە دەفەرموووێ: ((هەرکەسێ باوەڕی بەخوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە ئەزیەتی دراوسێی نادات...)) فتح الباري ٤٤٥/١٠.

دەبا گوێبیستی ئەم فەرمووودەیە بن ئەو ئافرەتانەی بۆ شەڕی منداڵ هۆشیان لە دەست دەدەن و جنێو و قسەی ناشیرین ئاڕاستەی دراوسێکانیان دەکەن، و هەموو مافێکی دراوسێیەتی لەیاد دەکەن، پەیوەندیەکانی خۆشەویستی و ژیانی چەند ساڵە و نزیکایەتی دەپچڕێنن لە ساتێکی توڕەبووندا، با ئەو جۆرە ئافرەتانە بزانن کە دژی ڕێنماییەکانی ئیسلام هەڵس و کەوت دەکەن لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دراوسێ و ڕازی بوونە بێن بە دراوسێی خراپ.

با چاوی ئەوانەش گوشادبێ کە ڕیزدەگرن لە دراوسێ و خۆیان ئـارایش دەدەن بـە ئـارامگرتن و سەنگینی و ڕەفتاری جوان و وەڵامی خراپە بە خراپە نادەنەوە، بەڕاستی ئەوانە خودا ڕازی بووە لە ڕەفتاری دانا و تێگەیشتووانەیان.

## ٩ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ خوشکان و هاوڕێیانی

### لەپێناوی خوا خۆشیانی دەوێت و هاوڕێیەتیان دەکات

ئافرەتی موسڵمان لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی لەگـەڵ خوشـکان و هاوڕێیـانی جیـاوازە لـە ئافرەتانیتر. ئافرەتی موسڵمان ئەم پەیوەندیانە لەسەر بنەڕەتی برایەتی خوایی دادەمەزرێنێ. ئـەم برایەتیە خواییەش بەرزترین پەیوەنییە دەبەسترێ لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤ، چ پیاو بێـت چ ئـافرەت. بەڕاستی ئەمە پەیوەندی باوەڕە بەخوا کە خودا لـە نێـوان سـەرجەم بـاوەڕداران بەسـتویەتی، وەك دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤمِنُونَ إِخوَةٌ. واتا: بەڕاستی باوەڕداران برای یەکترن﴾ الحجرات: ١٠.

ئەم پەیوەندیە تۆکمەترینی پەیوەندیەکانی دڵە، تونـدترین گرێـی نێـوان دڵەکانـە، بـەرزترین پەیوەندی هۆش و گیانە.

بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە ببینین خوشکانی لەپێناو خـوا پەیوەنـدیان بـەردەوام و توندوتۆڵـە، دامەزراوە لەسەر بنەمای خۆشەویستی لەپێناو خوا، کە بـەرزترین و بێگـەردترین خۆشەویـستییە لە ژیانی مرۆڤ. ئەمە ئەو خۆشەویستییە داماڵراوەیە لـە هەرچـی بەرژەوەنـدی هەیـە، پاکـە لـە هەرچی مەبەست و نیازە، بێگەردە لە هەرچی گەرد و پەڵە هەیە" چونکە سەرچـاوەی بێگـەردی و روونی و پاکیەکەی لە چرای سروش و ڕێنمایی پێغەمبـەر ﷺ وەردەگـرێ، ئـەو خۆشەویـستیەی تیایدا موسڵمانان شیرینی باوەڕ دەچێژن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((سـێ ئاکـار ئەگـەر لەهـەر مرۆڤێ هەبن شیرینی باوەڕ دەچێژێ: بەڕاستی خوا و پێغەمبـەری لەهـەموو کەسێك خۆشـتربوێ، هەر کەسێکی خۆش بوێت تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت، وە ڕقـی ببێتـەوە بگەڕێتـەوە سـەر بـێ باوەڕی پاش ئەوەی خودا ڕزگاریکرد لێی وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتـە نـاو ئـاگر)) متفـق علیە.

## پلەوپایەی ئەوانەی لەپێناوی خوا یەکتریان خۆش دەوێت

دەقی ڕاستی دەوڵەمەندی زۆرمان هەیە سەبارەت بە بەرزراگرتنی ئەوانەی لەپێناوی خوا یەکتریان خۆش دەوێت، پیاو بن یا ئافرەت، هەمووی وێنای پلەوپایەی بەرز و ڕێزداریان دەکات کە خودا لە ڕۆژی قیامەت پێیان دەبەخشێ.

ئەوانە ئەوەندەیان بەسە خودا لە ڕۆژی قیامەت بانگیان دەکات: ((کوان ئەوانەی لەپێناوی من یەکتریان خۆشویستووە! ئەمڕۆ لەژێر سایەی خۆم سێبەریان بۆ دەکەم لەو ڕۆژەی بێجگە لە سێبەری من سێبەریتر نییە)) مسلم ١٦/١٢٣.

گەیشتن بە پلەوپایەی خۆشەویستی پاك و پوختی مرۆڤ بەرامبەر بە برای مرۆڤی تەنها لە بۆ مەبەستی ڕەزامەندی خوا سەخت و دژوارە، تەنها ئەوانە پێی دەگەن کە دڵ و گیانیان بێگەردە، دونیا و ئەوەی لە دونیادایە لەبەرچاویان کەم بایەخە" بۆیە بەرزتربوون لە شتە سەرنج ڕاکێشەرەکانی ژیانی مادیەت و ئارەزووات و خۆشیەکانی، وە خۆشی تاتایی لای خوایان هەڵبژارد، بێگومان ڕەزامەندی خواش لە هەمووی گەورەترە، بۆیە سەیرنییە پێغەمبەر ﷺ لەو فەرموودەیەی معاذ بن جبل ﵁ لێی دەگێڕێتەوە، بفەرمووێ: (( خودای بەرز و خاوەن شکۆ دەفەرمووێ: ئەوانەی لەپێناو گەورەیی من یەکتریان خۆشویستووە لە ڕۆژی قیامەت مینەبەری نورانیان بۆ هەیە، پێغەمبەران و شەهیدان ئێرەییان پێ دەبەن)) الترمذي ٤/٢٤.

هەروا ابو هريرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((پیاوی سەردانی برایەکی کرد لە ئاواییەکیتر، خوداش لەسەرە ڕێگای فریشتەیەکی بۆ نارد، کاتێ پێی گەیشت وتی: بۆ کوێ دەچی؟ وتی: دەچمە لای برایەکم لەم ئاواییە، وتی: دەچی پاداشتی چاکەیەکی بدەیتەوە؟ وتی: نەخێر، تەنها لەپێناوی خوا خۆشم ویستووە، وتی: دەی من لەلایەن خواوە نێردراوم بۆ تۆ تا پێت بڵێم: بەڕاستی خودا تۆی خۆشویستووە وەك چۆن تۆ لەپێناوی خوا ئەوت خۆشویستووە)) مسلم ١٦/١٢٤.

پێغەمبەر ﷺ دەیزانی خۆشویستنی پاك و بێگەرد چەندە کاریگەرە لەسەر بەهێزکردنی کۆمەڵگە مرۆییەکان و بەرزکردنەوەی و بەختەوەرکرنیان" بۆیە ئەنەس ﷺ دەڵێ: پیاوێك لەلای پێغەمبەر ﷺ بوو، پیاوێکیش بە لایاندا تێپەڕی، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەو پیاوەم خۆش دەوێت، پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: ((ئایا پێت ڕاگەیاندووە؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((دەی پێی بڵێ))، ئنجا پیاوەکە شوێنی کەوت و وتی: من لەپێناوی خوا تۆم خۆش دەوێت، ئەمیش وتی: ئەو کەسە تۆی خۆش بوێت کە لەپێناویدا منت خۆشویستووە)) ابو داود ٤٥٢/٤.

پێغەمبەر ﷺ خۆشی ئەم کارەی دەکرد و موسڵمانانی فێردەکرد چۆن کۆمەڵگەی خۆشەویستی و برایەتی و بێگەردی بنیات بنێن، ڕۆژێکیان دەستی معاذی گرت و فەرمووی: ئەی معاذ، سوێند بەخوا تۆم خۆش دەوێت، پاشان ئەی معاذ ڕاتدەسپێرم: هەرگیز لەیاد مەککە پاش هەموو نوێژێك بڵێی: (اللهمَّ أعِنِّي عَلَى ذِكرِكَ وَشُكرِكَ وَحُسنِ عِبَادَتِكَ) واتا: (خودایە کۆمەکیم بکە و یارمەتیم بدە لەسەر یادکردنی تۆ و سوپاسکردنت و بە چاکی پەرستنت)) احمد ٢٤٥/٥.

پێشەوا مالك لە الموطأ بە اسنادێکی ڕاست لە ئەبی ئیدریس الخولانی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ((چوومە مزگەوتی دمشق، پیاوێکم بینی دەم بە زەردەخەنە، خەڵکی لە دەوروبەری کۆببونەوە، ئەگەر لە شتێك ناکۆکیان بوابە دەگەڕانەوە لای و ڕایان وەردەگرت. منیش پرسیم ئەوە کێیە؟ پێیان وتم: ئەمە معاذ بن جبل ﷺ ە، بۆ بەیانی زوو هەڵسام و چوومە مزگەوت، بینیم لە پێش من هەڵساوە و وا نوێژ دەکات، چاوەڕوانی بووم تا لە نوێژەکەی بوویەوە، پاشان بەرەو ڕووی هاتم و سڵاوم لێکرد، پاشان وتم: سوێند بەخوا خۆشم دەوێی، وتی: لەپێناوی خوا؟ وتم: لەپێناوی خوا، وتی: لەپێناوی خوا؟ وتم: لەپێناوی خوا، ئنجا بە ملی عەباکەم ڕایکێشام بۆ خۆی و وتی: مژدەت لێ بێ، لە پێغەمبەر ﷺ م بیست دەیفەرمووو: ((خوای گەورە فەرموویەتی: خۆشەویستی من واجب بووە بۆ ئەوانەی لەپێناوی من یەکتریان خۆش دەوێت، ئەوانەی لەپێناوی من کۆدەبنەوە و دادەنیشن، ئەوانەی لەپێناوی من سەردانی یەکتر دەکەن، ئەوانەی لەپێناوی من دەبەخشن)) رواه مالك في الموطأ ٩٥٣/٢.

## کاریگەری خۆشویستن لە پێناوی خوا لە ژیانی موسڵمانان

ئیسلام هاتووە تا کۆمەڵگەیەکی نمونەیی دامەزراو لەسەر خۆشەویستی و برایەتی و دڵسۆزی بنیات بنێ، جا زۆر پێویست بوو خۆشەویستی لە دڵی تاکەکانی بڕوێنێ کە کۆمەڵگەیان لێ پێك دێت" بۆیە ئەم خۆشەویستییەی نێوانیانی کردە مەرجێك لە مەرجەکانی باوەڕ و چوونە بەهەشت، مسلم لە ابو هريره ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ناچنە بەهەشت تا باوەڕنەهێنن، وە باوەڕناهێنن تا یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر بیکەن لەلای یەکتر خۆشەویست دەبن؟ سەلام و ئاشتی لە نێوانتان بڵاوبکەنەوە)) مسلم ٢/٣٥.

ئەمەیە تێڕوانینی دروستی ڕێنمایی پێغەمبەرایەتی، دەرکی ئەوە دەکات کە ڕق و کینە لە دڵەکان لاناچێت و پیسی و گەندەڵی ململانێ و ئێرەیی لە دڵەکان ناشورێتەوە مەگەر بە برایەتیەکی ڕاستگۆیانە و بەرز نەبێت، کە لە ژیانی موسڵمانان بڵاوببێتەوەو پڕی بکات لە خۆشەویستی و دڵسۆزی و بەیەکەوە ژیان و بێگەردی و سینە پاکی، خاوێنی بکاتەوە لە ڕق و یەکتر نەویستن و ناپاکی و کینە، تاکە ڕێگەش بۆ گەیشتن بە هەموو ئەمانە بڵاوکردنەوەی ئاشتی و سڵاوکردنە لە یەکتر، تا ببێتە کلیلی دڵان بۆ هەڵکردن لەگەڵ یەکتر و چاکەکاری خۆشەویستی و بێگەردی. لەم ڕوانگەیەوە بوو پێغەمبەر ﷺ ئەم واتایەی بە گوێکاندا دووپات دەکردەوە، بەمەش تۆوی خۆشەویستی لە دڵان دەچاند بە شێوەیەك ببنە چاودێری یەکتر، تا ئەو خۆشەویستییە گەورە و پاك و ڕووناکە بەرهەم بێت کە ئیسلام هەمیشە دەیهەوێت بۆ موسڵمانان.

بەم خۆشەویستییە بێگەرد و پێگەیشتووە پێغەمبەر ﷺ دەروونی نەوەی پێشینەی موسڵمانانی بنیات نا، بەڕاستی بوون بە بنەمایەکی پتەو و تۆکمە کە کۆشکی بەرزی ئیسلامی لەسەر دامەزرا، بوون بە ئەستێرەی درەوشاوە لە ئاسمانی تاریکی مرۆڤایەتی و ڕێگای بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك ڕۆشنکردەوە.

هـەر بـەم خۆشەویـستی‌یە بێگـەرد و ڕاسـتگۆیە پێغەمبـەر ﷺ تـوانی کۆمەڵگـەی نمونـەیی مرۆڤایەتی دامەزراو لەسەر برایەتی ئیمان، بێ وێنە لـە تونـدوتۆڵی تۆکمـەیی و بەرگـەگرتنی بـۆ تێکۆشان و فیداکاری لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئیسلام، هەروا ناوازەبوو لە یەکگرتوویی و پاڵپشتی و هاریکاری، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((بـاوەڕدار بـۆ بـاوەڕدار وەك بینـا وایـە، هەنـدێکی هەندێکی‌تری رادەکێشێ و توند دەکات)) متفق علیە.

هەروا دەفەرمووێ: ((نمونەی باوەڕداران لە خۆشەویستی و میهر و سۆزیان بۆ یەکتر نمونەی یـەك جەستەیە، کاتێ ئەندامێکی نەساغ دەبێت، ئەوا هەموو جەستە بۆی دێتە شەوخونی و تا گـرتن)) متفق علیە. شرح السنە ٣١/٤٦.

ئافرەتی موسڵمانیش لە سەرەتای ئیسلام و بەدرێژایی مێژوش بەشداریکردووە لە دروسـتکردنی ئەم کۆشکە پیرۆزەی ئیسلام بەهۆی بڵاوکردنەوەی بانگەوازی خۆشەویستی لەپێناوی خوا، بەمـەش بە دڵ و هەستی ڕوودەکاتە خوشکان و هاوڕێکانی و پەیوەندی دۆستایەتی بۆ خوا پتەو دەکات.

## لە خوشکانی دەنگ دانابڕێ و پشتیان تێ ناکات

ئەمە لای ئافرەتی موسـڵمانی ڕۆشـنبیر شـاراوە نییـە کـە ئـەو ئیـسلامەی هـانی برایـەتی و خۆشەویستی و سۆزی داوە، هەر ئەویشە دەنـگ دابـڕان و پـشت لەیـەك کـردن و دەسـت لەیـەك هەڵگرتنی یاساغکردووە ئەگەر بەڕاستی لە پێناوی خوا یـەکتریان خۆشویـستووە، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەو دوو کەسـە بەڕاسـتی لـەپێناوی خـوا یـا لـەپێناوی ئیـسلام یـەکتریان خـۆش نەویستووە ئەگەر بەهۆی یەکەم گوناه کە لە یەکێکیان ڕوودەدا لەیەکتر جیاببنەوە)) البخـاری فی الادب المفرد ١/٤٩٣.

هەندێ جار لەکاتێ سروشتی لاوازی مرۆڤ و کاتەکانی توڕەیی ڕەنگە خوشـکێك خراپـە بکـات بەرامبەر بە خوشکەکەی، ئەم توڕەیی و هەڵچوونە لەوانەیە ببێتە هۆی دابڕانیان لەیـەکتر، لێـرەدا ئافرەتی موسڵمان لە یادی ناچێت ڕێنمایی ئیسلام بێ ئاگا نییە لە سروشـتی دەروونـی مرۆڤـەکان کە بێگومان دوچاری هەڵچوون و توڕەبوون و وروژانی سۆز و ئارەزوو و گۆڕانکاریەکانی دەبێتـەوە“

بۆیه سێ ڕۆژی داناوه بۆ دەروونی مرۆڤەکان تا بتوانێ شۆڕشی هەڵچوون کپ بکاتەوه و هاواری توڕەیی کزکاتەوه، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((حەڵاڵ نییه بۆ موسڵمان دەنگ دابڕێ و پشتکا لە برای خۆی زیاتر لە سێ ڕۆژ، کاتێ بەیەك دەگەن ئەم ڕووی وەرگێڕێ و ئەو ڕووی وەرگێڕێ، وه باشترەکەیان ئەوەیه کە یەکەمجار سڵاو دەکات)) متفق علیه.

لەم ڕوانگەیەوه ئافرەتی موسڵمانی بێدار بەردەوام نابێت لە دەنگ دابڕان هۆکارەکان هەرچی بن، بەڵکو پەلە دەکات لە تەوقەکردن و سڵاوکردن لێی، وه دەشزانی باشترینیان ئەوەیه یەکەمجار سڵاودەکات، جا ئەگەر دەسته خوشکەکەی وەڵامی سڵاوەکەی دایەوه، ئەوا هەردووکیان لە پاداشتی ئاشت بوونەوەکە بەشداردەبن، وه ئەگەر وەڵامی نەدایەوه، ئەوا ابو هریرە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرمووو: ((حەڵاڵ نییه پیاوێك دەنگ دابڕێ لە باوەڕدارێك زیاتر لە سێ ڕۆژ، پاش ئەو سێ ڕۆژە با بەرەوڕووی بچێت و سڵاوی لێ بکات، ئەگەر سڵاوەکەی وەڵام دایەوه، ئەوا هاوبەش دەبن لە پاداشتەکە، وه ئەگەر وەڵامی نەدایەوه، ئەوا ئەوەی سڵاوی کردووه بێ گوناه دەبێت لە تاوانی ئەو دەنگ دابڕانە)) البخاری فی الادب المفرد ٥٠٥/١.

وشەی پیاو لەم فەرموودەیەدا (ئافرەت و پیاو) دەگرێتەوه، وه هەرچەندە ماوەی دەنگ دابڕان زیاتربێت هێندەیتر گوناهی زیاتردەبێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ ساڵێك دەنگ دابڕێ لە براکەی وەك ئەوە وایە خوێنی ڕشتبێ)) البخاری فی الادب المفرد ٤٩٧/١.

چەندە ناشیرینە تاوانی دەنگ دابڕین و پشت لەیەککردن لە یاسای ئیسلام! چەندە ئۆباڵێکی قورسه لە ئەستۆی ئەنجامدەرانی! تا وای لێدێت دەێتە بارتەقای ڕشتنی خوێنێکی حەڵاڵ! ئەویش لەبەرئەوەیه بەرنامەی ئیسلام لە بارەی پەروەردەکردنی دەروونەکان دامەزراوه لەسەر خۆشەویستی و برایەتی و نزیکبوونەوه و ئاشنایەتی" بۆیه ئیسلام دەیەوێت ئێرەیی و پشت لەیەکردن و ڕق و کینه لە ژیانی موسڵمانان وەدەرنێت، نایەوێت یەکێ لەو ڕەوشتە نزمانە بێگەردی ژیانیان لێڵ بکات" بۆیه پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((لە یەکتر دامەبڕێن، پشت لە یەکتر مەککەن، ڕقتان لە یەکتر نەبێتەوه، ئێرەیی بە یەکتر مەبەن، وه ببن بە برای یەکتر وەك چۆن خودا فەرمانی پێکردوون)) مسلم ١٢٠/١٦.

هەروا دەفەرمووێ: ((دووركەونەوە لە بەدگومانی" چونكە بەدگومانی درۆترینی گوفتارە، بەدوای كەم و كورتی یەكتردا مەگەڕێن، سیخوڕی بەسەر یەكتر مەككەن، ململانێ و دژایەتی مەككەن، ئێرەیی بە یەكتر مەبەن، ڕقتان لە یەكتر نەبێتەوە، پشت لە یەك مەككەن، وە ببن بە بەندەی خوا و برای یەكتر)) متفق علیه.

وە دەفەرمووێ: ((ئێرەیی بە یەكتر مەبەن، لەسەر كەل و پەل نرخی زیاد دامەنێن تا خەڵكی فریو بدەن، وە ڕقتان لە یەكتر نەبێتەوە، پشت لەیەك مەككەن، لەسەر كڕین و فرۆشتنی یەكتر كڕین و فرۆشتن مەككەن، وە ببن بە بەندەی خوا و برای یەكتر، موسڵمان برای موسڵمانە ستەمی لێ ناكات، نایداتە دەست و ریسوا و بێ ئومێدی ناكات، بەكەم سەیری ناكات، تەقوا و لە خوا ترسان لێرەیە ـ سێ جار ئاماژەی بۆ سنگی دەكات ـ ئەوەندە بەسە بۆ خراپەكاری مرۆڤ كە ڕقی لە برای موسڵمانی بێتەوە و بەكەم سەیری بكات، هەموو شتێكی موسڵمان لەسەر موسڵمان یاساغە، خوێنی و ماڵی و ئابڕوی)) مسلم ١٢٠/١٦.

كاتێ ئافرەتی موسڵمان ئەم دەقانە دەخوێنێتەوە كە هەرچی ڕەوشتی جوانە لە خۆشەویستی و نیازپاكی و دۆستایەتی و برایەتی و دڵسۆزی و بەزەیی و فیداكاری لەخۆگرتووە، سینگی بەرگەی ڕق و كینە ناگرێت و ناتوانێ بەردەوام بێ لەسەر دەنگ دابڕان، مەگەر ئافرەتێك بێت دڵی نەخۆش بێت، و هۆشی وشك و ڕەوشتی لاربێت. جا هەڕەشەیەكی زۆر توند هەیە بۆ ئەو جۆرە ئافرەتە دڵ ڕەق و مێشك بەردانە چ پیاو بێ چ ئافرەت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((دەرگاكانی بەهەشت لە ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە دەكرێنەوە، لەم ڕۆژانەدا خودا لە هەموو بەندەیەك خۆش دەبێت ئەگەر هیچ هاوبەشێكی بۆ خوا بڕیار نەدابێ، تەنها كەسێك نەبێ كە لە نێوان خۆی و براكەی ناكۆكی هەیە، جا دەفەرمووێ: مۆڵەت بدەن بەم دووانە تا ئاشت دەبنەوە، مۆڵەت بدەن بەم دووانە تا ئاشت دەبنەوە، مۆڵەت بدەن بەم دووانە تا ئاشت دەبنەوە)) مسلم ١٢٢/١٦.

ابو الدرداء ﷺ دەیوت: ((ئایا باسی كردەیەكتان بۆ بكەم كە چاكترە لە بەخشین و خێركردن؟ ئاشتكردنەوەی دوو كەس، لەكاتێكا ناكۆكی و دووبەرەكی و ڕق لێ بوونەوە هەموو پاداشت و چاكەیەك ڕەش دەكاتەوە)) البخاری فی الادب المفرد ٥٠٥/١.

لەم ڕوانگەیەوە ئافرەتی موسڵمان پێویستە ڕووبکاتە خوشکانی و نێوانیان چاك بکاتەوە" چونکە باشترە لە صەدەقە و لە ڕۆژوو، وە بەردەوامبوونیش لەسەر دەنگ دابڕان و ڕق و کینە هەموو پەرستشەکان و خێرەکانی لەناو دەبات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئایا هەواڵی کردەیەکتان پێ بڵێم باشترە لە پلەی ڕۆژ و نوێژ و خێر؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((چاککردنەوەی نێوانی خەڵکی" چونکە تێکچوونی نێوانی خەڵك وەك مووس دەتاشێ)) ابو عیسی دەڵێ: فەرموودەیەکی ڕاست و دروستە. لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە، فەرموویەتی: ((وەك مووس دەتاشێ، ناڵێم موو دەتاشێ، بەڵکو ئاین دەتاشێ)).

## چاوپۆش و لێبوردەیە بەرامبەریان

ئافرەتی موسڵمان چاوپۆش و لێبوردەیە بەرامبەر خوشکان و هاوڕێیانی، هیچ ڕق و کینە و گومانێك لە دڵیدا نییە بەرامبەریان، توڕەیی دەخواتەوە و لێیان خۆش دەبێت، بێ ئەوەی پەشیمان بێتەوە لەو خۆشبوونە، یا هەست بە کەمی بکات، بەڵکو دڵنیایە لەوەی بەم ڕەفتارەی خودا لێی خۆش دەبێت، وەك دەفەرمووێ: ﴿وَالكَاظِمِينَ الغَيظَ وَالعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللهُ يُحِبُّ المُحسِنِينَ. واتا: ئەوانەی ڕقی خۆیان دەخۆنەوە و لە خەڵکی دەبورن، وە خودا چاکەکارانی خۆش دەوێت﴾ ال عمران: ١٣٤.

چونکە ئەگەر توڕەیی لە دەروونی مرۆڤ شۆرشی کرد و لێخۆشبونی بەدوادا نەهات، سەردەکێشێ بۆ ناکۆکی و ڕق و کینە، ئەمەشیان بۆ سەر مرۆڤ لە توڕەیی سەختترە، بەلاّم ئەگەر لێخۆشبونی لەدواهات، پشکۆی توڕەییەکەی دەکوژێتەوە، دەروونیشی لە ڕق دەشواتەوە، ئەوەش پلەوپایەی چاکەکارانە.

هەروا توڕەیی ئاگرە بۆ بێشەی دەروون و دڵی مرۆڤ داخ دەکات، لەکاتێکا لێبوردەیی و ڕق خواردنەوە دڵی مرۆڤ ڕووناك دەکاتەوە، هەست بە فێنکایەتی

دڵنیایی دەکات، سرەوتن و ئاشتی ویژدانی پڕدەکات.

هیچ کاتێك لێبوردەیی و خۆشبوون نابێتە هۆی کەمایەتی و نزمی، بەڵکو بە هۆیەوە لەلای خوا بەرزدەبێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((مرۆڤ بەهۆی لێبوردەییەوە هەمیشە لەلای خوا شکۆدارتر و ڕێزدارتر دەبێت، وە هەرکەسێ بۆ خوا خۆی بەکەم بزانێ مسۆگەر خودا بەرزی دەکاتەوە)) مسلم ١٦/١٤١.

بەهۆی ئەم ئاکارانە ئافرەتی موسڵمان لای خوا خۆشەویست و ڕێزدار دەبێت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ خۆی لە سێ ئاکار بپارێزێ، خودا لە گوناهیتری خۆش دەبێت بۆ هەرکەسێك ئارەزووی بێت: ئەو کەسەی بمرێ و هیچ هاوەڵێك بۆ خوا بڕیارنەدات، وە نەبێتە جادوگەر و شوێنی جادوگەریەتی نەکەوێت و، ڕقی لە برای خۆی نەبوویەوە و بەرامبەری کینەی لە دڵ نەبوو)) البخاری فی الادب المفرد ١/٥٠٥.

## بەڕوویەکی خۆش بەرەورووی خوشکانی دەچێت

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ ڕووخۆشە، ڕوخسار گەشە، دەم بەزەردەخەنەیە، هەر بەم شێوەیەش بەرەورووی خوشکانی دەبێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هیچ چاکەیەك بەکەم مەزانن تەنانەت ئەگەر بە ڕوویەکی خۆش پێشوازی لە براکەت بکەی)) مسلم ١٦/١٧٧.

ڕووخۆشی خەسڵەتێکی جوانە، ئیسلام هانی بۆ داوین و مرۆڤ بەهۆیەوە دەتوانێ خۆشەویستی خەڵك بەدەست بێنێ، یەکێکە لەو کردەوە چاکانەی خاوەنەکەی پاداشتی لەسەر وەردەگرێ" چونکە زۆربەی کات ڕووگەشی بەڵگەیە لەسەر بێگەردی ناخ، ئیسلامیش بایەخی داوە بە خۆرازاندنەوەی موسڵمانان بەم بێگەردیەی ناخ و ڕواڵەت و کردنی بە ئاکارێکی هەمیشەیی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((زەردەخەنەت بە ڕووی براکەت صەدەقەیە)) الترمذي ٣/٢٢٨.

جریر بن عبدالله البجلی ﷺ دەڵێ: ((لەو کاتەی موسڵمان بووم هەرکاتێ پێغەمبەر ﷺ بەرەورووم بهاتایە بمبینیایە ئیلا بەڕووم دەگرژیەوە)) فتح الباری ١٠/٥٠٤.

ئیسلام ویستی پەیوەندییەکانی خۆشەویستی و دۆستایەتی بەپتەوی و یەکگرتوویی بمێنێتەوە" بۆیە سڵاوکردن و ڕووگەشی و گوفتارشیرینی و بەجوانی پێشوازیکردن لە یەکتری لەلا

خۆشەویستکردن، تاوەکوو دەروونەکان بە کراوەیی و بێگەردی ڕووبکەنە هاریکاری و چاکەکاری و کردەوەی باش، هەتا بەتوانا بێت لەسەر ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی ئیسلام و هەوڵ و تەقەلا و فیداکاریەکان.

## دڵسۆز و ئامۆژگارە بۆیان

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئاین دڵسۆزییە)) وتمان: بۆکێ؟ فەرمووی: ((بۆ خوا و بۆ قورئانەکەی و بۆ پێغەمبەرەکەی و بۆ گەورەی موسڵمانان و خەڵکی بەگشتی)) مسلم ٣٧/٢.

ئەم ڕەفتارە وا دەکات ئافرەتی موسڵمان دڵسۆزبێت بۆ خۆشکەکانی، فێڵیان لێ نەکات، فریویان نەدات، هیچ خێرێکیان لێ نەگرێتەوە، ئەم کارەش بۆ ڕووپامایی ناکات، بەڵکو باوەڕی وایە کە دڵسۆزی و ئامۆژگاری لە بنەما سەرەکیەکانی ئیسلامە کە موسڵمانە پێشینەکان بەیعەتیان لەسەر دەداو وەك جریر بن عبدالله ؓ دەڵێ: ((پەیمانم دا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر کردنی نوێژ، و دانی زەکات، و دڵسۆزی و ئامۆژگاری بۆ هەموو موسڵمانێك)) متفق علیه.

سەرنج دەن پێغەمبەر ﷺ ئاینی لە یەك وشەدا پێناسەکردووەو ئەویش دڵسۆزی و ئامۆژگارییە، ئەمەش جەختکردنێکە لەسەر ئەوەی ئەم ئاکارە کۆڵەگەی ئاینە، بناغە ڕەسەن و چەسپاوەکەیەتی، یەکێکە لە مەرجەکانی ڕاستی بڕوا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هیچ کامێکتان باوەڕی ڕاستەقینەتان نابێ تائەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت)) متفق علیه.

کەسانێکیش بەو پلەوپایەیە دەگەن کە ئیسلام هەستی پاڵفتەکردبێ، خۆویستی لە سنگی دەرکێشا بێ، دڵ و ناخی لە ئیرەیی و ڕق و کینە پاك کرابێتەوە و لە شوێنیدا خۆشەویستی خەڵکی تیا ڕوابێ.

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆش لەبەرئەوەی ئەو هەستانەی لە ناخی دەروونی جێگیربووە و دەزانێ ئەو ئاکارانە یەکێکن لە مەرجەکانی دروستی باوەڕ و تەواویەتیەکەی، دەزانێ ئاینەکەی

دامەزراوە لەسەر دڵسۆزی و ئامۆژگاری، بۆیە شیاوی گەیشتنە بەم پلەوپایە سەختە، بەڵکو کەم کەمە وای لێدێت ئەم ڕەفتارە بەرزانە ببنە شتێکی ئاسایی لە ژیانی و ڕەفتاری لەگەڵ خوشکان و هاوڕێکانی، دواتر دەبێتە ئاوێنەیەکی ڕاستگۆ بۆیان و ئامۆژگاری و ڕێنماییان دەکات، هەمیشە هیوای خێر و چاکەیان بۆ دەخوازێ. أبو هريرە ﷺ دەڵێ: ((باوەڕدار ئاوێنەی براکەیەتی، ئەگەر عەیبێکی لێببینی بۆی چاك دەکاتەوە)) البخاري فی الادب المفرد ١/٣٣٣.

ئەم وتەیەی ابو هريرە پزیسکێکە لە ڕووناکی و ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرمووێ: ((باوەڕدار ئاوێنەی باوەڕدارە، وە باوەڕدار برای باوەڕدارە، چاودێری ماڵ و خاوخێزانی دەکات و، لەپاش ملەش پارێزگاری لێ دەکات)) البخاري فی الادب المفرد ١/٣٣٣.

یەکێ لە سروشتە ئاکارەکانی ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ لەگەڵ خوشك و هاوڕێکانی ئەوەیە کە خاوەنی ئەو جۆرە هەڵوێستە بەرزەیە، وە ناتوانێ لەو ئاستە بەرزە دابەزێ" چونکە ئەوەی لەو کەشە پاك و بێگەرد و پڕ لە خۆشەویستی و دڵسۆزی و برایەتییە بژیێت ناتوانێ دابەزێتە پلەی ڕق و کینە و ناپاکی و خۆویستی و ئیرەیی...

## چاکەکار و دڵسۆزە بۆیان

ئیسلام تەنها بە هاندانی کچان و کوڕانی بۆ چاکەکردن لەگەڵ هاوڕێیان نەوەستاوە، بەڵکو هانیداون لەسەر چاکەکردن لەگەڵ هاوڕێیانی دایك و باوك، وەك جەختکردنێك لەسەر گەورەیی دڵسۆزی و چاکەکردن لە دەروونی مرۆڤایەتی، وە بۆ ڕەگ داکوتانی لە ژیانی ئیسلامیانەیان.

لە صحيحی مسلم، ابن عمر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((باشترین وەفاداری و چاکەکردن ئەوەیە پیاو پەیوەندی نزیکایەتی لەگەڵ دۆستان و هاوڕێیانی بگەیەنێ و چاکەیان لەگەڵ بکات)) مسلم ١٦/١١٠.

پێغەمبەر ﷺ زۆر بەتەنگ چاندنی تۆوی ئەمەکداری و دڵسۆزی بووە لە دەروونی موسڵمانان، ئەوەتا پیاوێك لە بەرەی سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا لەپاش مردنی دایك و باوکم چی

ماوه لە چاکەکاری بەرامبەریان بکەم؟ فەرمووی: ((نزایان بـۆ بکـەی، داوای لێخۆشـبوونیان بـۆ بکەی، بەڵێنەکانیان پاش مردنیان بەجێبگەیەنی، وە پەیوەندی خزمایەتیان بگەیـەنی کـە ئەگـەر بەهۆی ئەوانەوە نەبێت ئەم پەیوەندییە ناگـات، هـەروا ڕێزگـرتن لـە هاوڕێکانیـان)) ابـن حبـان ١٦٢/٢.

پێغەمبەر ﷺ چرایەکی ڕۆشنی لە ڕێنماییەکانی بۆ ئافرەتانی موسڵمان جێهێشتووە تـا ڕێگـای چاکەکاری و دڵسۆزی و ئەمەکداریان بۆ ڕووناك بکاتەوە، خاتوو عائـشە دەڵـێ: غـیرەم بەرامبـەر هیچ یەکێك لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ نەبووە هێندەی غیرەم بەرامبـەر بـە خـاتوو خەدیجـە، لەگەڵ ئەوەی هەرگیزیش نەمبینیبوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ زۆر باسی دەکـرد و نـاوی دەهێنـا، وە کاتێ مەڕێکی سەردەبڕی و پاشان پارچە پارچەی دەکرد، پاشان دەینـارد بـۆ هاوڕێیـانی خەدیجـە، منیش پێم وت: وەك بلێـی لـە دونیـا بێجگـە لـە خەدیجـە هـیچ ئـافرەتێکیتر نـەبووە! ئـەویش دەفەرمووو: ((ئەو وابوو...وابوو، هەر لـەویش کـوڕێکم هـەبوو)) فـتح البـاری ١٣٣/٧ ومـسلم ٢٨/١٥. لە گێڕانەوەیەکیتر: ((مەڕی سەردەبڕی و، بەدیاری هێندەی دەنارد بۆ هاوڕێیانی خەدیجە کە بەشی هەموویانی دەکرد)) فتح الباری ١٣٣/٧.

لەم ڕێنماییانەی پێغەمبەر ﷺ چاکەکاری و ئەمەکداری ڕەگ دادەکوتێ و فـراوان دەبێتـەوە تـا هاوڕێیە دوورەکانی باوان و هاوسەرانی مردووش دەگرێتەوە، جا چ جای هاوڕێی خزمانی نزیك لـە زیندووان؟

## نەرم و نیان و بەزەیيە لەگەڵیان

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو لە ئاینەکەی لووت بـەرزی ناکـات لەسـەر دەسـتە خوشـکانی، قسەی ڕەق و ڕەفتاری توندنییە لەگەڵیان، بـەڵکو هەمیـشە نـەرم و نیانـە لەگـەڵیان و بەچـاکە و نەرمی لەگەڵیان دەژیێ، لەم بارەوە خودا دەفەرموویێ: ﴿أذِلَّةً عَلَى المُؤمِنِينَ أعِزَّةٍ عَلَى الكَافِرِينَ. واتا: نەرم و نیان و خاك سیفەتن بەرامبەر بە باوەڕداران و بـەرز و شـکۆدار و تونـدن لەسـەر بێ باوەڕان﴾ المائدە: ٥٤.

لەم ئایەتەدا ئافرەتی بڕوادار ئەو بارەی لەبەرچاو بەرجەستە دەبێت کە پێویستە ئافرەتی موسڵمان لەسەری بێت لەگەڵ هاوڕێیانی. بەڕاستی ئەمە حاڵەتێکی نمونەییە لە خاك سیفەتی و نەرم و نیانی و چاکی ڕەفتار کە دەگاتە لوتکەی نەرم و نیانی و دەیچوێنێ بە زەلیل بوون لە بەرامبەر یەکتری.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((نەرم و نیانی لەهەر شتێك دابێت جوان و سەنگینی دەکات، وە لەهەر شتێك دەربهێنرێ کەم بایەخ و ناشیرینی دەکات)) مسلم ١٦/١٤٦.

کاتێ ئافرەتی موسڵمان سەیری ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ دەکات، واقی وڕدەمێنێ لە بەرزی ڕەفتار و کەسایەتیەکەی، کە ئەوپەڕی نەرم و نیانی لە کردار و گوفتاری بەدی دەکرێت، هەرگیز لێی نەبینراوە ڕۆژێك لە ڕۆژان لەگەڵ کەسێك توند و ڕەق بوو بێت چ لە کردار چ لە گوفتار، خودا لە بارەیەوە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَو كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ القَلبِ لَانفَضُّواْ مِن حَولِكَ.... واتا: ئەی محمد ئەگەر تۆ ڕەفتار وشك و دڵ ڕەق بوویتایە ئەوا ئەوانەی دەوروبەرت پەرتەیان دەکرد و کەست لەگەڵ نەدەما﴾ ال عمران: ١٥٩.

ئەنەس ﷺ ئەدگاری پێغەمبەر ﷺ دەکات و دەڵێ: (ماوەی ١٠ ساڵ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ م کردووە، هەرگیز وشەی ئۆفی پێ نەوتووم، وە هەر کارێکم کردووە نەیفەرمووە: بۆچی واتکردووە؟ وە بۆ کارێکیش نەمکردبێ خۆزیا ئەو کارەت بکردایە!! متفق علیه.

هەروا ئەنەس ﷺ دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ هەرگیز جنێوی نەداوە و نەفرەتی نەکردووە، لەکاتی سەرزەنشتاش دەیفەرموو: ((ئەوە بۆچی ناوچەوانی خۆڵاوی بووە؟[1])) فتح الباری ١٠/٤٥٢.

**لە پاشملە باسیان ناکات**

ئافرەتی موسڵمان لە کۆڕ و دانیشتنەکان لە پاشملە بەخراپە باسی کەس ناکات، بەڵکو زمانی بەتایبەتی لە غەیبەتکردنی هاوڕێیانی دەپارێزێ" چونکە غەیبەتکردن حەرامە، وەك خودا

---

[1] لە ڕاڤەی ئەم وتەیە وتراوە: پێغەمبەر ﷺ بەم وتەیە ویستویەتی نزایەك بکات بۆی بە زۆر سوجدە بردن، کە ئەمەش هەر ڕێنمایی و چاکەکارییە بۆی.

دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ يَغتَب بَعضُكَم بَعضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُم أن يَأكُلَ لَحمَ أخِيهِ مَيتًا فَكَرِهتُمُوهُ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ. واتا: هەندێکتان غەیبەتی هەندێکتان مەککەن، ئایا کەستان پێی خۆشە گۆشتی براکەی بە مردوویی بخوات، بێگومان پێتان خۆش نییە، دەی لە خوا بترسن، بەڕاستی خودا تەوبە گیرا دەکات و میهرەبانە﴾ الحجرات:١٢.

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار هەمیشە زمانی خۆی دەپارێزێ لە تێوەگلانی لە غەیبەتکردن" چونکە پێغەمبەر ﷺ هۆشداری داوە بە معاذ بن جبل ﷺ و دەستی بە زمانی خۆی گرت و فەرمووی: ((ئەمە بپارێزە)) معاذ وتی: ئایا بەهۆی قسەکردنیشەوە گوناهمان دەگا و لێمان دەگیرێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دایکت شیوەنت بۆ بکا، ئەی بێجگە لە بەرهەمی زمان چیتر هەیە مرۆڤ لەسەر روخساری یا فەرمووی لەسەر لووتی بخاتە ئاگرەوە؟)) ابن ماجە ١٣١٥/٢.

غەیبەتکردن ئاکارێکی ناشیرینە، نابێ لە ئافرەتی موسڵمانی رووناکبیر بە ڕێنمایی ئاینەکەیدا هەبێت، وە کەسایەتیە ئیسلامیە بەرزەکەشی رازی نابێت خاوەنی دووڕوو و دووزمان بێت و، بەپێی بەرژەوەندیەکانی بسازێ و دووڕوویی بکات و لە دانیشتن و کۆڕەکانی غەیبەتی خوشکان و هاوڕێیانی بکات، وە کاتێکیش پێیان بگات دڵسۆزی و ڕاستگۆییان بۆ دەرخات و بە ڕوویان پێبکەنێ!! چونکە دەزانێ ئەم خۆگۆڕینە یاساغە لە دەستوری ئیسلام کە دامەزراوە لەسەر ڕاستگۆیی و دامەزراویی و روونی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خراپترینی خەڵکی خوا لە ڕۆژی قیامەت دووڕووەکانن، ئەوانەی بە جۆرە ڕوویەك دێنە لای ئەوانە و بە ڕوویەکیتریش دەچنە لای ئەوانیتر)) فتح الباري ٤٧٤/١٠ ومسلم ١٥٧/١٦.

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ خاوەنی یەك ڕووە، ڕوویەکی گەشاوەی روونی بێگەرد، ئەو ڕەنگ و ئەو ڕەنگ ناکات، هەر بەیەك ڕوو پێشوازی لە هەموو خەڵك دەکات، وە دەشزانێ دووڕوو منافقە، وە ئیسلام و نیفاقیش لە یەك کەس کۆنابێتەوە و منافقان لەژێری ژێرەوەی ئاگری دۆزەخن.

**دوورە لە مشت و مڕ و گاڵتە و گەپی ئەزیەت ئامێز و شکاندنی بەڵێن**

یەکێ لە ئاکارەکانی ئافرەتی موسڵمانی ژیر هاوسەنگی و دانایی و هۆشیاریە لە هەڵکردنی لەگەڵ دەستە خوشکانی، گاڵە و مشت و مڕیان لەگەڵ ناکات، گاڵتەی بێمانا و لە سنوربەدەر

ناکات، ئەگەر بەڵێنیان پێ بدات نایشکێنێ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((لەگەڵ براکەت مشت و مڕ و قڕەقڕ مەککە، وە زیادەڕۆیی مەککە لە گاڵتەکردن، بەڵێنێکیشی پێمەدە پاشان نەیبەیتە سەر)) البخاری فی الادب المفرد ١/٤٨٥.

چونکە گاڵە و قڕەقڕ سنگ دەگوشێ، بەهۆیەوەش لێت دووردەکەونەوە و ڕقیان لێت دەبێتەوە، هەروا زیادەڕۆیی لە گاڵتە و گەپی ئەزیەت ئامێز بێگەردی پەیوەندی نێوان دوو خوشك لێڵ دەکات، بەڵێن نەبردنە سەریش خاسیەتی برایەتی و ڕاستگۆیی پیر دەکا و دەشێوێنێ و ڕێزی نێوانیان کەم دەکاتەوە، جا ئافرەتی موسڵمانی بێدار زۆر لەوە بەرزترە بخزێتە ناو ئەو جۆرە لادانە کۆمەڵایەتیانەی لە بەرزی کەسایەتی مرۆڤ کەم دەکاتەوە.

### دەستبلاوە و ڕێز لە خوشکانی دەگرێت

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر دەستبڵاوە بەرامبەر بە خوشکان و هاوڕێیانی، ڕوخسار گەشاوە و دەم بە زەردەخەنەیە لەکاتی بانگەشەکردنیان و پێشوازی و ڕێزلێگرتنیان و ئامادەکرنی خوان بۆیان" چونکە دیمانە و بەیەکگەیشتن لەسەر خواردن و خوان پەیوەندی برایەتی و خوشکایەتی پتەوتر دەکات لە نێوانیان، لە ژیانیاندا شەونمی بەرزی سۆز دەپرژێنێ کە ئافرەتی ڕۆژئاوایی لێی بێبەشە، ئەو ئافرەتەی ژیاری مادیەتی سەردەم پەروەردەی کردووە و لە دەروونیدا گیانی خۆویستی و یەك ئاخوڕی ڕواندووە، دەیبینی دەناڵێنێ بەدەست وێرانبوونی گیان و وشکی هەست و سۆز، ئەمەش لە ئەنجامی هەستکردن بە بێبەشبوون لە دۆستایەتی هاوڕێی دڵسۆز. ئەمە حاڵی مرۆڤی ڕۆژئاواییە بەگشتی و ئافرەتی ڕۆژشاوایی بەتایبەتی، وە ئەو ڕێزگرتنەی بۆ وەدەستهێنانی سەگ و پەروەردەکردنی و نازپێدانی و چاودێریکردنی تەنها بۆ قەرەبووکردنەوەی نەبوونی ئەو کانیاوەی سۆزی مرۆڤایەتیەیە کە فەلسەفەی مادی لە دەروونیدا وشکی کردووە. لە ڕاپۆرتێکی فەرەنسیدا هاتووە: ژمارەی سەگ لە فەرنسا گەیشتۆتە ٧ ملیۆن، لەکاتێکا ژمارەی دانیشتووانی ٥٢ ملیۆن کەسە، ئەم سەگانە لەگەڵ خاوەنەکانیان وەکوو خزم و خوێش دەژین، وە شتێکی نامۆ نییە کە لە چێشتخانەی پاریس ببینی سەگێك و خاوەنەکەی لەسەر یەك خوان نان دەخۆن، کاتێ لە بەرپرسێکی کۆمەڵەی چاودێریکردنی ئاژەڵ لە پاریس پرسیارکرا: ((لەبەرچی فەرەنسیەکان بە

شێوازێك مامەڵە و ڕەفتار لەگەڵ سەگەكانیان دەكەن وەك ڕەفتار و مامەڵەیان لەگەڵ خۆیان؟ وەڵامی دایەوە: (چونكە ئەوان دەیانەوێ خۆشەویستی بە دەست بێنن، بەڵام لە نێوان خەڵك كەسیان دەست ناكەوێ تا خۆشیانیان بوێ)[1].

مرۆڤی مادی لە ڕۆژئاوا یا لە ڕۆژهەڵات گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی مرۆڤێكی دۆستی خۆشەویست و ئەمەكدار نادۆزێتەوە لە كۆمەڵگاكەی تا خۆشەویستی و سۆزی پێبدات" بۆیە ڕوویكردۆتە ئاژەڵان كە تیایاندا ئەمەكداری و خۆشەویستی زیاتر دەست دەكەوێت لەوەی لە مرۆڤەكانی دەورووبەری دەستی دەكەوێت.

ئەم ڕۆچوونە لەو جۆرە سۆزە لەلایەن مرۆڤی ڕۆژئاواییی بووە هۆی وشككردنی سەرچاوەی هەستی مرۆڤایەتی لە دەروونیدا، ئەمەش یەكەم شتێك بوو سەرنجی ئەدیبە كۆچبەرەكانی موسڵمان و ناموسڵمانی ڕاكێشا" چونكە ئەوان سەیری ژیانی مادی ڕۆژئاواییان كرد كە مرۆڤی وەكو ئامێرێك لێكردووە، بەجۆرێك لە ژیانیدا بێجگە لە ماندووبوون و بەرهەمهێنان و ململانێی توند لەسەر دەستكەوتنی مادە هیچیتر ناناسێ، دڵی بۆ دۆستێك ناهەژێ، زەردەخەنەیەك ناكات بەرامبەر خۆشەویستی هاوڕێیەك، بەڵكو هەمیشە حەپەساو و خەریكی پەلە پەلە و ئامێر و جەنجاڵی و قەرەباڵغییە، ئەو هۆكارانە بوون ئەدیبانی سەرسام كرد كاتێ بینیان خۆیان لە وڵاتی موسڵمان بە جۆرێكیتر پەروەردە بوون، لە كەش و هەوایەكی ڕۆحانی هەناسەیان داوە، دەروونیان پڕبووە لە خۆشەویستی مرۆڤ بۆ مرۆڤ، بۆیە ڕاپەڕین و بە گەرمی بانگەشەی ڕۆژئاواییەكانیان كرد بۆ خۆشەویستی و برایەتی و ئاشنایەتی، ئەوە (نسیب عریضة) یە بەیداخی ئەم بانگەوازە مرۆییەی هەڵگرتووە، بانگی مرۆڤی ڕۆژئاواییی دەكات كە مادە دڵی ڕەشكردووە، تیشكەكانی ژیاری چاوی كوێر كردووە، دەنگی ئامێر گوێی كەڕكردووە، پێی دەڵێ:

یا ابن ودي، یا صاحبي، یا رفیقي لیس حبي تطفلا أو ثقالة

فاجبني (بیا أخي) یا صدیقي وأعـد، إنهـا ألـذ مقـالة

---

[1] من مقال للأستاذ وحیدالدین خان بعنوان: (وجوب تطبیق الشریعة الاسلامیة في كل زمان ومكان) نشره مجلة المجتمع الكویتیة، العدد ٣٢٥، في ٢٤ من ذي القعدة ١٣٩٦ هـ = ١٦ من تشرین الثاني في نوفمبر ١٩٧٦ م.

وإذا شئت أن تسير وحيدا وإذا مـــا اعـــترتك مني ملالة

فامض، لكنما ستسمع صوتي صارخا (يا أخي) يؤدي الرسالة

وسياتيك أيـــن كنـت صـدى حبي فتدري جمـالـه وجـلالـه

واتا: ئەی كوڕی دۆستم، هاوڕێم، برادەرم: خۆشەویستیم بۆت منالاَنە و بالگرانی نییە. جـا بـە ئەی برا وەلاَمم بدەوە ئەی هاوڕێم، وە دوبـارەی بکـەوە چـونکە ئەمـە خۆشەویـسترین وتەیـە. وە ئەگەر ویستت بە تەنها برۆی، وە ئەگەر لەلایەن منەوە بێزاریەك ڕێگای پێگرتـی. ئەوسـاکە بـڕۆ، بەلاَم پاشان دەنگم دەبیستی هاوار دەکات (براکەم) پەیامەککەی دەگەیەنێ، وە لە هەر کوێ بێـت زایەڵەی خۆشەویستیم پێت دەگا، ئەوکاتە هەست بە جوانی و بەرزیەکەی دەکەی.

هەروا لەم ولاَتە ڕۆژئاواییانە ژیانی مادیەت زۆر سەخت دەبێ لەسەر (یوسف أسعد غـانم)، زۆر بێزار دەبێ لەو ژیانە پڕ لە ئەرکە، کە نقومی شەپۆلی مادی توندبووە، هیچ شەونمێکی ڕۆحانیـەت یـا دۆسـتایەتی یـا سـۆزی لێ بـەدی ناکـەی" سەرچـاوەکانی کانیـاوی تاسـەی ولاَت و شـەوق و خۆشەویستی بۆ خاکی عەرەب لە ولاَتی ئیسلامی دەتەقێتەوە، ئەو شوێنەی جێگای لە دایکبوونی پێغەمبەران و سەرچاوەی ڕۆحانیەتە، ولاَتی دۆسـتایەتی و برایـەتی و بێگەردییـە، بۆیـە ئـاوات دەخوازێ ئەگەر تەنانەت لەژێر ڕەشماڵێکی عەرەبیش بێت بژیێ و دونیای ژیاری جێبێلێ بە هەموو ئەو نارەحەتی و دەنگە دەنگەی هەیەتی و دەڵێ: (ئەگەر تەمەن هەمووی ببێتە هـەڵمێکی کـورت لەسەر خاکێکی عەرەبی، ئەوکات سوپاسی خوا دەکەم لەسەر ژیانێکی کورتی پانڕەو لە دونیایـەك کە الله لە نێو دڵی خەڵکەکەدا نیشتەجێ بووە....، زۆر لە ڕۆژئـاوا مانـدوبووم بـە ڕادەیـەك ئـەو ماندوبوونە هەراسانی کردووم، ئۆتۆمبێل و فرۆکە بۆ خۆتانی ببەن و وشترێك و ئەسـپێکیش بـدەن بە من، دونیای ڕۆژئاوا بە زەوی و دەریا و ئاسمانیەوە بۆ خۆتـانی ببـەن، وە ڕەشمـاڵێکی عـەرەبی بدەن بە من تا لە یـەکێ لـە بەرزاییـەکانی ولاَتم لبنـان، لەسـەر کـەناری (بـردی)، لـە قـەراغی ڕافیدەین، لە خاکی عەممان، لە بیابانی سعودیە، لە هەرێمە نەناسراوەکانی یەمەن، لەسەر لوتکەی هەرەمەکان، لە پانتایی ئاقارەکانی لیبیا، ڕەشماڵێکی عـەرەبیم بـدەنێ تـا لـە تایـەکی دابنـێم و دونیاش لە تایەکەیتر، ئەو کاتە من براوەم و قازانجم کردووە....)).

ئەو دەقانەی لە ئەدەبی کۆچبەران لەسەر ئەم بابەتە دەدوێن زۆرن، هەموویان وێنای تینوێتی کۆچبەران دەکەن بۆ سەرچاوەی ئەو سۆزەی لە جیهانی مادیەتی ڕۆژئاوا لە دەستیان داوە، ئەوەش سەرچاوەی شەیدابوون و هۆگری بۆ ڕۆژهەلات تەقاندەوە کە ئیسلام دۆستایەتی و برایەتی و سۆز و هاوبەرپرسیاریەتی تیایدا بلاوکردۆتەوە.

ئیسلام لە ڕۆژهەلات تۆوی خۆشەویستی لە دەروونەکان چاندووە، نەمامی برایەتی و دۆستایەتی لە دلان ڕواندووە، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ- دەفەرمووێ: ((باشترینتان ئەو کەسەیە کە نان بدەیە و وەلامی سەلام دەداتەوە)) احمد ١٦/٦.

هەروا مزگێنی دەدات و دەفەرمووێ: ((سەلام لە خەلکی بکە و، نان بدە بە و، پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنە، شەویش هەلسە شەونوێژ بکە لەو کاتەی خەلك نووستووە، ئنجا بە ئاشتی و سەلامەوە بڕۆ بەهەشت)) احمد ٢/٢٩٥ والحاکم ٤/١٢٩.

هەروا دەفەرمووێ: ((لە بەهەشتدا کۆشکی وا هەیە لەناوەوەی دەرەوەی دەبینرێ و لە دەرەوەشی ناوەوەی دەبینرێ، خودا ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی نان بدەن و گوفتار و قسە نەرمن، ڕۆژوو دەگرن، لەو کاتەش بە شەو خەلك نووستووە ئەوان بە ئاگان و شەونوێژ دەکەن)) احمد ٥/٣٤٣ وابن حبان ٢/٢٦٢.

## لە پاشملە نزا بۆ خوشکانی دەکات

ئافرەتی موسلمانی ڕاستگۆ ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆش بێت بۆ خوشکەکەشی لە ڕێی خوا پێی خۆشە، لە پاشملە نزای خێری بۆ دەکات، نزای نادیارێك بۆ نادیارێك، کە پڕە لە گوڕی دۆستایەتی ڕاستگۆیانەو، لە دلێکی ڕاستگۆ و دۆست دەردەچێ، وە دلنیایە لەوەی ئەو جۆرە نزایانە خێراترینیانە لە گیرابوون، بەهۆی دلسۆزی لە پارانەوەکە، گەرمی هەست، بەرزی مەبەست، ئەمەش پێغەمبەر ﷺ جەختی لەسەر کردۆتەوە، وەك دەفەرمووێ: ((خێراترینی نزا بۆ گیرابوون نزای نادیارێکە بۆ نادیارێك)) البخاری فی الادب المفرد ٢/٨٣.

ئەم واتایە لە دەروونی هاوەڵان چەسپابوو" بۆیە هەر دەرفەتێك بهاتایە پێش داوایان لە براكانیان دەكرد تیایدا نزایان بۆ بكەن، لەم ڕووەوە پیاو و ئافرەت یەكسانن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەرزی ئاستی كۆمەڵگەی ئەو كاتە، بخاری لە ادب المفرد دەریكردووە لە صفوان بن عبدالله بن صفوان كە مێردی (الدرداء كچی ابی الدرداء) بووو وتی: هاتمە شام، دایكی دەردائم لە ماڵەوە بینی، بەڵام باوكی دەرداء لە ماڵەوە نەبوو، دایكی دەرداء پێی وتم: دەتەوێ حەج بكەی؟ وتم: بەڵێ، وتی: كەواتە نزای خێرمان بۆ بكە" چونكە پێغەمبەرﷺ- دەیفەرمووو: ((نزای مرۆڤی موسڵمان بۆ براكەی لە پاشملە گیرایە، لەلای سەریەوە فریشتەیەك ڕاسپێردراوە، هەرچەند جار نزا بكات، ئەو دەڵێ: ئامین، بۆ تۆش بە هەمان شێوە)) البخاری فی الادب المفرد ٢/٨٤ ، وتی: ئنجا لە بازاڕ باوكی دەردائیشم بینی، ئەمیش بە هەمان شێوە ئەو فەرموودەیەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ گێڕامەوە.

پێغەمبەر ﷺ گیانی بەیەكەوەیی لە دەروونی موسڵمانان ڕەگ داكوتا، وە پەیوەندی خۆشەویستی لەپێناوی خوا لە نێوانیاندا پتەوكرد، خەڵك ویستی لە دڵیاندا بڵاوكردەوە، هەر دەرفەتێك بووایە هەستی خۆویستی و تاك ویستی لە دڵیاندا ڕیشەكەن دەكرد، تاوەكوو هەستی خۆشەویستی و پەیوەندی و هاوبەرپرسیاریەتی و فیداكاری و خزمایەتی لە ژیانی كۆمەڵگەی موسڵمان بچەسپێ. ئەوەتا كاتێ پێغەمبەر ﷺ لە پیاوێك دەبیسێ بە دەنگی بەرز نزا دەكات و دەڵێ: خودایە تەنها لە من و لە محمد خۆش ببە، پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرمووێ: ((ئێمەت لە خەڵكێكی زۆر جیاكردەوە و پەناگیركرد)) البخاری فی الادب المفرد ٢/٨٥.

ئەمەیە ئافرەتی موسڵمان كە ئیسلام پەروەردەیكردووە، خوشكانی خۆش دەوێت و لەپێناوی خوا دۆستایەتیان دەكات، ڕاستگۆ و دڵسۆزە لە خۆشەویستییەكەی بۆیان، بایەخ دەدات بەهەرچی مایەی سوودە بۆیان، هەرچی بۆ خۆی پێیخۆش بێت بۆ ئەوانیشی پێخۆشە، لە غەمی مانەوەی پەتی خوشكایەتی و خۆشەویستی دایە لە نێوانیاندا، دەنگیان لێدانابڕێ و پشتیان تێ ناكات، لێبوردەیە و لە هەڵە چاوپۆشی دەكات، هیچ ڕق و كینەیەك لە دڵیدا بەرامبەریان هەڵناگرێ، هەمیشە بە ڕوویەكی گەش و دەمی بە زەردەخەنەوە پێشوازیان لێ دەكات، چاكەكار و ئەمەكدارە

بۆیان، نەرم و بەزەییە لەگەڵیان، لە پاشملە بەخراپە باسیان ناکات، بە گاڵە و قرە هەستیان ئازارنادات، دەستبڵاوە بۆیان و ڕێزیان لێدەگرێت، لە پاشملەش نزای خێریان بۆ دەکات.

جێگای سەرسوڕمان نییە ئافرەتی موسڵمان کە ئیسلام هەستی پەروەردە کردووە و کەسایەتی داڕشتووە، ئەو ئاکارانە لەخۆبگرێت، ئەمە سەراسیمای ئیسلامە لە پەروەردەکردنی مرۆڤ، پیاو بێ یا ئافرەت، لە هەرکات و شوێنێك ژیابێ.

## ١.ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ کۆمەڵگاکەی

### دەستپێك

ئافرەتی موسڵمان بەوەی وەکوو پیاو ڕاسپێردراوە، خاوەنی پەیامێکە لە ژیان، بۆیە دەبێت کەسێکی کۆمەڵایەتی چالاك و کاریگەر بێت، ئەوەندەی ڕەوشی ژیانی و خێزانی و تواناکانی دەرفەتی پێ بدات، بەپێی توانا تێکەڵی ئافرەتان دەبێت، هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەکات بە خوڕەوشتی ئیسلامی بەرز کە بەهۆیەوە لە ئافرەتانیتر جیادەبێتەوە.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر لەهەر کوێیەك هەبێت دەبێتە بەیداخی ڕووناکی و چرای ڕێنمایی و سەرچاوەی ئاڕاستەکردن، هەروا دەبێتە فاکتەرێکی کاریگەر بۆ بنیات نان و ئاڕاستەکردن و ڕۆشنبیرکردن بەهۆی گوفتار و کردارەکانی.

ئافرەتی موسڵمان بەهۆی بەرچاو ڕۆشنی بە ڕێنمایی قورئان و تێراوبوونی لە سەرچاوەی سوونەتی پاکی پێغەمبەر ﷺ، خاوەنی کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی بەرزە لە جۆری یەکەم، ئامادەیە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکە بانگخوازییەکەی لەناو کۆمەڵی ژنان. چاو و هزر و دانایی لەسەر ڕێنماییەکانی ئەم ئاینە کراوەتەوە کە بەهۆیەوە هەر لە سەرەتاوە لە مێژووی ئافرەتانی جیهان بەرزیکردۆتەوە، بڕێکی زۆری لە توێشوی بەهارەوشتیەکان پێ بەخشیوە کە قورئان و فەرمووودە باسیانکردووە، خۆرازاندنەوەشی بەم ئاکارانە بە ئاین هەژمارکردووە، کە مرۆڤ لەسەریان پاداشت وەردەگرێت و لە وازهێنانیش لێیان سزا دەچێژێ، ئەم دەقانەی قورئان و فەرمووودە توانی وا لە

کەسایەتی ئافرەتی ڕاستگۆ لەگەڵ خوا بکات ببێتە نمونەیەکی دانسقە بۆ ئافرەتی کۆمەڵایەتی بەرز و پەروەردەکراو پارێزکار و پاك و چاك و پارێزراو.

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو لە ئەحکامەکانی ئاینەکەی، لە هەر کۆبوونەوەیەکی ئافرەتانە هەبێت ئامادە دەبێ، بنەما و ئاکارە جوانەکانی ئاینەکەی لە خۆدا بەرجەستە دەکات، بەهۆی کردارکردن بەم بنەمایانە و خۆرازاندنەوە بەم ئاکارە جوانانە. ئنجا ئافرەتی موسڵمان لەم سەرچاوە گەورە و دەوڵەمەندە داب و نەریت وەردەگرێ، هەر لەم سەرچاوەیەش تێراو دەبێ و دەروونی پاك دەکاتەوە و کەسایەتییە کۆمەڵایەتیە موسڵمانەکەی پێك دێنێ.

## خوڕەوشتی چاك و جوانە

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار خوڕەوشت جوانە، خانەدانەو بێ فیزە، گوفتار نەرم و میهرەبانە، مامەڵە ئاسانە، ساز و گونجاوە لەگەڵ دەوروبەر، لە مانەش پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ دەکات، ئەنەس ﷺ کە خزمەتکاری بوو گەواهی بۆ دەدات و دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس خورەوشتی چاکتر بوو)) متفق علیه.

پێغەمبەر ﷺ خاوەنی خوڕەوشتێکی بەرزبوو، خوا دەفەرمووێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيم. واتا: بەڕاستی محمد تۆ خاوەنی خوڕەوشتێکی مەزنی﴾ القلم: ٤.

پێغەمبەر ﷺ کاریگەری خوڕەوشت چاکی بۆ موسڵمانان زۆر دوپات دەکردەوە، وەك دەفەرمووێ: ((باشترینتان ئەوانەن خوڕەوشتیان لە هەمووان چاکترە)) فتح الباری ١٠/٤٥٦ ومسلم ١٥/٧٨.

وە دەفەرمووێ: ((خۆشەویسترینتان و نزیکترینتان لە من لە ڕۆژی دوایی ئەوانەن خاوەنی چاکترین خورەوشت بن، وە ئەوەشی زۆر ڕقم لێی دەبێ و لە هەمووان لەمن دوورترە لە ڕۆژی دوایی کەسانی جەنەباز و دەم درێژانن و (المتفیهیقون)نن، وتیان: جەنەباز و دەم درێژانمان زانی، ئەی (المتفیهقون) چییە؟ فەرمووی: ((خۆ بەزل زانان)) الترمذي ٣/٢٤٩.

هاوەڵان چ پیاو چ ئافرەت ئەم ئاڕاستە بەرزەی پێغەمبەر ﷺ یان لە بارەی ڕەوشت چاکی دەبیست و بە چاوی خۆیان بەرجەستەکردنی زیندووی خورشەوشتە جوانەکانیان لە کەسایەتیەکەی دەبینی" بۆیە بەهارەوشتیەکان لە دەروونیان چاپ دەبوو، وە ببووە یەکێ لە ڕەفتار و ئاکارە هەمیشەییەکانیان، لێرەوە ئەو نەوەی خاوەن خورەوشتی ناوازە سەری هەڵدا لەو کۆمەڵگە نونەییە لە باشترین سەدە.

ئەنەس ﷺ دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ زۆر میهرەبان بوو، هەر کەس بهاتایە لای بەڵێنێکی پێدەدا، وە ئەگەر هەیبوایە هەر ئەوکات بەڵێنەکەی دەبردەسەر، ڕۆژێکیان بانگی نوێژیدا، لەو کاتە دەشتنشینێك هات و جلەکانی پێغەمبەر ﷺ ی ڕاکێشا و وتی: من هەندێ لە پێویستیم ماوە دەترسم تا نوێژ دەکەی لە بیری بکەم، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵی هەڵسا تا لە پێویستیەکەی بوویەوە، پاشان هات و نوێژی کرد)) البخاری فی الادب المفرد ١/٣٧٥.

پێغەمبەر ﷺ پێی شەرم نەبوو گوێ بۆ دەشتنشینێك بگرێ و پێویستیەکەی بۆ دابین بکات، لەگەڵ ئەوەی بانگی نوێژیشی دابوو، وە سنگی تەنگ نەبوو بەوەی جلەکانی گرتبوو و سووربوو لەسەر دابینکردنی پێویستیەکەی پێش نوێژ" چونکە پێغەمبەر ﷺ خەریکی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی خاوەن خورەوشتی چاك بوو، بە کردار چۆنیەتی رەفتارکردنی موسڵمانی لەگەڵ براکەی مرۆڤی فێر دەکردن، ئەو بنەما ڕەوشتیانەی بۆ بڕیاردان کە پێویستە لەناو کۆمەڵگەی موسڵمانان بڵاوبێتەوە.

وە ئەگەر بە دیدی ناموسڵمان خورەوشت چاکی سەرچاوە دەگرێ لە باش بەخێوکردن و جوانی و ساغی پەروەردە ە بەرزی ئاستی خوێندەواری، ئەوا خورشەوشت چاکی لەلای موسڵمانان پێش هەموو ئەوانە دەگەڕێتەوە بۆ ڕێنمایی ئاین کە خورەوشت چاکی کردووە بە ڕەفتارێکی ڕیشەیی لە مرۆڤی موسڵمان، بەهۆیەوە لە دونیادا پلەوپایەی بەرزدەبێتەوەو وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هیچ شتێك لە ڕۆژی قیامەت لە تەرازووی باوەڕدار قورستر نییە لە خورەوشت چاکی" چونکە بەڕاستی خوا ڕقی لە مرۆڤی بەدگۆ و جنێودەرە)) الترمذي ٣/٢٤٤.

بەڵکو ئیسلام خوڕەوشت چاکی بە باوەڕی تەواو هەژمارکردووە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەو باوەڕدارەی لە هەموو کەس باوەڕی تەواوترە، ئەو کەسەیە لە هەمووان خوڕەوشتی چاکترە)) الترمذي ٢/٣١٥.

ئوسامە کوڕی شورەیك ﷺ وتی: ((لەلای پێغەمبەر ﷺ زۆر بە ڕێزەوە دانیشتبووین وەك بلێی باڵندە لەسەر سەرمان نیشتووە، هەموومان بێ دەنگ بووین و قسەمان نەدەکردو لەو کاتە خەڵکانێك هاتن و وتیان: کام بەندەی خوا لەلای خودای مەزن خۆشەویستترە؟ فەرموووی: ((ئەوانەی لە هەمووان خوڕەوشت چاکترن)) الطبراني ١/١٨١، ١٨٣.

سەیرنییە خاوەنی چاکترین خوڕەوشت خۆشەویستترین بەندە بێ لەلای خوا" چونکە خوڕەوشت چاکی لە یاسای ئیسلام کارێکی مەزنە، قورسترین کردەوەیە لە تەرازوو، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموووێ: ((هیچ شتێك لە تەرازوو دانانرێ قورستر بێ لە خوڕەوشت چاکی، وە خوڕەوشت چاکی خاوەنەکەی دەگەیەنێتە پلەی ڕۆژو و نوێژ)) الترمذي ٣/٢٤٥. لە گێڕانەوەیەکیتر: ((بەندە بەهۆی خوڕەوشت چاکییەوە دەگاتە پلەی ئەو کەسەی هەردەم بەڕۆژووە و بە شەویش شەونوێژ دەکات)).

لەم ڕوانگەیەوە بوو پێغەمبەر ﷺ جەختی لەسەر گرنگی خوڕەوشت جوانی دەکردەوە بۆ هاوەڵە بەڕێزەکانی و هانی دەدان تا خۆیانی پێ برازێننەوە، لە ڕێگەی شێوازی جۆراوجۆری لە گوفتار و کرداری ئەم ڕەوشتەی خۆشەویست دەکرد بۆ دەروونیان" چونکە دەیزانی چەندە کاریگەرە بۆ پەروەردەی سروشت و خۆڕسکی مرۆڤ، و پاککردنەوەی دەروون، هەروا چاککردن و جوان بوونی ڕەفتار، ئەوەتا ﷺ بە أبي ذر دەفەرمووێ: ((ئەی أبا ذر، ڕێنماییت بکەم بۆ دوو ڕەفتار، کە لەسەر باڵت گران نییە و، لە هەموو ڕەفتارێکیتریش قورسترە لە تەرازوو؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((دەستگربە بە خوڕەوشت جوانی و زۆر بێ دەنگی" چونکە سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە کەس لەم دووانەی جوانتر نەدۆزیوەتەوە تا خۆی پێ جوان بکات)) رواه ابو يعلى والطبراني (مجمع الزوائد ٨/٢٢).

هەروا دەفەرمووێ: ((خوڕەوشت جوانی فەڕ و بەرەکەتە، بەدڕەوشتیش نەگبەتیە، چاکەکاریش تەمەن زیاد دەکات، خێر و بەخشنیش ڕێگە لە مردنی خراپ دەگرێ)) احمد ٥٢/٣.

پێغەمبەر ﷺ لە یەکێ لە نزاکانی دەیفەرمووو: ((خوایە وەك چۆن روخسارمت باش و جوانکردووە، ڕەفتار و خوڕەوشتیشم باش و جوان بکە)) احمد ٤٠٣/١.

ئەم نزایەی پێغەمبەر ﷺ بە جوانکردنی خوڕەوشتی، لە کاتێك خودا لە بارەیەوە دەفەرمووێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ القلم:٤ پێشتر ڕاڤەکراوە. بەڵگەیەکی قووڵە لەسەر توندی بایەخدانی پێغەمبەر ﷺ بە خوڕەوشت جوانی، تاوەکوو موسڵمانان هەمیشە لەم ڕەفتارانە زیاد بکەن...

جا خوڕەوشت جوانی وشەیەکی گشتگیرە، هەموو ڕەفتار و ڕەوشتێکی جوان لە خۆدەگرێت کە مرۆڤ پێی دەڕازێتەوە و، پاکی دەکاتەوە و بەرزی دەکاتەوە: وەك شەرم و حەیا و هێمنی و نەرم و نیانی و لێبوردەیی و ڕووخۆشی و دامەزراوی و نیاز پاکی و دڵسۆزی و دەست پاکی ....هتد.

کەچی لێکۆڵەرەوە لە دەقەکانی ئاڕاستەکرنی کۆمەڵایەتی لە ئیسلام، خۆی لە بەرامبەر ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەم دەقانە دەبینێتەوە کە هانی هەرچی خوڕەوشتی جوانە دەدات لەو خوڕەوشتە کۆمەڵایەتیە بەرزانە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مەبەستی هەرە بەرزی ئیسلام لە پێکهێنانی کەسایەتی مرۆڤی موسڵمانی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی زۆر ورد، وە تەنها بە خوڕەوشتە گشتیەکان ناوەستێ، بەڵکو لەسەر هەموو بەشێك لە بەشەکانی خوڕەوشت دەوەستێ کە لایەنێك لە لایەنەکانی کەسایەتی کۆمەڵایەتی تەواوکار پێك دەهێنێ، ئەم گشتگیری و تەواوکاریە لە هیچ پرۆگرامێکی پەروەردەیی کۆمەڵایەتی دەستەبەر نەبووە وەك لە پرۆگرامی ئەم ئاینە دەستەبەربووە.

لێکۆڵەرەوە لەم دەقانە بۆ نیشاندانی کەسایەتی ئافرەتی موسڵمان هیچ ڕێگایەکی لەبەردەم نییە بێجگە لە وەستان لەلای هەریەك لەو دەقانە و وردبوونەوە لەو ڕێنمایی و ئاڕاستە و دەستورانەی لە خۆگرتووە، تاوەکوو بتوانێ ئەو کەسایەتیە کۆمەڵایەتیە بەرزە نیشانبدات کە

مرۆڤی موسڵمانی پێ جیادەکرێتەوەو چ پیاو چ ئافرەت، هەروا مۆرکی ئەو کەسایەتییە جیاوازە و ئاکارەکانی دیاری بکات، لەوانە:

## ڕاستگۆیە

ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ هەموو خەڵك ڕاستگۆیە" چونکە لە بنەماکانی ئیسلام وانەی هاندان لەسەر ڕاستگۆیی فێربووە، کە لە لوتکەی چاکەکاری و بەهاڕەوشتیەکان وێنای دەکات، قەدەغەی درۆکردنی کردووە و بە سەرچاوەی هەموو خراپەکاری و گەندەڵی و کردارێکی خراپی داناوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ڕاستگۆیی بەرەو چاکەکاری دەبات، وە چاکەکاریش بەرەو بەهەشت دەبات، وە پیاو هەمیشە ڕاست دەڵێ تا لەلای خوا بە ڕاستگۆ دەنوسرێ. درۆکردن بەرەو خراپەکاری دەبات، وە خراپەکاریش بەرەوە ئاگر دەبات، وە پیاو بەردەوام درۆ دەکات تا لەلای خوا بە درۆزن دەنوسرێ)) متفق علیه.

لێرەوە ئافرەتی موسڵمان سوورە لەسەر ئەوەی ڕاستگۆ بێت، بەدوای ڕاستگۆییدا دەگەڕێت، لە کردار و گوفتارەکانی پابەند دەبێ پێی، ئەمەش پلەوپایەیەکی بەرز و شکۆدارە ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار بەهۆی ڕاستگۆیی و دڵ پاکی پێی دەکات و لەلای خوای خۆی بە ڕاستگۆ و ڕێزدار دەنوسرێ.

## گەواهی بە درۆ نادات

ئافرەتی موسڵمانی بێگەرد کە یاساکانی ئیسلام و ڕێنماییە بەرزەکەی کەسایەتیەکەی دارشتووە، هەرگیز گەواهی بە درۆ نادات" چونکە گەواهی درۆ لە یاسای ئیسلام یاساغە، خودا دەفەرمووێ: ﴿وَاجتَنِبُواْ قوولَ الزُور. واتا: خۆتان بە دووربگرن لە گەواهی بە درۆ﴾ الحج: ٣٠.

گەواهی بە درۆ وێڕای یاساغیەکەی، لە نرخ و بەهای ئەمانەت و دەست پاکیش کەم دەکاتەوە، ئابڕو و کەسایەتی خاوەنەکەی بریندار دەکات، وەك کەسێکی شەرمەزار و ڕیسوا و بێ نرخ وایە لە بەرچاوی خەڵك، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَالَّذِینَ لاَ یَشهَدُونَ الزُّورَ وَإذَا مَرُّواْ بِاللَّغوِ مَرُّواْ

كِرَامًا. واتـا: يەكێ لە خەسڵەتە جوانەكانی باوەڕدار ئەوەیە گەواهی بە درۆ نـادەن و بـەڕێزەوە بـە لای قسەی بێ سوود تێدەپەڕن و خۆیانی لێ دەپارێزن﴾ الفرقان: ٧٩.

ئەوەتا لەبەر گەورەیی ئەم سەرپێچییە پێغەمبەر ﷺ لەدوای دوو گوناهی گەورە باسی دەكـات كە بـاوەڕ لـە دڵـی مـرۆڤ دادەمـاڵن، وەك دەفـەرمووێ: ((ئایـا گـەورەترینی گوناهـەكانتان پـێ ڕابگەیەنم؟ وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((هاوەڵ بڕیاردان بـۆ خـوا، خراپـەكاری لەگەڵ دایك و باوك، ئنجا پاڵكەوتبوو هەڵسایەوە و دانیشت و فەرمووی: هەروا قسە و گوفتـاری درۆ و گەواهی درۆ، هێندەی دووبارەكردەوە وتمان: خۆزیا بێ دەنگ دەبوو)) متفق علیە.

## دڵسۆز و ئامۆژگارە

ئافرەتی موسڵمان تەنها بە خاوێنكردنەوەی دەروونی خۆی ناوەستێ لە ئاكاری ناشیرین، بـەڵكو بە هەر ئافرەتێك بگات لەوانەی لە ڕێگای خـوا لاریـان كردۆتـەوە ئامۆژگـاری دەكـات، چـەندین ئافرەت هەنە لەناو كۆمەڵی ژنان زیادەڕۆییان كـردووە لەسـەر دەروونـی خۆیـان و پێویـستیان بـە كەسـێكە ئامۆژگاریـان بكـات، بـەهۆی ڕەفتـاری جوانییـەوە سـەرنجیان بـۆ لای ڕێگـای ڕاسـت ڕادەكێشێ.

ئامۆژگاریكردنی ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو بۆ كەسانیتر كـارێكی سـونەت و زیـادە خێـر نییە، بەڵكو ئەرك و واجبێكـە و ئـاین هانیـداوە لەسـەری، پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((ئـاین دڵسۆزی و ئامۆژگارییە، وتمان: بۆ كێ؟ فەرمووی: بۆ خوا، بۆ كتابی خوا، بـۆ پێغەمبەرەكـەی، بۆ گەورە و ڕابەری موسڵمانان و سەرجەم خەڵكی)) مسلم ٢/٣٧.

هەروا جەریر كوڕی عبداللە ﷺ دەڵێ: ((پەیمانم بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا لەسـەر ئەنجامـدانی نوێژەكان و دانی زەكات دڵسۆزی و ئامۆژگاری بۆ هەموو موسڵمانێك)) متفق علیە.

چەندە جوانە ئەو گوزارشتەی پێغەمبەر ﷺ كاتێ دەفەرمووێ: ((الدین النصیە)) واتا: ((ئـاین دڵسۆزی و ئامۆژگارییـە))، ئـاینی هـەر هـەموو لەیـەك وشـەدا كۆكردۆتـەوە كـە (دڵـسۆزی و ئامۆژگارییە)، وەكوو ئاماژەیەك بۆ هەموو موسڵمانێك تا بەهای دڵسۆزی و ئامۆژگـاری بزانـێ،

وە بزانێ چەندە کاریگەرە لەسەر ژیانی تاك و خێزان و کۆمەڵگە" چونکە هەرکاتێك دڵسۆزی و ئامۆژگاری لەناو گەلێك بڵاوبێت مسۆگەر ڕێنمایی ڕێگەی ڕاست دەبن، وە لەناو هەر گەلێکیش نەمێنێ مسۆگەر سەریان لێ دەشێوێ.

بۆیە دڵسۆزی و ئامۆژگاری لە سەرووی ئەو پرسانەوە دێت کە موسڵمان تیایدا پەیمانی بە پێغەمبەر ﷺ داوە لەسەر، وەك لەو فەرمووودەی ڕابوورد کە باسی دڵسۆزی و ئامۆژگاری لە دوای نوێژ و زەکات دێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی ئەم ئاکارە لە تەرازووی کردەوەکانی مرۆڤی موسڵمان، وە ترسناکیەکەی لە دیاریکردنی چارەنوسی لە دوارۆژدا" بۆیە لێرەوە دەبێتە ئاکارێکی ڕیشەیی لە ئاکارەکانی موسڵمانی ڕاستگۆی پارێزکار، ئەوەی سورە لەسەر ئەوەی بە چاکی کۆتایی بە ژیانی بێت لەو ڕۆژەی هەموو خەڵکی لەبەر دەستی پەروەردگاری دەوەستێ.

## خێر و چاکە بە خەڵکی نیشاندەدات

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار کە ئیسلام دەروونی پاڵفتەکردووە، لە ژەنگی خۆویستی و حەزی خۆدەرخستن خاوێنی کردۆتەوە، هەرکاتێك بە چاك بزانێ خێر و چاکە بە خەڵکی نیشاندەدات، تاوەکوو بێتە ناو ڕووناکی و سوود ببینن، لای یەکسانە ئەگەر ئەم کارە خێرە لەسەر دەستی خۆی بێت یان لەسەر دەستی کەسانیتر بێت" چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ چاکە و خێر ڕێنمایی خەڵکی بکات، ئەوا پاداشتی وەك پاداشتی ئەو کەسە وایە کە چاکە و خێرەکە دەکات)) مسلم ١٣/٣٨.

ئافرەتی موسڵمان دوورە لەوەی تەنها خێری بۆ خۆی بوێت بۆ ئەوەی لەبەر چاوی خەڵك خۆی دەرخات، وەك ئەو ئافرەتە خۆویستانەی حەز بە خۆدەرخستن دەکەن، بەڵام ئافرەتی موسڵمان کە ڕێنمایی خەڵك دەکات بۆ چاکە دەزانێ پاداشتەکەی لەلای خوای گەورە جێگیرە لە هەر ڕەوش و بارێکدا بێت، وە پاداشتی خوای گەورەش لەلای ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار زۆر گەورەتر و مەزنترە لەناوبانگ و خۆدەرخستن، بەمەش خێزان و کۆمەڵگە گەشە دەکات، تاوەکوو لەو کەسە و بە گوێرەی ئەو توانایانەی خودا پێی بەخشیوە هەڵسێ بە ئەرکی خۆی.

چەندین جار ئەم خورەوشتی خۆویستی و خۆدەرخستنە کوشندەیە خێری لە کۆمەڵگە گرتۆتەوە" چونکە چاکە بە دەستان حەزیانکردووە تەنها بە دەستی خۆیان چاکە بکەن و خەڵکیتر لە بری ئەوانەوە چاکە نەکەن، لەکاتێکا بارودۆخ ڕێگایان نادات بەم چاکەیە هەڵسن، بەم جۆرە خێرەکە هەر بە نێژراوی دەمێنێتەوە، چاکەکاری و بەرژەوەندییەکە پەکی دەخرێ، وە کۆمەڵگەش بێبەش دەبێ لەو خێرەی لە مێشکی هەندێ کەسە و دەیشارێتەوە و لێی بێ دەنگ دەبێ تا بواری بە ئەنجامگەیاندنی بۆ دەرەخسێ، لەوانەشە ئەم دەرفەتە هەر نەیەتە پێش و، تەمەنیش کۆتایی پێ بێت، بەم جۆرە ئەو خێرە لە بەندی مێشکە تاریکەکان دەمێنێتەوە. موسڵمانانیش بە پیاو و ئافرەتیانەوە ئەوانەی بە نیازی پاداشتی خوایین دوورن لەم بەڵایانە، هەر دەرفەتی خێرێك بێتە پێش یەکسەر بە خەڵکی ڕادەگەیەنن، پاداشتی خۆشیان دەست دەکەوێت وەك ئەو کەسەی خێرەکەی ئەنجامداوە.

### فێڵ و تەڵەکە و ناپاکی ناکات

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ کە ئاشنایەتی کردووە لەگەڵ ڕاستی، بۆتە یەکێ لە ئاکارەکانی، هەرگیز فێڵ و تەڵەکە و ناپاکی لەگەڵ خەڵکی ناکات" چونکە ئاکاری دەروون نزمەکانە، پێچەوانەی ڕاستگۆییە" چونکە ڕاستگۆیی دەبێ دڵسۆزی و دامەزراوی و ئەمەکداری و دانایی و دادپەروەری لەگەڵدا بێت، دوورە لە دووڕوویی و درۆ و فێڵ و تەڵەکە و ناپاکی.

خۆڕسکی ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ، کە تێراوبووە لە ڕێنمایی ئیسلامی بێگەرد ڕادەکات و بێزارە لەم ئاکارنە، لەم ئاکارە خراپانەدا نیشانەی داماڵینی لە بە ئەندامبوونی لە ئیسلام دەبینێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ لە دژمانا چەك هەڵگرێ لە ئێمە نییە و، هەرکەسێ فێڵمان لێ بکات لە ئێمە نییە)) مسلم ٢/١٨.

لە گێڕانەوەیەکیتری موسلم هاتووە: پێغەمبەر ﷺ بە لای هەندێ خۆراکی کۆکراوەی سەریەك تێپەڕی و دەستی خستە ناوی و لە پەنجەکانیەوە هەستی بە تەڕاتی کرد، فەرمووی: ((ئەوە چییە ئەی خاوەن خۆراك؟)) وتی: باران لێی داوە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((ئەی نەدەبووا لە سەرەوەی خۆراکەکەی دابنێی تا خەڵکی بیبینێ ئەوەی فێڵ بکات لە ئێمە نییە)) مسلم ٢/١٠٩.

کۆمەڵگەی موسڵمان دامەزراوە لەسەر پاکی هەستی مرۆڤایەتی و، لەسەر دڵسۆزی و ئامۆژگاری بۆ هەموو موسڵمانێك، وە بەجێگەیاندنی بەڵێن بەرامبەر هەرکەسێك بێت، وە ئەگەر کەسێکی ناپاك و تەڵەکەباز هەبوو، ئەوا دەبێتە نامۆ و ناکەسە لەناو کۆمەڵگە و تاکەکانی، پەناگیرە لە ئاکار و ڕەفتارە بەرز و جوانەکانیان.

ئیسلام فێڵ و تەڵەکە و ناپاکی لە تاوانە گەورەکان هەژمارکردووە کە لە دونیادا خاوەنەکەی ڕیسوا دەکات، لە ڕۆژی دواییش ڕووی ڕەش دەبێت، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە: ((بۆ هەر ناپاکێك و ستەمکارێك لە ڕۆژی دوایی ئاڵایەك هەیە، دەوترێ: ئەمە ناپاکی و ستەمی فلانە کەسە)) متفق علیه.

ئای لە شەرمەزاری و ڕیسوایی ناپاکان، ئەوانەی وایاندەزانی ڕۆژگار ناپاکیەکەیانی پێچاوەتەوە، کەچی لە ڕۆژی دوایی لە سەرووی هەموو خەڵکەوە دیار دەبن و بەیداخی ناپاکیەکەیان بە دەستیانەوەیە.

ئنجا ئەو جۆرانە لەو ڕۆژی دوایی زیاتر سەرشۆڕ و شەرمەزار دەبن، کاتێ خوای گەورە بە خۆی دێتە بەرامبەریان و لە دژیان دەوەستێ، وەك هاتووە لە فەرمووودەی قودسی، خوای گەورە دەفەرمووێ: سێ کەس خۆم لە دژیان دەوەستم لە ڕۆژی قیامەت: پیاوێك بە ناوی من دەدات و پاشان ناپاکی دەکات، وە پیاوێك کەسێکی ئازادی فرۆشتووە و نرخەکەی خواردووە، وە پیاوێك کرێکارێکی بە کرێ گرتووە و کاری بۆ تەواوکردووە کەچی کرێکەی پێنەداوە)) فتح الباری ٤١٧/٤.

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ دووردەکەوێتەوە لە هەموو شێوە و ڕواڵەتەکانی ئەم جۆرە خورەوشتانە، کە ئێستا گەلێ زۆرن لە جیهانی ئافرەتانی سەردەم، وە ڕازی نابێت بچێتە ڕیزی منافقان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((چوار خورەوشت لە هەرکەسێ دابن دەبێتە منافقێکی تەواو و پوخت، وە ئەوەی یەك خورەوشتی لەم چوارە تیابێ ئەوا خورەوشتێکی لە نیفاق (دووڕوویی) هەیە تا وازی لێ دەهێنێ: کاتێ بە ئەمین و دەست پاك دادەنرێ ناپاکی دەکات، کاتێ قسە بکات

درۆ دەکات، وە کاتێ بەڵێن بدات نایباتە سەر و ناپاکی دەکات، وە کاتێ نەیار بێ لەگەڵ کەسێك خراپە و ناڕاستی دەکات)) متفق علیە.

**بەڵێنی دەباتەسەر**

یەکێ لە ئاکارە جوان و بەرزەکانی ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ: بەڵێن بردنە سەرە" چونکە ئەم ئاکارە هاودەمی ڕاستگۆییە و یەکێکە لە بەرهەم و ئەنجامەکانی، خورەوشتێکی پەسندە و بەڵگەیە لەسەر بەرزی ئەو ئافرەتەی خۆی پێ دەرازێنێتەوە، وە کۆمەکی دەکات بۆ سەرکەوتن لە ژیانیدا، بەهۆیەوە خۆشەویستی و ڕێزی خەڵکی دەست دەکەوێت.

بەڵگە نەویستە کە بەڵێن بردنەسەر کایگەری هەیە لەسەر ڕواندنی خورەوشتە جوان و ناوازەکانی کوڕان کچان کاتێ دەبینن دایکانیان بەم خورەوشتە ڕازاونەتەوە، بەهۆیەوە دەبنە نمونە و سەرمەشقێکی باش بۆیان.

بەڵێن بردنەسەر لەلای ئافرەتی موسڵمان تەنها ئاکارێکی کۆمەڵایەتی نییە، تاوەکوو لە نێو هاوڕێیان و دەستەخوشکانی خۆی پێدەرخا، بەڵکو بەڵێن بردنەسەر خورەوشتێکی ڕەسەنی ئیسلامیيە، لە هەموو خورەوشتەکانیتر زیاتر بەڵگەیە لەسەر دروستی باوەڕ و ڕاستی ئیسلامەتی. لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَوفُواْ بَالعُقُودِ. واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەمەکداربن بەرامبەر بە بەڵێنەکانتان و بیانبەنە سەر﴾ المائدە: ١.

هەروا دەفەرمووێ: ﴿وَأَوفَواْ بِالعَهدِ إِنَّ العَهدَ كَانَ مَسئُولاً. واتا: پەیمانەکانتان ببەنەسەر چونکە خوای گەورە لێپرسینەوە دەکات لەگەڵ پەیمان هەڵوەشێنان﴾ الاسراء :٣٤.

ئەمە فەرمانێکی خوایی یەکالاکەرەوەیە بۆ بەندە باوەڕدارەکانی بە هەڵنەوەشاندنەوەی بەڵێن و پەیمانەکانیان و هەروا بردنە سەری پێداویستییەکانی ئەم بەڵێنە بەکردار، کە هیچ بوارێك نییە بۆ خۆدەربازکردن لێی" چونکە ناگونجێ بۆ موسڵمانان کاتێ بەڵێنێکیاندا خۆیانی لێ بدزنەوە، بەڵکو پێویستە بە جوانترین شێوە بیبەنە سەر.

ئیسلام ڕقی دەبێتەوە لە بەدگۆیان و نائەمەکان بەرامبەر بە بەڵێن و ئەوانەی (قەولی و بەلی)ین بەبێ ئەوەی کرداری هەبێت یان بەڵێنەکەی بباتەسەر، خودا دەفەرمووێ: ﴿یَآأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لاَ تَفعَلُون. کَبُرَ مَقتًا أن تَقُولُواْ مَا لاَ تَفعَلُون. واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی ئەوەی دەیڵێن بە کردار نایسەلمێنن، لەلای خوای گەورە گوناهێکی گەورەیە کە قسە بکەن و بە کردار نەیسەلمێنن﴾ الصف: ٢، ٣.

خودا ڕازی نییە بۆ بەندە باوەڕدارەکانی چ پیاو چ ئافرەت دابەزێتە ئەو ئاستە نزمەی بەدگۆیی و بەڵێن نەبردنە سەر و شکاندنی پەیمان و پابەند نەبوون بە بەڵێنەکانیان" چونکە ئەمە شیاوی باوەڕدار نییە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((نیشانەی دووڕوو سێ خوڕەوشتە: کاتێ قسە دەکات درۆ دەکات، وە کاتێ بەڵێن بدات نایباتە سەر، وە کاتێ بە دەست پاك دابنرێ ناپاکی دەکات)) متفق علیه. لە گێڕانەوەیەکیتری مسلم هاتووە: ((ئەگەرچی ڕۆژوو بگرێ و نوێژ بکات و بانگەشەی موسڵمانەتی بکات)) مسلم ٢/٤٨.

چاکی ئیسلامەتی ئافرەتی موسڵمان تەنها لە ئەنجامدانی پەرستشتەکان نییە، بەڵکو بە ئاوێتەبوونی دەروونیەتی لەگەڵ یاسا و خوڕەوشتە بەرز و بنەما بڵندەکانی ئیسلامیەوەیە، بەجۆرێك هەرچی خودا پێی ڕازی نەبێت لێی ڕوو نادات، نە بەڵێن شکاندن، نە فێڵ کردن لە مامەڵە، نە ناپاکی لە پەیمان و گرێ بەستە" چونکە ئەمانە هەموی پێچەوانەی خوڕەوشتی ئیسلام و موسڵمانانە، تەنها لە ڕەفتاری دووڕوواندا هەیە.

دەی ئەو ئافرەتانەی درۆ لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن با ئەو ڕاستییە بزانن، کاتێ بەڵێنیان پێ دەدەن و پاشان نایبەنە سەر، بەهۆیەوە تۆوی درۆ و بەڵێن شکاندن لە دەروونیان دەڕوێنن، وە با بشزانن بەم کردارەیان دەچنە ڕیزی منافقان، سزای منافقانیش وەك زانراوە ژێری ژێرەوەی ئاگری دۆزەخە.

## دوورەپەرێزە لە دووڕوویی

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ و تێگەیشتوو ڕاشکاو و ڕوونە لە گوفتار و بڕیارەکانی، دوورە لە دووڕوویی و ڕووپامایی و ستایشکردنی ناڕاست" چونکە دەزانێ دووڕوویی یاساغە لە ئاینەکەی، وە شیاوی کەسایەتی ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ نییە.

سەیری پێغەمبەر ﷺ بکە کاتێ بەرەی عامر هاتنە لای و ستایشیان کرد و وتیان: تۆ گەورەی ئێمەی، فەرمووی: ((گەورە هەر الله یە)) وتیان: لە هەموومان پایەدارتری و، لە هەموومان دەستەلاتدارتری و بە تواناتری، فەرمووی: ((دەی ئەو قسانەتان یا هەندێ لەو قسانەتان بکەن، بەلاّم باشتر وایە نەبنە بریکاری شەیتان و لە جیاتی ئەو قسە بکەن، من نامەوێ لەو شوێن و پلەوپایەی خودا دایناوم بەرزترم بکەن، من محمدی کوڕی عبداللە م، بەندە و نێردراوی خوام))[1].

بەم وتەیە پێغەمبەر ﷺ ڕێگای لەو کەسانە بڕی کە بەسەر خەڵکیدا هەڵدەڵێن و لەکاتێکا هەندێکیان شایەنی ئەو جۆرە ستایشە نین، وێڕای ئەوەی بێگومان پێغەمبەر ﷺ گەورەی پێغەمبەرانە و گەورە و باشترینی موسڵمانانە، بەلاّم دەیزانی کاتێ دەروازەی پیاهەڵنان کرایەوە سەردەکێشێ بۆ ترسناکی خزانە ناو نیفاق و دووڕوویی، کە ناوەڕۆکی ئیسلامی بێگەرد و خاوێن پێی ڕازی نییە، ئەو ڕاستیەش نایگرێتە خۆی کە ئەم ئاینەی لەسەر دامەزراوە، هەروا پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی قەدەغە دەکرد لە پیاهەڵنان لە ڕووی مرۆڤ، نەبادا سەربکێشێ بۆ دووڕوویی و پیاهەڵنراویش دوچاری فیز و لووت بەرزی و شاگەشکەیی خۆی بێت، بخاري و مسلم لە أبي بەکرە ﷺ دەگێڕنەوە: پیاوێك لەلای پێغەمبەر ﷺ ڕووبەڕوو ستایشی پیاوێکیتری کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تیاچیت! لە گەردنی براکەتدا، لە گەردنی براکەتدا، چەندجار ئەمەی دوبارەکردەوە)) پاشان فەرمووی: ((ئەگەر هەر ویستتان ستایشی براکەتان بکەن، با بڵێ: من وای دەبینم، خوداش خۆی خاوەنیەتی و ئەو دەزانێ هەڵیبسەنگێنێ، وە من کەس لەسەر خوا چاك و پاك

---

[1] حياة الصحابة: ٣/٩٩.

ناکەم، واتێ دەگەم ئەو کابرایە فلاّنە شت و فیسارە شت بزانێ)) فتح الباری ٤٧٦/١٠ ومسلم ١٢٦/١٨.

جا ئەگەر ناچاربووی کەسێك ستایش بکەی، با ستایشەکەت ڕاستگۆ بێت و بگونجێ لەگەڵ ڕاستی پیاهەڵنراو، وە پێویستە مام ناوەندی بێت و زیادەڕۆیی تیانەبێت، تەنها بەمە کۆمەڵگە لە دووڕوویی و ڕووپامایی و خۆهەڵنان خاوێن دەبێتەوە.

بخاری لە الادب المفرد لە رەجائەوە لە میحجەن الاسلەمی ﷺ هاتووە، پێغەمبەر ﷺ و میحجەن لە مزگەوت دەبن، پێغەمبەریش ﷺ پیاوێك دەبینی نوێژ دەکات و کڕنوش دەبات و دەچەمێتەوە، فەرمووی: ((ئەمە کێیە؟)) میحجەن دەستی کرد بە پێداهەڵگوتنی، دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە فلاّنە کەسە ئاوایە و ئاوایە، فەرمووی: ((زمانت بگرە با نەیبسێ و بەهۆیەوە تیابچێت!)) الادب المفرد ٤٣٣/١.

لە گێڕانەوەی احمد هاتووە، ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە فلاّنە کەسە لە باشترین خەڵکی مەدینەیە، یان وتی: لە هەموو خەڵکی زیاتر نوێژ دەکات، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((با نەیبیسێ، نەبادا بەهۆیەوە تیابچێت، دووجار یان سێ جار ئەمەی دووبارەکردەوە، پاشان فەرمووی: ((ئێوە نەتەوەیەکن خودا ئاسانکاری بۆتان ویستووە)) احمد ٣٢/٥.

پێغەمبەر ﷺ بیستنی ستایش و پیاهەڵنانی بە تیاچوون ناوبردووە بەهۆی بوونی شوێنەواری خراپ و قووڵی لەسەر دەروونی مرۆڤایەتی کە حەز دەکات لە بیستنی ستایش، بەهۆیەوە پیاهەڵنراو سەری لێدەشێوێ، لووت بەرز دەبێت، ڕووی لە خەڵکی وەردەگێڕێ، وە ئەگەر ئەم پیاهەڵنانە لەلایەن دووڕوان و درۆزنان و تەڵەکەبازان دووبارەبوویەوە بەڕووی ـ کە ئەمڕۆ ئەو جۆرانە چەندە زۆرن لە دەوروبەری بەرپرسان و خاوەن دەسەلاّت و پۆستەکان ـ ئەوا دەبێتە شتێکی ئاسایی و باو لەلای و ویستی ئارەزووی دەروونی جێبەجێ دەکات، دواتر ڕقی لە بیستنی ئامۆژگاری و ڕەخنە دەبێتەوە، وە بێجگە لە ستایش و پیاهەڵنان و زیادەڕۆیی و گوڵاوپڕژێن کردن هیچیتر وەرناگرێ و پێی ڕازی نابێت، ئنجا لەپاش ئەمەش سەیرنییە حەق و ڕاستی لەناو بچێت، دادپەروەری بکوژرێت، چاکەکاری زیندەبەچاڵ بکرێ، کۆمەڵگەش گەندەڵ بێت.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەکرد بە هاوەڵانی کە خۆڵ بپرژێننە ڕوخساری ئەوانەی بەسەر خەڵکیدا هەڵدەڵێن، نەبادا لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی ژمارەیان زۆربێت، بەهۆیەوە دووڕوویی بڵاوبێتەوە و بەڵاکان هەموو لایەك بگرێتەوە.

لە نافع ﷺ و هیتریش: پیاوێك بە ابن عمر ﷺ وتی: ئەی باشترینی خەڵك، یان وتی: ئەی کوڕی باشترینی خەڵك! ابن عمر وتی: نە من باشترینی خەڵکم و نە کوڕی باشترینی خەڵکم، بەڵکو من بەندەیەکم لە بەندەکانی خوا، ئومێدم بە میهری خوا هەیە و لە سزاشی دەترسم، سوێند بەخوا ئاوەها هەمیشە ستایشی پیاو دەکەن پێی داهەڵدەڵێن تا لەناوی دەبەن[1].

هاوەڵان باش تێگەیشتبوون لە تێبینییە وردەکەی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە ڕێنمایی کردنیان بۆ کاروکردەوەکان و سەلامەتی بوون لە دووڕوویی، کەسانێك بە ابن عمر ﷺ یان وت: ئێمە دەچینە لای دەسەڵاتدارەکانمان، ئەو قسانەی لەبەردەمیان دەیلێین پێچەوانەی ئەو قسانەیە کاتێ لەلایان دێینە دەرەوە، ابن عمر وتی: (ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ئەوەمان بە نیفاق و دووڕوویی دادەنا) فتح الباری ١٣/١٧٠.

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆش هێندەی لە ئاینەکەی فێربووە تا پەنای بدات لە خزانە ناو دووڕوویی ترسناك کە زۆر لە ئافرەتانی ئەو سەردەمە دەخزێنە ناوی، کە وا دەزانن سنوری زمان شیرینیان تێنەپەڕاندووە، ناشزانن هەندێ جار زمان شیرینی یاساغە و بەرەو قوڵایی نیفاق دەیانبات و هەستیش ناکەن" چونکە بەهۆیەوە لە دەرخستنی حەق و ڕاستی بێ دەنگ دەبن، یان ستایشی کەسانێك دەکەن کە شایستەی ئەو پیاهەڵنانە نین.

**خاوەنی حەیا و شەرمە:**

بێگومان یەکێ لە خۆڕسکەکانی ئافرەت شەرمە، ئەو شەرمەم مەبەستە کە زاناکان پێناسەیان کردووە: بریتییە لە خوڕەوشتێکی بەرز و هەمیشە هۆکارێکە بۆ وازهێنان لە خراپە و دوورکەوتنەوە لە کەمتەرخەمی بەرامبەر خاوەن مافەکان، پێغەمبەریش ﷺ نمونەی هەرە بەرزی

---

[1] حیاة الصحابة ٣/١٠٣.

شەرم و حەیابوو، ابو سعید الخدری ﷺ وتی: (پێغەمبەر ﷺ زۆر بە شەرم و حەیاتربوو لە کچی ناو کەژاوە، ئەگەریش شتێکی پێ ناخۆش بووایە لە ڕوخساری دەمانزانی) متفق علیە.

ابن عمران بن حصین ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموووی: ((شەرم هەموو کات بە خێر و چاکە دێت)) متفق علیە.

لە گێڕانەوەی مسلم هاتووە: ((شەرم و حەیا سەرتاپای خێر و چاکەیە، یا فەرموووی: ((شەرم و حەیا هەر هەمووی خێر و چاکەیە)) مسلم ٧/٢.

ابو هریرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموووی: ((ئیمان حەفتا و هەندێك بەشە، یان شەست و هەندێك بەشە، باشترینی وتەی لااله الا الله یە، و نزمترینی لابردنی ئازارە لەسەر ڕێگا، شەرم و حەیاش بەشێکە لە ئیمان)) متفق علیە.

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆی پارێزکار بە شەرم و حەیا و ڕەوشت جوان و هەست ناسکە، هیچ گوفتار و کردارێکی لێ ڕوونادات خەڵکی ئازاربدات، یا گەورەییان بریندار بکات" چونکە شەرم و حەیاکەی کە ڕیشەی داکوتاوە لە ئاوگڵە شکۆدارەکەی بەهۆی تێگەیشتنی لە شەرم و حەیای ئیسلامی پەنای دەدات لە هەرچی سەرپێچی شەرعی هەیە. بە دووری دەگرێت لە هەر لاریەك لە مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی، نەك تەنها لەبەر شەرم و حەیا، بەڵکو لەبەر شەرمی خوا و لەبەرئەوەی نایەوێت ستەمێك ئاوێتەی باوەڕەکەی بێت" چونکە شەرم و حەیا بەشێکە لە باوەڕ، ئەمەش بەرزترین پلەیە ئافرەت پێی گەیشتبێ لە دەستگرتنی بە شەرم و حەیا، لێرەوە جیاوازی ئافرەتی موسڵمانی خاوەن شەرم و ئابڕو بەدیاردەکەوێ لەگەڵ ئافرەتی ڕۆژئاوایی کە داماڵڕاوە لە هەرچی پەردەی شەرمە.

## پاکیزە و جوامێرە

یەکێ لەو ڕەفتارانەی ئافرەتی موسڵمانی پێ جیادەکرێتەوە: پاکیزەیی و جوامێرییە، کاتێ دوچاری تەنگی وز هەژاری دەبێتەوەئارام دەگرێ، و دەست دەگرێ بە پاکیزەیی و جوامێری و، زیاتر هەوڵدەدات بۆ دەربازبوون لەو نالەبارییەی بە دەستیەوە دەناڵێنێ، وە هەرگیز بیر لە سواڵ و

داواکردن ناکاتەوە" چونکە ئیسلام ڕازی نییە ئافرەتی موسلمای ڕاستگۆ خۆی بخاتە ئەو جۆرە هەڵوێستانەوە، شکۆدارییە بۆی ئەگەر پاکیزەیی خۆی بپارێزێت و بێ نیاز بێت و ئارامبگرێت، ئەو کاتەش خودا کۆمەکی دەکات و چەسپاوی دەکات لەسەر ئارامگرتن و بێنیازی و پاکیزەیی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ دامێنی خۆی پاك ڕاگرێ خودا پاکی دەکاتەوە، وە هەرکەسێ بێ نیازی بنوێنێ لەوەی لەلای خەڵکە خودا دەوڵەمەندی دەکات، وە هەرکەسێ خۆی بگرێ خودا ئارامی پێ دەگرێ، وە هیچ بەخششێك ئەوەندەی ئارامگرتن خێرتر و فراوانتر نییە کە درابێ بە کەسێك)) متفق علیه.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بە ڕێنمایی ئاینەکەی دەزانێ کە ئیسلام لە ماڵی دەوڵەمەندان مافی هەژارانی داناوە، بەبێ هیچ چاوبەرەوژێری و منەتێباریەك دەتوانێ وەریبگرێ، لە هەمان کاتدا دەیەوێت هەژاران هەتا لەو مافەش بێنیاز بن، وە دەربخست کە دەستی باڵا چاکترە لە دەستی ژێرەوە، وە لەسەر موسڵمانان پێویستە چ پیاو چ ئافرەت دەستی ژێرەوە نەبن" چونکە ئەمە بۆیان شیاوتر و ڕێزدارترە، ئەمەش پاڵنەرێکە بۆ کەم دەرامەتان تا زیاتر هەوڵدەن و پاڵنەدەنە بەخشین و صەدەقە و خێرو هەرواش پاراستنی ڕوو و ئابڕو و ڕێزداری مرۆڤی تیایە، نەبادا ڕۆژێك دوچاری ئازار و ئەزیەتێك ببنەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((دەستی باڵا خێرترە لە دەستی ژێرەوە، دەستی باڵا ئەو دەستەیە کە دەبەخشێ، دەستی ژێرەوەش ئەو دەستەیە کە وەردەگرێ و داوا دەکات)) مسلم ١٢٤/٧.

### تێکەڵی کارێک نابێت پەیوەندی بەوەوە نەبێت

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر ژیر و زیرەکە، تێکەڵی کارێك نابێت پەیوەندی بەو نەبێت، چاونابڕێتە دەوروبەری بۆ ئەوەی لە تایبەتمەندییەکانیان بکۆڵێتەوە، هەروا خۆی هەڵناقورتێتە ناو کارێك پەیوەندی بە کەسانیتر هەیە چ نزیك چ دوور، کە لەوانەیە بە گوناە و سەرزەنشت بشکێتەوە سەری. کاتێ خۆی دووردەگرێ لەم خوڕەوشتانە و لە بەدگۆیی و قسەی پڕوپوچ، ئەوا دەستی گرتووە بە خوڕەوشتی ڕەسەنی ئاینەکەی کە مرۆڤی بەرزکردۆتەوە لە گوفتار و کرداری پڕوپوچ و، بەهاڕەوشتەکانی پێ بەخشیوە، وە ڕێنمایی باشترین ڕێگا و شێوازی کرد لە مامەڵەی

لەگەڵ خەڵك، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((لە نیشانەکانی چاکی و جوانی ئیسلامەتی مرۆڤ وازهێنانیەتی لەوەی پەیوەندی بەوەوە نییە)) الترمذي ٣٩٢/٣ وابن ماجة ١٣١٦/٢.

ابو هريرە ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((خودا بۆ ئێوە بە سێ شت ڕازییە و بە سێ شتیش ڕازی نییە، ڕازییە بۆ ئێوە: بیپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەن، وە هەمووتان دەستگرن بە پەتی خوا و، پەرت و بڵاو و ناکۆك نەبن. وە بۆ ئێوە ڕازی نییە: بەدوای قسە و قسەڵۆك بکەون، وە زۆر پرسیار و سواڵکردن، هەروا بە فیڕۆدانی ماڵ)) مسلم ١٠/١٢.

کۆمەڵگەی خوایی دامەزراو لەسەر بناغەی ئیسلامەتی، هیچ بوارێکی نییە بۆ قسە و قسەڵۆك و پرسیار و سواڵکردن و خۆهەڵقوڕتاندنە ناو کاروباری تایبەتی خەڵك" چونکە تاکەکانی بە شتی گەورەتر و گرنگتر سەرقاڵن، سەرقاڵن بە گەیاندنی پەیامەککەیان لە ژیان، هەریەکەو لە شوێنی خۆی و بازنەی تایبەتمەنییەکەی، بەجۆرێك هەوڵی هەر هەموویان بڕژێتە ناو بەجێگەیاندنی وشەی خوا لەسەر زەوی و بڵاوکرنەوەی بنەماکانی ئیسلام لەناو خەڵك، وە ئەوانەی هەڵدەستن بەو کارە مەزنانە، دەرفەتیان نییە بۆ چوونە ناو ئەو جۆرە گوناهانە.

### دوورە پەرێزە لە باسکردنی ئابڕوی خەڵک و شوێنکەوتنی عەیبەکانیان

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار زمانی پاك ڕادەگرێ لە شوێنکەوتنی عەیبی خەڵکی و باسکردنی ئابڕویان، وە پێی خۆش نییە ئەو جۆرە گفتوگۆیانە لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی بڵاوبێتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أن تَشِيعَ الفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُواْ لَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ في الدُّنيَا والآخِرَةِ.... واتا: ئەوانەی پێیان خۆشە خراپەکاری و بێ ئابڕوویی لە نێوان باوەڕداران بڵاوبێتەوە سزایەکی بە سۆیان بۆ هەیە لە دونیا و لە دوارۆژدا...﴾ النور: ١٩.

عەلی بن ابی طالب ﷺ دەڵێ: (ئەوەی بە کردار و گوفتار خراپە و بێئابڕوویی دەکا لەگەڵ ئەوەی بڵاوی دەکاتەوە لە گوناها وەکوو یەکن) البخاري في الادب المفرد ٤١٩/١.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بە ئاینەکەی دەزانێ لایەنی لاوازی مرۆڤایەتی لەلایەن هەندێ لە ئافرەتانی کەمتەرخەم بە شوێنکەوتنی و ئاشکراکردنی عەیبەکان و بڵاوکردنەوەی لەسەر زمانی

کۆمەڵگەوە چارەسەر نابێت، بەڵکو بە ئامۆژگاری جوان و ڕازاندنەوەی گوێڕایەڵی بوون بۆ خودا و، قێزەوەن کردنی سەرپێچی لە دەروونیان چارەسەر دەبێت، بەدەر لە هەرچی بریندارکردن و ڕووبەڕووبوونەوە و ڕووشکاندنێك" چونکە بە گوفتاری شیرین و ئامۆژگاری چاك و جوان لەکاتی چرپاندنی حەق و ڕاستییەکان بە گوێچکەکاندا کلیلی دڵەکان دەبێتەوە و، دەروونەکان ڕام دەبن، ئەندامەکان ملکەچ دەبن، بۆیە خوای گەورە موسڵمانانی قەدەغەکردووە لە سیخوڕی و شوێنکەوتنی عەیبی خەڵك، کە دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ تَجَسَّسُواْ. واتا: سیخوڕی مەککەن و شوێنی عەیبی یەکتر مەککەون﴾ الحجرات: ١٢.

چونکە ئاشکراکردنی کەم و کورتی گوناهباران و، شوێنکەوتنی عەیبەکانیان و، سیخوڕیکردن لەسەریان و، باسکرنیان، تەنها بە زیان بۆ ئەوان ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئازاری هەموو کۆمەڵگە دەدات" بۆیە خوای گەورە بەتوندی هەڕەشە لەوانە دەکات کە حەز دەکەن بێئابڕوویی لەناو کۆمەڵگە بڵاوبێتەوە" چونکە هەر کاتێ خراپەکاری لەناو کۆمەڵگە بڵاوبوویەوە و باسکردنی ئابڕوی خەڵکی تیا زۆر بوو، پڕوپاگەندە و گومانی تیا تەشەنەکرد، مسۆگەر دوچاری بەڵای لادان لە ڕێگای ڕاست دەبن، گوناهکردنیش کاریگەری نابێت لەسەر دەروونیان و، پەیوەندی برایەتی دەپچڕێ، دوژمنایەتی و ڕق و کینە و گەندەڵی لە نێو تاکەکان بەرپا دەبێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەگەر بە شوێن عەیبی موسڵمانان بکەویت خراپ و گەندەڵیان دەکەیت، یا خەریکە خراپ و گەندەڵیان بکەیت)) ابو داود ٣٧٥/٤.

هەروا دەفەرمووێ: ((بەندەکانی خوا ئازار مەدەن، عەیبداریان مەککەن، شوێنی کەم و کورتیەکانیان مەککەون" چونکە هەرکەسێ شوێنی عەیبی برای موسڵمانی بکەوێت، خودا شوێن عەیبی ئەو دەکەوێ و ئابڕوی دەبات ئەگەر لەناو ماڵی خۆشی بێت)) احمد ٢٧٩/٥.

پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵی دەئێشا بە دەست خاوەن گومانی خراپ و زمان درێژی لەسەر ئابڕو و ناموسی خولك، دەروونی پاکی هەڵدەچوو کاتێ شتێکی لەم بابەتە پێ دەگەیشتەوە، ابن عباس ﷺ ئەم هەڵچوونەی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ وێنا دەکات لەسەر ئەو جۆرە کەسانە، دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ وتارێکی خوێندەوە بە جۆرێك کچانی ناو کەژاوەش گوێبیستی بوون، فەرموووی:

((ئەی ئەوانەی بە زمان باوەڕتان هێناوە و هێشتا نەچۆتە ناخی دڵتان، باوەڕداران ئازار مەدەن و، شوێن عەیب و ئابڕوویان مەککەون" چونکە هەرکەسێ شوێن عەیب و ئابڕوی برای موسڵمانی بکەوێت، خودا شوێنی عەیبی دەکەوێت، وە هەرکەسێ خودا شوێنی عەیبی بکەوێت ئابڕوی دەبات، ئەگەر لەناو ماڵی خۆشی بێت)) الطبراني (مجمع الزوائد ٩٤/٨).

## دووره له ڕیا (ڕووپامایی)

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو و دانا ناخزێتە ناو گۆماوی ڕیا و ڕووپامایی و لە خۆبایی بوون و خۆهەڵکێشان" چونکە شارەزایی بوونی لە ئاینەکەی دەیپارێزێ، وە لەبەرئەوەی دەزانێ کرۆکی ئەم ئاینە دڵسۆزییە بۆ خوا لە کردار و گوفتار، وە هەر شوێنەوارێکی ڕیا هەبێت پاداشتەکان پوچەڵ دەکەنەوە و کردەوەکان بەفیڕۆ دەدەن، دەبێتە مایەی شەرمەزاری و ڕیسوایی بۆ خاوەنەکەی لە ڕۆژی دوایی" چونکە ئامانج لە دروستکردنی مرۆڤ و پەری تەنها پەرستنە بۆ خوا، خودا دەفەرمووێ: ﴿وَمَا خَلَقتُ الجِنَّ وَالإِنسَ إلاَّ لِيَعبُدُون﴾ پێشتر ڕاڤەکراوە.

ئەم پەرستشە بەتەواوی لەلایەن خواوە وەرناگیرێ ئەگەر بە پاکی و پوختی بۆ خوا نەبێت، وەك دەفەرمووێ: ﴿وَمَا أُمِرُواْ إلاَّ لِيَعبُدُواْ اللهَ مُخلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَآءَ. واتا: فەرمانیان پێکرا بوو تەنها الله بپەرستن و هاوڵی بۆ بڕیارنەدەن بە دڵسۆزی ئاینەکەی پیادە بکەن و مەیل و ئارەزووو نەکەن بۆ ئاین و ڕێبازیتر﴾ البينه: ٥.

هەرکاتێك کردەوەی ئافرەتی موسڵمان لەکەدار بوو بە ڕیا و حەزی خۆدەرخستن و ناوبانگ، یان سوپاسکردن و پیاهەڵگوتن، ئەوا کردەوەکان بە فیڕۆ دەچن، پاداشتەکەی پوچەڵ دەبێتەوە، خودا دەفەرمووێ: ﴿ يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالمَنِّ وَالأَذَى كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَاءَ النَّاسِ وَلاَ يُؤمِنُ بَاللهِ واليَومِ الآخِرِ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفوَانٍ عَلَيهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلداً لاَ يَقدِروون عَلَى شَيءٍ مِمَّا كَسَبُواْ وَاللهُ لاَ يَهدِي القَومَ الكَافِرِين. واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خێر و بەخشینەکانتان پوچەڵ مەککەنەوە بەهۆی منەتکردن و ئازاردانی هەژار، وە ئەو کەسەی بۆ ڕیا و ڕووپامایی ماڵی دەبەخشێ و باوەڕیشی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی نییە نمونەی ئەوە وەك بەردێکی لوس وایە هەندێ خاکی لەسەرە، کاتێ بارانی لێ دەدات تەنها بەردێکی ڕەق دەمێنێتەوە، هەرچی

کردوویانه بە فیڕۆ دەچێت و توانایان بەسەر هیچ شتێکدا نییە، وە الله ڕێنمایی کۆمەڵی بێ باوەڕان ناکات﴾ البقرە: ٢٦٤.

دەبینین لە کۆتایی ئایەتەکە توندی هەڕەشەکە دەگاتە ئەو ڕادەیەی ئەو جۆرانە شیاوی ڕێنمایی خوا نەبن و لە ڕیزی بێ باوەڕان هەژماردەکرێن" چونکە کاری ئەوانە تەنها خۆدەرخستن بووە لەبەرچاوی خەڵك بە کردەوەی چاك، غەمی ڕەزامەندی خوایان نەبووە، وەك دەفەرمووێ: ﴿یُرَاؤُنَ النَّاسَ وَلاَ یَذکُرُونَ اللهَ إِلاَّ قَلِیلاً. واتا: لەبەرچاوی خەڵك خۆ دەردەخەن بە کردەوەی چاکە، کەچی زۆر کەم یادی خوا دەکەنەوە﴾ النساء: ١٤٢.

لێرەوە کردەوەکانیان بەسەریان دادەدرێتەوە" چونکە لەگەڵ خوا شتیتریان کردۆتە هاوبەش، خوداش هەموو کردەوەیەکی بە پوختی تەنها بۆ خۆی دەوێت، ابو هریرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمووو: ((خودا فەرموویەتی: من لە هەموو هاوبەشێك بێنیازترم لە شیرك و هاوەڵ بۆ بڕیاردان، هەرکەسێ کردەوەیەك بکات و کەسێکیترم لەگەڵ بکاتە هاوبەش، ئەوا دەیسپێرمە هاوبەشەکەی)) واتا: لێی وەرناگرم.

ئافرەتی موسڵمانی ڕووناکبیر بە ئاینەکەی وریایە لە کەوتنەناو ڕیا لە کردەوە چاکەکانی کە زۆرێك لەو ئافرەتانەی لە چوارچێوەی بازنەی خێر و چاکە کاردەکەن تێی دەکەون بێ ئەوەی هەست بکەن، کە دەبینی هەندێ جار دەست دەکەن بە ئاماژەکردن بە کاروچالاکیەکان و ناوهێنان و باسکردنیان لە بۆنەکان، لێرەوە ترازانی گەورە ڕوودەدات، ابو هریرە ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((یەکەم کەس لە ڕۆژی قیامەت دادگەری لەگەڵ دەکرێت پیاوێکە شەهیدبووە و دەهێنرێ، خودا بەخششەکانی خۆی دێنێتەوە یاد و ئەمیش دانیان پێدا دەنێ، خودا دەفەرمووێ: دەی چیت بەو بەخششانە کرد؟ دەڵێ: لەپێناوت کوشتارم کرد و جەنگام تا شەهیدبووم، خودا دەفەرمووێ: درۆت کرد، بەڵام جەنگای تا بڵێن پیاوێکی ئازا و نەبەردە! دەی ئەوەش وترا، پاشان فەرمانی بۆ دەردەچێ و لەسەر ڕوو فڕێی دەدەنە ناو دۆزەخ. وە پیاوێکیش فێری زانیاری بووە و خەڵکیشی فێرکردووە، وە قورئانیشی خوێندووە، دەهێنرێت، خودا بەخششەکانی خۆی دێنێتەوە یاد و ئەمیش دانیان پێدا دەنێ، خودا دەفەرمووێ: دەی چیت بەو بەخششانە کرد؟ دەڵێ: فێری

زانیاری و زانست بووم و خەڵکیشم فێرکردووە و لەپێناوی تۆش قورئانم خوێندووە، خودا دەفەرمووێ: درۆت کرد، بەڵام فێری زانست و زانیاری بویت تا بڵێن: زانایە، قورئانت خوێند تا بڵێن: قورئان خوێنە! دەی ئەوەش وترا، پاشان فەرمانی بۆ دەردەچێ و لەسەر ڕوو فڕێی دەدەنە ناو دۆزەخ. وە پیاوێك خودا ماڵی زۆری پێداوە، لە هەموو جۆرەکانی ماڵ خودا پێی داوە، دەهێنرێ، خودا بەخششەکانی خۆی دێنێتەوە یاد و ئەمیش دانیان پێدا دەنێ، خودا دەفەرمووێ: دەی چیتکرد بەو بەخششانە؟ دەڵێ: هەر جێگا و کارێك تۆ پێت خۆشبووبێت کە بەخشین و خێری تیابکرێت، من لەو جێگا و کارە بەخشیومە لەپێناوی تۆ، خودا دەفەرمووێ: درۆت کرد، بەڵام ئەوەت کرد تا بڵێن: دەستبڵاو سەخی و خێرکەرە! دەی ئەمەش وترا، پاشان فەرمانی بۆ دەردەچێ و لەسەر ڕوو فڕێی دەدەنە ناو دۆزەخ)) مسلم ۱۳/۵۱.

هەروا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ کردەوەی ئاشکرا بکات بۆ خەڵکی بۆ ریا مسۆگەر خوای گەورە ئابڕووی دەبات لە ڕۆژی قیامەت، وە هەر کەسێ کاروکردەوەی دەرخات تا لەلایان پلەوپایەی بەرزبێت مسۆگەر خوای گەورە پەنهانیەکانی لەبەرچاوی هەموو دروستکراوان دەردەخات و پەردەیان لەسەر لادەبات)) متفق علیه.

**لە بڕیارەکانی دادپەروەرە**

**زۆرجار قەدەر ئافرەتی موسڵمان دەخاتە هەڵوێستێك داوای لێبکرێ ڕای خۆی یا بڕیارێك بدات، لێرەوە باوەڕی موسڵمان و تێگەیشتن و پارێزکاریەکەی دەردەکەوێ. جا ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو دادپەروەرانە بڕیاردەدات، ستەم ناکات، لایەنگیری ناکات، پاڵنادات ئارەزووو، وێڕای دژواری بارودۆخ" چونکە دەزانێ دادپەروەری و دوورکەوتنەوە لە ستەم کرۆکی ئاین و ناخەکەیەتی، وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ اللهَ يَأمُرُكُم أن تُؤَدُّواْ الأمَانَـاتِ إِلَـى أهلِهَـا وَإِذَا حَكَمتُم بَـينَ النَّـاسِ أن تَحكُمُـواْ بِالعَـدلِ. واتا: ﴿ خودا فەرمانتان پێدەکات بە گێڕانەوەی سپاردەکان بۆ لای خاوەنەکانیان وە ئەگەر دادتان کرد لە نێوانی خەڵکی بە یەکسانی و دادپەروەرانە داد بکەن ﴾ النساء :۵۸.**

ئەو دادپەروەرییەی بیری ئـافرەتی موسـڵمان تێیگەیـشتووە لـە ئاینەکـەی دادپەروەرییـەکی پوخـت و وردە، دۆسـتایەتی و ڕق هاوسـەنگیەکەی لار ناکاتـەوە، برادەرایـەتی و خزمایـەتی و نزیکایەتی کار لە بێگەردییەکەی ناکات، خودا دەفەرمووێ: ﴿يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلهِ شُهَدَآءَ بِالقِسطِ وَلاَ يَجرِمَنَّكُم شَنَئَانُ قَومٍ عَلَى أَن لاَ تَعدِلُواْ اعدِلُواْ هُوَ أَقرَبُ لِلتَّقوَى وَاتَّقُواْ اللهَ إِنَّ اللهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعمَلُونَ. واتا: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە بـۆ خـوا وەسـتاو و ئامـادەبن و گەواهیدەری دادپەروەرانە بن، وە ڕق و کینەی نێوان دوو هۆز و کۆمـەڵ ناچـارتان نـەکات لەسـەر ئەوەی دادپەروەر نەبن، دادپەروەر بن" چونکە دادپەروەری لە پارێزکاری نزیکترە، دەی خۆپارێز بـن و لە خوا بترسن، بەڕاستی الله شارەزا و زانایە بە کردەوەکانتان﴾ المائدە: ٨.

هەروا دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا قُلتُم فَاعدِلُواْ وَلَو كَانَ ذَا قُربَى. واتا: ئەگەر قسەتان کرد دادپەروەرانە بن ئەگەرچی بەرامبەر خزم و نزیکانیش بێت﴾ الانعام: ١٥٢.

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ نمونەی هەرە بەرزی هێنایەوە لە دادپـەروەری کاتـێ أسـامە کـوڕی زەیـد هاتە لای و بۆ ئافرەتێکی مەخزومیە کە دزی کردبوو تکـای لـەلای کـرد تـا دەسـتی نەبڕێتـەوە، پێغەمبەر ﷺ یش سووربوو لەسەر بڕینی دەستی و بە زەیدی فەرمووو: ((تکا دەکەی لە یەکێ لـە سنورەکانی خودا؟ سوێند بە خوا ئەگەر فاتیمەی کچی محمد دزی بکردایە دەستیم دەبـڕی)) متفـق علیه.

ئەمە ئەو دادپەروەرییە گشتی و ڕەهایەیە کە پیادە دەکرێ لەسـەر گـەورە و بـچوك، پاشـا و ژێردەست، موسڵمان و ناموسڵمان، هیچ کەسێك لە سزای رزگاری نابێت، ئەمەش ئەو جیاوازییـە لە نێوان دادپەروەری کۆمەڵگەی ئیسلامی و کۆمەڵگەکانیتر.

مێژوو وەستانی ئەمیری باوەڕداران (علی بن أبـی تالیـب ﷺ)مـان بـۆ دەگێڕێتـەوە لەبـەردەم دادوەر (قازی شورەیح) لەتەك جولەکەکەی نەیاری کە قەڵغانەکەی پێشەوا عەلی دزی بـوو، قـازی بۆ چەسپاندنی دادپەروەری ڕێز و گەورەیی ئەمیری باوەڕدارن قەدەغەی نەکرد لە داواکردنی بەڵگـە لەسەر دزینی قەڵغانەکە، کاتێ ئەمیری باوەڕداران بەڵگـەی دەسـت نەکـەوت، قـازی بڕیـاری بـۆ

بەرژەوەندی جولەکەدا لە دژی ئەمیری باوەڕداران! مێـژووی ئیـسلامیش پـڕە لـەو جـۆرە نمونـە و هەوالآنە کە بەڵگەن لەسەر سەروەریەتی حەق و دادپەروەری لە کۆمەڵگەی ئیسلامی.

لەم ڕوانگەیەوە ئافرەتی موسڵمان پابەندە بە ڕێنمایی ئاینەکەی و دادپەروەر دەبێ لە گوفتـار و کردارەکانی، ئەم خوڕەوشتە زیـاتر دەچەسـپێ کاتـێ حـەق و ڕاسـتی دێـرین بـێ لـە کەلتوریـدا، دادپەروەری ڕەسەن بێ لە ئۆمەتەکەیدا، لاربوونەوە لە دادپەروەری و ڕاستی یاساغە لە شـەریعەت و دەستورەکەی.

## ستەم ناکات

بە ڕادەی سووربوونی ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار لەسەر دادپـەروەری لـە گوفتـار و کرداریـدا، پەنادەگرێ لە ستەمکاری لە گوفتـار و کـرداری" چـونکە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((خۆتـان بپارێزن لە ستەم" چونکە ستەم تاریکایی‌یە لە ڕۆژی قیامەت)) مسلم ١٦/١٣٤.

خودا بە تەواوی ستەمی یاساغکردووە، هیچ بوارێکی جێنەهێشتووە بۆ ئیجتیهـاد و تـەئویل، خودا لەو فەرموودە قودسیە دەفـەرمووێ: ((ئـەی بەنـدەکانم: مـن سـتەمم لەسـەر خـودی خـۆم یاساغکردووە، وە لە نێوانی ئێوەشم یاساغکردووە، کەوابوو سـتەم لـە یـەکتر مەککـەن)) مـسلم ١٦/١٣٢.

جا ئەگەر خودا بەو گەورەیی و دەسەڵاتە ڕەهایەی هەیەتی ستەمی لەسەر خۆی یاسـاغکردبێ، ئایا دەگونجێ بۆ بەندەی کەم و کورتی لاواز بکەوێتە تاوانی ستەمکردن لە برای مرۆڤی خۆی؟

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((موسڵمان برای موسڵمانە، ستەمی لێناکات، پـشتی تێناکـات و بێئومێدی ناکات، هەرکەسێ لە پێویستی براکەی دابێت خـودا لـە پێویـستی ئـەودا دەبێـت، وە هەرکەسێ ناخۆشـیەك لەسـەر موسـڵمانێك لابـدات، خـودا ناخۆشـیەك لـە ناخۆشـیەکانی ڕۆژی قیامەتی لەسەر لادەدات، وە هەر کەسێ موسڵمانێك پۆشتە بکات و عـەیبی بپۆشـێ، خـودا لـە ڕۆژی قیامەت پۆشتەی دەکات و عەیبی دەپۆشێ)) فتح الباری ٥/٩٧.

دەبینین پێغەمبەر ﷺ تەنها ستەمکردنی لەسەر مرۆڤی موسڵمان یاساغ نەکردووە، پشت تێکردنیشی لەسەر یاساغکردووە" چونکە لە پشت تێکردنی موسڵمان بۆ براکەی ستەمێکی گەورە هەیە، لە بەرامبەردا جێبەجێکردنی پێویستی براکەی و لادانی غەم لەسەری و داپۆشینی عەیبەکانی لەلا خۆشەویستکردووە، وەك بلێی ئاماژە بەوە دەکات کە دواکەوتن لەو بەها ڕەوشتیانە ستەم و کەمتەرخەمی‌یە و بێدادی‌یە لە ئاست ئەو برایەتی‌یەی کە موسڵمان و براکەی بەیەکەوە دەبەستێتێتەوە.

ئەمانە هەمووی واتای پیادەکردنی دادپەروەری‌یە لەسەر هەموو مرۆڤێك، وە دوورکەوتنەوەیە لە ستەم لە بەرامبەر هەر مرۆڤێك بێ، هەرچەند ناموسڵمانیش بێ، خوا دەفەرمووێ: ﴿لاَ يَنهَاكُمُ اللهُ عَنِ الَّذِينَ لَم يُقَاتِلُوكُم فِي الدِّينِ وَلَم يُخرِجُوكُم مِن دِيارِكُم أن تَبَرُّوهُم وَتُقسِطُواْ إِلَيهِم إِنَّ اللهَ يُحِبُّ المُقسِطِين. واتا: خودا قەدەغەتان ناکات لە ئاست ئەوانەی لە ئاینتانەوە لە دژتان ناجەنگن و لە ماڵ و وڵاتتان وەدەرتان نانێن لەوەی چاکەکار و دادپەروەر بن لەگەڵیان، بەڕاستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت﴾ الممتحنە: ٨.

**دادپەروەرە لە بەرامبەر ئەوەی خۆشی ناوێت:**

هەندێ جار بەیەکەوە ژیان لەسەر ئافرەتی موسڵمان ژیانێك دەسەپێ لەگەڵ کەسانێك کە خۆشی ناوێن، وەك کۆبونەوەی ئەم لەگەڵ ژنی شوبرا یا براژن یا دش، کە لەوانەیە دۆستایەتی لە نێوانیاندا نەبێت، یا دڵی بۆی نابێتەوە، ئەمەش کارێکی باوە لە زۆر لە ماڵەکان، کەسیش ناتوانێ نکوڵی لێ بکات، وەك پێغەمبەر ﷺ روونیکردۆتەوە کەوا گیانەکان وەکوو پۆلی باڵندە وان، ئەوانەی ئاشنای یەکتر بوون خۆشەویستی و دۆستایەتی لە نێوانیان پەیدادەبێت، وە ئەوانەشی نائاشنان جیاوازی و ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان. جا دەبێ ئافرەتی موسڵمان لەو حاڵەتەدا چۆن بێت؟ ئایا لە رەفتار و هەڵوێست و کاردانەوەیدا سلبی دەبێت؟ یان میهرەبان و گونجاو و خورەوشت بەرز و دادپەروەر دەبێت هەتا لەگەڵ ئەوەی خۆشیشی ناوێت؟ بەڵکو دادپەروەر و خوڕەوشت شیرین دەبێ، ئەو ڕقەی لە دڵیەتی دەری ناکات بەرامبەری، وە هیچ هەڵوێست و ڕەفتار و کاردانەوەیەکی لێ ڕوونادات کە ئاماژە بە هەستی ساردی ناو دڵی بکات، بەڵکو بە شێوەیەك خۆی دەردەخات کە

ڕق و کینەی ناو دڵی دەرنەکەوێت، بۆیە ڕووی خۆش دەبێت لەگەڵی و بەسۆز دەبێت، بە نەرم و نیانی لەگەڵی دەپەیڤێ، أبی الدرداء ﷺ وتی: (ئێمە بە ڕووی هەندێ کەس پێدەکەنین، لەکاتێکا دڵەکانمان نەفرەتیان لێ دەکردن)) فتح الباری ۱/ ٥٢٧.

عوروەی کوڕی زوبەیر وتی: خاتوو عائشە پێی ڕاگەیاندووە: پیاوێك دەستوری وەرگرت تا بێتە لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ڕێگای پێ بدەن، کوڕێکی نەگبەتی بنەماڵەکەیەتی، یا برایەکی نەگبەتی هۆزەکەیەتی))کاتێ هاتە ژوورەوە بە نەرمی قسەی لەگەڵکرد، خاتوو عائشە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، سەرەتا چیت وت، پاشانیش بە نەرم و نیانی قسەت لەگەڵکرد! فەرمووی: ((ئای عائشە: خراپترین پلەوپایەی کەسێك لای خوا ئەوەی خەڵکی لەبەر بەدگۆیی خۆیانی لێ بپارێزن یا جێی بێڵن)) فتح الباری ۱/ ٥٢٨.

چونکە بەتەنگەوە هاتنی خەڵك و هەڵکردن لەگەڵیان و بەزەیی پێداهاتنیان لە خوڕەوشتی باوەڕدارانە، وە نەرم و نیانی و گوفتاری شیرین بەرامبەر خەڵك لە گرنگترین هۆکارەکانی بەیەکەوە ژیان و دۆستایەتی و نزیکبوونەوەیە کە ئیسلام لەسەری هانی داوین، موسڵمانانی ڕاسپاردووە تا پابەندبن پێی.

ئەو ئافرەتە موسڵمانەی ئیسلام دایڕشتووە ناکەوێتە دوای سۆزیەوە لە خۆشویستن یان ڕقبوونەوە، بەڵکو میانڕەو و بابەتیانە و دادپەروەرانە و ڕاستەقینانە دەبێت لە هەڵوێست و بڕیارەکانی بەرامبەر ئەوەی خۆشی ناوێت لە ئافرەتان، لە هەموو ئەمانە بیروهۆش و ئاین و جوامێرییەکەی و خوڕەوشتەکەی دەکاتە دادوەر، بۆیە گەواهی نادات ئەگەر حەق و ڕاستی نەبێت، بڕیارێکیش نادات ئەگەر بە یەکسانی نەبێت، وە ڕا دەرنابڕێ ئەگەر دانایانە نەبێت، لە هەموو ئەمانەدا دایکانی باوەڕداران سەرمەشقیەتی کە ئەوان لە لووتکەی دانایی و دادپەروەری و پارێزکاری بوون لە بڕیاردان لەسەر یەکتری، خاتوو عائشە نزیکترین خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو لە دڵی، زەینەب کچی جەحش لەمەدا ململانێی لەگەڵدا دەکرد" بۆیە زۆر ئاسایی بوو ئەگەر غیرە لە نێوانیاندا هەبێت، کەچی ئەم غیرەیە قەدەغەی نەدەکردن لە گەواهی دان بە حەق، جا سەیرکە چۆن باس و ئەدگاری یەکتر دەکەن: لە صحیح مسلم هاتووە، خاتوو عائشە سەبارەت بە زەینەب

دەڵێ: زەینەب ململانێی لەگەڵدا دەکردم لە پلەوپایەم لەلای پێغەمبەر ﷺ، وە هەرگیز ئافرەتێکم نەبینیووە باشتربێ لە ئاین لە زەینەب، یا پارێزکارتربێ، ڕاستگۆتربێ و زیاتر پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێ، زۆرتر خێر و بەخشین بکات، وە زۆرتر هەوڵبدات و خۆی ماندووبکات لەو بەخشینەی دەیدات تا لە خودا نزیکی بکاتەوە، تەنها ئەوە نەبێ ڕەفتاری توند بوو، زوو تووڕە دەبوو، بەڵام زوو سارد دەبوویەوە. مسلم ٢٠٦/١٥

هەروا لە صحیح بوخاری هاتووە، خاتوو عائشە لە بارەی بوختانەکەی بۆی هەڵبەسترابوو پاشان خودا بێتاوانیەکەی دەرخست، ئاماژە بە گەواهیدانی زەینەب دەکات بۆی: ((پێغەمبەر ﷺ لە زەینەب کچی جەحش لەبارەی منەوە دەپرسێ، فەرموویەتی: ئەی زەینەب، چی لێ دەزانی؟ چی دەبینی؟ زەینەبیش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا گوێ و چاوم دەپارێزم، سوێند بەخوا بێجگە لە خێر هیچیترم لێ نەزانیووە)) پاشان خاتوو عائشە وتی: ((لەکاتێکا زەینەب ململانێی لەگەڵ دەکردم لەسەر پلەوپایەی لەلای پێغەمبەر، بەڵام خودا بەهۆی لە خوا ترسانەکەی پاراستی)) فتح الباری ٤٥٥/٨.

وە ئەوەی سەیری پەرتووکەکانی (سیر وطبقات) بکات، چەندین گوتەی دایکانی باوەڕداران دەبینێ کە جۆرەها ستایشی تێدایە لە هەویێوە بۆ هەوێ لەوانە: لە أم سەلەمە سەبارەت بە زەینەب دەگێڕنەوە: ((زەینەب لەلای پێغەمبەر ﷺ جێگای ڕێز و خۆشەویستی بوو، وە پێغەمبەر ﷺ زۆر باسی دەکرد، زەینەب ئافرەتێکی چاك بوو، زۆر بەڕۆژوو دەبوو و شەونوێژی دەکرد، بە دەستی خۆی شتی دروست دەکرد، پاشان هەمووی دەبەخشی بۆ هەژاران))، هەروا لە عائشەوە سەبارەت بە زەینەب دەگێڕمەوە لەو کاتەی هەواڵی مردنیان پێدا: ((ئەو ئافرەتەی زۆر ستایش و سوپاس دەکرا کۆچی دوایی کرد، خواپەرست بوو، پەناگەی هەتیوان و بێوەژنان بوو))[1]. وە خاتوو عائشە لەبارەی مەیمونە دەڵێ: ((سوێند بەخوا میمونە کۆچی دوایی کرد....بەڵام سوێند بەخوا لە هەمووومان پارێزکارتر بوو لە هەمووشمان زیاتر پەیوەندی خزمایەتی بەجێگەیاند))[2]. ئەمە

---

[1] السمط الثمین: ١١٠، والإستیعاب ١٨٥١/٤، والإصابة ٩٣/٨.

[2] الإصابة: ١٩٢/٨.

ڕەفتاری دایکانی باوەڕداربوو لەگەڵ هەوێکانیان، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە چەندە ڕەفتار و خورەوشت بەرز بوون لەگەڵ خەڵکانیترو ئەمانە بەهۆی ژیاننامەی نمونەییان بەرنامەیەکی بەیەکەوە ژیانی شکۆدار دادەڕێژن بۆ ئافرەتانی موسڵمان بەهۆی فراوانی ئاسۆی عەقل و هۆشەوە هەرچی ڕق و کینە هەیە دەیمژێ، وە سنورێك دادەنێ بۆ غیرە ئەگەر هەبوو بەهۆی دانایی و چاکەکاری و رەوشتی بەرز، بەم جۆرە ئافرەتی موسڵمان دادپەروەر دەبێ بەرامبەر ئەو ئافرەتەی خۆشی ناوێت، هەر کێیەك بێ و پلەوپایەی هەرچی بێت، دادپەروەر دەبێت لە بڕیاردانی لەسەری، سەنگین و ڕەوشت شیرینە لە هەڵس و کەوتی لەگەڵی.

## بە پەژارەی کەس شاد نابێت

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ و پارێزکار کە رازاوەتەوە بە ئاکارە جوانەکانی ئاینەکەی، بە پەژارەی کەس دڵخۆش نابێت" چونکە ئەمە خورەوشتێکی نزم و ئازاردەر و بریندارکەرە نابێ لە ئافرەتی پارێزکار دابێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((شادبوونت بۆ پەژارەی براکەت دەرمەخە، نەبادا خودا ڕەحم بەو بکات و تۆ گرفتار بکات)) الترمذي ٦٦٢/٤.

ئافرەتی موسڵمان کە ئیسلام پاڵفتەی کردووەو لە دەروونیدا شوێنێك نابێتەوە بۆ ئەم خورەوشتەو بەڵکو بەزەیی دێتەوە بەوانەی دوچاری بەڵا دەبن و نزای خێریان بۆ دەکات، پەلە دەکات لە سووككردنی بەڵاکە لەسەریان، بە ئازاریان ئازار دەچێژێ، ئەم شادبوونە بە پەژارەی خەڵك تەنها لە دەروونی تاریك و توند و ڕەق و بەرد دەردەکەوێ، ئەو دەروونەی داڕێژراوە لەسەر پیلانگێڕان و تۆڵەسەندنەوە و کینە و حەزی بینینی شکستی و ئازاری خەڵك. ئافرەتی موسڵمان لەم خورەوشتە دوورە و پەناگیرە.

## بە دوورە لە گومانی خراپ

یەکێ لە خورەوشتەکانی ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ ئەوەیە بەبێ بەڵگە گومانی خراپ بە کەس نابات، خودا دەفەرمووێ: ﴿يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اجتَنِبُواْ كَثِيرًا مِنَ الظَنِّ إِنَّ بَعضَ الظَّنِّ إِثمٌ.

واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دووركەونەوە لە زۆربەی گومان، بەڕاستی هەندێ لە گومان گوناه و تاوانە﴾ الحجرات: ١٢.

چونكە دەزانێ گومانی خراپ بردن دەتخاتە گوناهەوە، بەتایبەتی ئەگەر لە هزر و هەستیدا قسە و خەیاڵی زۆر بكات، پاشان دەبینێ خەڵك تاوانبار دەكات بە عەیب و تاوان، لەكاتێكدا ئەوان لێی بێتاوانن، ئەو بەدگومانییە لە ئیسلام یاساغكراوە" بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خۆتان بپارێزن لە گومانی خراپ، چونكە بەدگومانی درۆترینی گوفتارە)) متفق علیه.

ئنجا ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ و پارێزكار لە قسەكردندا بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێ، هیچ قسەیەك بە زاری دانایەت شوێنەواری درۆی پێوە دیار بێت، جا چۆن دەكەوێتە گوناهی بەدگومانی كە درۆترینی گوفتارە؟!

بەم هۆشداریەوە پێغەمبەر ﷺ موسڵمانان ئاڕاستە دەكات بەوەی تەنها ڕوكاری كردار لە خەڵك وەرگرن، وە دووركەونەوە لە گومان و قسە و باسی ئەندێشە" چونكە لە ئاكاری موسڵمان نییە پەنهانی خەڵك ئاشكرا بكات و بكەوێتە باسی تایبەتمەنییەكانیان و ئابڕویان" چونكە پەنهانییەكان خودا پێی دەزانێ و ئاشكرای دەكات و لێپرسینەوەی لەسەر دەكرێ لەلایەن خواوە، بەڵام مرۆڤ تەنها ڕوكاری كردار سەیر دەكات و دەیكاتە پێوەر.

عبدالرزاق لە عبدالله بن عتبه بن مسعود ﷺ دەگێڕێتەوە، وتی: گوێم لە عمر بن الخطاب ﷺ دەیوت: ((خەڵكانێك هەبوون لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بەهۆی سروشەوە دەناسران و بڕیاریان لەسەر دەدرا، بەڵام وا سروش نەماوە، بەڵكو ئێستا بەهۆی ڕوكارەوە دەتانناسین و بڕیارتان لەسەر دەدەین، جا هەركەسێ خێر و چاكەمان بۆ دەربڕێ ئەوا لێی دڵنیا دەبین و لە خۆمانی نزیك دەكەینەوە، وە كارمان بە پەنهانی و نهێنی ناو دڵی نییە، خودا لەسەر شاراوەكانی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەكات، وە هەر كەسێ شەڕ و خراپەمان بۆ دەربڕێ لێی دڵنیا نابین و باوەڕیشی پێ ناكەین، هەرچەندە بڵێ: من نیازم خراپ نییە))[1].

---

[1] حیاة الصحابة ٢/٨٥

لێرەوە ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بە ئاینەکەی، کە پابەندە بە هۆکارەکانی پارێزکاری و کردەوەی چاك، هەموو کات خۆی دەپارێزێ لە هەر وشەیەك بە دەمی دادێت کە ئازاری خوشکە موسڵمانەکەی بدات چ لە نزیك چ لە دوور، خودا دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ تَقفُ مَا لَيسَ لَكَ بِهِ عِلمٌ إِنَّ السَّمعَ والبَصَرَ والفُؤَادَ كُلُّ أُوْلآئِكَ كَانَ عَنهُ مَسئُولاً. واتا: لە بارەی شتێك گەواهی مەدە و قسە مەککە کە زانیاریت لەسەری نییە، بەڕاستی لە قیامەت لەبارەی گوێ و چاو و دڵ لە خاوەنەکەی دەپرسرێتەوە﴾ الاسراء: ٣٦.

بۆیە ئافرەتی موسڵمان لەلای ئەو نەهیەی خودا دەوەستێ و بە زانیارییەوە نەبێت قسە ناکات، بە دڵنیاییەوەش نەبێت بڕیار نادات" چونکە خودا دەفەرمووێ: ﴿مَا يَلفِظُ مِن قَولٍ إِلاَّ لَدَيهِ رَقِيبٌ عَتِيد. واتا: هەر وشەیەك بێتە سەر زاری مرۆڤ ئیلا فریشتەیەکی چاودێر و ئامادە دەینوسێت﴾ ق: ١٨.

ئافرەتی موسڵمانی بێدار بەهای بەرپرسیاریەتی ئەو وشەیە دەزانێ کە لە دەمی دەردەچێ، دەزانێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((پیاو هەیە قسەیەك دەکات بۆ ڕەزامەندی خوا، ناشزانێ ئەو قسەیە لای خوا هێندە بەرز و گەورەیە، خودا بەهۆیەوە ڕەزامەندی خۆی بۆ دەنوسێ تا ئەو ڕۆژەی پێی دەگات، پیاویش هەیە قسەیەك دەکات خودا پێی نارازییە، ناشزانێ هێندە خراپ و دژوارە، خودا بەهۆیەوە توڕەیی خۆی لەسەر دەنوسێ تا ڕۆژی زیندووبوونەوە))[1].

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکاری ژیر زۆر گرنگی نادات بە زۆربەی ئەو قسە و باس و گومان و ئەفسانانەی لە کۆڕ و دانیشتنەکان دەوترێ، بەتایبەتی لە کۆڕی ئافرەتانی دەست بەتاڵ و سادە، وە ڕێگە بە خۆی نادات ئەو جۆرە قسانە لە زمانیدا هەڵگرێت و، پاشان شتێکی لێ بگێڕێتەوە بە بوونی بەڵگە و دڵنیایی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ بە درۆزن هەژمار بکرێ کە هەرچی ببیسێ بیگێڕێتەوە)) مسلم ١/٧٣.

---

[1] حديث صحيح رواه مالك في الموطأ ٢/٩٨٥ كتاب الكلام: باب ما يؤمر به من التحفظ في الكلام.

## زمانی دەگریّ لە غەییەت (باسکردنی پاشملە) و قسە هێنان و بردن (دوو زمانی)

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بە ئاشکرا و بە پەنهانی لە خودا دەترسێ، سورە لەسەر ئەوەی غەیبەت و دووزمانی نەیێ بەسەر زاریدا کە خودای تورە بکات و بیخاتە ریزی غەیبەتکارانەو، وەك دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ يَغتَب بَعضُكَم بَعضًا أيُحِبُّ أحَدُكُم أن يَأكُلَ لَحمَ أخِيهِ مَيتًا فَكَرِهتُمُوهُ وَاتَّقُواْ اللهَ إِنَّ اللهَ تَوَّابٌ رَحِيم. واتا: هەندێکتان غەیبەتی هەندێکتان مەککەن ئایا کەستان پێی خۆشە گۆشتی براکەی بە مردوویی بخوات، بێگومان پێتان خۆش نییە، دەی لە خوا بترسن، بەڕاستی الله تەوبە گیرا دەکات و میهرەبانە﴾ الحجرات: ١٢.

هەروا گوێبیستی ئەو فەرموودەیە دەبێت: ((موسڵمانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە موسڵمانان لە زمان و لە دەستی پارێزراو بن)) مسلم ١٢/٥. و هەست دەکات غەیبەتکردن گوناهێکە ناشێ بۆ کەسی باوەڕدار، وە هەرکەسێ ڕاهاتبێ لەسەر غەیبەتکردن لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا ئەوا لە ئافرەتە چاکەکان هەژمار ناکرێت.

خاتوو عائشە وتی: بە پێغەمبەر ﷺ وت: تۆ هەر صەفیەت بەسە، ئافرەتێکی واو وایە...ـ هەندێ لە ڕاپەکان دەڵێن: مەبەستی ئەوەبوو باڵای کورتە ـ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قسەیەکت کرد ئەگەر تێکەڵی ئاوی دەریا بکردرایە بۆگەنی دەکرد)) ابو داود ٣٧١/٤.

هەروا ئافرەتی موسڵمان لە ڕێگەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەزانێ گوناهی وا هەیە لە غەیبەتیش ترسناکترە، ئەویش بوختانکردنە، وەك دەفەرمووێ: ((خۆتان دوورخەنەوە لە گوناهە وێرانکارەکان، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، چین ئەو گوناهانە؟ فەرمووی: هاوبەشی دانان بۆ خوا، جادوگەری، کوشتنی کەسێك خودا حەرامی کردووە مەگەر بە حەق بێ، خواردنی ماڵی هەتیو، خواردنی سوو، ڕاکردن لە ڕۆژی غەزا و تێکۆشان، هەڵبەستنی درۆ و بوختان بە ئافرەتانی داوێن پاك و بێ ئاگا و باوەڕدار)) متفق علیه.

ئافرەتی موسڵمان کاتێ گوێبیستی ئەو ڕێنماییە بەرزە دەبێت هەرگیز ناکەوێتە ناو غەیبەتکردن بە هەر شێوەیەك بێت، هەروا ڕێگەش نادات لە کۆڕ و دانیشتنی ئەودا کەس غەیبەت بکات، بەڵکو غەیبەتی لەلا کرا هەڵوێستی بەم شێوەیە دەبێت کە پێغەمبەر ﷺ

دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ بەرگری کرد لە براکەی کاتێ غەیبەتی دەکرا ئەوا حەقە لەسەر خوا لە ئاگر ئازادی بکات)) احمد ٤٦١/٦.

هەروا ئافرەتی موسڵمان زمانی لە دووزمانیش دەپارێزێت و، دەزانێ ترسناکی دووزمانی لەسەر بڵاوبوونەوەی خراپە و گەندەڵی لە کۆمەڵگە چەندە زۆرە و، چۆن زنجیرەی پەیوەندی دۆستایەتی و خۆشەویستی لە نێوان تاکەکان دەپچڕێنێ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((باشترین بەندەکانی خوا ئەوانەن کاتێ دەیایانبینی خوات دەخەنەوە یاد و یادی خوا دەکەن، وە خراپترینی بەندەکانی خوا ئەوانەن بۆ دووزمانی دێن و دەچن، ئەوانەی نێوانی دۆستان و خۆشەویستان تێك دەدەن و، هەوڵدەدەن دەردەسەری توشی ئەوانە بکەن کە خۆیان پاراستووە)) احمد ٢٢٧/٤.

ئەوەندەش بەسە بۆ ئافرەتی دووزمان کە هەرگیز ناچێتە بەهەشت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ناچێتە بەهەشت ئەوەی دووزمانی بکات)) متفق علیه.

وە ئەوەی زیاتر مایەی نیگەرانی و ترسە لە ئاکامەکانی دووزمانی ئەوەیە کە بوخاری و مسلم و هیتریش لە ابن عباس رضي الله عنه دەگێڕنەوەو وتی: ((پێغەمبەر ﷺ بە لای دوو گۆڕدا تێپەڕی، فەرموووی: ئەو دووانە وا سزا و ئەشکەنجە دەدرێن، وە لەسەر شتێك ئەشکەنجە دەدرێن کە خەڵکی بە گوناهی گەورەی نازانێ. یەکەمیان بۆ دووزمانی دەهات و دەچوو، ئەوەیتریان خۆی لە پاشماوەی میز خاوێن نەدەکردەوە، وتی: ئنجا داوای لقە دارخورمایێکی سەوز و تەڕی کرد و کردیە دوولەت، پاشان لقێکی لەسەر ئەو گۆڕە و، ئەوەیتریش لەسەر گۆڕەکەیتر چاند، پاشان فەرموووی: ئومێد دەکەم خودا سزاکەیان لەسەر سوك بکات تا بە سەوزی بمێننەوە)) متفق علیه.

## خۆی دووردەگرێ لە جنێو و گوفتاری پیس

ئافرەتی موسڵمان کە ئیسلام پاڵفتەی کردووە هەرگیز جنێو و قسەی پیس بەسەر زمانیدا نایەت" چونکە دەزانێ ڕێنماییەکانی ئیسلام زۆر بەتوندی قەدەغەی ئەو جۆرە خوڕەوشتانە دەکات، ابن مسعود رضي الله عنه وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموووی: ((جنێودان بە موسڵمان ستەم و لە ڕێ دەرچوونە، وە کوشتار کردنیش لە دژی بێ باوەڕییە)) متفق علیه.

هەروا دەفەرمووێ: ((خودا هەرچی زمان پیس و خراپەکارە خۆشی ناوێت)) احمد والطبراني (مجمع الزوائد ٨/٦٤).

وە دەفەرمووێ: ((خودا ڕقی دەبێتەوە لە کەسی جنێودەر و زمان پیس)) الطبراني (مجمع الزوائد ٨/٦٤).

ئەمانە چەند ئاکارگەلێکن ناشێ بۆئافرەتی موسڵمان کە باوەڕ تێکەڵی دڵی بوبێ و شەونمی ڕێنمایی خوایی لە ڕێنمایی ئیسلام هەڵمژیبێ، وە یاسا و ڕێساکانی ئیسلام زمان و هەستی پاڵفتەکردبێ" بۆیە زۆر دوورە لە شەڕە قسە و جنێو، بێگومان لەو ئاکارە جوانانە پێغەمبەر ﷺ سەرمەشقیەتی، ئەنەس ﷺ وتی: ((پێغەمبەر ﷺ جنێودەر و زمان پیس و نەفرەتکار نەبووە، لە کاتی سەرزەنشتیشدا دەیفەرموو: چیەتی؟ ئاوەها نێوچەوانی خۆڵاوی بووە)) فتح الباري ١٠/٤٥٢.

تەنانەت پێغەمبەر ﷺ زمانی پاراستووە لە نەفرەت کردنو بە پێغەمبەر ﷺ وترا: ئەی پێغەمبەری خوا، نزا بکە لە هاوبەش بڕیاڕدەران، فەرمووی: ((من نەنێردراوم نەفرەت بکەم، بەڵکو بۆ ڕەحمەت و بەزەیی نێردراوم)) مسلم ١٦/١٥٠.

هەروا دەفەرمووێ: ((ئەرێ دەزانن نەدار و مایەپوچ (المفلس) کێیە؟ وتیان: نەدار و مایەپوچ لەلای ئێمە ئەوانەن درهەم و کەل و پەلیان نییە، فەرمووی: نەدار و مایەپوچی ئۆمەتی من لە ڕۆژی قیامەت ئەوەیە کە خاوەنی نوێژ و زەکاتیشە، بەڵام دێت جنێوی بەوە داوەو بوختانی بەو کردووە، ماڵی ئەوی خواردووە، خوێنی ئەوەی ڕژاندووە، لە فلانی داوە، جا لە چاکەکانی هەڵدەگیرێ و دەدرێ بە خاوەن مافەکان، کاتێ چاکەی نەما و مافی خەڵکیشی لەسەر مابوو، ئەوا لە خراپەی خاوەن مافەکان هەڵدەگیرێ و دەخرێتە سەر خراپەی ئەو و پاشان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگر)) مسلم ١٦/ ١٣٥.

بێگومان دەبێ ئەو جۆرە قسە پڕوپوچ و ململانێ و جنێودانە لە ژیانی ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ نەمینێ کە دامەزراوە لەسەر خورەوشت بەرزی و پەروەردە و ڕێزگرتنی هەستی مرۆڤایەتی، بەرزی پلەی کۆمەڵایەتی لە هەڵس و کەوت و گوفتار.

## گاڵتە بە کەس ناکات

کەسایەتی ئافرەتی موسڵمان کە حەزی خۆ بەکەم زانینی تیاڕواوە، دوورە لە لووت بەرزی و خۆ بەزل زانین، نابێ گاڵتە بە کەس بکات" چونکە خودا دەفەرمووێ: ﴿يآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَسخَر قَومٌ مَن قَومٍ عَسَى أن يَكُونُواْ خَيرًا مِنهُم وَلاَ نِسآءٌ مِن نِسآءٍ عَسَى أن يَكُنَّ خَيرًا مِنهُنَّ وَلاَ تَلمِزُواْ أنفُسَكُم وَلاَ تَنَابَزُواْ بِالألقَابِ بِئسَ الِاسمُ الفُسُوقُ بَعدَ الإيمَانِ وَمَن لَم يَتُب فَأُوْلآئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ. واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە با هیچ کۆمەڵ و هۆزێك ئەوەیتر بەکەم نەزانێ و گاڵتەی پێ نەکات چونکە لەوانەیە لەلای خوا لەوان چاکتربن، وە با هیچ ئافرەتێکیش ئەوەیتر بەکەم نەزانێ و گاڵتەی پێ نەکات چونکە لەوانەیە لەلای خوا لەوان چاکتربن، هەروا عەیب لە یەکتر مەبیننەوە و بە ناوبانگی خراپ بانگی یەکتر مەککەن، چونکە ئەوانەی ئەو گوناهانە لەپاش ئەوەی باوەڕیان هێناوە دەچنە ڕیزی فاسقان و سنور بەزێنان، وە هەرکەسێ تەوبە نەکات ئەوا دەچێتە ڕیزی ستەمکارانەوە﴾ الحجرات: ١١.

هەروا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەوەندە بەسە بۆ خراپەکاری مرۆڤ کە ڕقی لە برای موسڵمانی بێتەوە و بەکەم سەیری بکات)) مسلم ١٦/١٢١.

## نەرم و بەزەیییە بەرامبەر خەڵك:

لە سروشتی ئافرەتی موسڵمان ئەوەیە نەرم و بەزەیی و بەسۆز و ڕەفتار شیرین بێ" چونکە ئەمە زیاتر دەگونجێ لەگەڵ ئافرەت و پێکهاتەکەی، لەم ڕوانگەیەوە ئافرەتان ناویان نراوە (ڕەگەزی نەرم و ناسك) (الجنس اللطيف).

ئەو ئافرەتە موسڵمانەی تێراوبووە لە ڕێنمایی ئاینە بێگەردەکەی زیاتر نەرم و بەزەیییە بە ئافرەتانی دەوروبەری، زیاتر ناسك و ڕەفتار شیرینە لە هەڵکردن لەگەڵیان" چونکە خودا لە بەندەکانی ئاکاری نەرم و نیانی و بەزەیی و دانایی خۆش دەوێت، وایکردووە ئەوانەی خۆدەڕازێننەوە بەم ئاکارانە زیاتر لە دڵ و دەروون نزیك بن و خۆشەویست بن، خودا دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ تَستَوِي الحَسَنَةُ وَلاَ السَّيِّئَةَ اِدفَع بَالَّتِي هِيَ أحسَنُ فَإذَا الَّذِي بَينَكَ وَبَينَهُ عَدَوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيم.

وَمَا يُلَقَّاهَا إلاَّ الَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّاهَا إلاَّ ذُو حَظٍّ عَظِيم. واتا: هەرگیز چاكە و خراپە یەكسان نین، كەوابوو خراپە بە چاكە لابدە، ئەو كاتە لەگەڵ ئەو كەسەی دوژمنایەتیتان هەیە و نەیارن وەكو پاڵپشت و دۆستێكی نزیك و گیانی بە گیانی لێدێت، ئەم پلەوپایەیەش تەنها ئارامگران دەیگەنێ وە هەورا تەنها خاوەنی بەخت و بەشی مەزن دەیگاتێ﴾ فصلت: ٣٤، ٣٥.

با ئافرەتی موسڵمان بزانێ بەزەیی و نەرم و نیانی یەكێكە لە ئاكارەكانی خوای گەورە و حەز دەكات لە هەموو كارێكی بەندەكانیشیدا هەبێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خودا بەزەیی و نەرم و نیانە، حەزیش لە نەرم و نیانی و بەزەیی دەكات لە هەموو كاروبارێكدا)) متفق علیه.

هەروا دەفەرمووێ: ((خودا نەرم و نیانی و بەزەییە و حەزی لەم ئاكارەیە، وە ئەو پاداشتەی لەسەر نەرم و نیانی دەیدات زیاترە لەوەی لەسەر توند و تیژی دەیدات، وە زیاترە لە هەرچی كردەوەیەكیتر هەیە)) مسلم ١٦/١٤٦.

وە دەفەرمووێ: ((نەرم و نیانی لە هەر شتێك دابێت بەهادار و جوانی دەكات، وە لە هەر شتێك هەڵبگیرێ بێ نرخ و ناشیرینی دەكات)) مسلم ١٦/١٤٦.

لە هەموو كاتێكدا پێغەمبەر ﷺ بە كردەوە موسڵمانانی فێری نەرم و نیانی دەكرد هەرچەندە هەڵوێستەكە زۆر كاریگەر بێت و تووڕەیی بوروژێنێ. ابو هریرە ﷺ وتی: ((دەشتنشینێك هەڵسا و لە مزگەوت میزی كرد، خەڵكی پەلاماریان دا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وازی لێ بێنن و دۆلكەیەك ئاو بپرژێننە سەر میزەكەی، ئێوە نێردراون بۆ ئاسانكاری، نەنێردراون بۆ گرانكاری)) فتح الباری ١/٣٢٣.

بە نەرم و نیانی و بەزەیی و لێبوردەیی دەرگای دڵان دەبێتەوە كاتێ بۆ حەق بانگیان بكەن، نەك بە توند و تیژی و تووڕەیی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((مژدەدەر بن و خەڵكی دوور مەخەنەوێننەوە لە ئاین، ئاسانكار بن و گرانكار مەبن)) متفق علیه.

چونكە مرۆڤەكان بە سروشتی خۆیان بە توند و تیژی وشكی و تووڕەیی دووردەكەونەوە، وە زیاتر لەگەڵ ئەوانەی نەرم ونیان و خوو شیرینن دەگونجێن و دەسازێن، خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلَو كُنتَ فَظًّا

غَلِيظَ القَلبِ لَانفَضُّواْ مِن حَولِكَ. واتا: ئەی محمد ئەگەر تۆ توند و وشك و دڵ ڕەق بویتایە ئەوانەی دەوروبەرت لێت دووردەکەوتنەوە﴾ ال عمران: ١٥٩.

ئەمە گوتەیەکی هەمیشە زیندووە، دەستورێکی دامەزراو و چەسپاوە، بۆ هەموو ئافرەتێکە خەریکی بانگەوازکردنە بۆ ڕێگای ڕاست، کە پێویستە لەسەری بزانێ بەجوانی بچێتە ناو دڵان، وە لەپێناویدا هەموو ڕێگاکان و شێوازەکانی نەرم و نیانی بەزەیی و دانایی بگرێتەبەر، هەرچەندە لەلایەن ئەوانەی بانگیان دەکات دوچاری ڕەتکردنەوە و ڕووگرژی و پشت لێکردن بێتەوە" چونکەگوفتاری شیرین و نەرم و خۆش مسۆگەر لەناو دڵ و دەروون ڕێچکەی خۆی دەگرێت، وە مسۆگەر کاریگەری خۆی دەبێت" بۆیە کاتێ خودا پێغەمبەر موسی ﷺ و هاروون ﷺ ی ناردە لای فیرعەون، پێی فەرموون: ﴿اذهَبَا إِلَى فِرعَونَ إِنَّهُ طَغَى. فَقُولاَ لَهُ قَولاً لَيِّنًا لَعَلَّهُ يَتَذكَّرُ أو يَخشَى. واتا: بڕۆنە لای فیرعەون چونکە سنوری بەزاندووە و ستەمی کردووە، بە نەرم و نیانی لەگەڵی بدوێن و بە ئومێدی ئەوەی بیرکاتەوە و بترسێ﴾ طه: ٤٣، ٤٤.

جریر بن عبدالله ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەرکەسێ لە نەرم و نیانی و بەزەیی بێبەش بکرێ، ئەوا لە هەموو خێرێك بێبەشکراوە)) مسلم ١٦/١٤٥.

خاتوو عائشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: ((ئەی عائشە دەستگرە بە نەرم ونیانی و بەزەیی چونکە ئەگەر خودا خێری بوێت بۆ ماڵێك ڕێگای نەرم و نیانی و بەزەییان نیشاندەدات)) احمد ٦/١٠٤.

لە گێڕانەوەیەکیتر: ((ئەگەر خودا خێری بۆ دانیشتوانی ماڵێك بوێت نەرم و نیانی و بەزەییان دەخاتە ناو)) احمد ٦/١٠٤.

جابر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( ئەگەر خودا خێری بۆ گەلێك بوێت نەرم و نیانی و بەزەییان دەخاتە ناو)) البزار (مجمع الزوائد ٨/١٨).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئایا هەروالّی ئەوانەتان بدەمێ کە لە ئاگر حەرام دەکرێن، یان ئاگریان لەسەر حەرام دەکرێ؟ ئاگر یاساغ و حەرامکراوە لەسەر هەموو نزیکێکی سانا و نەرم و نیان و گونجاو و لەبار)) الترمذي ٤/٦٥٤.

ڕێنمایی پێغەمبەرایەتی زیاتر مرۆڤ بەرزدەکاتەوە لەو کاتەی نەرم ونیانی لە دلّی دەڕوێنێ و داوای لێدەکات هەتا لەگەلّ ئاژەلّیش نەرم و نیان بێت، دەفەرمووێ: (( خودا چاکەکاری لەسەر هەموو شتێك نوسیووە، جا ئەگەر شتێکتان کوشت با بە چاکەکاری بێت، وە ئەگەر ئاژەلّێکتان سەربڕی با بە چاکەکاری بێت، با هەریەکەتان چەقۆکەی باش تیژکات، ئاژەلّەکەش پالّخا)) مسلم ١٣/١٠٦.

چونکە بەزەیی هاتنەوە بە ئاژەلّی سەربڕاو بەلّگەیە لەسەر نەرم و نیانی دەروونی کەسەکە و میهر و سۆزی بەرامبەر هەموو گیانلەبەرێك، وە هەرکەسێ ئەم واتایانەی لە دلّی چەسپا بەرامبەر هەلّس و کەوتی لەگەلّ گیانداران، ئەوا بەرامبەر بە مرۆڤ زیاتر نەرم و نیان و بەسۆز دەبێت.

## میهرەبانە

ئافرەتی موسلّمان میهرەبانە، کانیاوی میهرەبانی و سۆز لە دلّە گەورەکەی و دەروونە پاکەکەی هەلّدەقوولّێ" چونکە دەزانێ میهری ئەو بۆ دەوروبەر مایەی ڕژانی میهری خوایە لە ئاسمان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((میهرەبان بە بەرامبەر خەلّکی زەوی، میهرەبان دەبێ لەگەلّت خودای ئاسمان)) الطبراني (مجمع الزوائد ٨/١٨٧).

وە ((هەرکەسێ بەزەیی نەیەتەوە بە خەلّکی، خوا بەزەیی پێدانایەتەوە)) الطبراني (مجمع الزوائد ٨/١٨٧).

هەروا: ((رەحمەت و بەزەیی دەرناکێشرێ تەنها لە بەدبەخت و چارەڕەشێك نەبێ)) البخاری فی الادب المفرد ١/٤٦٦.

میهر و بەزەیی لە دەروونی ئافرەتی موسلّمان تەنها بەرامبەر بە خاوخێزان و منالّەکانی و نزیك و خزمانی نییە، بەلّکو هەموو خەلّکی دەگرێتەوە" چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:

((باوەڕی ڕاستەقینە ناهێنن تا ڕەحم بە یەکتر نەکەن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، هەموومان بە ڕەحمین، فەرمووی: مەبەستم ئەو میهر و بەزەییە نییە بەرامبەر دۆستەکەت هەتە، بەڵکو میهرەبانی بەرامبەر خەڵك، کە میهرەبانییەکی گشتییە)) الطبراني (مجمع الزوائد ١٨٦/٨)

ئەوە ئەو ڕەحمە گشتی و تەواوەیە کە ئیسلام سەرچاوەکەی لە دڵی موسڵمانان تەقاندۆتەوە و، کردویەتیە یەکێك لە ئاکارە جیاکەرەوەکانی، تاوەکوو کۆمەڵگە بە پیاو و ئافرەتی، دەوڵەمەند و هەژاری، سەرجەم تاکەکانی ببێتە کۆمەڵگەیەکی تەواوی پڕ لە میهر و بەزەیی، کە برایەتی و دۆستایەتی و میهر و سۆز لە کەش و هەواکەی بڵاوبێتەوە.

پێغەمبەریش ﷺ نمونەیەکی بێوێنە بوو لە میهرێکی پوخت، وەك مسلم و بوخاری لە ئەنەس ﷺ دەگێڕنەوە، فەرموویەتی: ((من دەچمە ناو نوێژ، نیازم وایە نوێژەکە درێژبکەمەوە، گوێم لە گریانی منداڵێك دەبێت، نوێژەکە کورت دەکەمەوە" چونکە دەزانم دایك گریانی منداڵەکەی چەندە لەلا سەختە)) متفق علیه.

هەروا چەند دەشتنشینێك هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، یەکێکیان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێوە منالەکانتان ماچ دەکەن؟ سوێند بەخوا ئێمە ماچیان ناکەین. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جا چیم بە دەستە ئەگەر خودا ڕەحم و میهری لە دڵی تۆ دەرکێشا بێ؟؟)).

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ حسن بن علی ﷺ ماچکرد، ئەقرەع بن حابس التمیمی لەلابوو، ئەقرەع وتی: من دە کوڕم هەنە تا ئێستا یەکێکیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەر ﷺ سەیریکرد و پاشان فەرمووی: ((هەرکەسێ ڕەحم نەکات ڕەحمی پێناکرێ)) متفق علیه.

جارێکیان عمر ﷺ ویستی پیاوێك بکاتە کاربەدەستی موسڵمانان، گوێی لێ بوو ئەو پیاوە قسەی ئەقرەع بن حابسی دوبارەدەکردەوە، بەوەی ئەو منالەکانی ماچ ناکات" بۆیە عمر ﷺ پەشیمان بوویەوە لەسەر کاردانانی، وتی: ئەگەر دڵت بەزەیی و ڕەحمی بۆ منالی خۆت لێ نەدات، چۆن لەگەڵ خەڵکی بە ڕەحم دەبی؟ سوێند بەخوا هەرگیز ناتکەمە کاربەدەست، پاشان ئەو نوسراوەی دڕاند کە ئامادەیکردبوو بۆ لەسەر کاردانانی.

مسلم و بخاری له ابو هريره ﷺ دەگێڕنەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((پیاوێك لە ڕێگایەك دەڕۆیشت زۆر تینووی بوو، بیرێکی ئاوی بینی، چووە ناوی و ئاوی خواردەوە، پاشان هاتەدەر بینی سەگێك لە برسانا زمانی دەرکێشاوە و لە تاوانا خاك و خۆڵی شێدار دەخوات، پیاوەکە وتی: ئەم سەگە هێندەی من تینووە، چووە ناو بیرەکە و پێڵاوەکەی پڕکرد لە ئاو، پاشان بەدەمی گرتی تا سەرکەوت و دای بە سەگەکە، خوداش لە بری ئەم کارە سوپاسی کرد و لێی خۆش بوو))، ئنجا هاوەڵان وتیان: بۆچی بەهۆی ئاژەڵانیشەوە پاداشت دەدرێینەوە؟ فەرمووی: لە بری چاکەکردن لەگەڵ هەر گیانلەبەرێك پاداشت دەدرێنەوە)) متفق علیه.

جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێك دابەزی، بلبلێکی سوور بە شپرزەیی لەسەر سەری پیرۆزی هەڵنیشت، وەك بلێی هانای بۆ هێناوە و سکاڵای ستەمی پیاوێکی لەلا دەکات کە هێلکەی لێ بردووە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کێ ئەوەی خەفەتبارکردووە و، هێلکەکەی بردووە؟ پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من هێلکەکەییم بردووە، فەرمووی: ((بۆی بگەڕێنەوە وەکوو بەزەیی و ڕەحمێك بە حاڵی)) البخاری فی الادب المفرد ١/٤٧٢.

پێغەمبەر ﷺ بەم ڕێنماییە ویستی هەستی قووڵ و فراوان و گشتگیری ڕەحم و بەزەیی بچێنێ لە دڵی موسڵمانان، تا هەرچی باوەڕدارە بە سروشت و خۆڕسك ببێتە مرۆڤێکی خاوەن میهر و بەزەیی تەنانەت بەرامبەر ئاژەڵانیش، وە هەر کاتێ مرۆڤ دڵێکی میهرەبانی هەبوو هەتا بۆ ئاژەڵ، ئەوا ناشێ دڵی ڕەق بێت بەرامبەر بە برای مرۆڤی.

لە صحیحی مسلم هاتووە، ابو هريره ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سەگێك لە دەوروبەری بیرێکی ئاو دەسوڕایەوە، تینوێتی زۆری بۆ هێنابوو، خەریکبوو لە تینوانا بمرێ، لەو کاتە یەکێ لە ئافرەتە داوێن پیسەکانی بەنی ئیسرائیل بینی و پێڵاوەکەی لەپێ کردەوە و ئاوی بۆ دەرهێنا و تینوێتی شکاند، بەهۆیەوە خودا لێی خۆشبوو)) مسلم ١٤/٢٤٢.

ئەوەندەش بەسە بۆ گەورەیی و ڕێزی میهرەبانی و بەزەیی کە یەکێکە لەناوەکانی خوا (الرحمن الرحیم).

**کاردەکات لەسەر سوودگەیاندن بە خەڵکی و لادانی ئازار و شکستی لێیان**

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ هەوڵدەدات توخمێکی بنیاتنەر و سوودبەخش خێر بێت، نەك تەنها بۆ خۆی، بەڵکو بۆ هەموو خەڵك، بۆیە هەمیشە بەدوای دەرفەتی کاری خێرە، هەرچەندە بواری بێ و لە توانای دابێت کاری خێر ئەنجام دەدات، خودا دەفەرمووێ: ﴿وَافعَلُواْ الخَيرَ لَعَلَّكُم تُفلِحُونَ﴾ الحج: ٧٧.. واتا: هەمیشە کاری خێر بکەن بە ئومێدی بردنەوە و سەرفرازبوون

ئافرەتی موسڵمان دەزانێ ئەنجامدانی کاری خێر بۆ خەڵکی پەرستشە ئەگەر بۆ خوا بیکات، وە دەرگاکانی خێریش والآیە لەبەردەمی موسڵمانان، هەر کاتێك بیانەوێت دەچنە ناویەوە و ڕەحمەت و ڕەزامەندی خوا دەبەنەوە. هەروا شێواز و ڕووەکانی خێر و چاکە زۆر و جۆربەجۆرە، گۆڕەپانیش فراوان و درێژ و بەرینە، جێگای هەموو ئەوانەی لێ دەبێتەوە کە کاردەکەن لەپێناوی خوا، وە هەر کارێکی خێر بەنیازی پوخت بۆ خوا بە صەدەقە و خێرێکی تەواو دەنوسرێ لە تۆماری کردەوەکانیان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەموو چاکەیەك صەدەقەیە)) متفق علیه. وە دەفەرمووێ: ((قسەی خۆش و باش صەدەقەیە)) متفق علیه.

بەڵکو میهری بەرفراوانی خوا بەشی هەموو ئافرەتێکی موسڵمانی نیاز پاك دەکات ئەگەر کاری خێر بکات، وە ئەگەر کاری خێریش نەکات بەمەرجێك خۆی لە خراپە و شەڕ بگرێ، أبی موسی ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەموو موسڵمانێك صەدەقەی لەسەر واجبە)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر نەیبوو صەدەقە بکات؟ فەرمووی: ((با بە دەستی خۆی کاربکات و سوود بە خۆی بگەیەنێ و صەدەقە بکات)) وتیان: ئەی ئەگەر نەیتوانی و نەیکرد؟ فەرمووی: ((کۆمەکی کەسێکی خاوەن پێویستی بکات کە بەهۆیەوە دوچاری پەژارەبووە)) وتیان: ئەی ئەگەر واینەکرد؟ فەرمووی: ((با فەرمان بەچاکە یا بەخێر بکات)) وتیان: ئەی ئەگەر واینەکرد؟ فەرمووی: ((با خۆی لە شەڕ و خراپە بگرێ ئەوە بۆی دەبێتە صەدەقە)) متفق علیه.

بەڵێ" بەڕاستی مرۆڤی موسڵمان ئەو کەسەیە خەڵکی لە زمان و دەستی پارێزراو بن.

هەروا امام احمد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ لەلای هەندێ کەس وەستا کە دانیشتبوون، فەرمووی: ((ئایا هەواڵی باشترینتان لە خراپترینتان پێڕابگەیەنم؟ خەڵکەکە بێ دەنگبوون، سێجار ئەمەی دوبارەکردەوە، پیاوێك لە نێوانیان وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((باشترینتان ئەوەیە کە چاوەڕوانی خێری لێدەکرێت و، لە شەڕ و خراپەی دڵنیان، وە خراپترینتان ئەوەیە کە خێری لێ چاوەڕوان دەکرێ، کەچی لە شەڕ و خراپەی دڵنیا نابن)) احمد (مجمع الزوائد ١٨٣/٨).

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستەقینەش لەو جۆرەیە ئومێدی خێری لێدەکرێت و لە خراپە و شەڕی دڵنیان، وە کاتێ لە دونیا ڕوودەکاتە کاری خێر، دەزانێ هەوڵەکانی بەهەدەر ناچێت و پاداشتی لەسەر وەردەگرێتەوە لە ڕۆژی دوایی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەسێ پەژارەیەك لە پەژارە و ناخۆشیەکانی دونیا لەسەر باوەڕدارێك لابدات، ئەوا خودا پەژارە و ناخۆشیەك لە ناخۆشیەکانی قیامەتی لەسەر لادەدات، وە هەرکەسێ لەسەر قەرزارێك ئەرکی سووك بکات، خودا لە دونیا و دوارۆژ ئەرکی لەسەر سوك دەکات)) مسلم ٢١/٧.

هەمیشە ئافرەتی موسڵمان هەوڵدەدات کاری خێر بکات تا لە توانای دابێت" چونکە دەزانێ پێغەمبەر ﷺفەرموویەتی: ((هەرکەسێ خودا بەخششێکی بەسەر داببارێنێ و خۆشگوزەرانی بکات، پاشان نیگەران بوو لەوەی لە پێویستی خەڵکی بەکاری بێنێ، ئەوا ئەو بەخششەی دوچاری فەوتان کردووە)) الطبراني (مجمع الزوائد ١٩٢/٨).

ئافرەتی موسڵمان هیچ کارێکی خێر بەکەم نازانێ، ئەگەر نیازی دڵسۆزی و ڕاستگۆیی بۆ خوای لەگەڵدابوو، ئەوەتا پێغەمبەرﷺ- دەفەرمووێ: ((پیاوێکم بینی لە بەهەشت دەسوڕایەوە و خۆشی دەبینی بەهۆی ئەوەی دارێکی لەسەرە ڕێگا بڕیبوویەوە کە ئازاری خەڵکی دەدا)) مسلم ١٧١/١٦.

خێرکردن ڕووی زۆری هەیە، کە موسڵمانان پێویستە کاری تیابکەن و، پێشبڕکێی لەسەر بکەن بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا وەك: پێشکەشکردنی خێر و سوود بۆ خەڵکی، لەگەڵ لادانی ئازار و سەختی لەسەر خەڵکی.

چونکە لادانی ئازار و سەختی لەسەر موسڵمانان کەمترنییە لە پێشکەشکردنی خێر و سوود بۆیان، هەردوکیان لە کردەوەی چاکن و بکەرەکەی لەسەری پاداشت دەکرێت، هەر کۆمەڵگایەکیش لە هەموو کات و شوێنێکدا پێویستی بە هەردوو کردار هەیە" چونکە بەهۆیانەوە خێر و چاکە بڵاودەبێتەوە لە کۆمەڵگە و، پەیوەندییەکانی خۆشەویستی لە نێوان تاکەکانی توندتر دەبێت، چێژی جوانی ژیان و خۆشی بەیەکەوە ژیان دەکەن، ئەمەش ئامانج و مەبەستی ئیسلامە، ابو برزە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، شتێکم فێر بکە مایەی سوودبێ بۆم. فەرموووی: ((ئازار و سەختی لەسەر ڕێگا لابەرە)) مسلم ١٧١/١٦. لە گێڕانەوەیەکیتر: ئەی پێغەمبەری خوا، ڕێنمایی کارێکم بکە بمخاتە بەهەشتەوە، فەرموووی: ((ئازار و سەختی لەسەر ڕێگا لابەرە" چونکە ئەمە بۆ تۆ بە صەدەقەیە)) احمد ٤٢٣/٤.

جا چ جۆرە کۆمەڵگەیەکی پەروەردەکراو و بەرزە ئەو کۆمەڵگەیەی ئیسلام بنیاتی دەنێ، کاتێ دەخاتە هەستی تاکەکانی کە یەکێ لەو کردەوە چاکانەی لە خودا نزیك دەکاتەوە و خاوەنەکەی دەخاتە بەهەشتەوە، لابردنی ئازار و زیانە لەسەر ڕێی خەڵك؟

مرۆڤایەتی ئەمڕۆ زۆر پێویستی بەم جۆرە کۆمەڵگایەیە" چونکە تیایدا هەموو تاکێك هەست دەکات بەشداریکردنی لە کاری خێر و بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگە لە خودا نزیکی دەکاتەوە و دەیخاتە بەهەشتەوە، ئەگەر تەنانەت لابردنی ئازار و زیانیش بێت لەسەر ڕێگای خەڵك. چەندە جیاوازی هەیە لە نێوان کۆمەڵگەیەك ئەو جۆرە دەروونە هەستیارانە دادەڕێژێ کە بەرگە ناگرن فەرامۆشی و دواکەوتوویی و پیس و پۆخڵی لە کۆمەڵگەیان ببینن، وە لە نێوان ئەو کۆمەڵگەیەی گرنگی نادات بە داڕشتنەوەی دەروونەکان، کە دەیانبینی گوێ نادەنە پاك و خاوێنی و پیسی و ئازار و پاشماوەکانیان لەسەر ڕێگا فڕێ دەدەن، بێ گوێ دانە ئازاری خەڵك" بۆیە دەسەڵات ناچار دەبێت یاسا و بڕیار دەربکات بۆ سزادانی سەرپێچی کاران.

وە ئەگەر جیهانی ڕۆژئاوایی لەو بوارەدا گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز لە ڕێکخستن بە ڕاهێنانی تاکەکانی لەسەر ڕێزگرتنی یاسا و ڕژێم و، پیادەکردنی بەوردی و توندی، ئەوا ئیسلام لەم ڕێکخستنەدا بە ١٥ سەدە پێشی کەوتووە لەگەڵ جیاوازییەکی زۆرو ئەویش ئەوەیە: تاکی

موسڵمان پاڵ دەنرێ بۆ پیادەکردنی یاسا بەدڵسۆزی و ڕاستگۆیی" چونکە دەزانێ لادانی لەم یاسایە سەرپێچییە بۆ خوا و، لە ڕۆژی دوایی سزای لەسەر وەردەگرێ، لەکاتێکا مرۆڤی ڕۆژئاوایی لە سەرپێچی کردنی یاسا زیاتر لە گوناهێکی مەدەنی نابینێ، ئنجا ویژدانی ئازاری دەدات یان نا، بەتایبەتی ئەگەر لەژێر چاودێری خەڵك نەبوو و، دەسەڵات لێی بێ ئاگابوو.

## خەم لەسەر خوشکی قەرزاری دەرەوێنێتەوە

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار بە سروشتی پێکهاتەی ڕواڵەتی و ڕەفتاری جیادەکرێتەوە، کەسایەتیەکەشی بەهۆی لێبوردەیی و خوڕەوشتی سانا و شیرین و ڕەفتاری چاك و باشی دەناسرێتەوە، ئەگەر قەرزێکی لەلای خوشێکی هەبوو و کاتی دانەوەی هاتبوو، ئەم خوشکەش کەمدەرامەت بوو، ئەوا دانەوەی قەرزەکەی بۆ دوادەخات بۆ کاتێك کەمدەرامەتیەکەی نەمێنێ، وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيسَرَةٍ. واتا: ئەگەر کەسی قەرزار کەمدەرامەت بوو با مۆڵەتی بدرێ تا خۆشگوزەران دەبێت﴾ البقرە: ٢٨٠.

مۆڵەتدانی قەرزار خوڕەوشتێکی بەرزە. ئیسلام هانی لەسەر داوین" چونکە بەهۆیەوە مرۆڤایەتی مرۆڤ دێتەدی لە مامەڵەکردنی لەگەڵ برای مرۆڤی، هەرچەندە خاوەن مافیش بێت. ئافرەتی موسڵمانیش کاتێ ئەم کارە دەکات ملکەچی فەرمانی خوا دەبێت و، کارێکی چاك پێش دەخات کە لە بەڵا و سەختی قیامەت دەیپارێزێ و، لەژێر سایەی عەرشی خودا سێبەری بۆ دەکرێ، ئەبی قەتادە ﷺ وتی: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرمووو: ((هەرکەسێ پێی خۆش بێت خودا لە ناخۆشی و بەڵاکانی ڕۆژی قیامەت رزگاری بکات، با خەم لەسەر قەرزارێك بڕەوێنێتەوە، بە مۆڵەتدانی، یا دانەوەی قەرزەکەی لەجیاتی)) مسلم ١٠/٢٢٧.

ابو هریرەﷺ- وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەرکەسێ مۆڵەتی قەرزارێکی کەمدەرامەت بدات، یا لە جیاتی بیداتەوە، خودا لەژێر سێبەری عەرشی خۆی لە ڕۆژی قیامەت سێبەری بۆ دەکات لەو ڕۆژەی بێجگە لەو سێبەرە سێبەریتر نییە)) الترمذي ٣/٥٩٠.

هەروا ابو هريره ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((پیاوێك هەبوو قەرزی بە خەڵکی دەدا، بە خزمەتکارەکەی دەوت: ئەگەر چویتە سەر قەرزارێکی کەمدەرامەت لە قەرزەکەی ببورە، بەو ئومێدەی خوداش لە ئێمە ببورێ، کاتێ مرد و بە خودا گەیشت، خودا لێی خۆشبوو)) متفق علیه.

ابی مسعود البدری ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((پیاوێك لە پێش ئێوە لێپرسینەوەی لەگەڵکرا، بینیان هیچ خێر و چاکەیەکی نییە تەنها ئەوە نەبێ مامەڵەی فرۆشتن و قەرزی لەگەڵ خەڵك دەکرد و، پیاوێکی دەوڵەمەندبوو، فەرمانی دەکرد بە خزمەتکارەکانی کە لە قەرزی کەمدەرامەت ببورن، خوداش پێیفەرمووو: ((ئێمە بەو ئاکار و خەسیەتە لە تۆ لەپێشترین، دەی وازی لێبێنن و لێی ببورن)) مسلم ۱۰/۲۲٦.

حذیفة ﷺ وتی: ((بەندەیەکیان هێنا لای خوای گەورە لەوانەی خودا ماڵ و سامانی پێدابوو، خودا پێی فەرمووو: لە دونیادا چیتکرد؟ ـ هیچ کەس ناتوانێ لەو ڕۆژە هیچ قسەیەك لە خوا بشارێتەوە ـ وتی: خودایە لە ماڵی خۆتت پێمت بەخشی، منیش شتم بەقەرز بە خەڵکی دەفرۆشت و، یەکێ لە ئاکارەکانم لێبووردن بوو لە قەرز، ئەوەی هەیبوایە لە سەریم سوك دەکرد، ئەوەشی کەمدەرامەت بوایە مۆڵەتم دەدا، خودا فەرمووی: ((من بەو ئاکارە لە تۆ لەپێشترم، لەو بەندەیەم ببورن)) جا عوقبە بن عامر ﷺ و ابو مسعود الانصاری ﷺ وتیان: ئاوەهامان لە دەمی پێغەمبەر ﷺ بیستووە)) مسلم ۱۰/۲۲٥.

## چاوتێر و بەخشندەیە

یەکێ لە ئاکارەکانی ئافرەتی پابەند بە یاساکانی ئاینەکەی: چاوتێری و بەخشندەیی و نانبدەییە، دەستبلاوە بۆ کاری خێر، دەستەکانی کراوەیە بۆ کەمدەرامەت و خاوەن پێویستیان، خێر دەکا و دەبەخشێ هەرکاتێ دەرفەت و بوار و بۆنەیەك هەبێت" چونکە تەواو دڵنیایە لەوەی ئەو خێرەی دەیکات لەلای خودا ون نابێت، وەك دەفەرمووێ: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن خَيرٍ فَإِنَّ اللهَ بِهِ

عَلِيم. واتا: هەرچی ببەخشن لە خێر خودا پێی شارەزا و زانایە و پاداشتتان لەسەری دەداتەوە﴾ البقرە: ٢٧٣.

باوەڕی وایە ئەوەی دەیبەخشێ لەپێناوی خوادا بە چەندین هێند بۆی قەرەبو دەکرێتەوە، وەك دەفەرمووێ: ﴿ مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أموَلَهُم فِي سَبِيلِ اللهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أنبَتَت سَبعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِئَةُ حِبَةٍ وَاللهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُ وَاللهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ. واتا: نمونەی ئەوانەی لەپێناوی خوا خێر دەکەن و دەبەخشن وەك دەنکە گەنمێك وایە کە حەوت گوڵە گەنمی لێ پەیدا دەبێ لەهەر گوڵەگەنمێك سەد دەنکە گەنم هەیە، وە خوداش بۆ هەرکەسێ بیەوێ فەرِ و زیادە دەکات، وە فەزڵ و فەڕی خودا بەرفراوانە، وە خودا زانایە بەوەی شیاوی ئەو زیادەیە﴾ البقرە: ٢٦١.

هەروا دەفەرمووێ: ﴿وَمَا أنفَقتُم مِن شَيءٍ فَهُوَ يُخلِفُهُ. واتا: هەرچی ببەخشن خودا بۆتانی زیاد دەکات و نەش و نمای دەکا﴾ السبأ: ٣٩.

چەندین ئایەتیتر کە باس لە زیادبوونی ماڵی بەخشراو دەکات....

ئافرەتی موسڵمان دەزانێ ئەگەر خۆی لە چروکی دەروون نەپارێزێ، دواتریش سوربونی لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ و سامان زاڵ بێت بەسەری. ئەوا دوچاری لەناوچوون و کەم بوونی ماڵەکەی دەبێتەوە، وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: هەر ڕۆژێك بەیانی دێت بەسەر بەندەکانی خوا، ئیلا دوو فریشتە لە ئاسمانەوە دادەبەزن، یەکێکیان دەڵێ: پەروەردگارا: ئەوەی دەبەخشێ زیاتری پێ بدەی، ئەوەیتریش دەڵێ: ئەوەشی دەیگرێتەوە و نایبەخشێ ماڵەکەی لەناوببەی)) متفق علیە.

لە فەرموودەی قودسی هاتووە: ((ئەی نەوەی ئادەم ببەخشە پێت دەبەخشرێ)) متفق علیە.

ئافرەتی موسڵمان دەزانێ بە خێرکردن ماڵی کەم ناکات، بەڵکو فەڕی تێ دەکەوێ و پاك دەبێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ماڵی هیچ کەسێك بە بەخشین و صەدەقە کەم ناکات)) مسلم ١٦/١٤١.

بەڵکو باوەڕی وایە ئەوەی لەپێناوی خوا دەیبەخشێ دەمێنێ" چونکە لە تۆماری کردەوەکان دەنوسرێ، ئەوەیتر دەڕوات و نامێنێ، بۆیە کاتێ پێغەمبەر ﷺ- پرسیاریکرد لە خاتوو عائشە و فەرمووی: ((چەندە ماوەتەوە لەو مەڕەی سەرمان بڕی؟)) خاتوو عائشە وتی: تەنها پیلەکەی ماوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵکو هەمووی ماوەتەوە جگە لە پیلەکەی)) الترمژی ٦٤٤/٤.

لەپێناو هەموو ئەمانە ئافرەتی موسڵمانی دانا و شارەزا بە ئەحکامی ئاینەکەی پەلە دەکات لە خێر و چاکە و بەخشین. بخاری لە ابن عباس ﷺ- وتوویەتی: ((لە ڕۆژی جەژن پێغەمبەر ﷺ دەرچووەدەر، دوو رکات نوێژیکرد، هیچ نوێژیتری لەپێش و لەدوای نەکرد، پاشان هاتەسەر ئافرەتان و فەرمانی پێکردن بە صەدەقە و بەخشین، ئافرەتی وا هەبوو ئەڵقەی زێر یا زیوی دەبەخشی، هی واش هەبوو ملوانکەکەی دەبەخشی)) فتح الباری ۱۰/۳۳۰.

لە گێڕانەوەیەکیتری بخاری هاتووە: ((ئافرەتان ئەنگوستیلەیان کردۆتە خێر)) فتح الباری ۱۰/۳۳۰ یان ((گوارەی گوێیان....)) فتح الباری ۱۰/۳۳۱.

دایکانی باوەڕداران و ئافرەتانی باوەڕدارانی پێشینەی نمونەی هەرە بەرزی بەخشین و خێر بوونە.

الذهبي لە پورتوکەکەی (سیر أعلام النبلاء ۲/۱۸۷) لە وەرگێڕانی لە دایکی باوەڕداران خاتوو عائشە کەوا جارێکیان ۷۰۰۰۰ درهەمی کردە خێرە لە کاتێکا دامێنی بەرگی زرێکەی پینەکردبوو.

هەورا جارێکیان معاویە سەدهەزار درهەمی بۆ نارد، ئەویش نەیهێشت بگاتە شەو تا هەمووی بەخشی، کەنیزەکەکەی پێی وت: ئەگەر بە درهەمێکی گۆشتت بۆمان کریبوایە! خاتوو عائشە وتی: ئەی نەدەبوا پێم بلێی.

جارێکیتر معاویە ملوانکەیەکی بۆ خاتوو عائشە نارد بای سەدهەزار درهەم دەبوو، ئەمیش لە نێوان دایکانی باوەڕداران دابەشیکرد.

وه عبدالله بن الزبير هەندێ پارەی لەناو دوو کیسە بۆی نارد کە بەقەدەر سەدهەزار دەبوو، ئەمیش داوای دەفرێکی کرد و دەستیکرد بە دابەشکردنی بەسەر خەڵك، کاتێ شەو داهات وتی: ئەی کەنیزەك نانی بەربانگم بۆ بێنە ـ جا خاتوو عائشە دەستوری وابوو هەمیشە بە ڕۆژووبوو ـ کەنیزەکەکە وتی: ئەی دایکی باوەڕداران" ئەی نەتدەتوانی بە درهەمێك گۆشتمان بۆ بکڕی؟ خاتوو عائشە وتی: باڵم گران مەککە، ئەگەر یادت خستبامەوە دەمکڕی.

عبدالله بن الزبير ﷺ-لە بارەی هەردوو خوشك ئەسما و عائشە بۆمان دەگێڕێتەوە: هیچ ئافرەتێکم نەبینیوە بەخشندەتر بێ لە ئەسما و عائشە، جا بەخشندەییەکەیان لەیەکتر جیاوازبوو، هەرچی عائشەیە، هێدی هێدی شتی کۆدەکردەوە، تا زۆر دەبوو ئنجا دەیبەخشی، بەڵام ئەسما هیچ شتێکی بۆ بەیانی هەڵنەدەگرت، واتا هەرچی دەستکەوتایە یەکسەر دەیبەخشی.

مسلم لە خاتوو عائشە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ- فەرموویەتی: ((ئەوەی لە هەمووتان دەستی درێژترە لە هەمووان زووتر بە من دەگات، خاتوو عائشە دەڵێ: جا هەریەکەمان دەستمان دەپێوا تا بزانین کامان لە هەمووان دەستی درێژترە! بەڵام زەینەب لە هەمووان دەستی درێژتربوو" چونکە بە دەستەکانی کاری دەکرد پاشان دەیبەخشی)) مسلم ٨/١٦.

عمر بن الخطاب ﷺ هەندێ خەڵاتی نارد بۆ زەینەب، ئەمیش دەستی خستە ناوی و وتی: خودا لە عومەر خۆش بێت، خوشکانیترم خۆڕاگرتربوون لەسەر ئەو جۆرە بەخششە. وتیان: ئەمە هەمووی بۆ تۆیە، وتی: سبحان الله! هەڵیڕێژن و جلێکی بەسەر دادەن، پاشان بە (بەرزەی کچی رافع)ی ـ کە ئەم ئەو هەواڵەمان بۆ دەگێڕێتەوە ـ وت: دەستت بخەرە ناوی مشتێکی لێدەربێنە و بیبە بۆ بەرەی فلان، بەرەی فلان لە خزمان و هەتیوانی بوون، تا کەمێك لەو خەڵاتە لەژێر جلەکە مابوویەوە، بەرزە پێی وت: ئەی دایکی باوەڕداران خوا لێت خۆش بێت، سوێند بەخوا ئێمەش بەشمان تێیدا هەبوو وتی: ئەوەی لەژێر جلەکە ماوەتەوە بۆ ئێوە بێت، سەیرمان کرد ٨٥ درهەمی

لەژێر مابووو پاشان دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و وتی: خودایە لەپاش ئەم ساڵەوە چیتر خەڵاتی عومەرم پێنەگات، ئنجا پێش ئەوەی ساڵ بسوڕێتەوە کۆچی دوایی کرد))[1].

ابن سعد وتی: ئەم قسەیەی زەینەب بە عومەر ﷺ گەیشتەوە، وتی: ئەم ئافرەتە خێری پێوەیە، بۆیە چووە بەردەرگای و سڵاوی بۆ نارد و، وتی: پێم گەیشتەوە پارەکەت هەمووی بەخشیوە، ئنجا هەزاردرهەمیتری بۆ نارد تا لەلای خۆی بیهێڵێتەوە، بەڵام زەینەب ئەمیشی هەموو بەخشی و هیچی لێ هەڵنەگرت.

مێژوو باسی ئافرەتێکیتری بەخشندەمان بۆ دەکات، ئەویش: (سەکینە کچی حسین)ە کە هەرچی دەستکەوتایە دەیبەخشی، ئەگەریش پارەی دەست نەکەوتایە بازنی دەستی دەردەهێنا و دەیدا بەوانەی سواڵ ناکەن و نەدارن.

هەروا عاتیکەی کچی یەزیدی کوڕی موعاویە هەرچی هەبوو هەمووی بەخشی بە هەژارانی بەرەی ابی سوفیان.

یەکێکیتریش: (ام البنین)ە خوشکی عمر بن عبدالعزیز، بەڕاستی سەرمەشقێك بوو بۆ بەخشین، دەڵێ" هەر کۆمەڵێك حەز و ئارەزووی لە شتێك هەیە، حەز و ئارەزووی منیش لە بەخشینە، بۆیە هەموو هەینییەك کۆیلەیەکی ئازاد دەکرد، هەروا سواری جەنگی ئامادە دەکرد لەپێناوی خوا، دەیوت: ئۆف لە چروکی وز رەزیلی، ئەگەر جل بوایە لەبەرم نەدەکرد، وە ئەگەر ڕێگا بوایە نەمدەبڕی[2].

یەکێکیتر (زبێدەیە) هاوسەری خەلیفە هاروون الرشید، کە بۆ خەڵکی مەککە و حیجاز روبارێکی ئاو لەبەر ڕۆیشتووی هەڵکەند بەسترابوو بە سەرچاوەکانی ئاو و شوێنی باران، کە ناونرا بە کانی زبێدە، وە بەیەکێ لە شتە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەو سەردەمە دادەنرێ، کاتێ

---

[1] طبقات ابن سعد ٨/ ١٠٩،١١٠ن وصفة الصفوة ٢/٤٩،٤٨ وسير أعلام النبلاء ٢/٢١٢.

[2] احكام النساء لابن الجوزي: ٤٤٦.

خەزێنەدارەکەی خەرجی ئەم پڕۆژە گەورەیەی لا زۆربوو، زبێدە وشە زیندووەکەی وت: (کاربکە هەتا ئەگەر لێدانی یەك چەکوش دینارێکی تێبچێت).

نمونەی زۆرمان هەنە لەسەر ئافرەتانی باوەڕداری بەخشندە لەو کاتەوە تا سەردەمی ئەمڕۆمشمان، کە بەدوای خێر و بەخشین دەگەڕان و چاوی هەتیوانیان دەسڕی،دڵی هەژارانیان فێنك دەکردەوە، سەختی و ناخۆشیان لەسەر گرفتاران لادەدا، جەستەی ڕووتیان پۆشتە دەکرد...

ئافرەتی موسڵمان هیچ خێرێك بەکەم نازانێ، بەلکو بەپێی توانای خۆی خێر دەکات" چونکە دەزانێ خودا پاداشتی لەسەر دەداتەوە ئەگەر کەمیش بێت، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللهُ نَفسًا إلاَّ وسعَهَا. واتا: خودا ئەوەندەی لە توانای مرۆڤ دایە پێی دەسپێرێ و داوای لێ دەکات﴾ البقرە: ٢٨٦.

بوخاری و مسلم و هیتر دەگێڕنەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر ئافرەت لە خۆراکی ماڵەکەی بەخشی ـ لە گێڕانەوەی مسلم: لە ماڵی مێردەکەی ـ بێ خراپەکاری ئەوا پاداشتی ئەو بەخشینەی بۆ هەیە، وە بۆ مێردەکەشی پاداشتی پەیداکردنی ماڵەکە هەیە، بۆ گەنجینەوانیش هەمان پاداشت هەیە، پادلشتی هیچیان لە ئەویتر کەم ناکاتەوە)) فتح الباری ٢٩٣/٣.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خۆتان لە ئاگر بپارێزن ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت)) فتح الباری ٢٨٣/٣.

ئیسلام دەرگاکانی خێری لەسەر پشت والاکردووە بۆ پیاوان و ئافرەتان، دەوڵەمەندان و هەژاران، وە ناوی ناوە صەدەقە، تاوەکوو هەژاران و کەمدەرامەتان لەو بەشداریکردنە بێبەش نەبن بەهۆی نەداریەکەیان، وە هەموو کارێکی خێر و چاکەی بە صەدەقە هەژمارکردووە، هەژار پاداشتی لەسەر وەردەگرێ وەك چۆن دەوڵەمەند بە بەخشین و خێرکردن پاداشت وەردەگرێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەموو کارێکی خێر صەدەقەیە)) متفق علیه.

بەم شێوەیە ئیسلام بەشداریکردنی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەی لەکاری خێر بەدیهێنا، هەروا بنیات نانی گەشەسەندن و پێشخستن و چاککردنی کۆمەڵگەی بەدیهێنا، سەرەوتن و دڵنیایی و

خۆشی و ئاسودەیی و خستە دڵیانەوە و بەهۆیەوە مرۆڤ هەست بە مرۆڤایەتیەکەی دەکات و، ڕێز و پلەوپایەی دەپارێزێ، وە لەبەردەم بەرپرسیاریەتیەکەی دادەنێ لە ژیان، پاداشتەکەشی بۆ مسۆگەر دەکات.

ئافرەتی موسڵمانی بەخشندە خێر و صەدەقە بە کەسانی شایستە دەکات، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەو کەسە هەژارنییە بە دەنکە خورمایەك یا دووان، یا پارویەك یا دووان بە ڕێ دەکرێت، بەڵکو هەژار ئەو کەسەیە شەرم دەکات داوا بکات و سواڵ بکات)) متفق علیه.

هەروا لە صحیحی بوخاری و مسلم هاتووە: ((هەژار ئەو کەسە نییە لە دەرگای ماڵان دەگەڕێ و بە پارویەك یا دوان، یا خورمایەك یا دووان بە ڕێ دەکرێ، بەڵام هەژار ئەو کەسەیە هیچ گومان نابات دەوڵەمەندی بکات، کەسیش پێی نازانێ تا صەدەقەی پێبکەن، وە هەڵیش ناستێ سواڵ بکا و لە خەڵکی داوا بکات)) رواه الشیخان.

ئافرەتی موسڵمان ئەگەر خاوەن ماڵ بوو زۆرتر بە هەتیو دەبەخشێ و سەرپەرشتی پەروەردە و پێگەیاندنی دەکات" چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((من و سەرپەرشتکاری هەتیو لە بەهەشت وەك ئەو دووانەین)) ئاماژەی بە پەنجەی دۆشاومژە و ناوەڕاست کرد و کەمێك لە یەکی جیاکردنەوە)) متفق علیه.

هەروا ئافرەتی موسڵمان خێر بە بێوەژن و هەژار دەکات" چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەوەی لە پێویستی بێوەژن و هەژار دایە وەکوو تێکۆشەر و موجاهیدێکە لەپێناوی خوا)) وا تێدەگەم فەرموویی: ((وەکوو کەسێکە هەمیشە نوێژ بکات و نەخەوێ و، هەمیشە بەڕۆژوو بێت و نان نەخوات)) متفق علیه.

چونکە چاکەکردن لەگەڵ بێوەژن و هەژار و سەرپەرشتی کردنی هەتیوو لە ڕێزدارترینی کردەوەکانە، کارێکی مرۆیی بەرزە، لەگەڵ کەسایەتی ئافرەتی موسڵمان دەگونجێ و زیاتر ناسکی و مرۆڤایەتی و پاکی و جوامێری پێدەبەخشێ.

## ناز و منەت ناکات بەسەر ئەوانەی خێریان پێدەکات

کاتێ خوای گەورە ڕێگەی خێرکردن و بەخشینی بۆ ئافرەتی موسڵمان خۆش دەکات، منەت و ناز ناکات بە خێرەکەی، بەڵکو سورە لەسەر ئەوەی خێرەکەی بێگەرد و پوخت بۆ خوا بێت، وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَموَالَهُم فِي سَبِيلِ اللهِ ثُمَّ لاَ يُتبِعُونَ مَا انفَقُواْ مَنًّا وَلاَ أَذًى لَهُم أَجرُهُم عِندَ رَبِّهِم وَلاَ خَوفٌ عَلَيهِم وَلاَ هُم يَحزَنُون. واتا: ئەوانەی ماڵیان دەبەخشن لەپێناوی خوادا پاشان منەت و ناز ناکەن و ئازاری دەروونی هەژارەکە نادەن پاداشتی ئەو کارەیان لەلای خودا بۆ هەیە و لە ڕۆژی دواییش نە ترسیان لەسەر نە خەم و خەفەت دەخۆن﴾ البقرە: ٢٦٢.

ئافرەتی موسڵمان دەزانێ هیچ شتێك وەکوو منەت و ناز پاداشتی خێرکردن پوچەڵ ناکاتەوەو خودا دەفەرمووێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بَالمَنِّ وَالأذَى..... واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خێر و صەدەقەکانتان پوچەڵ مەککەنەوە بە منەت و نازکردن و ئازاردانی دەروونی هەژار...﴾ البقرە: ٢٦٤.

منەت و نازکردن بەسەر هەژاران، سوکایەتی کردنە بە مرۆڤایەتیەکەی و پلەوپایەیکەی، کەمکردنەوەی ڕێزیەتی، ئەمانە هەمووی لە یاسای ئیسلام یاساغە کە کەسی بەخشندە و کەسی وەرگر بە دوو برا ئەژمار دەکات، هیچ جیاوازیەك لە نێوانیاندا نییە مەگەر بە تەقوا و کاری چاکە، براش ناز و منەت ناکاتە سەر براکەی و ئازاری دەروونی نادات، لە ڕێزی کەم ناکاتەوە، بۆیە پێغەمبەرﷺلەو فەرموودەیەی مسلم لە ابو ذر ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: ((سێ کەس خودا لە ڕۆژی قیامەت قسەیان لەگەڵ ناکات و، سەیریان ناکات و، پاکیان ناکاتەوە و، سزایەکی بەسۆیان بۆ هەیە، سێ جار ئەمەی دوبارەکردەوە، ابو ذر وتی: نائومێد و زیانمەندن، ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوەی جلەکانی شۆڕ دەکات تا ژێر پاژنەی بۆ فیز و لووت بەرزی، وە ئەوەی منەت و ناز بەسەر هەژاران دەکات، وە ئەوەی کاڵا و کەل و پەلەکەی بە سوێندی درۆ بە قازانجی زۆر دەفرۆشێ)) مسلم ٢/١١٤.

## ئارام و لەسەرخۆیە

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر دەروونی خۆی لەسەر هێمنی و میهرەبانی و خواردنەوەی ڕق و لێبوردەیی و چاکە ڕادێنێ، وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿وَالكَاظِمِينَ الغَيظِ والعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللهُ يُحِبُّ المُحسِنِينَ. واتا: ئەوانەی ڕقی خۆیان دەخۆنەوە و لە خەڵکی دەبورن، وە خودا چاکەکارانی خۆش دەوێت﴾ ال عمران: ١٣٤.

﴿وَلاَ تَستَوِي الحَسَنَةُ وَلاَ السَّيِّئَةَ ادفَع بَالَّتِي هِيَ أحسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَينَكَ وَبَينَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيم وَمَا يُلَقَّاهَا إِلاَّ الَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلاَّ ذُو حَظٍّ عَظِيم﴾ فصلت: ٣٤، ٣٥ پێشتر ڕاڤە کراوە.

پێغەمبەر ﷺ بە ئەشجی کوڕی عبدالقیس ﷺ دەفەرمووێ: ((تۆ دوو ئاکارت تێدایە خودا خۆشیانی دەوێت: لەسەرخۆیی و مان دان)) مسلم ١/١٨٩.

لەبەرئەوەی لەسەرخۆیی و مان دان (الحلم والأناة) دوو ئاکاری هەرە جوانن لە ئاکارەکانی موسڵمانان کە خودا پێی ڕازییە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی پرسیاری ئەو پیاوەی هاتە لای و داوای وشەیەکی کرد و چەندین جار دوبارەیکردەوە و داوای لە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری بکات، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووو: ((تورە مەبە)) فتح الباری ١٠/٥١٩.

ئافرەتی موسڵمان هەندێ جار تورە دەبێ، بەڵام تورە بوونەکەی بۆ خوایە نەك بۆ خۆی، تورە دەبێ کاتێ دەبینێ لە نێو کۆمەڵی ئافرەتانا بنەماکانی ئاین بێ‌نرخ دەکرێن و، خەڵکی لە یاسا و ئەحکامەکانی لایانداوە و زماندرێژی لەسەر ئاین دەکەن، بوخاری و مسلم دەگێڕنەوە لە پێغەمبەر ﷺ ((هەرگیز پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی تۆڵەی لە کەس نەکردۆتەوە، مەگەر سنوری خودا و خاڵە سورەکانی بەزێنرابن و فەرامۆشکرابن، ئەو کاتە بۆ خوا تۆڵەی دەسەندەوە)) فتح الباری ٦/٥٦٦.

پێغەمبەر ﷺ تورە دەبوو و ڕەنگی ڕووی پیرۆزی دەگۆڕا کاتێ خراپەیەك بکرابوایە بەرامبەر ئاین، یا هەڵەیەك لە پیادەکردنی ئەحکامەکانی بەدی بکردایە، یاخود گوێ نەدان و فەرامۆشی بکرایە لە جێبەجێکردنی سزاکانی خوا.

ئەو ڕۆژە تورەبوو کاتێ پیاوێك هاتە لای و وتی: من بە ئەنقەست لە نوێژی بەیانی دوادەکەم بەهۆی فلانە نوێژخوێن" چونکە نوێژەکەی زۆر درێژدەکاتەوە، ئنجا هەرگیز نەبینراوە پێغەمبەر

ﷺ له ئامۆژگاریکردنیدا هێندەی ئەو ڕۆژە تـوڕە بێـت، فـەرمووی: ((ئـەی خەڵکینـە: هەتانـە خەڵکی لە ئاین دووردەخاتەوە، جا هەر یەکێکتان پێش نوێژی بۆ خەڵك کرد با کـورتی بکاتـەوە" چونکە ئەوانەی لە دواوەینە پیر و منداڵ و خاوەن پێویستی تیایە)) متفق علیه.

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لە گەشتێك گەڕایەوە و هاتـە لای خـاتوو عائـشە و پەردەیـەکی تـەنکی بینی وێنەی تیابوو، یەکسەر دایماڵی و ڕەنگی گۆڕا و فەرمووی: ((ئەی عائشە ئەوەی لە هـەموو کەس سزای توندترە لە ڕۆژی دوایی ئەوانەن لاسایی دەستکردی خوا دەکەنەوە)) متفق علیه.

وە پێغەمبەر ﷺ زۆر توڕەبوو لە گوتەی ئوسامە بن زەید لـەبارەی ئـەو ئافرەتـە مەخزومیـەی دزیکرد، پێغەمبەریش ﷺ سووربوو لەسەر ئەوەی سزای خوای لەسەر جێبەجێ بکات، جـا وتیـان: کێ غیرەت دەکا لەبارەیەوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ قسە بکات؟ وتیان: ئنجا کـێ لـە ئوسـامە بـن زەید بوێرترە، خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئوسامە قسەی لەگـەڵکرد، پێغەمبـەریش ﷺ بەتوڕەییەوە فەرمووی: ((لەبارەی سنورێك لە سـنورەکانی خـوا تکـا دەکـەی؟ پاشـان هەڵـسا و وتاریدا، پاشان وتی: ((گەلانی پێش ئێوە تیاچوون بەهۆی ئەوەی کاتێ پیاوی نـاودار و دیـار دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا و سزایان نەدەدا، وە ئەگەر لاواز و بێ دەسەڵاتانیان دزی بکردایە سـزای خوایان لەسەر جێبەجێ دەکردن! سوێند بەخوا ئەگـەر فاتیمـەی کـچی محمـد دزی بکـات دەسـتیم دەبڕیەوە)) متفق علیه.

ئەوەبوو توڕەبوونی پێغەمبەر ﷺ، وە ئەمەش پوختەکەیەتی لە ئاینی ئیسلام: توڕەبوون بۆ خوا بێت نەك بۆ خودی خۆی. وە ئـافرەتی موسـڵمانی بێـداریش بـە ڕێنمـایی ئاینەکـەی کـە شـوێن هەنگاوی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت و ڕێنمایی و ئاڕاستە و هەڵس و کەوت و کردارەکانی هەمیـشە لەبەرچاوە، لەکاتی توڕەبوون دان بەخۆیدا دەگرێت، توڕەبوونەکەشی هەمیشە بۆ خوا و ئاینی خـوا و سنورەکانیەتی.

## لێبوردە و نەرم و نیانە و ڕق و کینە لە دڵی هەڵناگرێ

ئافرەتی موسڵمان ڕەق و کینە هەڵناگرێ لە دڵی" چونکە ئیسلام ئەم خوڕەوشتەی لە دەروون هەڵکێشاوە و ئاگری ڕق و کینەی کوژاندۆتەوە، دەروونی لەم خوڕەوشتە پاککردۆتەوە، لە شوێنیدا تۆوی برایەتی و خۆشەویستی و لێبوردەیی و لێخۆشبونی چاندووە، خودا دەفەرمووێ: ﴿وَالكَاظِمِينَ الغَيظَ والعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللهُ يُحِبُّ المُحسِنِينَ﴾ (پێشتر ڕاڤەکراوە).

بەڕاستی ئەو پلەوپایەیە هەموو کەس پێی ناگات، مەگەر کەسانێك دەروونیان پاك و پوخت بێ، حەزی دوژمنایەتی و تۆڵەسەندنەوە و ڕق و کینەی فرێ دابێ، تا شیاوی گەیشتن بێ بە پلەوپایەی ئیحسان. ئیسلام بەم ڕێنماییە بەرزە توانی بچێتە ناخی دەروونەکان و خاوێن و بێگەردی بکاتەوە، وە ئەودڵانەی پڕی بوو لە دژایەتی و شت هەڵگرتن و ڕق و کینە بیانگۆڕێ بە دڵێك بە خۆشەویستی و پشتگیری و دۆستایەتی کرابێتەوە.

ئەوەتا هند کچی عوتبە پێش موسڵمان پێش موسڵمانبوونی دڵەکەی پڕبوو لە ئاگری دوژمنایەتی و ڕق و کینە بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئال و بەیتی، تەنانەت لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە پێغەمبەر ﷺ خوێنی حەڵاڵکرد لە سزای ئەو هەتکەی کردبووی بە لاشەی حەمزە ﷺ لە ڕۆژی ئوحود، بەڵام کاتێ موسڵمانبوو هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ((ئەی پێغەمبەری خوا، لەسەر ڕووی ئەو زەوییە لە هەموو کۆمەڵێك زیاتر حەزم دەکرد گەل و کۆمەڵی تۆ بە ڕیسوایی و شکستی ببینم، بەڵام ئەمڕۆ لەسەر ڕووی ئەو زەوییە لە هەموو گەل و کۆمەڵێك زیاتر حەز دەکەم گەل و کۆمەڵی تۆ سەربەرز و سەرکەوتووبن)) فتح الباري ١٤١/٧.

ئنجا لەپێناوی خوا و ئاینەکەی، پەراگەندەیی و تەنیایی نامێنێ، دڵەکان هۆگری یەکتر دەبن، زامی ڕق ڕیشەکەن دەکرێ، خوڕەوشتی کینە و ڕك دەردەکێشرێ.

قورئان لێهاتووترین شێوازی گرتەبەر لە بەرزکردنەوەی دەروونی مرۆڤایەتی بۆ ئەم ئاستە بەرزە، کاتێ بڕیاریدا ئەوەی دوچاری ستەم لێکردن دەبێتەوە مافی خۆیەتی خۆی سەرخا و بەرەنگاری دوژمنایەتی ببێتەوە" چونکە سزای خراپە خراپەیەکە وەکوو خۆی، بەڵام بانگی مرۆڤی

ستەم لێکراوی نەکرد بۆ تۆڵەسەندنەوە، بەڵکو زۆر بەنەرمی دەستی گرت و بەرەو ئاستی بەرزی لێبوردەیی و لێخوشبوون بردی، وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ البَغيُ هُم يَنتَصِرُونَ، وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثلُهَا فَمَن عَفَا وَأَصلَحَ فَأَجرُهُ عَلَى اللهِ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ، وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعدَ ظُلمِهِ فَأُوْلآئِكَ مَا عَلَيهِم مِن سَبِيلٍ، إِنَّمَا السَبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظلِمُونَ النَّاسَ وَيَبغُونَ فِي الأَرضِ بِغَيرِ الحَقِ أُوْلآئِكَ لَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ، وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَالِكَ لَمِن عَزمِ الأُمُورِ. واتا: ئەوانەی دوچاری ستەم دەبنەوە بەرەنگاری ستەمەککە دەبنەوە و خۆیان سەر دەخەن، وە سزای هەر خراپەیەك خراپەیەکە وەکوو خۆی، بەڵام ئەوەی لە ستەمکار خۆش بێت و دۆستایەتی دروست بکاتەوە ئەوا بێگومان خودا پاداشتی دەداتەوە، بەڕاستی خودا ستەمکارانی خۆش ناوێت. وە هەر کەسێ تۆڵەی خۆی بکاتەوە لە ستەمکار هیچ گوناهی لەسەرنییە و لێی ناگیرێ، بەڵکو گوناه لەسەر ئەوانەیە یەکەمجار ستەم لە خەڵکی دەکەن و لەسەر زەوی کاردەکەن لەسەر سەرپێچی و خراپەکاری، ئەوانە سزایەکی بەسۆیان بۆ هەیە، وە هەرکەسێ ئارامبگرێ و تۆڵە نەکاتەوە و چاوپۆشی بکات لە ستەمکار ئەوە داواکاری شەرعی خوای پیادەکردووە﴾ الشوری: ٣٩ـ ٤٣.

سەیرکە کاتێ بوختانگێڕان درۆیان هەڵبەست بۆ خاتوو عائشە، ابوبکر بەڵێنیدا ئیتر یارمەتی و کۆمەکی ببڕێت لەوانەی پێشتر یارمەتی دەدان و ئێستاش ئەم بوختانەیان بۆ کچەکەی هەڵبەستووە" چونکە لەو کاتەی توڕەیی و غەم و پەژارەییەدا وای بینی ئەوانە بەدنمەکن و شیاوی چاکە نین، بەڵام خودا لەبەرئەوەی ڕاستگۆیی و پاکی و بێگەردی ابوبکر ﷺ دەزانی، نەیهێشت بچێتە ژێر فشاری خواستی تۆڵەسەندنەوە و دامرکاندنەوەی ئەو ڕقەی لە دەروونیدا بوو، بۆیە گێڕایەوە کرۆکی ڕەسانەیەتیەکەی و بێگەردی دەروونە بڕوادارەکەی، پاڵی نا بۆ بەرزی لێبوردەیی و لێخۆشبوون، وەك دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ يَأتَلِ أُوْلُواْ الفَضلِ مِنكُم وَالسَّعَةِ أَن يُؤتُواْ أُلِي القُربَى وَالمَسَاكِينَ وَالمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَليَعفُواْ وَليَصفَحُواْ أَلاَ تُحِبُّونَ أَن يَغفِرَ اللهُ لَكُم وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ.واتا: خاوەن دارایی و خۆشگوزەران لە ئێوە با سوێند نەخۆن لەسەر ئەوەی یارمەتی خزم و نزیکان و هەژاران و کۆچبەرانی ڕێی خوا نەدەن، دەی با لێیان خۆش بن و چاوپۆشی بکەن لە هەڵەکانیان، ئایا پێتان خۆش نییە الله لێتان خۆش بێت و چاوپۆشی لە هەڵەکانتان بکات، وە الله چاوپۆش و میهرەبانە﴾ النور: ٢٢.

کۆمەڵگەی خوایی دامەزراو لەسەر برایەتی ئیمانی هەرگیز مامەڵەی نێوان تاکەکانی دانامەزرێ لەسەر هەمیشە لێپرسینەوە و پێکانی هەڵەکان و تۆڵەسەندنەوە و دامرکاندنەوەی ڕقی دڵ و سەرخستنی خود، بەڵکو لەسەر برایەتی و چاوپۆشی و لێبوردەیی و لەبیرکردنی هەڵەکان دادەمەزرێ، وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿ وَلاَ تَستَوِي الحَسَنَةُ وَلاَ السَّيِّئَةَ ادفَع بِالَّتِي هِيَ أحسَن فَإِذَا الَّذِي بَينَكَ وَبَينَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ، وَمَا يُلقَاهَا إلاَّ الَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلقَّاهَا إلاَّ ذُو حَظٍ عَظِيمٍ﴾ فصلت: ٣٤، ٣٥ پێشتر ڕاڤەکراوە.

ئەگەر هەمیشە بەرامبەر خراپە خراپە بکرێت ئەوا ئاگری دوژمنایەتی و ڕق و کینە و دوبەرەکی لە نێوان خەڵکی هەڵدەگیرسێ، وە بێجگە لە ڕق و کینە و ململانێ و دوبەرەکی هیچیتری لێ بەرهەم نایەت. بەڵام ئەگەر خراپە بە چاکە وەڵام درایەوە ئەوا ئاگری دوژمنایەتی دەکوژێنێتەوە، دەنگی تورەیی کپ دەکاتەوە، شۆرشی دەروون دادەمرکێنێ، پەڵەی ڕق و کینە دەشواتەوە، ئەو کاتە نەیارەکان بەهۆی قسەیەکی خۆش، زەردەخەنەیەکی نورانی لەلایەن یەکێکیانەوە دەبنەوە دۆستی گیانی بە گیانی. بەڕاستی سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ ئافرەت خراپە بە چاکە لابدات، بەمەش دوژمنایەتی بگۆڕێ بۆ دۆستایەتی، ڕق و کینە بۆ خۆشەویستی، ئەمەش تەنها خاوەن بەختی گەورە و خۆڕاگر و ئارامگران دەیگەنێ، خودا دەفەرمووێ: ﴿فَاصفَحِ الصَفحَ الجَمِيل. واتا: زۆر بەجوانی چاوپۆشی بکە و لێبوردە بە﴾ الحجر: ٨٥.

پێغەمبەریش ﷺ بەکردار و گوفتار وەرگێڕانێکی زیندووی ئەم خورەوشتە بەرزە مرۆییە بووە، خاتوو عائشە وتی: ((پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی لە هیچ دروستکراوێکی نەداوە، نە ئافرەت نە خزمەتکار، تەنها ئەگەر لەپێناوی خودا تێکۆشابێ، وە هەرگیز لەپێناوی خۆی تۆڵەی لەکەس نەکردۆتەوە تەنها ئەگەر شتێك لە سنورەکانی خوا بەزێنرابێ، ئەو کاتە بۆ خوا تۆڵەی کردۆتەوە)) مسلم ١٥/٨٤.

پێغەمبەر ﷺ پەیڕەوی ڕێنمایی خوای دەکرد کە دەفەرمووێ: ﴿خُذِ العَفوَ وَأْمُر بِالعُرفِ وَأعرِض عَنِ الجَاهِلِينَ. واتا: لە ڕەفتاری خەڵك سانایی وەرگرە و فەرمان بکە بەچاکە و چاوپۆشی بکە لە نەزانی و نەفامی خەڵك و فەرامۆشیان کە﴾ الاعراف: ١٩٩.

ئەنەس ﷺ وتی: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەڕۆیشتم کراسێکی بە یاخەی نەجرانی دامێن ئەستوری لەبەردابوو، دەشتەکیەك هات و زۆر بەتوندی یاخەی ڕاکێشا، سەیری لایەکی شانی پێغەمبەر ﷺ م کرد بینیم شوێنەواری یاخەی کراسەکەی لەسەر دیاربوو بەهۆی توندی ڕاکێشانەکە، پاشان وتی: ئەی محمد" فەرمانبدە لەوماڵەی خودای لەلاتە بەشم بدەن، پێغەمبەریش ﷺ ئاوڕی لێدایەوە، پێکەنی، پاشان فەرمانیکرد بڕێکی پێ ببەخشن)) متفق علیه.

مسلم وبوخاری دەگێڕنەوە: ئافرەتێکی جولەکە مەڕێکی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ و هەندێ لە هاوەڵان لێیان خوارد، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دەست هەڵگرن، ژەهراوییە))، جا ئافرەتەکەیان هێنا بۆ لای و پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووو: ((چی پاڵی نای ئەو کارە بکەی؟)) وتی: ویستم بزانم ئەگەر پێغەمبەر بیت خودا بۆتی ئاشکرا دەکات و هیچ زیانێکت پێ‌ناگەیەنێ، وە ئەگەریش پێغەمبەر نەبیت ئەوا لە دەستت ڕزگارمان دەبێت، وتیان: ئەی نەیکوژین؟ فەرمووی: ((نەخێر)) ئنجا لێی خۆشبوو. رواه الشیخان.

هەروا بەرەی دەوس یاخی بوون و ڕازی نەبوون ملکەچی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بن، طُفَیل بن عَمرُو الدَّوسِي ﷺ هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەوە بەرەی دەوس یاخی بوون و ملکەچ نابن، لەلا خوا نزای خراپیان لێ بکە، پێغەمبەر ﷺ ڕوویکردە ڕووگە و دەستەکانی بەرزکردنەوە، خەڵکی وتیان: بەرەی دەوس تیاچوون، بەڵام پێغەمبەری میهرەبان فەرمووی: ((پەروەردگارا ڕێنمایی بەرەی دەوس بکە و بە موسڵمانی بیانهێنە، پەروەردگارا ڕێنمایی بەرەی دەوس بکە و بە موسڵمانی بیانهێنە، پەروەردگارا ڕێنمایی بەرەی دەوس بکە و بە موسڵمانی بیانهێنە)) متفق علیه.

پێغەمبەر ﷺ لە دەروونی موسڵمانان خوڕەوشتی لێبوردەیی و چاوپۆشی دەچاند، هەرچەندە لە بەرامبەردا بە خراپە و دابڕان و پشت تێکردن وەڵام بدرایەوە" چونکە بەهۆی داناییەکەیەوە دەیزانی خەڵکی بە نەرم و نیانی و لێبوردەیی زیاتر بەرەو ڕووت دێن و وەڵامت دەدەنەوە لەوەی بەتوندی وتیژی، عوقبە کوڕی عامر ﷺ پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا، باشترینی کردەوەکانم پێ بڵێ، فەرمووی: ((ئەی عوقبە، پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ ئەو خزمانە بگەیەنە کە پەیوەندیت

لەگەڵ دەپچڕێنن، وە ئەوەی بێبەشت دەکا و ناتداتێ تۆ پێی ببەخشە، ئەوەشی ستەمت لێ دەکا وازی لێبێنە)) لە گێڕانەوەیەکیتر: ((ئەوەی ستەمت لێ دەکا لێی ببورە)) احمد والطبراني (مجمع الزوائد ٨/١٨٨).

## ئاسانکارە و کار لەسەر خەڵکی گران و ئاڵۆز ناکات

ئافرەتی موسڵمان هەمیشە کاروبار لەسەر خەڵکی ئاسان دەکات و گران ناکات" چونکە ئەم خوڕەوشتە زیاتر جێی ڕەزامەنی خوایە، وەك دەفەرمووێ: ﴿يُرِيدُ اللهُ بِكُمُ اليُسرَ وَلاَ يُرِيدُ العُسرَ. واتا: خودا ئاسانکاری بۆ ئێوە دەوێت نەك کارگرانی﴾ البقرە: ١٨٥.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خەڵکی فێر بکەن و ئاسانکاربن کاریان لەسەر سەخت و گران مەککەن، وە ئەگەر یەکێکتان توڕەبوو با بێ دەنگ بێ)) البخاري في الادب المفرد ١/٣٤٢.

ئەو ئافرەتەی پەنا دەباتەبەر ئاڵۆزکردن و کارگرانی لەپاش ئەوەی ڕێنمایی ئیسلامی بۆ ڕوون بویەوە، ئافرەتێکی پارێزکار و دادپەروەر نییە، هەر ئافرەتێك ئەگەر لاریەك لە خوڕەوشت، ئاڵۆزیەك لە دەروونی، درزێك لە کەسایەتی و پەروەردەی نەبێت پەنا ناباتەبەر گرانکاری و ئاڵۆزکردن، ئەوەتا خاتوو عائشە دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێك لە نێوان دوو کاردا سەرپشك بکرایە ئاسانەکەی هەڵدەبژارد، بە مەرجێك گوناه نەبوایە، ئەگەر گوناه بوایە لە هەموو کەس زیاتر لێی بە دووربوو، وە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز بۆ خودی خۆی تۆڵەی لە کەس نەکردۆتەوە، مەگەر سنوری خوا بەزێنرابێ، ئەو کاتە بۆ خوا تۆڵەی سەندۆتەوە)) متفق علیە.

ئنجا ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر و پارێزکار لەئاست ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ دەوەستێ و نایبەزێنێ، وە سەرپێچی فەرمانەکانی ناکات.

## ئیرەیی (حەسودی) نابات

ئافرەتان گەلێ زۆر دوچاری نەخۆشی ئیرەیی دەبنەوە، کاتێ دەبینن هەندێ لە ئافرەتان کە لەوانیش کەمتر جوانتر و هۆشیارتر و ڕۆشنبیرترن، کەچی نقومی پارە و خۆشی و دەوڵەمەندی

بوونه، لەکاتێکدا ئەو بەشێکی کەمیشی لەو خۆشییە نییە، بەڵام لەبەرئەوەی ئافرەتی موسڵمانی بێدار باوەڕی وایە هەرچی لەو ژیانە ڕوودەدات بە بڕیار و قەدەری خوایە، وە خۆشی ڕابواردنەکانی دونیا هەرچەندە زۆربن هەر کەمە لەتەك ئەوەی ئامادەکراوە بۆ ئافرەتانی باوەڕدار و چاوتێر و ڕازی بە بەشی خوا، وە بەهای ڕاستەقینەی ئافرەت لەوەیە تای تەرازووی پارێزکاری و کردەوەی چاکی قورستر بێ، نەك لەوەی دێتە دەستی لە خۆشیەکانی دونیا و هۆکارەکانی لەزەتی دونیای کاتی و ڕۆیشتوو، وە هەرچەندە ئەم بنەمایانە لە دەروونی ئافرەت پتەوتر بێ هێندە دەروونی بێگەرد و خاوێن و دڵنیا دەبێ، وە دەچێتە ریزی ئەوانەی ڕەزامەندی خوایان بردۆتەوە لە بەهەشت، هەرچەندە خاوەنی پەرستشی زۆریش نەبێت، احمد بە سەنەدێکی حەسەن لە ئەنەس بن مالك ﷺ وتی: ((لەلای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، فەرمووی: ((ئێستا پیاوێك دێتە لاتان لە خەڵکی بەهەشتە)) جا پیاوێك لە یاریدەدان هات[1]، ئاوی دەستنوێژ لە ڕیشی دەتکا، هەردوو پێڵاوەکانی بە دەستی چەپی هەڵواسیبوو، کاتێ بەیانی هات بەهەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ قسەیکرد، هەمان پیاو هات، بۆ ڕۆژی سێیەم دیسان پێغەمبەر ﷺ هەمان قسەیکرد، هەمان پیاویش هات لەسەر شێوەی یەکەمجار. کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە کۆڕەکە هەڵسا عبداللە بن عمرو بن عاص ﷺ دوای ئەو پیاوە کەوت، وتی: من لەگەڵ باوکم بۆتە ناکۆکیمان و سوێندم خواردووە تا سێ شەو ناچمەوە ماڵەوە، ئەگەر ڕازی بیت تا ئەو سێ شەوە دەڕوات لای خۆت بمهێڵەوە، وتی: بەڵێ، ئەنەس دەڵێ: عبداللە بۆمانی باس دەکرد، کەوا سێ شەو لەگەڵی بووە نەیبینیوە هیچ شەونوێژ بکات، تەنها کاتێ لەسەر جێگای نووستن خۆی وەردەگێڕا یادی خوای دەکردو تا نوێژی بەیانی دەهات. عبداللە وتی: بەڵام گوێم لێی نەبوو بێجگە لە خێر هیچ قسەیەکیتر بکات، کاتێ ئەو سێ شەوە تێپەڕین و خەریکبوو کارەکەی بەکەم بزانم، وتم: ئەی عبداللە لە نێوانی من و باوکم ناکۆکی نەبووە، بەڵام سێجار لە پێغەمبەر ﷺ م بیست دەیفەرمووو: ((ئێستا پیاوێك لە خەڵکی بەهەشت دێتە لاتان)) هەر سێ جاریش تۆ دەهاتی، بۆیە ویستم لە ماڵتان بمێنمەوە تا کردەوەت ببینم و پەیڕەویت بکەم، کەچی نەتمبینی کارێکی گەورە بکەیت؟ وتی: هەر ئەوەیە کە بینیت، کاتێ پشتم لێکرد و ویستم بڕۆم بانگی کردم و وتی: هەر ئەوەیە کە دەیبینی، بەڵام لە دڵ و

---

[1] ئەو پیاوە (سعد بن ابي وقاص) بوو وەکوو چۆن لە کتابی (البداية والنهاية)ی ابن کثير ٧٤/٨ ناوی هاتووە.

دەروونمدا بەرامبەر بە موسڵمانان ناپاکی و ئیرەییم بۆ کەس نییە سەبارەت بەو بەخششانەی خودا پێیانی بەخشیون، عبداللە وتی: ئەوەیە تۆی بەو ئاستە گەیاندووە، ئەوەشە کە ئێمە بەرگەی ناگرین)) احمد ۱٦٦/۳.

ئەم فەرمودە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەر کاریگەری پاکی دەروون لە ڕق وئیرەیی و کینە و ناپاکی لەسەر دیاریکردنی چارەنوسی مرۆڤ لە دوارۆژیدا و، بەرزکردنەوەی پلەوپایەی لەلای خوا، وە گیرابوونی کردەوەی ئەگەرچی کەمیش بێت، ئەم کاریگەریە زۆر بەروونی دیارە لەو پیاوەی وێڕای کەمی پەرستشی بەهۆی بێگەردی سینە و پاکی و سەلامەتی خەڵك لە ئازار و زیانی چووە بەهەشت، بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئافرەتەی لەبارەیەوە لە پێغەمبەر ﷺ یان پرسی: کەوا ئافرەتێکە شەونوێژ دەکات و زۆر بە ڕۆژوو دەبێت، بەڵام ئازاری دراوسێکانی دەدات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خێری تێدا نییە، لە خەڵکی ئاگرە)) البخاري في الادب المفرد ۱/ ۲۱۰.

مرۆڤێك هەرچەندە پەرستشی زۆر بکات، بەڵام کە دڵی پڕبوو لە هەستی ڕق و ئیرەیی و کینە، ئەوا پەرستشەکەی تەنها ڕواڵەتیە و پاڵی نەداوەتە بنەمایەکی پتەو لە باوەڕ، بۆیە کایگەری نەبووە لەسەر خاوێنکرنەوەی دەروون لە ئیرەیی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((لە دەروونی هیچ بەندەیەك ئیمان و حەسودی کۆنابێتەوە)) ابن حبان (۱۰) ٤٦٦.

ضمرة بن ثعلبة ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خەڵکی بە خێر و سەلامەتن تا حەسودی و ئیرەیی بە یەکتر نەبەن)) الطبراني (مجمع الزوائد ۷۸/۸).

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر و ژیر ئەوەیە لە نێوان پەرستشی چاك و نێوان پاکی دەروون لە پیسی ڕق و کینە کۆبکاتەوەو بەم شێوەیە دەگاتە بەرزترین پلەی تەقوا و لەلای خوا پلەی بەرز وەدەست دێنێ، بەمەش لە دونیادا خۆشەویستی و ڕێزی خەڵك دەباتەوە، وە دەبێتە بەردێکی پتەو و خاوێن لە بینای کۆمەڵگەی خاوێن و یەکگرتوو و بەرز کە شایستەی هەڵگرتنی پەیامی خودا بێ بۆ خەڵك.

## دووره له شانازی و حەزی خۆدەرخستن

یەکێ لە ئاکارەکانی ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر و خوڕەوشتی ئیسلامی ئەوەیە خۆ بەکەم زان و ڕاستکار و ڕاستگۆیە، خۆ بەگەورە زانین و لە خۆبایی بوون و درۆ نازانێ، بانگەشەی شتێك ناکات هی خۆی نەبێ و خۆی بە شتێك بانادات هی خۆی نەبێت، لە بەرامبەر هاوڕەگەزانی خۆی دەرناخات" چونکە دەزانێ ئەم خوڕەوشتە ناگونجێ لەگەڵ سروشتی دەروونی کە بنەما و دەستوری ئیسلام دروستی کردووە.

ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاریکرد ڕێگەی بدات بلێ: کەوا مێردەکەی شتی واو وای پێداوە، لە ڕاستیشدا وا نییە، مەبەستی شانازی و خۆدەرخستن و فیز بووە، پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوە: ((ئەوەی بە شتێك خۆی دەرخا و لە ڕاستیشدا وانەبێ وەك ئەوە وایە دوو جلی ساختەی لەبەر دابێ)) مسلم ١٤/١١٠.

ئیسلام ئاینێکە لەسەر ڕاستگۆیی و بێگەردی و خۆبەکەم زانین و ڕاستکاری دامەزراوە، ڕقی دەبێتەوە لە درۆ و ناپاکی و فیز و خۆبەزل زانین و بانگەشەی شتی درۆ و دەلەسە. بۆیە نایەوێت تاکەکانی ئەو جۆرە ڕەفتارانە لە خۆبگرن و خۆیان لەسەر خەڵکی بەگەورەتر بگرن، وە زۆر بەتوندی سەرزەنشتی ئەو جۆرانەی کردووەو وەك چۆن باسی خراپی کەسێك دەکرێ کە دوو جلی ساختەی لەبەر دابێت و خۆی پێ بادات و دەرخات.

## دووره له خۆگۆڕین و خۆسەپاندن و باڵگران کردن (التنطع والتكلف)

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو لە ڕواڵەت و ڕەفتار و کردارەکانیدا ئاسایی و سروشتییە، لە قسەکردن خۆی ناگۆڕێ، بە شێوازێك قسە ناکات تاوەکوو سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشێ و خۆی دەرخا" چونکە خۆگۆڕین لە کردار و گوفتار شتێکی پەسند نییە، عبدالله بن مسعود ﷺ وتی: ((سوێند بەوەی بێجگە لەو پەرستراویتر نییە کەسم نەبینیوە هێندەی پێغەمبەر ﷺتوند بێت لەسەر ئەوانەی لە کردار و گوفتار خۆیان دەگۆڕن، لەپاش ئەویش کەس هێندەی ابو بکر ﷺ توند نەبووە لەسەریان، وە وابزانم عومەریش ﷺ لە هەموو خەڵکی سەر ڕوی زەوی زیاتر بۆیان خەفەتبار بوو، یان لێیان دەترسا)) ابو يعلى والطبراني (مجمع الزوائد ١٠/٢٥١).

## کەسایەتیەکەی لەلای خەڵکی خۆشەویستە

ئافرەتی موسڵمان گرنگی دەدات بەوەی هۆکاری کردەوەی چاك و کاریگەری سودبەخش بێت و، ناوبانگی باشی لەناو کۆمەڵگە هەبێ و لەلای خەڵکی خۆشەویست بێ.

وە خۆشەویستی خەڵکی بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی خوا بۆی" چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((کاتێ خودا بەندەیەکی خۆش دەوێت بانگی جبریل دەکات و دەفەرمووێ: من فلانە بەندەم خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێ، ئنجا جبریل خۆشی دەوێت، پاشان لە ئاسمان بانگ رادەدێرێ و دەڵێ: خودا فلانە بەندەی خۆش دەوێت ئێوەش خۆشتان بوێت، ئنجا خەڵکی ئاسمان خۆشیان دەوێت، پاشان ئەو خۆشەویستی‌یەی بۆ لەسەر زەوی دادەنرێ. وە ئەگەر خودا رقی لە بەندەیەك بێتەوە بانگی جبریل دەکات و دەفەرمووێ: من رقم لە فلانە بەندەیە تۆش رقت لێی بێتەوە، ئنجا جبریل رقی لێ دەبێتەوە، پاشان بانگی خەڵکی ئاسمان دەکات: خودا رقی لە فلانە بەندەیە ئێوەش رقتان لێی بێ، فەرمووی: ئەوانیش رقیان لێی دەبێتەوە، پاشان ئەو رقەی بۆ لەسەر زەوی دادەنرێ)) مسلم ١٦/١٨٤.

ئەمە ئەو نهێنییە پەنهانیە خواییەیە بۆ هەندێ لە موسڵمانان سەبارەت بە خۆشەویستبوونیان لەلای خەڵك، ئەوە خۆشەویستی خوایە لە نێوان خەڵکی ئاسمان و زەوی بڵاوی کردۆتەوە، یان ئەو رقەی خوایە کە لەسەر زەوی بۆیان دانراوە.

کەسێك ئەو خۆشەویستی‌یەی خوای دەست ناکەوێت مەگەر بۆ گەیشتن بە رەزامەنییەکەی رووی کردبێتە خوا، وە کەسێکیش دوچاری ئەو رقەی خوا نابێتەوە مەگەر پشتی لە رێنماییەکەی کردبێ و سەرپێچی کردبێ.

مژدەی خۆشویستنی خوا و رەزامەندی‌یەکەی تەنها بۆ باوەڕدارانە، ئەوانەی کاری چاك دەکەن و خەڵکیش ستایشیان دەکەن لەسەر ئەو جۆرە کارە چاکانە، مسلم لە ابی ذر ﷺ دەگێڕێتەوە وتویەتی: بە پێغەمبەری خوا وترا: چی دەڵێی سەبارەت بەو پیاوەی کاری چاکە و خێر دەکات و خەڵکیش لەسەری ستایشی دەکەن؟ فەرمووی: ئەمە مزگێنی پێش وەختەی باوەڕدارە)) لە

گێڕانەوەیەکیتری مسلم هاتووە، ((وە خەڵکی لەسەر ئەو جۆرە کارانە خۆشیان دەوێت)) مسلم ١٨٩/١٦.

ئافرەتی موسڵمانی ڕازاوە بە بەهاڕەوشتیەکان، کە هەرچی فەرمانی خوایە جێبەجێی دەکات و، ئەوەی قەدەغەیکردووە نایکات، شایەنی ئەو مزگێنییە پێش وەختەیە، جا هەرکەسێ بیناسێ خۆشی دەوێت بەهۆی کردەوە چاکەکانی وەك: (چاوپۆشی لە نەفامان..چاکەکردن بەرامبەر بە خراپە..بەزەیی هاتنەوە بەرامبەر نائومێدان و بەشخوراوان..حەزکردن بە خێر بۆ خەڵکی..فەرامۆشکردنی خود لەپێناو خەڵکی پێویستتر..قسەی خێر و چاکە....هتد)، ئەم خوڕەوشتە بەرزانە گەوهەرێکی گران بەهایە گەردنی ئافرەتی موسڵمانی جوانترکردووە، بەهۆیەوە ڕێنمایی ئاینەکەی شارەزا بووە و، خۆشەویستی خەڵکی وەدەست هێناوە لە دونیا، وە دەستکەوتنی ڕەزامەندی خوا و بەهەشتەکەی لە دوارۆژدا.

### لەگەڵ خەڵکی دەسازێ و دۆست و خۆشەویستە

ئافرەتی موسڵمانی ژیر ساز و خۆشەویستە، بەهۆی کەسایەتیە شیرین و سەرنج ڕاکێشەر و نەرم و نیانی و هەڵکردنی لەگەڵ خەڵك، دۆستایەتی ژنان دەکات و تێکەڵیان دەبێت و خۆشیانی دەوێت، ئەوانیش دۆستایەتی دەکەن و تێکەڵی دەبن و خۆشیان دەوێت، ئەمە بەرزترین ئاکاری کۆمەڵایەتییە کە ئافرەت بیگاتێ و خۆی پێئامادە بکات بۆ پەیوەندیکردن بە کۆمەڵی ئافرەتان و، وەدەستهێنانی متمانەیان و کارتێکرنیان" چونکە ئەو جۆرە کۆمەڵانە تەنها لەو ئافرەتانە قسە وەردەگرن و متمانە دەکەن و دڵنیا دەبن کە ساز و دۆست و خۆشەویست بن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئایا هەواڵی خۆشەویسترینتان و نزیکترینتان لە کۆڕی من لە ڕۆژی قیامەت پێ ڕابگەیەنم؟ سێ جار یان دووجار ئەمەی دوبارەکردەوە، وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەوەی خوڕەوشتی لە هەموان چاکتر و باشترە)) احمد ١٨٥/٢. لە هەندێ گێڕانەوە ئەمەی بۆ زیادکراوە: ((خاك سیفەتان و بێ فیزان ئەوانەی ساز و دۆست و خۆشەویستن و لەگەڵ خەڵکی دەگونجێن)).

ئەو جۆرە ئافرەتە ساز و خۆشەویستە دەتوانێ پەیامێك بگەیەنێ، سودبەخشێ، خەڵکی هۆشیار بکاتەوە، ئەوەشی وەها نەبێت خێری تیانییە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((باوەڕدار ساز و خۆشەویستە لەگەڵ خەڵکی دەگونجێ و دەسازێ، وە خێر لەوە دانییە کە نازانێ خۆی خۆشەویست بکات و لەگەڵ خەڵکی بسازێ و بگونجێ)) احمد والبزار (مجمع الزوائد ٨/٨٧).

پێغەمبەر ﷺ نمونەی هەرە بەرزە بۆ ئۆمەتەکەی لە چاکی ڕەفتارکردن لەگەڵ خەڵکی و لێهاتوویی لە خۆشویستنی دڵەکان بۆی، بانگی کردوین تا لە کردار و گوفتار و مامەڵەدا پەیڕەوی بکەین، شێواز و ڕێگای گونجاوی بۆ کێشاوین بۆ چۆنیەتی چوونە ناو دڵی خەڵکی و دەستکەوتنی خۆشەویستی و شەیدایی و هۆگری خەڵك" چونکە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە مژدەدەربوو، خورەوشت سانا و خۆشبوو، نەرم و نیان بوو، توند و تیژ نەبوو، بچوبوایە کۆڕێك لەو شوێنە دادەنیش کە کۆتایی خەڵکەکە و کۆڕەکەیە، فەرمانیشی دەکرد بە خەڵك تا وابن، مافی هەموو تاکێکی کۆڕەکەی دەدا و هەرکەسە و پشکی خۆی وەردەگرت، ئامادەبوانی کۆڕی پێغەمبەر ﷺ هەستیان نەدەکرد کەس لەوان ڕێزدارترە، هەرکەسێك داوای شتێکی لێ بکردایە بۆی جێبەجێ دەکرد، یان بە قسەیەکی خۆش ڕازی دەکردن، خەڵکی هەموو بەهۆی ڕەفتاری جوانی و دڵفراوانیەکەی بەختەوەر ببوون، ببوویە باوك بۆیان، لە حەق و ڕاستیشدا هەموو خەڵك لەلای وەکوو یەك بوون، خەڵکی لە کۆڕیدا یەکسان بوون، تەنها بە تەقوا لە یەکتر بەرزتر دەبوون، خاك سیفەتی بوون، ڕێزیان لە گەورە دەگرت و سۆز و بەزەییان بۆ بچوك هەبوو، بۆ خاوەن پێویستیەك خودی خۆیان فەرامۆش دەکرد، غەریبە و ئاوارەیان دەپاراست. ئنجا پێغەمبەر ﷺ کەسی نائومێد نەدەکرد، بۆ خۆی وازی لە سێ شت هێنابوو: مشت و مڕ..زیادەڕۆیی..هەروا ئەوەی پەیوەندی بەو نەبووایە. بەرامبەر خەڵکیش وازی لە شت هێنابوو: سەرزەنشتی کەسی نەدەکرد..عەیب و نەنگی لەکەس نەدەگرت..باسی ئابڕوی کەسی نەدەکرد. ئنجا قسەیەکی نەدەکرد ئومێدی پاداشتی لێ نەکردایە، کاتێ قسەی بکردایە دەوروبەر گوێیان بۆ دەگرت بێ ئەوەی جوڵە بکەن وەك بلێی باڵندە لەسەر سەریان هەڵنیشتووە، تا بێدەنگ نەبوایە قسەیان نەدەکرد، لەلای ئەو مشت و مڕ و ململانێیان نەدەکرد، پێدەکەنی بەوەی ئەوان پێکەنینیان پێدەهات، سەرسام دەبوو بەوەی ئەوان پێی سەرسام دەبوون، ئارامی دەگرت لەسەر کەسی نامۆ و غەریب لە بەرامبەر وشکی گوفتار و داواکاریان،

تەنانەت بە هاوەڵانی دەفەرمووو: ((ئەگەر خاوەن پێویستیەکتان بینی کۆمەکی بکەن، وە هەرگیز بە سوپاس و ستایشی کەس ڕازی نەبووە مەگەر چاکەیەکی بەرامبەر کرابێ، هەرگیز قسەی کەسی نەدەبڕی تا کەسەکە خۆی وازی دەهێنا یا کۆتایی پێدەهێنا یا هەڵدەستا))[1].

خاتوو عائشە دەڵێ: خۆی لە خەڵکی خراپ دەپاراست و قسەی نەرم و ڕەفتاری چاکی لەگەڵ دەکرد وەك لە فتح الباري هاتووە ٤٧١/١٠.

بێگومان ئافرەتی موسڵمانی پێگەیشتوو و کراوە، پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ دەکات لە ڕەفتاری لەگەڵ خەڵکی باش و خراپ، بەمەش خۆشەویست و گونجاو و ڕێزدار دەبێت لەناو کۆمەڵی ئەو ئافرەتانەی ناسیویانە یان ناویان بیستووە.

## نهێنی دەپارێزێ

لای ئافرەتی موسڵمانی پێگەیشتوو و ژیر شاراوە نییە پاراستنی نهێنی لە جوانترینی ئەو خوڕەوشتانەیە کە مرۆڤ دەڕازێنێتەوە، چ پیاو چ ئافرەت" چونکە پاراستنی نهێنی بەڵگەیە لەسەر پێگەیشتنی کەسایەتی، پتەوی خوڕەوشت، سەلاری تێڕوانین، سەنگینی بیروهۆش...بۆیە لەم ڕوانگەیەوە ئافرەتی موسڵمان نهێنی پارێزە بەوەی ئیسلام داوای لێکردووە و کردویەتی بە جوانترین خوڕەوشت.

وە جوانترین نمونە لەسەر پاراستنی نهێنی هەڵوێستی ابوبکر ﷺ و عثمان ﷺ ە بەرامبەر بە عومەر ﷺ، کاتێ عومەر داوایانی لێکرد حەفصەی کچی بخوازن پاش ئەوەی بێوەژن کەوت، بخاري بۆمان دەگێڕێتەوە: عبداللە کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: کاتێ حەفصەی کچی عەمەر ﷺ بێوەژن کەوت، عومەر ﷺ وتی: ((بە عثمان کوڕی عەففان گەیشتم و حەفصەم پێشکەشی کرد، وتم: ئەگەر حەز بکەی حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە دەکەم، وتی: با بیری لێ بکەمەوە. چەند شەوێك تێپەڕی، پاشان پێم گەیشت و وتی: بۆم دەرکەوت کە جارێ ژن نەهێنم، وتی: گەیشتم بە ابوبکر الصدیق ﷺ وتم: ئەگەر حەز بکەی حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە دەکەم. ابو بکر ﷺ

---

[1] حياة الصحابة ٢٢/١، ٢٣.

بێ دەنگ بوو، هیچی پێ نەوتم، جا زۆر توڕەبووم زیاتر لەوەی لە عثمان. چەند شەوێك چاوەڕێم کرد. پاشان پێغەمبەر ﷺ داوایکرد و مارەیکرد، جا ابوبکر پێم گەیشت و وتی: ڕەنگە لێم توڕە بووبی ئەو کاتەی حەفصەت پێشکەشکردم و وەڵامم نەدایەوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: بەڵام ئەوەی ڕێگرم بوو لە وەڵامدانەوەی داواکاریەکەت تەنها ئەوە بوو دەمزانی پێغەمبەر ﷺ باسیکردووە، نەشدەبوایە نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بدرکێنم، وە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ دەستی لێ هەڵگرتایە من پێی ڕازی دەبووم)) فتح الباری ٩/١٧٥.

مسلم لە ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، وتویەتی: ((پێغەمبەر ﷺ هاتە سەرم، منیش لەگەڵ منداڵان یاریم دەکرد، پێغەمبەر ﷺ سڵاوی لێمان کرد و، ناردمی بۆ پێویستیەکی، بەهۆیەوە تۆزێك لە دایکم دواکەوتم. کاتێ هاتمەوە لای دایکم، دایکم وتی: بۆچی دواکەوتی؟ وتم: پێغەمبەر ﷺ ناردمی بۆ پێویستیەکی، وتی: پێویستیەکەی چی بوو؟ وتم: نهێنییە، وتی: نهێنی پێغەمبەر ﷺ بە کەس نەڵێی. ئەنەس دەڵێ: سوێند بەخوا ئەی ثابت ئەگەر ئەو نهێنییەم بۆ کەسێك باسکردایە بۆ تۆم باس دەکرد)) مسلم ١٦/٤١.

ئەوەیە پەروەردەی ئیسلامی، دایکێك هانی کوڕەکەی دەدات لەسەر پاراستنی نهێنی و ناچاری ناکات و شێوازیتر بەکارناهێنی بۆ ئەوەی نهێنییەکەی پێ بدرکێنێ، ئەمە ئەو ئاستە بەرزەیە کە مرۆڤ پێویستە بیگاتێ، چ پیاو بێ چ ئافرەت.

نهێنی درکاندن کارێکی خراپ و ناپەسندە، وە درکاندنی هەندێ نهێنی لەوانیتر خراپترە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خراپترین پلەوپایەی خەڵك لەلای خوا لە ڕۆژی دوایی پیاوێکە خۆی بۆ هاوسەرەکەی واڵا دەکات و ئەمیش خۆی بۆ واڵا دەکات، پاشان نهێنییەکانی بڵاودەکاتەوە)) مسلم ١٠/٨.

چونکە نهێنی و تایبەتمەندییەکان دەبێت پارێزراو و پەنهان بن و تەنها خاوەنەکانیان بیزانن، کەسێکیش ئەگەر کەم هۆش نەبێت، خوڕەوشتی لار نەبێت، کەسایەتی لاواز نەبێت، تایبەتمەندییەکانی لەلای خەڵکی بڵاوناکاتەوە، موسڵمانانیش بەهۆی ڕێنمایی ئاینەکەیان و خوڕەوشتە جوان و بەرزەکانیان، دوورن لەم جۆر ڕەفتارانە.

## ڕووی خۆشە

لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی ئافرەتی موسڵمان لە ژیانی تایبەتی لەگەڵ هاوسەر و خێزانی و، لە ژیانی گشتی کۆمەڵایەتی ئەوەیە: ڕووخۆش بێت، دڵ ساف بێت، دەم بەزەردەخەنە بێت و مژدەی لێ بباریێ، هەموو ئەمانە وا دەکەن لەلای خەڵکی خۆشەویست بێ و لە دڵیان نزیک بێ، لە پاڵ ئەمەش یەکێکە لە ڕەفتارە چاکەکان و، جوانی کەسایەتی و، کاری چاکە و باش.

لە صحیحی مسلم هاتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هیچ چاکەیەك بەکەم مەزانن، تەنانەت ئەگەر بە ڕوویەکی خۆش بە ڕووی براکەت ببیتەوە)) مسلم ١٦/١٧٧.

ئافرەتی ڕووخۆش ئاسودەیی و بەختەوەری دەخاتە دڵی مێردەکەی، هەرچەند چاوی بکەوێتە سەری زیاتر لەلای بەڕێز و بەرز و خۆشەویست دەبێ، بەهەمان شێوەش لەناو کۆمەڵی ئافرەتانا" چونکە هیچ شتێك وەکوو ڕووخۆشی سۆز و خۆشەویستی لەناو کۆمەڵگە بڵاوناکاتەوە، ئەم ڕەفتار و کارانەش زیاتر شیاوی ئافرەتی موسڵمانی بانگخوازە بۆ ڕێگای خوا" چونکە بەهۆی ئەو ئاکارانەوە دەتوانێ بگاتە دڵەکان و بچێتە قوڵایی دەروون.

## ئێسکی سوکە

ئافرەتی موسڵمانی بێدار ئێسك سوکە، ئاسان لەگەڵ خەڵکی هەڵدەکات، قسە خۆشە، لەکاتی گاڵتە و گەپی هاوڕێیانی بێزار نابێت ڕووگرژ نابێت، گاڵتەی خۆش دەکات، بەڵام گاڵتەکردنی ئافرەتی موسڵمان شەقڵ و مۆرکی ئیسلامی پێوە دیارە، دانابەزێتە ئاستی قسەی پڕوپوچ و جنێو و گوفتاری ناشیرین و نابەجێ.

پێغەمبەر ﷺ گاڵتەی دەکرد لەگەڵ هاوەڵانی، بەڵام لە بازنەی حەق و ڕاستی دەرنەدەچوو، هەندێ لە هاوەڵان بە پێغەمبەریان ﷺ وت: تۆ گاڵتەمان لەگەڵ دەکەی، فەرمووی: ((بەڵێ، بەڵام بێجگە لە حەق و ڕاستی هیچیتر ناڵێم)) البخاري في الادب المفرد ١/٣٦٥.

له پەرتوکەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ هاتووە کە گاڵتەی لەگەڵ منداڵێکی بچوك دەکرد نازناوی (ابا عومەیر) بووە، کوڕی یەکێ لە هاوەڵان بوو، باڵندەیەکی هەبوو یاری لەگەڵ دەکرد. ڕۆژێکیان بە خەفەتباری بینی، فەرمووی: لەبەرچی ابا عومەیر بە خەفەتباری دەبینم؟ وتیان: ئەو باڵندەیەی یاری لەگەڵ دەکرد مردووە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش ﷺ بە گاڵتە بە منداڵەکەی فەرموو: ((ابا عومەیر، چۆلەکەکەت چی کرد؟)) حياة الصحابة ١٤٩/٣.

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ داوای ئاژەڵی سواری لێکردو پێغەمبەریش ﷺ بە گاڵتە پێی فەرمووو: ((من لەسەر پشتی بەچکەی ماوشترێك هەڵتدەگرم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، جا چ لە بەچکەی ماوشترێك بکەم؟ فەرمووی: ((ئایا وشتر بێجگە لە بەچکە چیتری دەبێ؟)) البخاري في الادب المفرد ٣٦٦/١.

احمد لە ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، وتویەتی: پیاوێکی بیابان نشین ناوی زاهیر بوو، هەموو جار لەو بیابانەوە دیاری دەهێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ هۆکاری گەڕانەوەی بۆ ئامادە دەکرد کاتێ بیویستایە بڕواتەوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((زاهیر لە بیابان دیاریمان بۆ دێنێ ئێمەش ئامادەی دەکەین)). پێغەمبەر ﷺ زاهیری خۆش دەویست، پیاوێکی ناشیرین و نابوت بوو، جارێکیان پێغەمبەر ﷺ هاتە لای، ئەویش کەل و پەلی دەفرۆشت، پێغەمبەر ﷺ لە پشتەوە لە باوەشی گرت، زاهیریش نەیدەدی، وتی: بەرمدە! ئەوە کێیە؟ ئاوڕی دایەوە و پێغەمبەری ﷺ ناسی، ئنجا توندتر پشتی بە سنگی پێغەمبەر ﷺ نوساند، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: ((کێ ئەو بەندەیە دەکڕێ؟)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کەواتە سوێند بەخوا وامدەبینی بێ بازاڕم! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵام لەلای خوا بێ بازاڕ نیت)) یان فەرمووی: ((بەڵام لەلای خوا تۆ بەهاداری)) احمد (مجمع الزوائد ٣٦٨/٩).

پیرەژنێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لە خودا داوام بۆ بکە بمخاتە بەهەشت، پێغەمبەریش ﷺ بە گاڵتە فەرمووی: ((ئەی دایکی فلان، بەهەشت پیرەژنی ناچیتێ)) پیرەژنەکەش ڕۆیشت و گریا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پێی بڵێن بە پیرەژنی ناچێتە بەهەشت))" چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَآءً فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا. واتا: بەڕاستی

ئێمە دروستیانمان کردوون، وە لە پاش ئەوەی لە دونیادا ببوونە پیرەژن دوبارە دەیانکەینەوە کچی لاو﴾ الترمذي ١١١.

احمد لە خاتوو عائشە دەگێڕێتەوە، وتی: ((لە هەندێ لە گەشتەکان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووم، ئەو کاتە تازە هەڵدەکەوتم و گۆشتن نەببووم، جا پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکەکەی فەرمووو: ((ئێوە پێشمان کەون، ئەوانیش پێش کەوتن، پاشان پێی فەرمووووم: وەرە با پێشبڕکێت لەگەڵدا بکەم)) منیش پێشبڕکێم لەگەڵی کرد و بە پێشی کەوتم لێم بردەوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ماوەیەك بێ دەنگ بوو تا قەڵەوبووم و گۆشتن بووم، منیش ئەو پێشبڕکێیەم هەر لە یاد نەمابوو، لە یەکێ لە گەشتەکان دیسان دەرچووم لەگەڵی، بە خەڵکەکەی فەرمووو: ((بە پێش کەون)) خەڵکەکە بە پێش کەوتن، پاشان پێی فەرمووووم: ((وەرە با پێشبڕکێت لەگەڵ بکەم))، پێشبڕکێم لەگەڵی کرد، بەڵام ئەمجارەیان ئەو بە پێشم کەوت و بردیەوە، ئنجا دەستی کرد بە پێکەنین و فەرموووی: ((ئەوەیان بەوەیتر)) احمد ٢٤٦/٦ وابو داود ٤١/٣.

پێغەمبەر ﷺ کە پێشەوا و ڕابەر و مامۆستای موسڵمانان بوو، کەچی هەندێ جار گاڵتەی دەکرد و هەندێ جاریش خۆشی و شادی دەردەبڕی، وێڕای سەرقاڵیە سەختەکانی ڕابەرایەتی کە پێی هەڵدەستا بۆ دامەزراندنی ئۆمەت و نەتەوەی ئیسلام و، ئاڕاستەکردن و ئامادەکردنی سوپای تێکۆشان و کارو باریتر.

خاتوو عائشە وتی: ((خواردنی (حەریرە[1])م لێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ بۆیم هێنا، بە خاتوو سەودەم وت ـ کە پێغەمبەر ﷺ لە نێوانی من و ئەو دانیشتبوو ـ: بخۆ، سەودە نەیخوارد، وتم: دەیخۆی، ئەگەرنا دەم و چاوتی پێ دەسوم، هەر نەیخوارد، منیش دەستم لەناو حەریرەکە هەڵێنا و دەم و چاویم پێ سوی، پێغەمبەر ﷺ پێکەنی، وە بە دەستی خۆی هەندێکی بۆ سەودە دانا و پێی فەرمووو: تۆش دەم و چاوی پێ بسوو. لە گێڕانەوەیەکیتر: عائشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕانی بۆ دابەزاند تا تۆڵەم لێ بکاتەوە، ئنجا سەودە هەندێکی لەو حەریرە لە دەفرەکە هەڵگرت و دەم و چاومی پێ سووی، پێغەمبەریش ﷺ پێدەکەنی)) ابو یعلی (مجمع الزوائد ٣١٦/٤).

---

[1] حەریرە خواردنی نەخۆشە، ئارد و ڕۆن و شیر پێکەوە تێکەڵ دەکرێ و لێدەنرێ.

ئەم فەرمووودانە بەڵگەن لەسەر سانایی ئیسلام و موسڵمانان و، لەسەر ئەو ئێسك سوكی و قسە شیرینی و گەمە و یارییەی ئیسلام دەیەوێت، ئەوانە چەند ئاكارێكی خۆشەویستن بۆ ئافرەتی موسڵمانی ئەو سەردەمە، كەمەندكێشی و جوانی و كاریگەری زیاتر دەدات بە كەسایەتیەكەی.

## خۆشی و ئاسودەیی دەخاتە دلان

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو بایەخ دەدات بە بلاوكردنەوەی خۆشی و ئاسودەیی لە نێوەندی ئافرەتانا، هەروا بلاوكردنەوەی زیندوێتیو خۆشی و چالاكی لە دەروونیاندا، لە رێگەی گێڕانەوەی هەواڵی خۆش و نوكتەی گاڵتەئامێز و نوێ و ناوازە" چونكە ئاسودەیی خستنە ناو دڵی موسڵمانان لە چوارچێوەی ئەوەی خودا رێی پێداوە، داواكاری ئیسلامە و شەرعی ئیسلامی بێگەرد هانی لەسەر داوین، تاوەكوو كەش و هەوای موسڵمانان پڕبێ لە خۆشەویستی و ئاسودەیی و گەشبینی، دواتریش ئامادەبێ بۆ بەڕاستی كاركردن و فیداكاری.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەركەس بەو شێوەی خودا پێی خۆشە بە برای موسڵمانی بگات و ئاسودەی بكات، خودا لە رۆژی دوایی ئاسودەی دەكات)).

ئافرەتی موسڵمانی ژیریش جۆرەها شێوازی ئاسودەیی خستنە دڵی لەبەر دەستە تا بەهۆیەوە خۆشی بخاتە دڵی خوشكانی، وەكوو: سلاوكردنێكی گەرم وگوڕ، قسە و گوفتاری شیرین، ئاوڕدانەوەیەكی ژیرانە، نوكتەیەكی بەتام، مزگێنییەكی خۆش، زەردەخەنەیەكی خۆشەویستانە، سەردانێكی دڵسۆزانە، دیاریەكی دڵخۆشكەر، پەیوەندی بەردەوام، پاڵپشتیەكی ڕاستگۆیانە، دڵنەوایی كردن، كە بەهۆیانەوە دەرگای دڵەكان دەبێتەوە، تۆوی خۆشەویستی دەچنرێ، پەتی پەیوەندی دۆستایەتی دەگەیەنرێ، ڕەگی برایەتی بە هێزتر دەكات.

## توند نییە

ئافرەتی موسڵمان ئەو كارانە توند ناكات كە لە شەرعدا ڕێیان پێدراوە، بەتایبەتی لە بۆنەكان، وەك گۆرانی و سرود وتن لەكاتی جەژنەكان و ئاهەنگی بوك گواستنەوە، هەروا بینینی هەندێ دیمەن و نمایشی دڵخۆشكەر بە مەرجێك گەندەڵی و ئازار و گوناهی لێنەبێتەوە.

ئەگەرچی ئافرەتی موسڵمان هەندێ یاری و خۆشی ئەنجام دەدات لە بۆنەکان، بەڵام نابێ ببێتە هەموو غەمی، لە صحیحی بوخاری هاتووە: خاتوو عائشە ئافرەتێکی هەتیویان کردە بووك بۆ پیاوێکی ئەنصاری، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائشە شایی و بەزمتان نەکرد" چونکە ئەنصار حەزیان لە شایی و بەزمە)) فتح الباری ٩/٢٢٥.

لە بوخاری هاتووە: خاتوو عائشە وتی: ((پێغەمبەر ﷺ هاتە لام، منیش دوو کەنیزەکم لەلا بوو گۆرانی (بُعَاثیَان[1]) دەوت، پێغەمبەر ﷺ لەسەر جێگاکەی پاڵکەوت و ڕووی خۆی وەرچەرخاند، ابوبکریش ﷺ هاتە ژورەوە و خۆی لێ تورە کردم و وتی: زورنای شەیتانی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ! پێغەمبەریش ﷺ ڕووی تێکرد و فەرمووی: لێیان گەڕێ. عائشە وتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ بێئاگا بوو لێمان، بە چاو ئاماژەم بۆ کردن و چوونە دەرەوە)) فتح الباری ٢/٤٤٠.

لە گێڕانەوەیەکیتری بوخاری: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی ابوبکر هەر گەلێك جەژنێکی هەیە، ئەمەش جەژنی ئێمەیە)) فتح الباری ٢/٤٤٥.

هەروا بخاری قسەی خاتوو عائشە دەگێڕێتەوە: ((ڕۆژێکیان جەژن بوو، ڕەش پێستەکان بە زرێی چەرم و ڕم یاریان دەکرد، جا نازانم یان من داوام لە پێغەمبەر ﷺ کرد یان خۆی فەرمووی: حەز دەکەی سەیرکەی؟ وتم: بەڵێ، ئنجا لە پشتی خۆی ڕایگرتم، ڕومەتی لەسەر ڕومەتم بوو، وە دەیفەرموو: بگرن ئەی بەرەی ئەرفیدە[2]. تا ئەو کاتەی بێزار بووم، فەرمووی: ئەوەندە بەسە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: دە بڕۆ)) فتح الباری ٢/٤٤٥.

لە گێڕانەوەی یەزید کوڕی رومان لەلای نەسائیەوە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((ئەرێ تێر نەبووی، ئەرێ تێر نەبووی؟ منیش دەمووت: نەخێر، تا بزانم پلەوپایەم چەندە لەلای)) فتح الباری ٢/٤٤٠.

---

[1] بُعَاث: شوێنێکە لە قەراغی مەدینە تیایدا شەرێك لە نێوان ئەوس و خەزرەج ڕویداوە پێش ئیسلام ناونراوە بە ڕۆژی بعاپ، شاعیران شیعری زۆریان لەسەر وتووە..

[2] نازناوێکی حەبەشیەکانە.

سیراج له ڕێگەی ابی الزناد له عوروه له خاتوو عائشه دەگێڕنەوە: پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژه فەرموویەتی: ((تاوەکوو جولەکه بزانێ ئاینی ئێمه فراوان و کراوەیه، وه من به ئاینێکی ڕاستاڵ و سانا و دلۆڤان نێردراوم)) فتح الباری ٢/٤٤٤.

ترمذي له خاتوو عائشه دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: ((پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو، له پڕ گوێمان له غەڵبه غەڵب و دەنگه دنگی منالآن بوو، پێغەمبەر ﷺ هەڵسا سەیریکرد، بینی ئافرەتێکی حەبەشی سەما دەکات و منالآنیش له دەورەی کۆبونەتەوە، فەرمووی: ((ئەی عائشه، وەره سەیرکه)) منیش هاتم، گەردنم لەسەر شانی پێغەمبەر ﷺ دانا، له نێوان شانی و سەری سەیری ئافرەتەکەم دەکرد، پێی فەرمووم: ((ئەرێ تێر نەبوویت؟)) منیش هەر دەموت: نا، تا بزانم پلەوپایەم چەنده لەلای، تا ئەو کاتەی عومەر ﷺ دەرکەوت، ئیتر خەڵکەکه له ترسانا پەرتەیان لێکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من دەبینم شەیتانەکانی پەری و ئادەمی له عومەر هەڵآتن)) عائشه وتی: ئیتر منیش گەڕامەوە)) الترمذي ٥/٦٢١.

ئەم فەرموودانه بەڵگەن لەسەر چاکی و جوانی خورشەوشتی پێغەمبەری هاوسەر ﷺ و نازدانی به هاوسەرەکەی، وه بایەخدانی به بەختەوەرکردنی و خۆشی خستنه دڵی، هەروا بەڵگەیه لەسەر فراوانی و کراوەیی و سانایی ئیسلام و، میهرەبانیەکەی بۆ ئافرەتان کاتێ ڕێگەیدا ڕابوێرێ به هەندێ جۆری خۆشی و بەزم و یاری، که هەندێ له ئافرەتانی توندڕەوی ئەمڕۆ به تاوانێکی گەورەی تێدەگەن و ئافرەتی لەسەر سزا دەدەن.

پێویسته ئافرەتی موسڵمان له زۆربەی کاتەکانی ڕاست و بێ پێچ و شۆخی بێت، خەریکی کاری بەرز بێت، وەرجەرخێ له کاری پوچ و بێسود، بەلام ئەمه ئەوه ناگەیەنێ بەشداری شایی و بەزم و خۆشی نەکات له بۆنەکان بەو شێوەی ئیسلام ڕێگەی پێداوه وەکوو کراوەیی و خۆشی و فراوانی" چونکه خودا شارەزای دەروونەکانه و دەزانێ ماوه نا ماوه ئارەزووی باڵ سوککردن و شایی و بەزم و خۆشی دەکەن، تاوەکوو پاشان چالاکانەتر بگەڕێنەوه سەر کاری ڕاستی، به دڵێکی پتەوتر و ئامادەبونێکی زیاتر بۆ هەڵگرتنی ئەرکی هەڵسان به بەرپرسیاریەتیەکان. هەر ئەوەشه ئیسلام له پرۆگرامه هاوسەنگ و یەکسان و گشتگیرەکەی بەدیهێناوه.

## لووت بەرزی ناکات

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆی ڕۆشنبیر بێفیزە، لووت بەرزی ناکات لەسەر ئافرەتانیتر لەوانەی کەمتر جوانترن، یا بنەماڵە و ڕەچەڵەکیان وەکوو ئەو ناودار نییە" چونکە دەزانێ فیز و لووت بەرزی لە دونیا دەبێتە هۆی بێبەش بوون لە خۆشیەکانی دوارۆژ، خودا دەفەرمووێ: ﴿ تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجعَلُهَا لِلَّذِينَ لاَ يُرِيدُونَ عُلُوًا فِي الأرضِ وَلاَ فَسَادًا، وَالعَاقِبَةُ لَلمُتَّقِينَ. واتا: بەهەشت ئامادەکراوە و دانراوە بۆ ئەوانەی لەسەر زەوی لووت بەرزی ناکەن و سەرپێچی و گەندەڵی ئەنجام نادەن، وە ئاکامی چاك و باش بۆ پارێزکارانە﴾ القصص: ۸۳.

هەروا دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ تُصَعِّر خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلاَ تَمشِ فِي الأرضِ مَرَحًا إِنَّ اللهَ لاَيُحِبُّ كُلَّ مُختَالٍ فَخُور. واتا: ﴿بە فیزەوە ڕوو لە خەڵکی وەرمەگێڕە، وەلەسەر زەوی بە لووت بەرزی و کەش و فشەوە مەڕۆ، بەڕاستی الله خۆشی نایێت لە هەرچی خۆ بەزل زان و شانازیکار بێت لەسەر خەڵکی﴾ لقمان: ۱۸.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ناچێتە بەهەشت ئەوەی تۆزقاڵێك فیزی لە دڵدا بێت، پیاوێك وتی: پیاو هەیە حەز دەکات جلەکەی و پێڵاوەکەی جوان و باش بێت. فەرموووی: ((خودا جوانە و جوانی خۆش دەوێت، لووت بەرزی دان نەنانە بە حەق و بە سوك و بەکەم سەیرکردنی خەڵکە)) مسلم ۲/۸۹.

حارثة بن وهب ﷺ وتی: لە پێغەمبەری خوا ﷺم بیست دەیفەرمووو: ((ئایا هەواڵی کۆمەڵی ئاگرتان پێبدەم؟: هەموو دڵ ڕەق و توندێکە، کە لە ڕۆیشتنیدا لووت بەرزی دەکات و، خۆی بە زل دەزانێ)) متفق علیه.

ئەوەندەش بەسە بۆ ئافرەتانی لووت بەرزی بە فیزی خۆ بەزل زان لەسەر هاوڕێکانیان کە خودا سزایەکی ناخ (معنوی) لە ڕۆژی دوایی بۆ ئامادە کردوون، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خودا لە ڕۆژی دوایی سەیری ئەو کەسە ناکات لەبەر لووت بەرزی جلی شۆڕی لە دوای خۆی دەخشاند)) متفق علیه.

وه دەفەرمووێ: ((سێ کەس خودا لە ڕۆژی دوایی قسەیان لەگەڵ ناکات و، خاوێنیان ناکاتەوە و، سەیریان ناکات و، سزایەکی بە سۆشیان بۆ هەیە: بە ساڵاچویەکی داوێن پیس، پادشایەکی درۆزن، وە هەژارێکی خۆ بەزل زان)) مسلم ٢/١١٥.

چونکە خۆ بەگەورە زانین تایبەتمەندی خوای باڵا دەستە، ناشێ دروستکراوی لاواز و بێ دەسەڵات بیکاتە تایبەتمەندی خۆی، وە هەرکەس دەروونی خۆ بەزل زانی بۆ ڕازاندەوە، ئەوا سنوری پلەوپایەی ئولوهیەتی خوای بەزاندووە، لە مسلم هاتووە: ((خودای باڵا دەست دەفەرمووێ: ((شکۆداری پۆشاکمە، خۆ بەگەورە زانینیش باڵا پۆشمە، هەر کەسێك لە یەکێك لەو دووانە ململانێم لەگەڵدا بکات ئازاری دەدەم)) متفق علیە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەسێك خۆی بەگەورە هاتە بەرچاو، یان لە ڕۆیشتنیدا لووت بەرزی کرد، ئەوا کاتێ بە خوا دەگاتن خودا لێی تورەیە)) البخاری ٢/٧.

## خاک سیفەت و خۆ بەکەم زانە

ئافرەتی موسڵمانی شارەزا بە ئاینەکەی، خاك سیفەتیە، خۆ بەکەم زانە، دڵ فراوانە، لە هەڵکردنی لەگەڵ خەڵکی نەرمە" چونکە دەزانێ لە بەرامبەر ئەو دەقانەی هەڕەشە لە لوت بەرزی دەکەن، دەقیتر هەیە هانی خۆ بەکەم زانین و ڕاخستنی باڵ دەدەن و خۆشەویستی دەکەن، مسلم دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەرکەسێ بۆ خوا خۆی بەکەم بزانێ مسۆگەر خوا بەرزی دەکاتەوە)) مسلم ١٦/١٤١.

هەروا دەفەرمووێ: ((خودا سروشی بۆ ناردم کە خۆ بەکەم زان بن، تاوەکوو کەس شانازی بەسەر کەس نەکات، وە کەس دەستدرێژی نەکاتە سەر کەس)) مسلم ١٧/٢٠٠.

ئافرەتی موسڵمان لە وردبوونەوەی لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ نمونەیەکی زیندوو و ناوازە دەبینێ لە خاك سیفەتی و خۆ بەکەم زانین و سانایی و ڕێز و دەروون فراوانی، دەگێڕنەوە ئەنەس

ﷺ به لای چەند منالێك تێپەڕبووە و سلاوی لێکردوون و، وتی: (پێغەمبەر ﷺ وایکردووە) متفق علیه.

هەروا ئەنەس ﷺ لەبارەی خاك سیفەتی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕتەوە: کەنیزەکێك لە کەنیزەکەکانی مەدینە دەهات دەستی پێغەمبەری ﷺ دەگرت و بۆ کوێ بیویستایە دەیبرد، تا پێویستی بۆ جێبەجێ بکات)) فتح الباری ١٠/٤٨٤.

تەمیم کوڕی ئوسەید دێتە مەدینە، تا لە ئەحکامەکانی ئیسلام بپرسێ، ئەو پیاوە حەزی بە دیتنی پێغەمبەر ﷺ ە، ئەو پێغەمبەرەی یەکەم پیاوی دەوڵەتی ئیسلامییە، کەچی هیچ پاسەوان و پەردە و ڕێگرێك نابینێ لە گەیشتن پێی، ئەوەتا تەمیم خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە، کە مسلم لێی دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: ((گەیشتمە لای پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەی وتاری دەدا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، پیاوێکی ناشارەزا و نامۆ هاتووە لە ئاینەکەی پرسیار بکات، نازانێ ئاینی چییە؟ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وتارەکەی جێهێشت و هاتە لام، کورسیەکیان بۆ هێنا و لەسەری دانیشت و دەستی کرد بە فێرکردنم لەوەی خودا فێری کردبوو، پاشان گەڕایەوە سەر وتارەکەی و تەواویکرد)) مسلم ٦/١٦٥.

هەروا پێغەمبەر ﷺ ئەم خوڕەوشتەی لە دەروونی هاوەڵان دەچاند، بخاری دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر بۆ قۆڵی مەڕێك یان بۆ پێچکەکەی بانگەشە بکرێم بە دەمیەوە دەچم، وە ئەگەر قۆڵی مەڕێك یان پێچکەکەییم بە دیاری بۆ بێنن ڕەوانەی ناکەمەوە و وەری دەگرم)) فتح الباری ٥/١٩٩.

## میانڕەوە لە جل و بەرگ و ڕواڵەت و دیمەنی

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆناکبیر پابەندە بە میانڕەوی لە هەموو شتێك بەتایبەتی لە جل و بەرگ و دیمەنی، بایەخ بە چاکی و باشی دیمەنی دەدات بەبێ زیادەڕۆیی و لووت بەرزی، پەیڕەوی ئەو ئافرەتە زیادەڕۆیانە ناکات کە جل و بەرگە نوێکانیان لەپاش ئەوەی یەکجار لەبەری دەکەن و فڕێی

دەدەن و، دوای مۆدێکی بێسنور کەوتوون، لە هەمان کاتیشدا دیمەن و ڕێك و پێکی جل و بەرگی فەرامۆش ناکات.

لە ئاستی میانڕەوی دەوەستێ، وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُواْ لَم يُسرِفُواْ وَلَم يَقتُرُواْ وَكَانَ بَينَ ذَالِكَ قَوَامًا. واتا: ئەوانەی لە خەرجیدا زیادەڕۆیی ناکەن و ڕەزیلیش ناکەن، وە لە نێوان ئەو دوانەدان و میانڕەون﴾ الفرقان: ٦٧.

ئافرەتی موسڵمان هۆشدار و ئاگادارە لە ملکەچبوون بۆ کۆیلایەتی مۆدە، کە خانەی نمایشگاکانی جل و بەرگ سەرپەرشتی دەکەن و، هیچ خێر و چاکەیەکیان بۆ ئافرەت ناوێت، بەتایبەتی ئافرەتی موسڵمان.

ئافرەتی موسڵمان خۆی دەپارێزێ لەو کۆیلایەتیەی پێغەمبەر ﷺ هۆشداری لە بارەوە داوین، وەك دەفەرمووێ: ((بەدبەختە کۆیلەی دینار و درهەم و قەدیفە و خوری و صوف، ئەگەر بیدەیتێ ڕازی دەبێت، وە ئەگەر نەیدەیتێ ڕازی نابێت)) فتح الباری ٨١/٦.

هەروا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((لەو کاتەی پیاوێك بە کەش و فشەوە دەڕۆیی، لەناو دوو جلی جوانا بە فیزەوە دەڕۆیی و خۆی بادەدا، زۆر سەرسام بوو بە خۆی، خودا بە زەویدا ڕۆیچواند، تا ڕۆژی قیامەت بە ناخی زەویدا دەچێتە خوارەوە)) مسلم ٦٤/١٤.

ئافرەتی موسڵمان جوانکاری و هۆکاری ڕازاندنەوەیەك بەکاردێنێ کە شەرع ڕێی داوە، هەروا جلی جوان و ڕێك و پێك و گرانبەهاش لەبەر دەکات، بەڵام ئەمانە هەموی لە چوارچێوەی ئەو شتە پاك و چاکانەیە کە خودا بۆی حەڵاڵ کردووە، بەبێ ئەوەی لارکاتەوە بۆ زیادەڕۆیی و زیادە خەرجی، ئەمەش ئەو میانگیریەیە کە ئیسلام بانگەشەی بۆ دەکات، وە جیاوازیەکی زۆریش هەیە لە نێوان ئافرەتی موسڵمانی میانگیر و دانا و سەنگین، لەگەڵ ئافرەتی زیادەڕۆ و ئاش و بۆش و ناژیر.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر لە جل و بەرگ و دیمەنیدا دوورە لە زیادەڕۆیی هەروا لە کەمتەرخەمی: نە زیادە ڕۆیی و زیادە خەرجی دەکات لە خۆڕازاندنەوە و جل و بەرگ و دیمەنیدا،

وه نه کەمتەرخەمی دەکات لە دیمەن و جل و بەرگی تا ڕادەی ڕەزیلی و چروکی، یان زوهد بکات لە ڕێك و پێکی دیمەن و چاك و باشکردنی، بە گومانی ئەوەی بەم زوهدەوە خواپەرستی دەکات و ڕەزامەندی خودا دەباتەوە.

ئەو ئافرەتەی جلی جوان لەبەر دەکات بۆ فیز و لووت بەرزی و خۆبادان لەسەر دەستە خوشکانی گوناهبارە" چونکە خودا ئەوانەی خۆش ناوێت کە لووت بەرزن و شانازی دەکەن بە خۆیان، بەلاّم ئەو ئافرەتەی جل و بەرگی جوان لەبەر دەکات بە مەبەستی دەرخستنی بەخششی خودا، تاوەکوو پاڵپشتی و کۆمەکی بێت بۆی لە خواپەرستی، ئەوا گوێڕایەڵی خودایە و پاداشتی بە چاکە دەدرێتەوە، ئەوەشی جلی جوان لەبەر ناکات لەبەر ڕەزیلی، هیچ سەنگ و ڕێزێکی لە دڵی خەڵکی نییە، وا دەزانێ بە حەرامکردنی شتە حەڵاڵەکان لەسەر خۆی خواپەرستی دەکات، ئەمیش بە هەمان شێوە گوناهبارە، وەکوو چۆن شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە ـ رحمه الله ـ[1] دەڵێ: (کۆڵەکە و پاڵپشتی بەختەوەری ئافرەتی موسڵمان لە دین و دونیای لە مانەیە: دامەزراوی و نێوەنجیەتی و میانڕەوی.

ئەمە کار و پیشەی ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیرە بەڕێنمایی ئاینەکەی، کە پابەندە بە ئەحکامە پیرۆزەکانی و، جل و بەرگی خاوێن و جوان و ڕێك و پێك و شایەنی خۆی لەبەر دەکات، بەخششی خوا لەسەر خۆی دەردەخا، بەبێ زیادەڕۆیی و لووت بەرزی و کەش و فشی.

## گرنگی دەدات بە کاروبارە بەرز و پایەدارەکان

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو لە ڕێنمایی ئاینەکەی گرنگی دەدات بە کاروبارە بەرز و پایەدارەکان، دووردەکەوێتەوە لە کارو باری کەم بایەخ و پوچ و نزم کە شایستەی گرنگی دانی نییە لەلایەن مرۆڤی بەرز و شکۆمەند، لەسەر ئەم بنەمایە بەرزە لە بایەخدان و مەبەست و ئامانجی ناوازە پەیوەندی لەگەڵ ئافرەتانیتر بنیات دەنێ، لە ژیانیدا بوارێك نییە بۆ هاوڕێیەتی کردنی ئافرەتی ئاش و بۆش و بەدگۆ و بێنرخ، وە کاتیشی نییە بۆ گۆتە گۆت و قسەی بێسود و کەم

[1] فتاوي ابن تيمية ۱۳۸/۲۲، ۱۳۹.

بایەخ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خودای بەرز و شکۆمەند بەڕێز و بەخشندەیە، وە خۆشی دێت لە مرۆڤی بەڕێز و بەخشندە و لە کاروباری بەرز و پایەدار، وە ڕقی دەبێتەوە لە کاروباری بێ‌نرخ و کەم بایەخ)) الطبراني (مجمع الزوائد ٨/١٨٨).

## گرنگی دەدات بە کاروباری موسڵمانان

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆناکبیر بە ئەحکامەکانی ئاینەکەی گرنگی دان و بایەخدانی تەنها لە مێرد و منداڵەکانی نییە، بەڵکو بایەح بە کاروباری موسڵمانان دەدات، بە دوای هەواڵ و دەنگ و باسیانە" چونکە موسڵمانان وەك پێغەمبەر ﷺ چواندویەتی بەیەك جەستە، کاتێ ئەندامێکی بێتە ئێش، ئەوا سەرجەمی جەستەی بۆ دێتە شەونخونی و تا هاتن. مسلم ١٦/١٤٠. هەروا چواندویەتی بە یەك بینایە کە بەشێکی بەشەکەی‌تری ڕادەکێشێ و توند دەکات. مسلم ١٦/١٣٩.

لێرەوە گرنگی دانی ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری سەردەم بە کاروباری تاکی موسڵمان و خێزانی موسڵمان و کۆمەڵگەی موسڵمان و ئۆمەتی ئیسلامی سەرچاوەی گرتووە لە کەسایەتیە موسڵمانە تێرەکەی بە گیانی ئیسلام، کە لە ئاست ڕێنمایی و ئەحکامەکانی وەستاوە، هەروا سەرچاوەی گرتووە لە تێڕوانینی بۆمرۆڤ و ژیان و گەردون، وە لە هەستکردنی بەو بەرپرسیاریەتیەی ئیسلام هەموو موسڵمانێکی پێ هەڵپەساردووە، بە مەبەستی گەیاندن و ڕوونکردنەوەی ئەحکامەکانی بۆ خەڵك.

لە نمونەی ئەو ئافرەتە موسڵمانانەی بایەخیان داوە بە کاروباری موسڵمانان: مسلم لە (مولی شداد) دەگێڕێتەوە، وتی: چوومە لای عائشە لەو ڕۆژەی سەعد بن ابی وقاص کۆچی دوایی کرد، لەو کاتە عبدالرحمن بن ابی بکر هاتە ژورەوە و دەستنوێژی لەلا هەڵگرت، خاتوو عائشە فەرمووی: ئەی عبدالرحمن دەست نوێژەکەت بە تەواوی و ڕێك و پێکی بشۆ" چونکە لە پێغەمبەر ﷺ م بیستووە دەیفەرموو: ((هاوار و تیاچوون بۆ پاژنەی پێکان لە ئاگری دۆزەخ)) مسلم ٣/١٢٨.

خاتوو عائشە سەرنجی عبدالرحمانی برای ڕاکێشا لەوەی پاژنەی پێکانی جوان نەشوشتووە، بۆیە لەسەر ئەمە بێ دەنگ نەبوو، بەڵکو ئاگاداری کردەوە بە پێویستیەتی ڕێك و پێکی و تەواوەتی

دەستنوێژ گرتن، ئەم جۆرە بایەخدانەش لەسەر هەموو موسڵمانێك واجبە هەر كات و ڕەوشێك بێتە پێش و پێویست بكات بە فەرمانكردن بە چاكە و جڵەوگیری كردن لە خراپە.

وە كاتێ عومەر ﷺ بە خەنجەر لێیدرا و هەستی بە نزیكبوونەوەی مردنی كرد، بە عبداللە ی كوڕی وت: بڕۆ لای عائشە و سەلامی لێبكە و، مۆڵەتی لێ وەرگرە تا لەماڵی ئەو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و ابوبكر ﷺ بنێژرێم، عبداللە هاتە لای عائشە و پێی ڕاگەیاند، عائشە وتی: بەڵێ بە ڕێزەوە، پاشان وتی: كوڕەكەم، سەلامی من بە عومەر ڕابگەیەنە و پێی بڵێ: ئۆمەتی محمد ﷺ بەبێ شوان و ڕابەر جێمەهێڵە، جێنشینێك لە شوێنی خۆت دانێ، لەپاش خۆت فەرامۆشمان مەككە" چونكە من دەترسم دوچاری ئاژاوە و فتنە ببین. طبقات ابن سعد ٣٦٣/٣.

ئەمە تێڕوانینی دروست و دووربین و ژیرانەیە بۆ كاروباری ئۆمەت و، بەزەیی هاتنەوەیە پێی لەوەی بەبێ شوانێك بمێنێتەوە سەرپەرشتی بكات و كاروباری لە دەست بگرێت و یەكێتیو ئاسایشی بپارێزێ.

ئافرەتی موسڵمانی سەردەمیش لە وتەكانی خاتوو عائشە چرایەك دەبینێ ڕێگەی تێگەیشتنی بۆ ناوەڕۆكی ئیسلام و بۆ بەرپرسیاریەتیەكەی لە ئاین و ئۆمەتەكەی و گرنگی دانی بە كاروباری موسڵمانان بۆ ڕووناك دەكاتەوە، تاوەكوو چاوكراوانە ڕاپەڕێ بۆ بەجێگەیاندنی ئەركی كاركردن بۆ بێداركردنەوەی موسڵمانان و، بانگەشەكردنیان بۆ گەڕانەوەیان و بوونیان بە باشترین ئۆمەت كە بۆ خەڵكی بەدیهێنراوە.

## ڕێز لە میوانی دەگرێ

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ زۆر بەگەرمی پێشوازی لە میوانی دەكات، پەلە دەكات لە ڕێزگرتنیان، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەر كەسێ باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانی بگرێ)) متفق علیه.

ئافرەتی موسڵمان كاتێ ڕێز لە میوانی دەگرێ جەخت لەسەر باوەڕبونی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی دەكاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەر كەسێ باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە

با ڕێز لە میوانی بگرێ و پاداشتی بکات)) وتیان: پاداشتی چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((ڕۆژ و شەوەکەی، وە میوانیش سێ ڕۆژە، ئەگەر زیاتر لەوە مایەوە بە صەدەقە بۆی دەنوسرێ)) متفق علیه.

لەم ڕوانگەیەوە ڕێزگرتن لە میوان کارێکی بەڕێز و خۆشەویستە لەلای هەموو موسڵمانێك باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، لەلای خواش پاداشتی لەسەر هەیە، لەلای خەڵکیش ناوبانگی چاك و باش وەدەست دێنێ، ئیسلام میوانداری ڕێکخستووە و سنورێکی بۆ داناوە. بەم شێوەیە پاداشتی میوان شەو و ڕۆژێکە، پاشان ئەرکی میوانداری دێت کە سێ ڕۆژە، ئەوەی زیاتر لەمە دەبێتە صەدەقە و لە پەڕاوی کردەوە چاکەکانی ئافرەتی موسڵمانی خاوەن میوان دەنوسرێ.

ڕێزگرتنی میوان لە ئیسلام کارێکی خۆویست نییە بەپێی ئارەزووو هەوا و کۆششی کەسەکان بێت، بەڵکو ئەرك و واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك و دەبێت لەو کاتەی یەکێ لە دەرگای دەدات و بە میوانی دێتەماڵیان جێبەجێی بکات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((شەوی میوانداری حەق و واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك بەرامبەر ئەو کەسەی دەچێتە ماڵی و ڕۆژی تیا دەکاتەوە، ئەم حەق و واجبە دەبێتە قەرز لەسەر شانی، ئەگەر بیەوێت دەیداتەوە، ئەگەریش بیەوێت فەرامۆشی دەکات)) البخاري ٢/٢٠٧.

بەڵام ئەوانەی دڵیان تەنگ دەبێ بە پێشوازیکردن لە میوان و، دەرگایان بە ڕوو دادەخەن، هیچ خێریان تێدا نییە، امام احمد لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((خێر لەو کەسە دانییە میوانی ڕاناگرێ)) احمد ٤/١٥٥.

ئیسلام میوان ڕاگرتنی واجبکردووە لەسەر هەموو موسڵمانێك، بەیەکێ لە حەقە فەرزەکانی میوانی داناوە، کە نابێ هیچ مرۆڤێکی موسڵمان کەمتەرخەمی بکات لە جێبەجێکردنی، عوقبە بن عامر ﷺ وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ دەماننێریتە لای کۆمەڵ و هۆزێك دەبینە میوانیان و ڕامانناگرن، ڕات چییە بەرامبەر بەمە؟ فەرمووی: ((ئەگەر لەلای کۆمەڵ و هۆزێك بوونە میوان و فەرمانکرا بەوەی پێویستە بۆ میوان بۆتان کرا، پێی ڕازی بن، ئەگەر نەیانکرد، ئەوا مافی ئەو میوانداریەی لەسەریان پێویستە لێیان وەرگرن)) متفق علیه.

ڕێزگرتن لە میوان خوڕەوشتێکی ئیسلامی ڕەسەنە، بۆیە ئافرەتی موسڵمان نابێ چاوتەنگ و چروك بێ لە ڕێزگرتن لە میوان، یان مێردەکەی شەرمەزار بکات لەبارەی پێشوازیکردنی لە میوان، بارودۆخ و ڕەوشی خۆی و مێردەکەی هەر چۆنێك بێت" چونکە ابو هریرە ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: ((خواردنی دووان بەشی سیان دەکات، وە خواردنی سیانیش بەشی چواران دەکات)) متفق علیە.

کەواتە پێویست بە ترس ناکات لە هاتنی لە ناکاوی میوان، جابر ﷺ وتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرمووو: ((خواردنی یەك کەس بەشی دوو کەس دەکات، وە خواردنی دوو کەس بەشی چوار کەس دەکات، خواردنی چواریش بەشی هەشت کەس دەکات)) مسلم ١٤/٢٢.

ئافرەتی موسڵمان کە ئیسلام دەروونی داڕشتووە، ناترسێ لە دەستی زۆر لەسەر خوانی نان خواردن، پێچەوانەی حاڵی ئافرەتی ڕۆژئاوا کە پێشوازی لە میوانێك ناکات ئەگەر پێشتر خواردنێکی بۆ ئامادە نەکردبێ، بەڵکو ئافرەتی موسڵمان پێشوازی لە میوانەکان دەکات ئەگەر لە ناکاویش بێنە سەردانی، بە دڵێکی خۆشەوە میوانەکان بەشداری پێ دەکات لە خواردنی خۆی و خێزانەکەی، جا چی دەبێت ئەگەر چەند پارویەکی کەم لە پشکی ئەو ڕۆژی گەدەی کەم بوویەوە" چونکە برسێتی ساناترە لەلای ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ لە ڕانەگرتنی میوان وەك چۆن خودا و پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پێکردووە، بەڵکو بڕوای وایە خودا فەڕو بەرەکەت دەخاتە خواردنەکەیان، وە هیچ پێویستیەك نییە بۆ ئەو جۆرە ڕەفتارە وشکانەی مرۆڤی ڕۆژئاوایی پێی گرفتاربووە، ئەوانەی پەروەردەی دەستی ژیاری مادیەتن چ لە ڕۆژئاوا چ لە ڕۆژهەڵات.

بوخاری و مسلم لە ابو هریرە ﷺ دەگێڕنەوە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ ناریە لای خێزانەکانی بۆ خواردن، وتیان: لە ئاو زیاتر هیچیترمان نییە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کێ ئەوەی لە خۆ دەگرێ یا میوانداری دەکات؟)) پیاوێك لە یاریدەدەران وتی: مـن، بردیەوە لای خێزانەکەی و وتی: ڕێز لە میوانی پێغەمبەر ﷺ بگرە، وتی: بێجگە لە خواردنی منالەکان هیچیترمان نییە، وتی: خواردنەکە ئامادە بکە، خۆشت خەریك بکە بە چاککردنەوەی چراکە، وە منالەکانیش ئەگەر داوای نانی ئێوارەیان کرد بیانخەوێنە، ئنجا خواردنەکەی ئامادەکرد

و، خۆی خەریك كرد بە چراكە و، منالّەكانیشی خەواند، پاشان هەڵسا و وای نیشاندا چراكە چاك دەكاتەوە، بەڵام كوژاندیەوە و، خۆیان وا نیشاندا نانی ئێوارە دەخۆن و، بە سكی برسی خەوتن. كە بەیانی بوویەوە چووە لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خودا سەرسام بوو لە كردەوەی ئەو شەوەتان بەرامبەر بە میوانەكەتان))، جا خودا لەبارەیانەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَيُؤثِرُونَ عَلَى أنفُسِهِم وَلَو كَانَ بِهِم خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفسِهِ فَأُوْلَآئِكَ هُمُ المُفلِحُونَ. واتا: خودی پێویستی خۆیان فەرامۆش دەكەن بۆ هەژارانیتر هەرچەندە خۆیان لە پێشترن بەو پێویستیە، وە هەر كەسێ خۆی بپارێزێ لە چروكی دەروون و پەیوەستبوونی بە ماڵی دونیا ئەوانە براوەو سەركەوتوون﴾ الحشر: ٩.

ئافرەتی موسڵمانی ڕێزدار میوان ڕادەگرێ لە هەر كاتێك سەردانی بكەن، بەمەش دەبێتە پاڵپشت بۆ مێردەكەی تا ئەمیش ڕێز لە میوان بگرێ و پەلە بكات لە بەگەرمی پێشوازیكردن لێیان:

وەك شاعیر دەڵێ:

أُضَاحِكُ ضَيفِي قَبلَ إنزَالِ رَحلِهِ ... وَخصَبُ عِندِي وَالزَّمَانُ جَدِيبُ

مَا الخَصبُ لِلأضيَافِ أن يَكثُرَ القِرَى ... وَلَكِنَّمَا وَجهُ الكَرِيمِ خَصِيبُ

واتا:

بە زەردەخەنە و پێكەنین پیشوازی لە میوانم دەكەم پێش ئەوەی كەل و پەلی دابەزێ، پیت و فەڕ و پیرۆزی دەڕژێتە سەرم هەرچەندە ڕۆژگاریش قاتی و گرانی بێت، هەرگیز پیت و فەڕی بۆ میوان بە زۆری خواردن نییە، بەلكو ڕووی گەشی مرۆڤی بەخشندە خۆی پیت و فەڕو پیرۆزیيە.

## پێویستی خۆی فەرامۆش دەکات بۆ کەسانی پێویستر (خۆنەویستە)

ئافرەتی موسڵمان کە لە ڕێنمایی ئیسلامی بێگەرد تینوێتی شکاوە، خودی خۆی فەرامۆش دەکات لە خێر و چاکە و بە کەسانیتر دەبەخشێ، هەرچەندە خاوەنی ماڵی زۆریش نەبێ" چونکە ئەم کارە زۆر بەرز و ناوازە و خۆشەویستە، ئیسلام ئاماژەی پێداوە و، هانی داوین لەسەری، تاوەکوو ببێتە شەقڵێکی تایبەتی و مرۆڤی موسڵمانی ڕاستگۆ و بەخشندەی پێبناسرێتەوە.

یاریدەدەران (خودا لێیان ڕازی بێت) پێشەنگ و سەرمەشقی ئەم ئاکارە جوانە بوون لەپاش پێغەمبەر ﷺ، خودا لەبارەیانەوە دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُواْ الدَّارَ والإِيمَانَ مِن قَبلِهِم يُحِبُّونَ مَن هَاجَرَ إِلَيهِم وَلاَ يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِم حَاجَةً مِمَّا أُوتُواْ وَيُؤثِرونَ عَلَى أنفُسِهِم وَلَو كَانَ بِهِم خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفسِهِ فَأُوْلآئِكَ هُمُ المُفلِحُونَ. واتا: ئەو یاریدەدەرانەی لە مەدینە جێنشینن و هەر زوو باوەڕیان هێناوە و ئەو کۆچبەرانەیان خۆش دەوێت کە بۆ لایان کۆچ دەکەن و لە دەروونیان هیچ حەسودی و ئیرەیی هەست پێناکەن بەرامبەر ئەو ماڵ و داراییەی پێیان دەبەخشن و خودی پێویستی خۆیان فەرامۆش دەکەن بۆ هەژارانیتر هەرچەندە خۆیان لە پێشترن بەو پێویستییە، وە هەر کەسێ خۆی بپارێزێ لە چروکی دەروون و پەیوەست بوونی بە ماڵی دونیا ئەوانە براوەو سەرکەوتوون﴾ الحشر: ٩.

ژیانی پێغەمبەر ﷺ پڕبوو لەو فیداکارییە، بۆیە لەناو دەروونی موسڵمانی پێشینە ڕەگی داکوتابوو، ڕۆچووبوو لە خوڕەوشتیان، سهل بن سعد ﷺ وتی: ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ جلێکی چنراوی هێناو، وتی: بە دەستی خۆم چنیومە تا لەبەری بکەی، پێغەمبەر ﷺ وەریگرت و پێویستیشی پێبوو، بەو جلە هاتە لامان، یەکێ وتی: بیدە بە من، چەندە جوانە! فەرمووی: باشە، جا هەندێ لەلامان دانیشت، پاشان ڕۆیشتەوە و جلەکەی پێچایەوە و بۆی نارد، خەڵکەکە پێیان وت: کارێکی باشت نەکرد! پێغەمبەر ﷺ لەبەریکرد و پێویستیشی پێبوو، پاشان لێیت داواکرد کە دەشزانی هیچ داواکاریەك ڕەت ناکاتەوە، وتی: سوێند بەخوا بۆ ئەوە داوام لێ نەکرد تا لەبەری بکەم، بەڵکو تا ببێتە کفنم. سهل وتی: جا بە ڕاستیش بوو بە کفنی)) فتح الباری ١٤/٣.

پێغەمبەر ﷺ دڵی خۆش دەبوو بە بینینی ئەو خوڕەوشتە لە خەڵکی، وەك دەفەرمووێ: ((ئەشعەریەکان ئەگەر لە غەزادا ئافرەتیان بێوەژن کەوتایە، یان خۆراکی مناڵەکانیان لە مەدینە

کەمی کردبایە، هەرچی لەلایان بوو لەناو یەك جل کۆیان دەکردەوە. پاشان لەناو یەك دەفر بەشیان دەکرد بە یەکسانی، ئەوان لە منن و منیش لە وانم)) متفق علیه.

چەندە جوانە ئەو خۆنەویستی‌یەی ئەنصار کە مرۆڤایەتی لێیانی ناسیوە! هەرواش لە ئەشعەریەکان و هاوشێوەی ئەوان لە نەوەکانی ئیسلام ناسیویانە! وە فەزڵ و بەخشندەیی پێغەمبەر ﷺ چەندە مەزنە کە تۆوەکەی لە دەروونی نەوەکانی پێشینەی موسڵمان چاند، نەوەکانی‌تریش لێیان وەرگرتن، تا بوو بە خوڕەوشتێکی ڕەسەن لە خوڕەوشتەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی.

### داب و نەریتەکانی ملکەچی پێوەرەکانی ئیسلام دەکات

ئافرەتی موسڵمانی چاوکراوە بە ئەحکامەکانی ئاینەکەی ملکەچی داب و نەریت و باوی چەوت نابێ، لەوەی خەڵکی لەسەری ڕاهاتووە" چونکە لەوانەیە ئەو نەریتە لە کەلتوری نەفامی کۆن یا سەردەم بێت کە ئیسلام دانی پیا نانێ.

ئافرەتی موسڵمان ماڵەکەی بە وێنەو پەیکەر ناڕازێنێتەوە، سەگ لە ماڵەکەی ڕاناگرێ بۆ پاسەوانی" چونکە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێکردووە، هەروا دەقە ڕاستەکانیش بە تەواوی یاساغیان کردووە.

ابن عمر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەوانەی ئەو وێنانە دروست دەکەن لە ڕۆژی قیامەت ئەشکەنجە دەدرێن، پێیان دەوترێ: دەی ئەوەی دروستتان کردووە زیندووی بکەنەوە)) متفق علیه.

خاتوو عائشە وتی: پێغەمبەر ﷺ لە گەشتێك گەڕایەوە، منیش پەنجەرەیەکی بچوکمان هەبوو بە پەردەیەك داپۆشیبوو وێنە و پەیکەری تیابوو، کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەمەی بینی ڕەنگی گۆڕا، فەرمووی: ((ئەی عائشە، توندترین ئەشکەنجە لەلای خوا لە ڕۆژی قیامەت بۆ ئەوانەیە لاسایی دەستکردی خوا دەکەنەوە!)) عائشە وتی: ئێمەش پەردەکەمان پارچە پارچە کرد و کردمانە سەرینێك یان دووان)) متفق علیه.

ابن عباس ﷺ وتی: گوێم له پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرمووو: ((هەموو نیگارکێشێك دەچێتە ناو ئاگر، هەر وێنەیەکی کێشابێ لێی دەبێتە نەفسێك و، لەناو دۆزەخ ئەشکەنجەی دەدا)) ابن عباس وتی: ئەگەر هەر ناچاربووی ئەو کارە بکەی، ئەوا وێنەی دار و بەرد و ئەو شتانەی گیانیان تیا نییە بکێشە. متفق علیه.

ابي طلحة ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((فریشتەکان ناچنە ماڵێك سەگ یان وێنەی تیا بێ)) متفق علیه.

خاتوو عائشە وتی: جبریل ـ علیه السلام ـ بەڵێنی دایە پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکی دیاریکراو بێتە لای، بەڵام کاتەکە هات و جبریلیش نەهات! عائشە وتی: پێغەمبەر ﷺ گۆچانێکی لە دەست بوو فڕێی دا و، فەرمووی: ((خودا و پێغەمبەرانی خوا هەرگیز بەڵێنیان ناشکێنن)) پاشان ئاوڕی دایەوە و بینی تولە سەگێك لەژێر چەرپایەکەیەتی. فەرمووی: ((ئەم سەگە کەی هاتۆتە ژوورەوە؟)) منیش وتم: سوێند بەخوا ئاگام لێی نەبووە، ئنجا فەرمانیکرد و دەریان کردە دەرەوە، پاشان جبریل هاتە لای، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵێنت پێدام و بۆت دانیشتم ، کەچی نەهاتی!)) جبریل ـ علیه السلام ـ فەرمووی: ((ئەو سەگەی لە ماڵتان بوو پێگرم بوو، ئێمە ناچینە ماڵێك سەگ یان وێنەی تیا بێ)) مسلم ١٤/٨١.

دەقی فەرمووودە لەم بارەیەوە زۆرن، هەموویان هەڵواسینی وێنە و چەسپاندنی پەیکەر حەرام دەکەن. وە پەردەی لاداوە لەسەر حیکمەتی ئەم حەرامکردنە، بەتایبەتی لەم سەردەمە تیایدا منافقان و لارە ڕێیان و خاوەنی بەرژەوەندی و حەز و ئارەزووو پەلە دەکەن بۆ ئەوەی ستەمکاران زیاتر درێژە بدەن بە ستەمەکانیان، بەهۆی دامەزراندنی پەیکەر بۆیان لە ژیان و لەپاش مردنیان، تاوەکوو ببێتە پەرستراو یان هاوشێوەی پەرستراو، کە لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتوون و پشتی لاوازان و بێدەسەڵاتان بە دار و قامچی سوردەکەنەوە.

ئەو ئیسلامەی پێش پانزە سەدە بیروباوەری یەکتاپەرستی هێنا، هەرچی بت و هاوبەش دانانە بۆ خوا و نەفامییە هەمووی تێك شکاند، هەرگیز ڕازی نابێت جارێکیتر ئەو بتانە بگەڕێنەوە

ژیانی موسڵمانانن جارێ بەناوی زیندوو ڕاگرتنی یادی فلانە سەرکردە، جارێتر بە ناوی ڕێزگرتن لە فلانە هونەرمەند، یا بەناوی بەگەورەگرتنی زانا یان شاعیر یان فلانە ئەدیب. کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەیەکی یەککگرتووە، بەگەورەگرتن و پیرۆز ڕاگرتن بۆ کەس نازانێ بێجگە لە الله، لەم ڕوانگەیەوە هیچ شوێنێکی نییە بۆ ئەو جۆرە بت و پەیکەرانە.

هەرچی ڕاگرتنی سەگە، ئەوا باسی تیا نییە ئەگەر بۆ ڕاوکردن یان بۆ مەڕو ماڵات و مێگەل یان بۆ زەوی و زار بێت، وەك هاتووە لە فەرموودەی ابن عمر ﷺ وتی: بیستم لە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((هەر کەسێ سەگێك ڕابگرێ تەنها سەگێك نەبێ کە بۆ ڕاوکردن یان مێگەلی مەڕ و ماڵات بێ، ئەوا هەموو ڕۆژێك لە پاداشتی دوو قیرات کەم دەبێتەوە)) متفق علیه.

هەرچی ڕاگرتنی سەگە لەسەر شێوەی ڕۆژئاوا لە ماڵەکان، بایەخدان و نازدان پێی، وە خواردن و صابون و شامپۆی تایبەتی بۆ دابنرێ، هەروا دروستکردنی گەرماوی تایبەت بۆی، لەوانەی لە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان و وڵاتە یەککگرتووەکان ئەنجامدەدرێ و چەندین ملیار دۆلاری لە ساڵێك بۆ خەرج دەکرێ، ئەوا هیچی بەسەر ئیسلام و داب و نەریتە پاکەکەیەوە نییە. وە ئەگەر ڕەوشی دەروونی و نەتەوەیی مرۆڤی ڕۆژئاوا و، ئەو ژیانە وشکەی مادیەت کە تیایدا دەژین لاری کردونەتەوە تا ڕادەی زیادەڕۆیی کردن لە پەروەردەکردنی سەگ، تا بەهۆیەوە سۆز و خۆشەویستی‌یەك کە لە مرۆڤ دەستیان نەکەوتووە قەرەبووی بکەنەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتیان، ئەوا ژیانی کۆمەڵایەتی لە ئیسلام بەسۆزی مرۆڤایەتی ئاودراوە و هیچ پێویستیەك بەو جۆرە لاری و لادانە نییە[1].

هەروا ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو لە دەفری زێڕ و زیو ناخوا و ناخواتەوە، هەرچەندە زۆریش دەوڵەمەند و خۆشگوزەران بێت" چونکە بەکارهێنانی دەفری زێڕ و زیو لە ئیسلام یاساغە.

ام سەلەمە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەوەی لە دەفری زیو دەخواتەوە وەك ئەوە وایە ئاگری دۆزەخ لە سکیدا ڕادا)) متفق علیه.

---

[1] سەیری تحلیلا لهذا الانحراف ص: ٢٩١ ـ ٢٩٣.

له گێڕانەوەی مسلم هاتووە: ((ئەوەی لەدەفری زێڕ یان زیو دەخوات و دەخواتەوە)) مسلم ٢٩/١٤. لە گێڕانەوەیەکیتر: ((هەر کەسێ لە دەفری زێڕ یان زیو بخواتەوە وەك ئەوەوایە لە سکیدا ئاگرێك لە ئاگری دۆزەخ ڕادا)) مسلم ٣٠/١٤.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر لەهەر کوێیەك بێت نەریتەك کۆمەڵگاکەی دەخاتە تەرازووی حوکم و بنەما و تێگەیشتنەکانی ئیسلام، هەرچی لەگەڵی بگونجێ وەریدەگرێ، ئەوەشی پێچەوانە بێت پشتگوێی دەخات، چ لە کاتی مارەبڕین یا لە کاتی ئاهەنگی بوك گواستنەوە بێت، یان لە ژیانی ماڵ و خێزان کۆمەڵگاکان بێت" چونکە داب و نەریت لە نێو گەلان و وڵاتانی ئیسلامی زۆر و جیاوازن، ئنجا حیکمەت لە داب و نەریتەکان یاسایی و مەشروعیەت و گونجانیەتی لەگەڵ ئیسلام، نەك لە زۆری وبڵاوبوونەوەی و پیادەکردنی لەنێو خەڵکی.

### پابەندە بە ئەدەبی ئیسلام لە خواردن و خواردنەوە

ئافرەتی موسڵمانی بێدار بەوە جیادەکرێتەوە دەستگرە بە ئەدەبی ئیسلام لە خواردن و خواردنەوە، کاتێ لەسەر خوان نان دەخوات، یا کاتێ ڕێك و پێکی خوانەکەی دەبینی، دەزانی تا چ ڕادەیەك ئەدەبی ئیسلامی پەیڕەوکردووە.

ئافرەتی موسڵمان بەناوی خوا دەست بە خواردن دەکات، وە بە دەستی ڕاستی و لەلای خۆیەوە دەخوات، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ناوی خوا بێنە و بە دەستی ڕاستت بخۆ و لەلای خۆتەوە بخۆ)) متفق علیه.

ئەگەر لەسەرەتا لەیادی چوو ناوی خوا بێنێ، ئەوا خاتوو عائشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر یەکێکتان نانی خوارد با ناوی خوا بێنێ، ئەگەر لەیادی چوو لە سەرەتاوە ناوی خوا بێنێ، با بڵێ: بەناوی خوا لە سەرەتا و لە کۆتایی)) ابو داود ٤٧٥/٣ والترمذي ٢٨٨/٤.

هەرچی نان خواردنە دەبێ بە دەستی ڕاست بێ، هەرگیز ئافرەتی موسڵمان بە دەستی چەپی نان ناخوات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەگەر یەکێکتان نانی خوارد با بە دەستی ڕاستی بخوات،

هەروا بە دەستی ڕاستی بشخواتەوە، “ چونکە شـەیتان بـە دەسـتی چـەپی دەخـوا و دەخواتـەوە))
مسلم ١٣/١٩١.

هەروا دەفەرمووێ: ((کەستان بە دەستی چەپی نەخوا و نەخواتەوە“ چونکە شەیتان بـە دەسـتی چەپی دەخوا و دەخواتەوە)) مسلم ١٣/١٩٢.

نافع ئەمەی لێ زیادکردووە: ((وە بە دەستی چەپی نەبەخشێ و وەرنەگرێ)) مسلم ١٣/١٩٢.

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ وتی: پیاوێك لەلای پێغەمبەر ﷺ بە دەستی چەپی نـانی خـوارد، فەرمووی: ((بە دەستی ڕاستت بخۆ)) وتی: ناتوانم: فەرمووی: ((یا خوا هـەر نـەتوانی))! تـەنها لەبەر لووت بەرزی وتی نـاتوانم! ئنجـا ئـەو پیـاوە تـا مـرد نـەیتوانی ئـەو دەسـتەی بـۆ دەمـی بەرزکاتەوە. مسلم ١٣/١٩٢.

پێغەمبەر ﷺ لە هەموو شتێك حەزی لە ڕاستەوانەیی دەکرد و هانی خەڵکیـشی لەسـەر دەدا، بوخاری و مسلم و امام مالك لە ئەنەس ﷺ دەگێڕنەوە: هەندێ شیریان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ بـە ئاوی بیر روونکرابوویەوە، لەلای ڕاستەی دەشتنشینێك و لای چەپیشی امامی ابـوبکر وەسـتابوو، ئنجا یەکەمجار بە خۆی لێی خواردەوە، پاشان دایە دەشتنـشینەکە و فـەرمووی: ((ڕاسـتە پاشـان ڕاستە)) متفق علیە.

سهیل بن سعد ﷺ وتی: ((خواردنەوەیەکیان هێنـا بـۆ پێغەمبـەر ﷺ لێـی خـواردەوە، لـەلای ڕاستی کوڕێك ـ ئەو کوڕە ابن عباس بـووە ـ بـوو، لای چەپیـشی پیـاوی بـە تەمـەن بـوون، بـە کوڕەکەی فەرموو: ((ڕێگە دەدەی یەکەمجار بدەمە ئەوانە؟)) کوڕەکە وتی: نا سوێند بەخوا بەشـی خۆم لە تۆ بە کەس نادەم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ دایە دەستی)) متفق علیە.

ئەو دەقانە هەموویان جەخت لەسـەر گرنگـی ئـەم ئادابـە ئیـسلامیيە دەکەنـەوە، کـە دەبـێ موسڵمان بەبێ کەمتەرخەمی دەستی پێوە بگرێت، هاوەڵان و شوێنکەوتوانیش لەسـەر ئـەم حاڵـە بوون، ئەوەتا عمر ﷺ لە یەکێ لە سەردانەکانی و بەسەرکردنەوەی گەلەکەی، پیـاوێکی بینـی بـە دەستی چەپی دەیخوارد، پێی وت: بەندەی خوا بە دەستی ڕاستت بخۆ، جارێکیتر بینیەوە بە دەستی

چەپی دەیخوارد، بە دارەکەی دەستی لێیدا و پێی وات: بەندەی خوا بـە دەسـتی ڕاسـتت بخـۆ، بـۆ جاری سێیەمیش بینی بە دەستی چەپی دەیخوارد، بە دارەکەی دەستی لێیداو و بەتوندی پێی وت: بەندەی خوا بە دەستی ڕاستت بخۆ، پیاوەکە وەڵامی دایەوە، ئەی ئەمیری باوەڕداران ئـەو دەسـتەم براوەتەوە، عمر وتی: بەچی بڕاوەتەوە؟ وتی: لە ڕۆژی غەزای موئتە بڕاوەتەوە، ئنجا عومەر گریا، ڕوویکـردە پیاوەکـە و داوای لێبـوردنی لێکـرد و دڵنـەوایی کـرد و وتـی: کـێ دەسـتنوێژت پـێ هەڵدەگرێ؟ کێ پێویستیەکانت جێبەجێ دەکات؟ کێ لە کاروبارەکانـت کۆمـەکیت دەکـا؟ پاشـان فەرمانیکرد چاودێری بکرێت و سەرپەرشتی بکرێت.

ئەوجا ڕووی گوفتارم لەو ئافرەتانە دەکەم کە یاسا و ڕژێمی خوانی ڕۆژئاوایی پەیڕەو دەکەن، بـە دانانی جەنگاڵ لەلای چەپ و چەقۆش لەلای ڕاست، تاوەکوو بەدەستی ڕاسـت خواردنەکـە بـبڕن و بەدەستی چەپیش بیخوات، ئنجا دەبینی خاڵ بە خاڵ ئەم ڕژێمە پەیڕەو دەکەن، بەبێ هەموارکردن، کەچی کاتێ بەدەستی چەپیان دەخۆن پێچەوانەی ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ ڕەفتار دەکەن، وە تۆزێـك خۆیان ئەزیەت ناکەن و جەنگالەکە بگوێزنەوە دەستی ڕاست و چەقۆکەش بۆ دەستی چەپ، نـەبادا پێچەوانەی ڕەوتی ڕۆژئاوایی رەفتار بکەن. ئەمەش جۆرێکە لە داڕوخـانی دەروونـی کـە ئۆمـەتی ئێمە پێوەی گرفتاربووە لەو تازەگەریەی بۆی ڕەوانە دەکـرێ و پـێ بـە پـێ پیـادەی دەکـەن بـەبێ هەمواركردن، یا گۆڕانێك كە بگونجێ لەگەڵ کەسـایەتی و ئـاین و بنـەما ڕەسـەنەکانی. ئـافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیریش دوورە لەو لاساییە کوێرانە و بێ نرخانە.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری شانازیکار بە ئاینە دامەزراوەکـەی و ئەدەبـە بەرزەکـەی جـەخت دەکاتەوە لەسەر خواردن بە دەستی ڕاستی، ئافرەتانیتریش بـۆ ئەمـە بـانگ دەکـات، شـەرمیش ناکات کاتێ بە ئاشکرا ئەم کارە دەکات لە ئاهەنگ و ئەو کۆبوونەوانەی تـا ئێـستاش دەسـتگرن بەوەی لەلایەن ڕۆژئاوا دێت، تاوەکوو ئافرەتانی بێ ئاگا و ئاش و بۆش بێداربنەوە، بگەڕێنەوە بـۆ بیروهۆشیان لە پەیڕەوکردنی ڕێنمایی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە ڕاستەوانەیی لە کـاتی خـواردن و خواردنەوە.

هەرچی پرسی دووەمە، ئەوەیە لە پێش خۆیەوە بخوات، وەکوو چۆن عومەر بن ابی سەلەمە ﵁ دەڵێ: منداڵ بووم لەژێر سەرپەرشتی پێغەمبەر ﷺ دابووم، ناغمان دەخوار، منیش بە هەموو لایەکی دەفرەکە دەستم دەگێڕا، پێغەمبەر ﷺ فەرموووی پێم: ((ئەی منداڵ ناوی خوا بێنە و بە دەستی ڕاستت بخۆ، وە لەپێش خۆشت بخۆ)) متفق علیه.

جوانترە بۆ ئافرەت کاتێ بە دەستی نان دەخوات، بە نەرم و نیانی و ڕێك و پێکی بیخوات، کعب بن مالك ﵁ وتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ م بینی بە سێ پەنجەی نانی دەخوارد، کاتێ تەواو دەبوو پەنجەکانی دەلێستەوە) مسلم ۱۳/۲۰٤.

جابر ﵁ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمانیکردووە بە لێستنەوەی پەنجەکان و سڕینەوەی دەفری نان خواردن و فەرموووی: ((چونکە ئێوە نازانن لە کوێی خواردنەکەتان فەڕ و پیرۆزی هەیە)) مسلم ۱۳/۲۰۷.

ئەنەس ﵁ وتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر نانی بخواردایە هەر سێ پەنجەی دەلێستەوە و دەیفەرمووو: ((ئەگەر پارویەك لە یەکێکتان کەوتە خوارەوە با هەڵیگرێتەوە و پیسییەکەی لێ لابدات و بیخوات و بۆ شەیتان جێی نەهێڵێ)) وە فەرمانی پێمان دەکرد دەفرەکەش بسڕینەوە و دەیفەرمووو: ((ئێوە نازانن لە کوێی خواردنەکەتان فەڕ و پیرۆزی هەیە)) مسلم ۱۳/۲۰۷.

لەم ڕێنماییە بەرزەی پێغەمبەر ﷺ وێڕای دەستکەوتنی فەڕ و پیرۆزی، هاندانە لەسەر پاك و خاوێنی دەستەکان و دەفرەکان، وە سڕینەوەیان لە پاشماوەی خواردن کە شایستەترە بە مرۆڤی پەروەردەکراوی خاوێن، زیاتریش بەڵگەیە لەسەر ڕێك و پێکی و خاوێنی و زەوقی بەرزی، ئەمڕۆش ڕۆژئاواییەکان دەستیان گرتووە بەو داب و نەریتەی پێغەمبەر ﷺ پیادەی کردبوو پێش ١٥ سەدە، ئەمڕۆ ڕۆژئاواییەکان دەفرەکانیان دەسڕنەوە و هیچی تیا ناهێڵن.

ئافرەتی موسڵمانی پەروەردەکراو لە کاتی نان خواردن مرچەمرچ و مشەمش ناکات، فو لە خواردن ناکات، دەنگی ناخۆشی لێ نابیسرێ، پاروی گەورە ناخاتە دەمی نەبادا دیمەنی دەمی و شێوەی هەڵئاوساو و ناشیرین بێتە بەرچاو سروشت و ناسکی و نەرمیەکەی بێزراو بێتە بەرچاو.

ئەو کاتەش لە نان خواردن تەواو دەبێ سوپاسی خوا دەکات، ئەبو ئومامە ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کاتێ خواردن هەڵدەگیرا دەیفەرمووو: ((الحمد لله كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، وَلاَ مَكْفِيٍّ وَلاَ مُوَدَّعٍ وَلاَ مُسْتَغنِيٌّ عَنهُ، رَبَّنَا)) فتح الباري ٩/٥٨٠.

واتا: ((سوپاس و ستایشی زۆر و پاك و پیرۆز و فەر تێخراو بۆ الله، خودایە کەمی نەکەی و لێمانی نەبڕی و لێی بێ نیاز نین، پەروەردگارمان)).

معاذ بن انس ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموووی: ((هەرکەسێ نانی خوارد پاشان وتی: الحمد لله الذي اطعمني هذا الطعام ورزقنيه من غير حول مني ولا قوة)) ابو داود ٤٠/٦٣ والترمذي ٥/٥٠٨.

واتا: ((سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەوەی پێبەخشیم و رزق و رۆزی پێدام بێ ئەوەی هیچ هەوڵ و هێز و توانایەکی منی تێدابێت، ئەوا خودا لە گوناهی خۆش دەبێت)).

ئافرەتی موسڵمانی خاوەن پەروەردەی ئیسلامی عەیب لە خواردن ناگرێ، ابو هريره ﷺ وتی: ((هەرگیز پێغەمبەر ﷺ عەیبی لە خواردن نەگرتووە، ئەگەر دڵی بیردایە دەیخوارد، وەگەرنا وازی لێ دەهێنا)).

هەرچی ئەدەبی ئاو خورادنەوەیە بەهەمان شێوە لە ئەدەبی ئیسلامی وەریدەگرێ، لە پاش بسم الله کردن بە دوو یان سێ جار ئاوەکە دەخواتەوە، هەناسەی لەناو دەفری ئاوخواردنەوە نادات، تا لە توانای دابێت لە دەمی کوندە ئاو ناخواتەوە، فو لەناو ئاو ناکات، تا لە توانای بێت بە دانیشتن ئاو دەخواتەوە، ئەنەس ﷺ وتی: ((پێغەمبەر ﷺ بە سێ جار ئاوی دەخواردەوە)) متفق عليه.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((بە یەك جار ئاو مەخۆنەوە وەك ئاوخواردنەوەی حوشتر، بەڵام بە دوو جار یان سێ جار ئاو بخۆنەوە، وە کاتێ ئاو دەخۆنەوە بسم الله بکەن، کاتێکیش تەواوبوون الحمد لله بکەن)) الترمذي ٤/٣٠٢.

ابی سعید الخدری ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوین لە فوکردن لە خواردنەوە، پیاوێك وتی: شتی پیسی تیا دەبینم، پێغەمبەر ﷺ فەرموووی: ((کەواتە بیرێژە))، وتی: لەیەك هەناسەدا

تێر ئاو نابم، پێغەمبەر ﷺ فەرموووی: ((کەواتە دەفرەکە لە دەمت بەرزکەرەوە پاشان هەناسە بدە)) الترمذي ٣٠٢/٤.

ئنجا باشترە بۆ ئافرەتی موسڵمان لەپاڵ ئەمانەی باسکران لە دەمی کونده نەخواتەوە و بە دانیشتن ئاو بخواتەوە تا لە توانای دابێت، هەرچەندە دروستە ئەگەر لە دەمی کوندەش بخواتەوە و یا بە وەستاوی ئاو بخواتەوە" چونکە پێغەمبەر ﷺ بە هەموو ئەم حاڵەتانە ئاوی خواردۆتەوە.

## پابەندە بە سلاوی ئیسلام

یەکێ لەو ئادابە ئیسلامیانەی ئافرەتی موسڵمانی پێ جیادەکرێتەوە: پابەندبوونیەتی بە سلاوی ئیسلامی، بە السلام علیکم دەگات بە موسڵمانان، بەپێی بنەماکانی سلاوکردن کە ئیسلام دایڕشتووە و فەرمانیکردووە بە سلاوکردن لە یەکتری.

سەلامکردن لە ئیسلام ئەدەبێکی ئیسلامی ڕەسەن و دیاریکراو و ڕێکخراوە، خودا لە قورئان فەرمانی پێکردوین، پێغەمبەریش ﷺ ڕێکی خستووە و بنەما و بنەڕەتەکانی بۆ داناوین لە ڕێگەی فەرموودەکانی، کە فەرموودە گێڕەوەکان لە بەشێکی سەربەخۆیان داناوە و ناویان ناوە (کتاب السلام) یان ( باب السلام).

خودا دەفەرمووێ: ﴿يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَدخُلُواْ بُيُوتًا غَيرَ بُيُوتِكُم حَتَّى تَستَأنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَى أَهلِهَا. واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە نەچنە ماڵانێك بێجگە لە ماڵی خۆتان تا مۆڵەت وەردەگرن و سلاو دەکەن لە دانیشتوانەکەی﴾ النور: ٢٧.

هەروا فەرمانیکردووە بەهەمان شێوە یان بە باشتر سلاو وەلامبدەینەوە، واجبە لەسەر هەر کەسێك سلاو دەبیسێ وەلام بداتەوە و فەرامۆشی نەکات، خودا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحسَنَ مِنهَا أَو رُدُّوهَا. واتا: ئەگەر سلاوتان لێکرا بە باشتر یا وەکو خۆی وەلام بدەنەوە﴾ النساء: ٨٦.

عبدالله بن عمر بن العاص ﷺ وتی: پیاوێك له پێغەمبەر ﷺ ی پرسی: کامە ئیسلام خێرتـرە؟ فەرمووی: ((نان بدەیی و سەلامکردن لەوەی دەیناسی و نایناسی)) متفق علیه.

سەلامکردن یەکێکە لەو ٧ راسپاردەیەی پێغەمبـەر ﷺ بـە هـاوەڵانی ڕاسـپاردبوو تـا پێـوەی پابەند بن لە ژیانی کۆمەڵایەتیان، البراء بن عازب ﷺ وتی: ((پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە ٧ شت پێکردوین: سەردانی نەخۆش، شـوێنکەوتنی جـەنازە، وتنـی یرحمـك الله بـەو کەسـەی دەپـشمێ، سەرخستنی لاواز و بێدەسەڵات، پاڵپشتی کردنی ستەم لێکراو، سڵاوکردن، نەشـکاندنی سـوێندی سوێندخۆر)) متفق علیه.

پێغەمبــەر ﷺ گرنگیــەکی زۆری داوە بــە ســڵاوکردن، هــانی داویــن لەســەر پیـادەکردنی، وە خۆشەویـستی کـردووە لـەلامان" چـونکە دەیزانـی کاریگـەری چـەندە زۆرە لەسـەر تەقاندنـەوەی سەرچاوەی خۆشەویستی لە دەروونەکان و، پتـەکردنی پەیوەندیـیەکانی دڵ، هـەروا تۆکمـەکردنی پەیوەندییەکانی دۆستایەتی و نزیکایەتی و سینە سافی لە نێوان تاکەکان و کۆمەڵەکان، تەنانـەت بە هۆکاری دروستبوونی خۆشەویـستی دانـاوە کـە بـەرەو ئیمـان و بـاوەڕ دەبـات، دواتـریش بـۆ بەهەشـت، وەك دەفـەرمووێ: ((سـوێند بـەوەی خـودی منـی بـە دەسـتە ناچـنە بەهەشـت تـا باوەڕنەهێنن، باوەڕیش ناهێنن تا یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پێبڵێم ئەگەر بیکەن ببێتە هۆی خۆشەویستبوونتان لەلای یەکتر؟ هەمیشە سڵاو لە یەکتر بکەن)) مسلم ٢/٣٥.

وە دەفەرمووێ: ((ئەوەی لە هەموو کـەس لـە خـوا لەپێـشترە ئـەو کەسـەیە یەکـەمجار سـەلام دەکات)) ابو داود ٥/٣٨٠.

بۆیە عبدالله بن عمر ﷺ دەچوویە بازاڕ و بەلای هەر یەکێك تێپەڕیبوایە سڵاوی دەکرد، ڕۆژێـك یەکێك لێی پرسی: لە بازاڕ چی دەکەی، نە شتێك دەکڕی، نە لە کەل و پەلێك دەپرسی و نە نرخـی زیاد دەکەی، لە کۆڕو دانیشتنەکانی بازاڕیش دانانیشی؟ وتـی: (بـەڵکو دەچـینە بـازاڕ لـەپێناوی سڵاوکردن لەوانەی پێیان دەگەین)) البخاری ٢/٤٦٥.

سڵاوکردن له ئیسلام داب و نەریتێکی کۆمەڵایەتی نییە، مرۆڤ له سەردەم و ژینگه جیاجیاکـان دایانڕشتبێ، که له ژینگەیەکی کۆمەڵایـەتی بـۆ ئـەوەیتر و لـه سـەردەمێك بـۆ سـەردەمێکیتر گۆرانکاری بەسەر دادێت، بەڵکو ئـەدەبێکی ئیـسلامی دیـاریکراوه لـه ڕووی شـێواز و بنـەما و بنەڕەتەکانی، وه تەنها یەك شێوازی هەیـه و موسـڵمانانی ڕۆشـنبیر بـەهۆی ئـەدەبی ئاینەکـەیان پێوەی پابەند دەبن، ئەوانەی گرنگی دەدەن بـه پیـادەکردنی ڕێنماییـه جۆربـەجۆر و ڕەسـەنەکەی، شێوازەکەش ئەمەیە: (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته). بەم شێوازه و به ڕانـاوی کـۆ دەگـوترێ، ئەگەر چی ئەوەی سڵاوی لێدەکرێ یەك کەسیش بێت، وەڵامدەریش دەڵێ: (وعلیکم السلام ورحمـة الله وبرکاته).

ئافرەتی موسڵمانیش پابەنده بەم شێوازه پیرۆزەی سڵاوکردن، سڵاوی ڕەسەنی ئیسلامی، وه بـه سڵاویتر و شێوازیتری بێجگه لەمه ڕازی نابێت.

ئەم سڵاوەی ئیسلام خودا بۆ موسڵمانانی هەڵبـژاردووه لەوەتـەی ئـادەم ﷺی دروسـتکردووه و فێری کردووه، تـا بـەم شـێوازه سـڵاو لـه فریـشتەکان بکـات" چـونکه واتـای سـەلام (ئاشـتی) خۆشەویسترین شته بۆ مرۆڤ له هەموو کات و شوێنێکدا. وه بێجگه له ئۆمەتی ئیسلام که لەسەر ئاینی پاك و بێگەرد ماوەتەوه، هیچ ئۆمەتێکیتر پابەنـد نـەماوه بـەم سـڵاوه خواییـه ڕەسـەنه، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((کاتێ خودا ئادەم ﷺ ی دروستکرد، فەرمووی: بڕۆ سـڵاو بکـه لـەو کۆمەڵه ـ چەند فریشتەیەك بوون دانیشتبون ـ ببیسته چۆن سڵاوت لێدەکەن، ئەمه دەبێته سـڵاوی خۆت و نەتەوەکەت، ئنجا ئادەم ﷺ فەرمووی: (السلام علیکم، فریشتەکان وتیان: السلام علیـك ورحمة الله، ئەوان رحمة الله یان بۆ زیادکرد)) متفق علیه.

بۆیه سەیرنییه ئەم شێوازه ببێته سڵاوی پیرۆز و پاك" چونکه لەلایەن خوداوه بۆمان هـاتووه و فەرمانی پێکردوین بیکەین به سڵاوی خۆمان و لێی لانەدەین بۆ شـێوازیتر، خـودا دەفـەرمووێ: ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُواْ عَلَى أَنفُسِكُم تَحِيَّةً مِن عِندِ اللهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً. واتا: ئەگەر چوونه هـەر ماڵێك سڵاو له خۆتان بکەن ـ واتا بڵێن: السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین ـ سڵاوێکی پـیرۆز و پاك و بێگەرد لەلایەن خواوه و پاداشتی لەسەر وەردەگرنەوه﴾ النور: ٦١.

خاتوو عائشە وتی: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ((ئەمە جبریلە سەلامت لێدەکات، وتی: وتم: سەلام و رەحمەت و بەرەکاتی خوا لەو بێ)) متفق علیە.

سڵاوکردن لە ئیسلام بنەمای هەیە، ئافرەتی موسڵمانی پابەند بە ڕێنمایی ئاینەکەی سورە لەسەر بەوردی پیادەکردنی لە ژیانی کۆمەڵایەتی، ابو هریرە ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سواری سڵاو لە پیادە دەکات، پیادەش سڵاو لە دانیشتوو دەکات، چەند کەسێکیش سڵاو لە چەند کەسێکی زۆرتر دەکەن)) متفق علیە. لە گێڕانەوەیەکیتری بوخاری: ((بچوکیش سڵاو لە گەورە دەکات)) البخاری: ٤٤٠.

ئەسمای کچی یەزید وتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێک بە مزگەوتدا تێپەڕی، کۆمەڵێک ئافرەت دانیشتبوون، پێغەمبەرﷺ دەستی هەڵبڕی وەکوو سڵاوکردن لێیان)) الترمذي ٥٨/٥.

پێویستە لە منالێش سڵاو بکرێ، تاوەکوو ڕابێن لەسەر ئادابی سڵاوکردن، ئەنەس ﷺ ڕۆژێک بەلای چەند منالێك تێپەڕی و سڵاوی لێکردن و، وتی: (پێغەمبەر ﷺ وایکردووە) متفق علیە.

یەکێکیتر لە بنەما و ئەدەبەکانی سڵاوکردن لە ئیسلام ئەوەیە: کاتێ بە شەو سڵاو لە یەکێ دەکەی بە دەنگێکی نزم بێت، بە شێوەیەك نووستوو بێدار نەکاتەوە، میقداد ﷺ وتی: ((ئێمە بەشە شیری پێغەمبەر ﷺ مان هەڵدەگرت، ئنجا بە شەو دەهاتە لامان و بە شێوەیەك سڵاوی دەکرد نووستووی بەئاگا نەدەهێنا، تەنها کەسی بێدار دەیبیست، ئنجا ئەو شەوەش پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان و وەکوو جاران سڵاوی کرد)) مسلم ١٤/١٤.

هەروا سڵاوکردن تەنها بۆ چوونە ژوورەوە نییە، بەڵکو کە هاتیە دەروەش سڵاو بکە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((کەسێکتان چووە کۆڕ و دانیشتنێك با سڵاو بکات، کاتێ هەڵساش با سڵاو بکات" چونکە سڵاوی یەکەم لەپێشتر و خێرتر نییە لەوەی کۆتایی)) ابو داود ٣٨٦/٥ والترمذي ٦٢/٥.

ئنجا ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری خاوەنی خوڕەوشتی ڕەسەنی ئیسلامی لە ڕێی ڕێنماییە بەرزەکانی پێغەمبەر ﷺ لە گەورەیی سلاوکردن و ئادابەکانی تێدەگات و بەوردی لە ژیانی تایبەتی و گشتی پیادەی دەکات و، خەڵکیش هان دەدات لەسەر پیادەکردنی و پابەندبوون بە بنەماکانی.

## ناچێتە بێجگە لە ماڵی خۆی مەگەر بە مۆڵەت وەرگرتن

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر ناچێتە ماڵێکی بێجگە لە ماڵی خۆی پێش مۆڵەت وەرگرتن، پاشان سلاو لە دانیشتووانی ئەو ماڵە دەکات. ئەمەش فەرمانێکی خواییە، ناکرێ فەرامۆش بکرێ و چاوپۆشی لێبکرێ، وەك دەفەرمووێ: ﴿يَآأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَدخُلُواْ بُيُوتًا غَيرَ بُيُوتِكُم حَتَّى تَستَأنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَى أهلِهَا ذَالِكُم خَيرٌ لَكُم لَعَلَّكُم تَذَكَّرُونَ. فَإن لَم تَجِدُواْ فِيهَا احَدًا فَلاَ تَدخُلُوهَا حَتَّى يُؤذَنَ لَكُم وَإن قِيلَ لَكُمُ ارجِعُواْ فَارجِعُواْ هُوَ أزكَى لَكُم وَاللهُ بِمَا تَعلَمُونَ عَلِيمٌ﴾ و ﴿وَإذَا بَلَغَ الأطفالُ مِنكُمُ الحُلُمَ فَليَستَأذِنُواْ كَمَا استَئذَنَ الَّذِينَ مِن قَبلِهِم. واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە نەچنە ماڵانێك بێجگە لە ماڵی خۆتان تا مۆڵەت وەردەگرن و سلاو لە دانیشوانەکەی دەکەن. ئەگەر کەستان لەو ماڵە نەبینی نەچنە ژوورەوە تا مۆڵەتتان دەدرێ، وە ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە چونکە گەڕانەوەتان باشترە لە چوونە ژوورەوەتان، وە خودا شارازا و زانایە بە کردەوەکانتان﴾ و ﴿کاتێ منداڵەکانتا گەیشتنە تەمەنی پێگەیشتن با مۆڵەت وەرگرن وەك چۆن گەورەکانیان پێش ئەوان مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەیان وەردەگرت..﴾ النور: ٢٧، ٢٨، ٥٩.

ناشێ بۆ ئافرەتی موسڵمان مۆڵەت وەربگرێ بۆ چوونە ماڵێك کە دروست نییە بۆی بچێتە ئەو ماڵە، وەك ماڵێك تەنها پیاوی بێگانەی تیابێ، مۆڵەت وەرگرتنی ئافرەتی موسڵمان بۆ چوونە لای ئافرەتانە، یان ئەو پیاوانەی مەحرەمن.

مۆڵەت وەرگرتنیش لە ئیسلام ئادابی هەیە:

یەکەمیان: مۆڵەت وەرگر لەبەر دەرگا ناوەستێ، بەڵکو لای چەپ یا ڕاستی دەرگا دەگرێ، عبدالله بن بُسر ﷺ وتی: ((کاتێ پێغەمبەر ﷺ چووبایەماڵێك و ویستبای مۆڵەتی چوونە ژوورەوە وەرگرێ، لەبەر دەرگا نەدەوەستا، بەڵکو لەلای ڕاست یان چەپی دەرگا دەوەستا، ئەگەر مۆڵەتی درابوایە دەچوویە ژوورەوە ئەگەرنا دەڕریشت)) البخاری ٢/٥١٣.

چونکە مۆڵەت وەرگرتن لەپێناو سەیرکردنی چاو دانراوە، سهل بن سعد ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵکو مۆڵەت وەرگرتن لەپێناوی چاو دانراوە)) متفق علیه.

لەم ڕوانگەیەوە دروست نییە بۆ کەسی مۆڵەت وەرگر پیاو بێ یا ئافرەت، ڕاستەوخۆ لەبەر دەرگا بوەستێ و چاو ببڕێتە کردنەوەی دەرگا.

دووەمیان: یەکەمجار سڵاوکردن پاشان مۆڵەت وەرگرتن، دروست نییە مۆڵەت وەرگرتن پێش سڵاوکردن، ربیعی بن حیراش وتی: پیاوێك لە بەرەی عامر بۆی گێڕامەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ماڵێك بووە، ئەمیش مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی وەرگرت و وتی: بێمە ژوورەوە؟ پێغەمبەر ﷺ بە خزمەتکارەکەی فەرمووو: ((بڕۆ دەرەوە لای ئەو کابرایە و چۆنیەتی مۆڵەت وەرگرتنی فێر بکە. پێی بڵێ: بڵێ: السلام علیکم، ئایا بێمە ژوورەوە؟ پیاوەکە گوێی لێ بوو، وتی: السلام علیکم، ئایا بێمە ژوورەوە؟ پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داو و هاتە ژوورەوە)) البخاری ٢/٥١٨.

سێیەمیان: پێویستە مۆڵەت وەرگر ناوی یان نازناوی خۆی بدات، ئەگەر پێی وترا: تۆ کێی؟ وە نابێ وشەیەکی شاراوە و نادیار بڵێ وەك: منم، یا خۆمانین، جابر ﷺ وتی: هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ لە دەرگام دا، فەرمووی: کێیە؟ وتم: منم، فەرمووی: منم منم؟! وەك بڵێی پێی ناخۆشبوو)) متفق علیه.

ابي ذر ﷺ وتی: (شەوێك لە شەوەکان چوومە دەرەوە، بینیم پێغەمبەر ﷺ بە تەنیا دەڕوات، منیش لەژێر ڕۆشنایی مانگ ڕۆیشتم، ئاوڕی دایەوە و بینیمی، فەرمووی: ((ئەوە کێیە؟)) وتم: ابو ذر). متفق علیه.

أم هانيء وتی: هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ خۆی دەشوشت، فاتیمەش پەردەی بۆ کردبوو، فەرمووی: ((ئەوە کێیە؟)) وتم: (منم ام هانیء). متفق علیه.

چوارەمیان: ئەگەر پێی وترا بگەڕێوە، با بگەڕێتەوە بێ ئەوەی لە دڵەوە پێی ناخۆش بێت، خودا دەفەرمووێ لە سورەتی النور ئایەتی ۲۸.پێشتر ڕاڤەکراوە.

بۆیە ابو موسی الاشعری ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مۆڵەت وەرگرتن سێ جارە، ئەگەر ڕێگای چوونە ژورەوەی درا باشە، ئەگەرنا با بگەڕێتەوە)) متفق علیه.

ابو موسی ﷺ وتی: (سێ جار مۆڵەتم لە عمر وەرگرت بۆ چوونە ژورەوە، کەچی ڕێگەی پێنەدام، منیش گەڕامەوەن کەسێکی نارد بە شوێنم و وتی: ئەی عبداللە، سەخت بوو لەسەرت لەبەر دەرگام بوەستی؟ بزانە خەڵکیش بەهەمان شێوە لایان سەختە لەبەر دەرگات بوەستن، منیش وتم: بەڵام من سێ جار مۆڵەتم لێت وەرگرت، کەچی ڕێگەم پێنەدرا، منیش گەڕامەوە (ئاوەها فەرمانمان پێکراوە) عمر وتی: لە کێ ئەوەت بیستووە؟ وتم: لە پێغەمبەر ﷺ م بیستووە، وتی: شتێکت لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە کە ئێمە نەمانبیستووە؟ ئەگەر بەڵگەیەکی ڕۆشن لەسەر ئەو قسەیەت نەهێنیەوە دەتکەمە پەند. ئنجا چوومە دەرەوە تا هاتمە لای کۆمەڵێ لە ئەنصار لە مزگەوت دانیشتبوون، لەم بارەیەوە پرسیارم لێیان کرد، وتیان: ئایا کەسێك هەیە گومانی لەو قسەیە هەبێ؟ منیش ئەوەی عمر وتی پێم ڕاگەیاندن، وتیان: دەبێ ئەوەی لە هەمووومان بچوکترە لە گەڵت بێ بۆ لای عمر، ئنجا ابو سعید الخدری یان ابو مسعود هەڵسا و لەگەڵم هات بۆ لای عمر و وتی: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووین، دەچووە لای سعد بن عوبادە، گەیشتەماڵیان و سڵاوی کرد، بەڵام مۆڵەتی پێنەدرا، دوبارە سڵاوی کرد، پاشان سێبارە سڵاوی کرد، هەر مۆڵەتی نەدرا، فەرمووی: ئەوەی لەسەر ئێمە بوو کردمان، پاشان گەڕایەوە، ئنجا سعد شوێنی کەوت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەو کەسەی تۆی بە حەق ناردووە، هەرچەند جار سەلامت دەکرد دەمبیست و وەڵامم دەدایەوە، بەڵام حەزمکرد زۆرتر سەلام لە خۆم و لە ماڵ و خێزانم بکەی. ئنجا ابو موسی وتی: سوێند بەخوا ئەمین و دەست پاکم لەسەر فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ،

عمر وتی: بەڵێ، بەڵام حەزم دەکرد قسەکەت بسەلمێنم و دڵنیا بم)) فتح الباری ۲٦/۱۱ ومسلم ۱۳۰/۱٤.

لە گێڕانەوەی مسلم هاتووە: کاتێ عومەر ﷺ فەرموودەکەی بۆ سەلما،وەکوو سەرزەنشتی دەروونی خۆی وتی: (لەو فەرمانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ ئاگا بووم، دەرچوون بۆ بازرگانی لە بازاڕ سەرقاڵ و بێ ئاگای کردبووم) مسلم ۲۳٤/۱٤.

ئەمانە ئاداب و بنەماکانی مۆڵەت وەرگرتن بوو لە ئیسلام، بێگومان ئافرەتی موسڵمانی گرنگی دەدات بە وەرگرتنی و ملکەچبوون بۆی و پیادەکردنی لە ژیانیدا، هەر کاتێك بچێتە سەردانی ماڵێك، مۆڵەتی چوونە ژوورەوە لە خاوەن ماڵ وەردەگرێ، هەروا کوڕان و کچانیشی فێری ئەم ئادابانە دەکات.

## بچێتە کۆڕێک لەو شوێنە دادەنیشێ کە کۆتایی کۆڕەکەیە

ئەمەش یەکێکیترە لە ئەدەبی ئافرەتی موسڵمان کاتێ دەچێتە کۆڕێکی قەرەباڵغ و ئافرەتانیتر پێش ئەو شوێنی خۆیان گرتووە، لەو کاتەدا ئەم لە کۆتایی کۆڕەکە دادەنیشێ. ئەمەش ئەدەبێکی کۆمەڵایەتی بەرزە لە کردەوە و گوفتاری پێغەمبەر ﷺ وەرگیراوە، هێمای زەوقی جوان و پایەبڵندی کۆمەڵایەتی و ڕەفتارشیرینییە.

ئافرەتی موسڵمانی بێدار بەسەر دانیشتوانی کۆڕەکە تێناپەڕێ و خەڵکی ناچارناکات تا شوێنی بۆ چۆل بکەن، جابر بن سەمورە ﷺ وتی: ((کاتێ بهاتینایە کۆڕی پێغەمبەر ﷺ لەو شوێنە دادەنیشتین کە کۆتایی کۆڕەکەیە)) ابو داود ١٦٤/٥ والترمذي ٧٣/٥.

ئافرەتی موسڵمانی بێدار دوورە لەوەی لە نێوانی دوو کەس دانیشێ و لە یەکیان بکات، مەگەر زۆر پێویست بێ، یان بە مۆڵەتی ئەوان بێت" پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((دروست نییە بۆ هیچ پیاوێك لە نێوانی دوو کەس دانیشێ مەگەر بە ڕێگە دانیان بێت)) ابو داود ١٧٥/٥ والترمذي ١٤/٥.

ئیسلام بەتوندی ناپەسندی و قێزەونی ئەم خورەوشتەی روونکردۆتەوە، سعید المقبری وتی: (بە لای ابن عمر تێپەڕیم پیاوێکی لەگەڵدابوو قسەی لەگەڵ دەکرد، منیش چوومە لایان، ابن عمر لە سنگی دام و وتی: ئەگەر دوو کەست بینی بەیەکەوە قسە دەکەن مەچووە لایان و لەگەڵیان دامەنیشە، تا مۆڵەتیان لێ وەردەگری، وتم: ئەی عبدالرحمن خودا چاکت بکات، بەڵکو نیازم وابوو خێرێکتان لێببیستم) البخاری ٢/٥٨٠.

هەندێ جار یەکێ هەڵدەستێ بۆ یەکێکیتر تا لە شوێنی دایبنیشێنێ، لەو حالەتەدا باشتر وایە ڕازی نەبێت و دانەنیشێ، ابن عمر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((نەکەن کەسێکتان کەسێکیتر لە شوێنەکەی هەڵسێنێ، پاشان خۆی لێی دانیشێ، بەڵام کۆڕ و دانیشتنتان فراوان بکەن و شوێنی یەکتر بکەنەوە)) متفق علیه. ابن عمر ﷺ باوی وابوو ئەگەر یەکێ لە کۆڕێك بۆی هەڵسایە تا لە شوێنی دانیشێ ڕازی نەدەبوو و دانەدەنیشت. مسلم ١٤/١٦.

ئافرەتی موسڵمان پەیڕەوی ئەم ئادابانە دەکات بۆ بردنەوەی ڕەزامەنی خوا

## ئەگەر سێ ئافرەت بوون دووانیان جیانابنەوە و بەنهێنی قسە ناکەن

ڕێنماییەکانی ئیسلام هاتن تا مرۆڤی بەرز و هەست بڵند داڕێژێ، بەشێوەیەك وردبین بێت، هەستی خەڵکی ڕەچاو بکات، ئەم یاسایانە دانراون بۆ بەدیهێنانی بنەما خورەوشتی و شێوازی کۆمەڵایەتی کە کرۆك و مەبەستی ئەم ئاینەیە، وە فەرمانی پێکردوین دەستی پێوە بگرین و لە ژیانماندا پیادەی بکەین.

پێغەمبەر ﷺ دەفەموێ: ((ئەگەر سێ کەس بوون، نابێ دووانتان بەنهێنی و بەجیا لەوەیتر قسە لەگەڵ یەکتر بکەن، تا تێکەڵی خەڵك دەبن" چونکە ئەم کارە دڵی ئەوەیتر خەفەتبار دەکات)) متفق علیه.

ئافرەتی موسڵمانیش دەست بەم ڕێنماییە دەگرێ و هەستی خوشکی سێیەم لەبەرچاو دەگرێ، بارودۆخ هەرچۆنێك بێت. وە ئەگەر پێویست بوو دووان بەجیا لەوەی سێیەم قسە بکەن، ئەوا با مۆڵەتی لێوەرگرن و، لە کورتی قسەی دەبڕێتەوە و، داوای لێبوردنیش دەکات.

ئەمە خوڕەوشتی ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو و سەنگین و وریایە. ئەمەش شێوازە کۆمەڵایەتییە بەرزەکەیەتی لە رەفتاری لەگەڵ خەڵکی، مالك لە الموطأ لە عبدالله بن دینارەوە، وتی: (من و ابن و عومەر لەوماڵەی خالد بن عوقبە بووین کە لە بازاڕ بوو، پیاوێك هات ویستی بەنهێنی قسەی لەگەڵدا بکات، بێجگە لە منیش کەسیتر لەگەڵ ابن عمر نەبوو، بۆیە پیاوێکیتری بانگکرد و بووین بەچوار، بە من و بەو پیاوەی بانگی کرد وتی: تۆزێك دواکەون، چونکە لە پێغەمبەر ﷺ م بیستووە فەرموویەتی: ((نابێ دوو کەس بەنهێنی بەجیا لەوەیتر بەیەکەوە قسە بکەن)) الموطأ ٢/٩٨٨.

ئافرەتی موسڵمانیش پەیڕەوی ئەم کارەی ابن عمر دەکات، هەستی کەسی سێیەم لەبەرچاو دەگرێ، نەبادا ئازار بخوات، ابن عمر بەم کارەی هەموانی فێرکرد کە ئەمە سونەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، وەکوو جەختکردنێك لەسەر ئەو هەڵوێستەی پێویستە لەو حاڵەتانە وەربگیرێ، بۆ لەبەرچاوگرتنی هەستی خەڵك و پەیڕەوکردنی سونەتی پێغەمبەرﷺ.

### ڕێز دەنێ لە ئافرەتی بەساڵاچوو چاکەکار و بەخشندە:

ئەمەش خوڕەوشتێکی بەرزی کۆمەڵایەتی ئیسلامیە، یەکێکە لە دیارترین بنەما خوڕەوشتیەکانی.

ئافرەتی موسڵمانیش بێ ئاگا نییە لە دەستگرتن بەم بنەما و بنەڕەتە ئیسلامیە دێرینانە کە ناسنامەی ڕەسەنایەتی بە ئافرەتی موسڵمان دەبەخشێ لە کۆمەڵگەی ئیسلامی، ئەوەشی دەستی پێوە نەگرێ لە پلەوپایەی بە ئەندامیەتی بوونی لە ئۆمەتی ئیسلام دادەماڵرێ و دەردەهێنرێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((لە ئۆمەتی من نییە ئەوەی ڕێز لە بە ساڵاچوانمان نەگرێ و بەزەیی نەیەتەوە بە بچوکمان و مافی زاناکانمان نەزانێ)) احمد والطبراني.

چونکە ڕێزگرتن لە ئافرەتی بە ساڵاچوو و پێشخستنی لەوانەی بە تەمەن بچوکترن، بەڵگەیە لەسەر پایە بەرزی کۆمەڵگە و، لەسەر دەستگرتنی ئەندامەکانی بە ڕێنماییە ڕەفتاریەکانی ئیسلام، هەروا بەرزی دەروونیەتی ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵگەیە نیشان دەدات، چ پیاو بێ چ

ئافرەت. پێغەمبەر ﷺ کە بینی عبدالرحمن قسە دەکات، لەکاتێکا لەو شاندەی هاتبونە بەردەستی پێغەمبەر ﷺ لە هەموان بە تەمەن بچوکتر بوو، فەرمووی: ((با گەورە قسە بکات، با گەورە قسە بکات)) جا عبدالرحمن بێ دەنگ بوو و، ئەوەی لەو گەورەتر بوو قسەی کرد. متفق علیه.

ئەم ڕەفتارە ئاکارێکی بەرزە، پیادەکردنی پەرستشە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((یەکێ لە هۆکارەکانی بە گەورەگرتنی خودا: ڕێزگرتنە لە موسڵمانی سەرسپی و بەساڵاچوو، هەروا ڕێزگرتن لەوەی قورئانی هەڵگرتووە، نە ئەوەی وازی لێ دێنێ یا دوورە لە خوێندنەوە و کارپێکردنی، وە ڕێزگرتن لە دەسەڵاتداری دادپەروەر)) ابو داود ٥/١٧٤.

ئافرەتی موسڵمان بەم کارەی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ جێبەجێ دەکات، مسلم وتی: ((لە خاتوو عائشە دەگێڕنەوە وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردوین هەر کەسەو لە ئاست و شوێن و پلەوپایەی خۆی دانبێین)) مسلم ١/٥٥.

دانانی هەر کەسەو لە شوێن و پلەوپایە و ئاستی خۆی واتای زانینی ڕێز و گەورەییەکەیەتی.

## چاوی بە ماڵی خەڵکیدا ناگێڕێ

ئافرەتی موسڵمانی بێدار و سەنگین چاو بە ماڵی خەڵکیدا ناگێڕێ، تا بزانێ چی تیایە و چیان هەیە" چونکە ئەمە ئاکارێکی پەسند و جوان نییە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێ چاو بە ماڵی کەسێدا بگێڕێ بەبێ مۆڵەتیان، ئەوا حەڵاڵە بۆیان چاوی کوێر بکەن)) مسلم ١٤/١٣٨.

## لە کۆڕ و دانیشتنەکان باوەشک نادات تا لە توانای دابێت

ئافرەتی موسڵمانی ژیر و ڕۆشنبیر بە ئادابی کۆڕ و دانیشتن، تا لە توانای دابێت باوەشک نادات، وە ئەگەر زۆری بۆ هێنا، هەوڵدەدات ڕێی لێ بگرێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەگەر

یەکێکتان باوەشکی هات بـا تـا لـە توانـای دایـە بیخواتـەوە)) فـتح البـاری ١٠/٦١١ ومـسلم ١٨/١٢٣.

بەڵام ئەگەر باوەشکەکەی بۆ نەخورایەوە، بـا دەسـتی لەسـەر دەمـی دابنێـت، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەگەر یەکێکتان باوەشکی هات با دەستی لەسەر دەمـی دابنـێ" چـونکە شـەیتان دەچێتە ژورەوە)) مسلم ١٨/١٢٢.

باوەشك هاتن کارێکی ناپەسندە، ناشێ بۆ مرۆڤی پەروەردەکراو، بۆیە پێویستە ڕێی پێ بگیرێ، ئەویش بە دەست خستنە سەر دەم و داپۆشینی دیمەنی ناشیرینی کرانەوەی دەم لە خەڵکی" چـونکە باوەشك هاتن نیشانەی تەمبەڵی و بێزاری دەگەیەنێ.

### لە کاتی پشمین دەست دەگرێ بە ئەدەبی ئیسلام

ئافرەتی موسڵمان دەزانێ ئەو ئیسلامەی ئەدەبێکی دانـاوە بـۆ باوەشـك هـاتن، ئەدەبێکیـشی داناوە بۆ پشمین، ابو هریرە ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((خودا خۆشی دێت لە پـشمین و ڕقی لە باوەشکە، جا ئەگەر یەکێکتان پشمی و سوپاسی خوای کرد، ئەوا واجبە لەسـەر هـەموو موسڵمانێك گوێ بیستی دەبێ بڵێـت: یرحمـك الله، هەرچـی باوەشـکە لـە شـەیتانەوەیە، ئەگـەر کەسێکتان باوەشکی هات با تا لە توانای دایە بیگێڕێتـەوە" چـونکە کاتـێ یـەکێکتان باوەشـکی دێت شەیتان پێی پێدەکەنێ)) فتح الباری ١٠/٦١١.

دەبینین ڕوداوی وا بچوك لە ژیانی موسڵمان بەبێ بنەما و ئاداب تێناپەڕێ، تـا موسـڵمانان لـە ناخیانەوە هەست بکەن ئەم ئاینە هاتووە بـۆ چـاککردنی هـەموو کاروبارێکیـان، هـیچ کـارێکی بچوك یا گەورەی بەبێ ڕێکخستن و یاسا تێنەپەڕانـدووە، هەمیـشە شـێوازی تایبـەتی بـۆ دانـاوە بەهۆیەوە مرۆڤ بە خودای دەبەستێتەوە.

کاتێ ئافرەتی موسـڵمان دەپـشمێ پێویـستە لەسـەری بڵێـت: الحمـد لله، وە لەسـەر ئەوەشـی دەیبیسێ بڵێت: یرحمك الله، ئەمیش وەڵامی ئەو نزایـە دەداتـەوە و دەڵـێ: یهـدیکم الـه ویـصلح بالکم.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەگەر یەکێکتان پشمی با بڵێ: الحمد لله، وە براکەی یا هاوڕێکەی با بڵێ: یرحمك الله، ئەگەر پێی وت: یرحمك الله، با بڵێ: یهدیکم الله ویصلح بالکم)) فتح الباری ٦٠٨/١٠.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەگەر یەکێکتان پشمی و سوپاسی خوای کرد، ئەوا پێی بڵێن: یرحمك الله، ئەگەر سوپاس و ستایشی خوای نەکرد، ئێوەش پێی مەڵێن یرحمك الله)) مسلم ١٢١/١٨.

ئەنەس ﷺ وتی: دوو پیاو لەلای پێغەمبەر ﷺ پشمین، بە یەکێکیانی فەرمووو: یرحمك الله، بە ئەوەیتریای هیچ نەفەرمووو، جا ئەوەی هیچی پێ نەفەرموو بوو، وتی: فلان پشمی و پێییت فەرمووو: یرحمك الله، بەڵام من پشمیم پێت نەفەرمووم یرحمك الله؟ فەرمووی: ((ئەوە سوپاس و ستایشی خوای کرد، بەڵام تۆ سوپاس و ستایشی خوات نەکرد)) متفق علیه.

لە هاندانی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەم کارە مەبەستی گەورە دەردەکەوێ، وەك: یادکردنی خوا و سوپاس و ستایش کردنی، هەروا بەهێزکردنی پەیوەندی برایەتی و دۆستایەتی و سینە سافی لە نێوان موسڵمانان، ئنجا ئەوەی دەپشمێ سوپاسی خوا دەکات لەوەی بەهۆی ئەم پشمینە میکرۆب و هەستیاری و شتی زیانبەخش دەردەچێ و دەبێتە مایەی سوود بۆی، ئەوەشی دەبیسێ پێی دەڵێ یرحمك الله وەك زیاتر هەستکردن و نواندنی برایەتی" چونکە دیارە ئەوەی سوپاسی خوا دەکات هەمیشە شیاوی ڕەحمەتی خوایە، لە بەرامبەردا ئەوەی پشمیوە نزایەکی درێژتری بۆ دەکات تیایدا هەرچی واتای خۆشەویستی و خێر و دۆستایەتی هەیە لە خۆی دەگرێ.

بەم شێوەیە هەر بۆنەیەك و ڕوداوێك بە ژیانی موسڵمانان تێپەڕێ تیایدا ئیسلام وایکردووە ببێتە مایەی وەیادخستنەوەی خوا و پتەوترکردنی پەیوەندییەکانی برایەتی و خۆشەویستی و سۆز لە دەروونیان.

ئەدەبێکیتری پشمین ئەوەیە: ابو هریرە ﷺ وتی: ((پێغەمبەر ﷺ ئەگەر پشمیبایە دەستی یا جلی لەسەر دەمی دادەنا، وە دەنگیشی پێ نزم دەکردەوە)) ابو داود ٢٨٨/٥ والترمذي ٨٦/٥.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری پەروەردەکراو بە ئەدەبی ئیسلامی لە هەموو ئەو ڕوداوانەی بەسەریدا تێپەڕ دەبێت، ئەوا فەرمووودەی و ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ ڕێگا و شێوازەکانی لە یادە و وەکوو خۆی پیادەیان دەکات.

## چاوەڕوانی جیابوونەوەی هیچ ئافرەتێک ناکات لە مێردەکەی تا بە خۆی شوێنی بگرێتەوە

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری پارێزکار هەست دەکات لە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی دەژی، تاکەکانی خوشك و برای ئەون، لەو کۆمەڵگە خواییەدا ناپاکی و ستەم و زۆرداری و هەرچی خوڕەوشتی ناپەسندە کە لە کۆمەڵگاکانیتر هەیە یاساغ و حەرامە.

لە ناپەسندترینی ئەو خوڕەوشتانە چاوبڕینی ئافرەتە بۆ پیاوێکی خاوەن خێزان، بەمەبەستی سەندنی لە خێزانەکەی پاش جیابوونەوەی لێی، تا هەرچی خێر و بێری ئەو پیاوە هەیە بۆ خۆی گلیداتەوە، ئافرەتی موسڵمانیش زۆر دوورە لەو جۆرە خوڕەوشتە خراپ و نزمە،بوخاری و مسلم لە ابو هریرە ﷺ ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((نرخ لەسەر کەل و پەل زیاد مەککەن بۆ فریودانی خەڵکی، داواش لەو کەسە مەککەن شتێکی کڕیوە کڕینەکەی هەڵوەشێنێتەوە، تا بە کەمتر بفرۆشرێ، وە دەست مەگرن بەسەر نرخی بازاڕ بۆ زیان گەیاندن، وە داخوازی ئافرەتێك مەککەن کە براکەت داخوازی کردووە تا دەستی لێ هەڵدەگرێ، هەروا حەڵاڵ نییە بۆ هیچ ئافرەتێك داوای جیابوونەوەی ئافرەتێکیتر بکات لە مێردەکەی بۆ ئەوەی خێر و بێرەکەی بۆ خۆی گلداتەوە)) فتح الباری ٤/٣٥٢، ٣٥٣ ومسلم ٩/١٩٨.

لە گێڕانەوەیەکی بوخاری لە ابو هریرە ﷺ هاتووە: ((دروست نییە بۆ ئافرەتێك داوای جیابونەوەی خوشکەکەی بکات، تا هەموو خێر و بێرەکەی بۆ خۆی بێت، بەڵکو قەدەر چی بۆ بڕیار دابێ هەر ئەوە بەش و باریەتی)) فتح الباری ٩/٢١٩.

چونکە موسڵمان خوشکی موسڵمانە، باوەڕی وایە ئەوەی خودا بۆی نوسیبێ پێی دەگات، وە نابێتە باوەڕداری ڕاستەقینە تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆش بێت بۆ خوشکیشی پێی خۆش بێت: وەك

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هیچ کامێکتان باوەڕی ڕاستەقینە ناهێنن تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت)) متفق علیه.

لێرەوە ئافرەتی موسڵمان بەهۆی ڕۆشنبیری و باوەڕەکەی پارێزراو دەبێ لە کەوتنە ناو ئەو گوناهە و پیسبوون پێی، وەکوو گوێڕایەڵیەك بۆ فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی و، وەکوو وەستانێك لە ئاست بنەما مرۆڤایەتیە بەرزەکان کە ئیسلام لە کەسایەتی ئیسلام هەوێنی کردووە، نەك لە ترسی ئابڕووچوونی کۆمەڵایەتی" چونکە ئافرەت دەتوانێ کار و پیلانەکانی داپۆشێ، وە خۆی دەربازکات لەو ئابڕووچوونە کۆمەڵایەتیە، بەڵام ناتوانێ لە ڕکێفی خودا دەرباز بێت" چونکە خودا ئاشکرا و پەنهانیەکانی دەزانێ.

### کار و پیشەیەک هەڵدەبژێرێ بگونجێ لەگەڵ سروشتە مێیانەکەی

ئیسلام ئەرکی کارکردن و پەیداکردنی خەرجی بۆ بژێوی ژیانی خۆی لەسەر ئافرەتی موسڵمان هەڵگرتووە، ئەو ئەرکەی سپاردووە بە باوکی یا برای یا مێردی یا یەکێ لە خزمانی، بۆیە چاو نابڕێتە کارکردن لە دەرەوە ئەگەر زۆر پێویست نەبێ" چونکە لە دەرەوە ژیانی ئازادانە و سەربەرزانەی بۆ مسۆگەر نییە، یا ئەگەر کۆمەڵگا پێویستی بە کاری ئەو هەبوو، ئەوا کارێك دەکات لەگەڵ مێیانەکەی بگونجێ و، سەربەرزی و خوڕەوشتی و ئاینی بپارێزێ.

بۆیە ئیسلام ئەرکی پەیداکردنی خەرجی خێزان و بەرپرسیاریەتی ژیانی سپاردووە بە پیاو، تا ئافرەت دەست بەتاڵ بێت بۆ ژیانی هاوسەرایەتی و دایکایەتی، دواتریش ببێتە ڕەیحانەو ئاسودەیی و جوانی و گوڵاو و گەشبینی ناو ماڵ، هەروا ببێتە ئەو هۆش و بیرەی کاروباری مێردەکەی ڕێك دەخات، ئەو سۆزەی لە کەش و هەوای ماڵ بڵاوی دەکاتەوە، ئەو گیانە باڵدارەی لە دەوری جگەرگۆشەکانی باڵە فڕێ دەکات و دەسوڕێتەوە.

ئەمە تێڕوانینی ئیسلامە بۆ ئافرەت و خێزان، هەر ئەمەشە فەلسەفەی ئیسلام لە مەڕ هاوسەرایەتی و خێزانداری.

بە پێچەوانەی ئەمە، فەلسەفەی ڕۆژئاوا سەبارەت بە ئافرەت و ماڵ و خێزان و منداڵ وا دادەمەزرێ کە: کاتێ کچ دەبێتە ١٧ ساڵ، باوك یا برا یا یەکێ لە خزمانی ناچار نابن خەرجی ژیانی بگرنە ئەستۆ، بەڵکو پێویستە لەسەری بە دوای کارێك دابگەڕێت تا خەرجی ژیانی دابین بکات بۆ خۆی، پاشانیش هەندێکی لێ پاشەکەوت بکات بۆ پرۆسەی هاوسەرگیری، کاتێ شوو دەکات لەسەری پێویستە هاوکاری مێردەکەی بکات لە خەرجی ماڵ و منداڵ، کاتێ پیریش دەبێ و هێشتا توانای کارکردنی دەمێنێ، پێویستە لەسەری بەردەوام بێت لە کارکردن بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان، ئەگەرچی خاوەنی منالی دەوڵەمەندیش بێت.

بێگومان ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو هەست بەو جیاوازییە بەرفراوانە دەکات لە نێوان بارودۆخی ئافرەتی موسڵمان و بارودۆخی ئافرەتی ڕۆژئاوا، ئافرەتی موسڵمان پارێزراوە و ژیانێکی ڕێزدارانە و سەربەرزانەی بۆمسۆگەر کراوە، بەڵام ئافرەتی ڕۆژئاوا هەمیشە ماندوو و ڕیسوا و بێ ڕێزە بەتایبەتی کاتێ بەساڵا دەچێ.

سکاڵای بیریارانی (فلاسفە) ڕۆژئاوایی یەك لە دوای یەك هات سەبارەت بەو ئاستە خراپەی ئافرەتی ڕۆژئاوایی پێی گەیشتووە لە کۆتایی سەدەی ڕابردوو، بانگخوازی ئیسلامی گەورە دکتۆر مصطفى السباعي ـ رحمه الله ـ لە پەرتوکەکەی (المرأة بين الفقه والقانون) کۆپلەیەك لە وتەی ئەو بیریارە ڕۆژئاواییانەی هێناوەتەوە، سەبارەت بە ڕەوش و ئاستی خراپی ئافرەتی ڕۆژئاوا لەوەی ئەو بیریارانە هەستیان پێکردووە...، لەوانە: فەیلەسوفی ئابوری (جول سیمون) دەڵێ: ((ئافرەتان بوونەتە تەون چن و چاپکەر....هتد، میری لە کارگەکان بەکاریان دێنێ، بەم شێوەیە چەند درهەمێکیان دەستکەوتووە، لە بەرامبەریدا کۆڵەکەی خێزانیان ڕوخاندووە، بەڵێ پیاو سودێك دەبینێ لە دەستکەوتی ژنەکەی، بەڵام بەهۆی کارکردنی ئافرەت پیاو دەستکەوتی کەم بۆتەوە.

هەروا دەڵێ: (ئافرەتانی پایە بڵندتریش هەن لەوانەی باسمان کردن، کە سەرپەرشتی ژمێریاری دەکەن، وە لە شوێنی بازرگانی کاردەکەن، هەروا میری لە پیشەی فێرکردن بەکاریان دێنێ، هەشیانە لە پۆستە و گەیاندن و هێڵە ئاسنیەکان و بانقەکانی فەرەنسا کاردەکەن، بەڵام ئەم کار و پیشانە بە تەواوی لە خێزان دایاڵیون)).

هەروا دەڵێ: ((دەبێ ئافرەت هەر بە ئافرەتانەیی بمێنێتەوە" چونکە تەنها بەم ئاکارە دەتوانێ بەختەوەری بدۆزێتەوە و بە خەڵکیشی ببەخشێ. دەی با ڕەوشی ئافرەت چاك بکەین، بەڵا با نەیگۆڕین، وە ئاگادار و هۆشدار بین لەوەی بیانگۆڕین بە پیاو" بەم شێوەیە خێرێکی زۆریان لە دەست دەچێت" چونکە سروشت[1] هەموو شتێکی بە جوانی و وردی دروستکردووە، دەی با لێی بکۆڵینەوە و هەوڵی چاککردنی بدەین، دەبا خۆمان بپارێزین لە هەموو ئەو هۆکارانەی لە یاسا و نمونە ڕاستەقینەکان دووردەخاتەوە)).

لە هەمان سەرچاوە وتەی ئافرەتە نوسەری ئینگلیزی بەناوبانگ (ئەنا رورد) دێنێتەوە کە دەڵێ: ئەگەر کچانمان خزمەتکار بن لە ماڵان، یان وەکوو خزمەتکار بن، چاکترە و بەڵاکەی سوکترە لە کارکردنیان لە کارگەکان" چونکە کچ لەو شوێنانە پیس دەبێت، روونی و ڕەونەقی ژیانی هەتا هەتایی لەناو دەچێت، خۆزگە وڵاتانی ئێمە وەکوو وڵاتانی موسڵمانان بوایە، لەوێ پاکی و بێگەردی و ئابرو باڵاپۆشیانە، لەوێ خزمەتکار و کۆیلە خۆشترین ژیان دەگوزەرێنن، وەکوو منداڵ لە ماڵ ڕەفتاریان لەگەڵ دەکەن، هیچ کاتێك خراپە بەرامبەر ئابڕویان ناکرێ، بەڵێ" سەرشۆڕییە بۆ وڵاتانی ئینگلیز کچەکانی ببنە نمونەی خراپەکاری و ڕیسوایی بەهۆی تێکەڵبوونیان بە پیاوان. دەی لەبەرچی هەوڵ نادەین کچ لە ماڵەوە جێگیر بێت بەو شێوەیەی دەگونجێ لەگەڵ ئاوگڵە سروشتەکەی لە هەڵسانی بە کاری ماڵ، وەجێهێشتنی کاری پیاو بۆ پیاوان، لەپێناو سەلامەت ڕاگرتنی ئابڕوکەی؟!)).

دکتۆر مصطفی السباعي دەڵێ: ئافرەتی ڕۆژئاوایی ئیرەیی دەبات بە ئافرەتی موسڵمان، بە ئاواتە کەمێك لەو ماف و پاراستن و ڕێز و سەقامگیریەی دەست بکەوێت، کچێکی ئیتالی لە کۆلیژی ئۆکسفۆرد ماف دەخوێنێ، پاش ئەوەی هەندێکی لە مافەکانی ئافرەتی بیست لە ئیسلام، کە چۆن ئیسلام دیاردەکانی ڕێزگرتنی بۆ دەستەبەرکردووە کاتێ بەخشی لە ئەرك و پەیداکردنی

---

[1] ئەمە گۆڕانکاری بێ باوەڕانەی ڕۆژئاوایە: (سروشت) لە جیاتی خودای دروستکاری باڵادەست، پاش ئەوەی ڕۆژئاوا پشتی کرد لە ئاین ئەم بۆچوونەی پەیڕەو کرد.

خەرجی ژیان، وە تەواو دەست بەتاڵی کرد بۆ گەیاندنی پەیامی هاوسەرایەتی و خێزانی، وە من ئیرەیی دەبەم بە ئافرەتی موسڵمان، ئاوات دەخوازم ئەگەر لە وڵاتانی ئیسلام لە دایك بوومایە.

ئەم ڕاستەقینەیە لە هزری ئافرەتانی ڕابەری بزوتنەوەی ژناندا جێگیربووە لە وڵاتانی عەرەبی، ئەوەتا خاتوو سەلما الحفار الكزبري کە زیاتر لە جارێك سەردانی ئەوروپا و ئەمریکای کردووە، لە ڕۆژنامەی (الايام الدمشقيه) کە لە ئەیلول ( سبتمبر) ١٩٦١ م دەرچووە، لە بەدواداچونەوەیەکی لەسەر قسەی استاذ شقيق جبري لە پەرتوکەکەی (ارض السحر) سەبارەت بە بەدبەختی ئافرەتی ئەمریکی نوسیویەتی: ((ئەم ئەدیبە گەشتیارە تێبینی کردووە کە ئەمریکاییەکان منالآنیان هەر لە سەرەتای ژیانیان ئاڕاستە دەکەن لەسەر خۆشویستنی ئاسن و ئامێر و پاڵەوانیەتی لە کاتی یاریکردن و گەمەدا، هەروا ئافرەتان کاری پیاوان دەکەن لە کارگەکانی ئۆتۆمبێل و خاوێنکردنەوەی ڕێگاو بان، ئنجا ئازار دەخوات بۆ بەدبەختی ئافرەت لە بەهەدەربردنی لاوی و تەمەنی لەوەی ناگونجێ لەگەڵ مێیانەکەی و سروشت و زەوقی. بەڕاستی ئەو قسەیەی استاذ جبري دڵی خۆش کردم" چونکە ماوەی پێنج ساڵە لە گەشتێکم لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەڕاومەتەوە، من دڵم دەسوتێ بۆ حاڵی ئافرەت کە شەپۆڵە کوێرەکانی بەناو یەکسانی ڕایماڵیوە، لەپێناو دەست خستنی بژێوی ژیان بەدبەخت بووە، تەنانەت ئازادی و سەربەخۆییشی لە دەست داوە، ئەو ئازادیەی زۆر هەوڵی دەست خستنیدا" چونکە ئێستا بۆتە دیلی ئامێر و چرکە. ئێستا بە کارێکی قورس دادەچێتەوە، بەڕاستی جێی داخە ئافرەت بەرزترین شت لە دەستبدات، مێیانەکەی پاشان بەختەوەریەکەی" چونکە کاری بەردەوام و پڕ شەکەتی باخچە بچوکەکانی لە کیس چواندووە کە پەناگەی سروشتییە بۆ ئافرەت و سەرپەرشتی ماڵ، جا بەختەوەری کۆمەڵگە و تاك لە ماڵان و لە نێوان ئامێزی خێزان دەست دەکەوێت، کە سەرچاوەی نیگا و کانیاوی خێر و داهێنانە)).

گومڕایی ڕاستەقینە ئەوەیە ئافرەت بخرێتە بەر کارکردن و بەربەرەکانێی پیاوان بکات، تا شوێنیان بگرێتەوە، یان هاوبەشیان بکات، بێ ئەوەی پێویستی بەرژەوەندی گشتی هەبێ، بەڕاستی ئەمە ئەو شڵەژانە نەویستراوەیە کە نەتەوە و گەلانی لەسەردەمی داڕوخان و فتنە و لاری و

گومڕایی دوچاری دەبن. ئافرەتی موسڵمانی ڕۆناکبیر بە قورئان و فەرمووودە، ڕازی نابێت بخزێنرێتە ناو ئەو جۆرە ڕەوشە، بێزارە لەوەی ببێتە کەل و پەلێکی کەم بایەخ، تینوان و چاوچنۆکان و خاوەن سەرمایەداری هەوڵی قووتدانی بدەن، یان ببێتە یاریەکی باق و بریق و هەرچی دەروون نزمە لەوانەی بەناو پیاون چێژ وەرگرن لە هاوڕێتی کردنی، زۆر سەربەرزانە ئەم پێشکەوتنە درۆیینە کوێرانەیە ڕەت دەکاتەوە کە بانگەشەی دەرچوونی ئافرەت دەکات بە ڕووت و قووتی و بێ جل و بەرگ، تا لە تەك پیاو لە نوسینگەکان و دام و دەزگاکان کاربکات، ئافرەت بەم هەڵوێستە ڕەسەن و ژیرانە و دانایانەی خزمەتێکی گەورە پێشکەش بە وڵات و کۆمەڵگە و ئۆمەتەکەی دەکات بەهۆی بانگەوازکردنی بۆ لادانی ئەم گاڵتەجاڕیە گەورە لە بەربەرەکانێی ئافرەت بۆ پیاو لە کارەکانیاندا، وە لادانی پاشماوە سلبیەکانی ئەم گاڵتەجاڕیە لە گەندەڵی بوونی خوڕەوشت و، فەرامۆشکردنی خێزان، بە هەدەرچوونی ماڵ، گەورەترە لەو سودەی ئافرەت پێشکەشی دەکات لە کارەکەیدا، بەڵگەش لەسەر ئەمە وتەی دادوەری کۆریای باکورە لە کۆنگرەی یەکێتی ئافرەتان لە وڵاتەکەی ساڵی ١٩٧١: ((ئێمە ڕێگەمان داوە ئافرەتان بچنە ناو کۆمەڵگە، ئەمە بەهۆی نەبوونی دەستی ئیشکەر نەبوو، ئەگەریش بە ڕاشکاوی قسە بکەین، دەڵێین: ئەوەی دەوڵەت هەڵی دەگرێ لە ئەرکی ئافرەتانا زۆر گەورەترە لەو سودەی ئافرەتان پێشکەش بە دەوڵەتی دەکەن لە ڕێگەی بەشداریکردنیان لە کارکردن پاش ئەوەی هاتنە ناو کۆمەڵگە، پاشان وتی: کەواتە لەبەرچی دەمانەوێ ئافرەتان چالاك بن لە ڕاپەڕینیان بۆ چوونە ناو کۆمەڵگە؟ چونکە ئامانجی ئەو ڕاپەڕینەیان بەشێوەیەکی سەرەکی شۆڕشێکە بۆیان و گۆڕانیانە لەسەر ڕەوتی چینی خزمەتکار لە میانەی ژیانی کۆمەڵایەتی، پارتەکەی ئێمەش چالاکی ئافرەتان هاندەدات بۆ چوونە ناو کۆمەڵگە لەپێناو هەڵگیرسانی شۆڕشی ئافرەتان و گۆڕانیان لەسەر ڕەوتی چینی خزمەتکار، ئەگەرچی ئەرکی دەوڵەتیش قورستر بکەن)).

بێگومان ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیری تێگەیشتوو ڕێگای خۆی دۆزیوەتەوە و، جێ پێی خۆی ناسیووە، پاش ئەوەی ئەو جیاوازیە گەورەی بینیوە لە نێوان حوکمی خوا و حوکمی نەفامی، ئنجا حوکمی خوای هەڵبژارد بێ گوێدان و ئاوڕدانەوە لە بانگەوازی نەفامان: خودا دەفەرمووێ:

﴿أَفَحُكمَ الجَاهِلِيَّةِ يَبغُونَ وَمَن أحسَنُ مِنَ اللهِ حُكمًا لِقَومٍ يُوقِنُونَ. واتا: ئايا داواى حوكمى نەفامى دەكەن؟ ئايا كىٚ لە اللە حوكمى باشترە بۆ گەل و كۆمەڵێك تێدەگەن و بيردەكەنەوە﴾ المائدة: ٥٠.

## لاسايى پياوان ناكاتەوە

ئافرەتى موسڵمان كە شانازى دەكات بە كەسايەتيەكەى هەرگيز لاسايى پياوان ناكاتەوە" چونكە دەزانێ لاسايى كردنەوەى ئافرەت بۆ پياو، پياويش بۆ ئافرەت لە شەرعى ئيسلام حەرامە" چونكە حيكمەتى خودا و سونەتە هەميشە زيندووەكەى لە گەردون و ژيانى مرۆڤ وا دەخوازێ پياو كەسايەتى تايبەت و جياوازى هەبێ لە ئافرەت، ئافرەتيش كەسايەتيەكى سەربەخۆ و جياوازى هەبێ لە پياو، ئەم جياوازيەش پيويستىيە بۆ هەردوو رەگەز" چونكە هەريەكەيان رۆڵى جياوازى هەيە لەوەىتر لە ژيان، ئەم جياوازيەى كارى سەرەكى ڕەگەز و ئەركى لە ژيان تەواو بەستراوە بە جياوازى كەسايەتى رەگەز، واتا بە جياوازى كەسايەتى پياو لە ئافرەت، وە جياوازى كەسايەتى ئافرەت لە پياو.

ئيسلاميش هەر شتەى لە شوێنى تايبەتى خۆى داناوە كاتێ بۆ هەريەكێ لە پياو و ئافرەت ئەركى خۆى بۆ دياريكردووە لە ژيان، وە ئەو كار و ڕێگايەى بۆ ئاسان كردووە كە بۆى دروستبووە. لێرەوە هەر دەرچونێك لەم دياريكردنە خواييە واتاى دەرچوونە لەو فيترەيەى خودا خەڵكى لەسەر بەديهێناوە، ساختەكردنە لە سروشتى مرۆڤ و لاركردنەوەيەتى لە ڕەسەنايەتى دروستكردنە چەسپاوەكەى، ئەمەش نەويستراوە لەلايەن هەردوو ڕەگەز، بەڵگەش لەسەر ئەمە: ئافرەت ڕقى لە پياوى ژنانييە كە لاسايى ئافرەت دەكاتەوە، وە پياويش ڕقى لە ئافرەتى پياوانى و زبرە كە لاسايى پياو دەكاتەوە. وە ئاوەدانكردنەوەى گەردون و بەختەوەرى مرۆڤايەتى بە شێوەى ڕاستى خۆى تەواو نابێت مەگەر بە جياوازى ئەو دوو ڕەگەزە لە يەكتر، وە بە پيادەكردنى هەريەك لەو دوو رەگەزە بۆ ئەو جياوازيەى لەوەىتری جيادەكاتەوە و، هاريكارى هەردوكيان بۆ ئاوەدانكردنەوەى گەردون و بەختەوەركردنى مرۆڤايەتى.

لەپێناو هەموو ئەمانە، دەقە ئیسلامیەکان هاتن و بەتوندی هەڕەشەیان کرد لەوانەی لاسایی رەگەزەکەیتر دەکەنەوە، ابن عباس ﷺ وتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لەو پیاوانەی لاسایی ئافرەتان دەکەنەوەو، لەو ئافرەتانەی لاسایی پیاوان دەکەنەوە)) فتح الباری ۳۳۲/۱۰.

هەروا ابن عباس ﷺ وتی: ((پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی کردووە لە پیاوانی ژنانی و ژنانی پیاوانی، وە فەرمووی: ((ئەو جۆرانە لە ماڵ دەرکەن))، وتی: جا پێغەمبەر ﷺ فلانە پیاوی ژنانی لە ماڵ دەرکرد، وە عومەریش فلانە ئافرەتی پیاوانی لە ماڵ دەرکرد)) فتح الباری ۳۳۲/۱۰.

ابو هریرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لەو پیاوەی جلی ژنانە لەبەر دەکات، وە لەو ئافرەتەی جلی پیاوانە لەبەر دەکات)) ابو داود ٤/٨٦ وابن حبان (١٣) ٦٣.

ئنجا لەو ڕۆژەی موسڵمانان شەرعی خوایان پیادە دەکرد و، کۆمەڵگاکانیان بە رووناکی ئیسلام رووناك ببویەوە، هیچ شوێنەوارێکی گرفتی لاسایی کردنەوەی یەکتری ئەو دوو رەگەزە لە ئارادا نەبوو، بەڵام ئەمڕۆ، لەپاش ئەوەی سێبەری ئیسلام لەسەر موسڵمانان لاکەوت، رووناکیەکەی لە کۆمەڵگاکانیان ونبوو، دەبینین لە زۆر لەو کۆمەڵگایانە ئافرەتانی پانتۆڵی تەسك و تریسك لەبەر دەکەن، سترێچ و بەدی تەسك کە بۆ پیاو و بۆ ئافرەتیش دەشێ، ئنجا سەر و قژیان لێ ڕووتکردووە و قۆڵ و باسکیان دەرخستووە، بەشێوەیەك وەکوو کوڕانیان لێ هاتووە، بەهەمان شێوە کوڕی گەنجی ژنانی وا دەبینین کە ملوانکەی زێڕی لە ملکردووە و هاتۆتە سەر سنگە ڕووتەکەی و، قژی درێژکردووە و، سەروسیمای وەکوو ئافرەت لێکردووە، بەشێوەیەك ئاستەنگە لە یەکیان جیا بکەیتەوە.

ئەو دیمەنە نزمانە لە هەندێ وڵاتانی ئیسلامی کە دوچاری داگیرکردنی فیکری بونەتەوە دەبینرێ، وە لە زۆر لەو لاوانەی توشی شکستی ڕۆحی بوونەتەوە، ئەم دیمەنانە مایەی شەرمەزاریە بۆ ئۆمەتی ئیسلامی و کۆمەڵگاکەی و بنەما و داب و نەریتە ئیسلامیەکان، ئەم دیمەنانە لەلایەن ڕۆژئاوای بێ دین و ڕۆژهەڵاتی بێباوەر سەری هەڵداوە، تیایدا هەرچی گومڕایی و لاری ولە ڕێ لادانە بڵاوبۆتەوە، بۆتە هۆی بەدبەختبوونی و چارەڕەشیەکی گەورە، کاتێ لە فیترەی ساغ و

سەلامەتی ڕایماڵی بەرەو لاری و گومڕایی، ئەمەش خراپترین ئاکام و ترسناکترین پەتا و نەخۆشی لێکەوتەوە.

ئێمەش لە هەموو ئەمانە پڕوشك و دوكەڵمان بەرکەوتووە، کە بەگشتی ژیانی ئەوانەی گرتەوە لە ڕێنمایی خوا لایانداوە لە هەندێ لە وڵاتانی ئیسلامی، پاش نەمانی سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی و پارچە پارچە بوونی یەکێتی ئۆمەت و، لە قینی زۆرێك لە بنەماکانی لە هەندێ لە کۆمەڵگا ئیسلامیەکان، بەشێوەیەك ئەو جۆرە ئافرەت و پیاوە ناوازانە نامۆبوون لەسەر جەستەی ئۆمەتی ئیسلامی و، دەرچوون لە پرۆگرامە ڕەسەن و بنەما چەسپاو و کەسایەتیە جیاوازەکەی.

## بانگەواز دەکات بۆ حەق و ڕاستی

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بە ڕێنمایی ئاینەکەی دەزانێ مرۆڤ بە گاڵتە دروست نەکراوە، بەڵکو دروستکردراوە تا پەیامێك بگەیەنێ، سپاردەیەك هەڵگرێ، وە هەڵسێ بە ئەنجامدانی فەرزێك، کە پەرستنی خوایە، وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا خَلَقتُ الجِنَّ والإِنسَ إِلاَّ لِيَعبُدُونِ ﴾. پێشتر ڕاڤەکراوە.

پەرستنی خواش هەموو جوڵەیەکی ئیجابی و بنیاتنەر دەگرێتەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی گەردون و، بەدیهێنانی وتەی خوا لەسەر زەوی و، پیادە کردنی بەرنامەککەی لە ژیان، ئەمانە هەمووی لەسەر موسڵمانان پێویستە بانگەوازی بۆ بکەن چ پیاو چ ئافرەت.

لێرەوە ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ هەست بە ئەرکی خۆی دەکات لە بانگکردنی ئافرەتان بۆ ئەو حەقەی ئەم باوەڕی پێهێناوە، مەبەستی لەمەش ئەو پاداشتە خواییەیە کە بەڵێنی خوایە بۆ ئەوانەی خەڵکی بانگ دەکەن بۆ خوا، وەك هاتووە، پێغەمبەر ﷺ بە عەلی ﷺ دەفەرمووێ: ((سوێند بەخوا ئەگەر خوا بەهۆی تۆوە یەك پیاو ڕێنمایی بکات خێرترە بۆت لە وشتری سوور)) فتح الباري ٤٧٦/٧.

وشەیەکی چاك کە ئافرەتێکی موسڵمان لەناو کۆمەڵێك ئافرەتی بێ ئاگا دەیڵێتن یا دەیچرپێنێ بە گوێی ئافرەتێکی دوور لە ڕێنمایی خوا، کاریگەری خۆی دەبێت لەسەر دەروونی، بەهۆیەوە

پاداشتی گەورەی دەست دەکەوێت کە خێرتر بێ لە وشتری سوور، ئەمیش بەهادارترینی ماڵ بوو لەو سەردەمە، لەپاڵ ئەمە پاداشتی وەکوو ئەو کەسە هەیە کە ڕێنماییەکەی وەرگرتووە. وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەر کەسێ بانگەواز بکات بۆ ڕێنمایی و هیدایەت، ئەوا پاداشتی وەکوو پاداشتی ئەوانە هەیە کە شوێنی کەوتوون و ڕێنماییان وەرگرتووە، هیچیش لە پاداشتی ئەوان کەم ناکاتەوە)) مسلم ١٦/٢٢٧.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر هیچ زانستێك بە کەم بایەخ نازانێ لەو کاتانەی ئافرەتان بانگ دەکات بۆ لای خوا، چەندەی دەزانێ با بیگەیەنێ، هەرچی بیستووە لە ئامۆژگاری و ڕێنمایی با بیگەیەنێ، ئەگەر یەك ئایەتیش بێ لە قورئان، پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی دەفەرمووو: ((ئەگەر یەك ئایەتیش بێت لە منەوە بیگەیەنن)) فتح الباری ٦/٤٩٦.

لەوانەیە ئەو ئایەتە، یان وشەیەك لە وشەکانی بانگخواز، شوێنی باوەڕ بکاتەوە لە دڵی بەرامبەر، ئەو کاتەش گڕی ڕێنمایی دەچێتە ناو دەروونی ئافرەتی گوێگر و ڕوودەکاتە حەق و، ژیانی هەمووی بەم نورە گەشە ڕووناك دەبێتەوە[1].

لێرەوە ئافرەتی موسڵمان هەمیشە هەوڵدەدات ئافرەتان بانگ بکات بۆ حەق، کە لەم سەردەمەدا زۆر پێویستیان پێیەتی بەئومێدی دەستکەوتنی ڕەزامەندی خوا، بەهۆیەوە ڕۆشنبیری لەناو ڕیزی ئەو ئافرەتانە بڵاودەکاتەوە کە ڕۆشنبیری و ڕێنماییان پێ نەگەیشتووە، بەڵگە دەداتە دەست کە ئەو ئافرەتێکی باوەڕدارە و ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ خوشکیشی پێی خۆشە، بەم خوڕەوشتە ئافرەتی بانگخواز جیادەکرێتەوە لە ئافرەتانی ئاسایی، بەڕاستی ئەمانە خوڕەوشتی بەرز و بڵندن، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێداوە و ستایشی کردووە، دەفەرمووێ: ((خودا ئەو کەسە گەشاوە و خۆشگوزەران بکات کە شتێك لە ئێمە دەبیستێ و پاشان وەکوو خۆی دەیگەیەنێ، بەشکو ئەوەی دەگەیەنێ تێگەیشتووترە و ڕۆشنبیرترە لەوەی دەیبیسێ)) الترمذي ٥/٣٤.

---

[1] ئافرەتێکی نزیکی خۆمانم بانگکرد بۆ ڕێنمایی و هیدایەت، زۆر کەللە ڕەق بوو، هەرچیم بۆ باس دەکرد بیانویەکی دەهێناوە تا ملکەچ نەبێ، تا لە کۆتایی پرسیاری کرد و تی: باشە تۆ ئەو هەموو قسانە دەکەی من چۆن بزانم ڕاستەقینەن؟! وتم: ئەو قورئانە بۆمانی روون کردۆتەوە کە تا ئێستا تەنانەت یەك پیتی لێ زیاد و کەم نەکراوە و بێ گۆڕانکاری و بە پارێزراوی و زیندوویی ماوەتەوە! ئنجا ڕێنمایی وەرگرت، تا ئێستاش دەڵێ: تەنها ئەو قسەیە لە دڵم چەسپاو بوویە مایەی هیدایەت دانم. سوپاس بۆ خوا.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بە ڕێنمایی قورئان و فەرموودە وەك چرای ڕۆشن وایە، ڕێگا بۆ خەڵكی ڕووناك دەكاتەوە لە شەوەزەنگی تاریكایی، وە هەرگیز خوشكانی ونبوو لە تاریكایی شەو لەم نورە بێبەش ناكات، پاش ئەوەی ئەو پاداشتە گەورەی بۆ ڕوونبوویەوە كە خودا ئامادەیكردووە بۆ بانگخوازانی دڵسۆزان و ڕاستگۆ.

## فەرمان دەكات بە چاكە و قەدەغەی خراپە دەكات

ئەم كارە تەنها ئەركی پیاو نییە، بەڵكو هەردوو ڕەگەز دەگرێتەوە، وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿وَالْمُؤمِنُونَ وَالْمُؤمِنَاتُ بَعضُهُم أولِيَاءُ بَعضٍ يَأمُرُونَ بِالمَعرُوفِ وَيَنهَونَ عَنِ المُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللهَ وَرَسُولَهُ أولاَئِكَ سَيَرحَمُهُمُ اللهُ إنَّ اللهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ. واتا: پیاوانی باوەڕدار و ئافرەتانی باوەڕدار هەندێكیان پاڵپشت و دۆستی یەكن و فەرمان دەكەن بە چاكە و قەدەغەی خراپە دەكەن و نوێژ ئەنجام دەدەن و زەكات دەدەن و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەكەی دەكەن، ئەوانە خودا ڕەحم و میهریان لەگەڵ دەكات، بەڕاستی خودا باڵادەست و دانایە﴾ التوبە: ٧١.

ئیسلام پلەوپایەیەكی بەرزی كۆمەڵایەتی بەخشیوە بە ئافرەت كاتێ ئەو ئەركە كۆمەڵایەتیەی پێ سپارد، ئەركی فەرمانكردن بە چاكە و قەدەغەكردن لە خراپە، كە بۆ یەكەمجار لە مێژوو كرا بە فەرماندە، وە بێجگە لە ئیسلام هەمیشە بە فەرمان پێكراو ناسیویانە.

لە بەرامبەر ئەم ئەركەدا كە خۆی لە خۆیدا ڕێز و گەورەییە، ئافرەتی موسڵمان هەڵدەستێ بە واجبی فەرمانكردن بە چاكە و قەدەغەكردن لە خراپە لە سنور و ناوەندێك كە لەگەڵ سروشتە مێیانەكەی دەگونجێ، وە لە بازنە و بواری تایبەتمەندی خۆی، ئنجا بەرەنگاری خراپە دەبێتەوە و بە هۆش و دانایی و ژیریەوە قەدەغەی خراپە دەكات، جا ئەگەر توانی بە دەست خراپەكە لادەدات، ئەگەر نەیتوانی بە زمان بۆی ڕوون دەكاتەوە، ئەگەر نا بە دڵ پێی ناخۆش دەبێت، وە هەمیشە بیر لەو شێواز و هۆكارانە دەكاتەوە كە دەبێتە مایەی لادان و نەهێشتنی خراپەكە لە ڕەگەوە، پێغەمبەر ﷺ- دەفەرمووێ: ((هەر كەسێ خراپەیەكی بینی با بە دەست بیگۆڕێ، ئەگەر

نەیتوانی با بە زمانی، ئەگەر هەر نەیتوانی با بـە دڵـی، ئەوەشـیان لاوازترینـی بـاوەڕە)) مـسلم ٢٢/٢.

ئافرەتی موسڵمان بە دڵسۆزیەوە و بـە شـێوەی ئامۆژگـاری ئـەم کـارە دەکـات بەرامبـەر بـە خوشکانی موسڵمانی بـێ ئاگـا یـا کەمتەرخـەم لـە پـەیڕەوکردنی ڕێنمـایی ئیـسلامی بێگـەرد، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئاین دڵسۆزی و ئامۆژگاریە، وتمان: بۆ کێ؟ فەرمووی: بۆ خوا و بۆ کتابەکەی و بۆ پێغەمبەرکەی و گەورەی موسڵمانان و خەڵکی بەگشتی)) مسلم ٣٧/٢.

ئافرەتی موسڵمانی تێگەیشتوو کاتێ هەڵدەستێ بـە فـەرمانکردن بـە چـاکە و قەدەغـەکردنی خراپە لە نێوەندی ئافرەتانا، دەبێتە هۆی ڕاستکردنەوەی زۆر هەڵە و کار و داب و نەریتی چەوت و کۆن، کە پێچەوانەی ڕێنمایی ئیسلامین، ئەو هەڵانەش یەکجار زۆرن لەناوەندی ئافرەتانی بێ ئاگـا و دوور لە ئاین، ئـافرەتی موسـڵمانیش کاتـێ بـەرەنگاری ئـەو هەڵانـە دەبێتـەوە بـە مەبەسـتی ڕاستکردنەوەی ئەو داب و نەریتانە و، ڕوونکردنەوەی ڕای ئیـسلام تیایـدا، خزمـەتێك و خێرێکـی گەورە بە ئوممەت و کۆمەڵگاکەی دەکات و، دەبێتە چاکترینی خەڵك: پیاوێك هاتە لای پێغەمبـەر ﷺ لەو کاتەی لەسەر مینبەر بوو، وتی: ئەی پێغەمبـەری خـوا کـام خـەڵك خێرترینـی خەڵکـە؟ فەرمووی: ((خێرترینی خەڵك ئەوەیە لە هەمووان زیاتر فەرمان بکات بە چاکە و قەدەغەی خراپە بکات، وە لە هەموان زیاتر پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێ)) احمد والطبراني.

ئافرەتی موسڵمانی بێداری خاوەنی پرس، لەسەر درۆ و سـاختەیی بـێ دەنـگ نابێـت، سـستی نانوێنێ لە ڕوونکردنەوەی حەق، بە لاری و لادان ڕازی نابێت، هەمیـشە کاردەکـات لەسـەر سـود گەیاندن بە خوشکانی لە کۆمەڵگەی ئیسلامی و، دەرهێنانیان لەو دواکەوتوویی و کەمتەرخـەمی و نەفامیەی تێیکەوتوون، ئـافرەتی موسـڵمان لـەو کارەیدا تـەنها مەبەسـتی ملکەچبوونە بـۆ فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی، بۆ لادانی سزای خوا کە ئەو کۆمەڵگایانە دەگرێتەوە بـێ دەنگـن لە ئاست خراپەکاری و فەرمان ناکەن بە چاکە و قەدەغەی خراپە ناکەن.

کاتێ ابوبکر ﷺ کرایە خەلیفە، چووە سەر مینبەر، سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان وتی: ئەی خەڵکینەو ئێوە ئەو ئایەتە دەخوێننەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيكُم أنفُسَكُم لاَ يَضُرُّكُم مَن ضَلَّ إِذَا اهتَدَيتُم﴾ واتا: ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئێوە تەنها خۆتان بەدەستە، ئەوانەی گومڕابوونە زیانتان پێناگەیەنن ئەگەر ئێوە هیدایەت و ڕێنمایی وەرگرن﴾، وە ئێوە ئەم ئایەتە لە شوێنی خۆی بەکارناهێنن، وەمن لە پێغەمبەری خوام بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر خەڵکی خراپەیان بینی و نەیانگۆڕی، نزیکە خودا هەموویان بە گشتی سزا بدات))[1].

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکاریش هەموو کات بۆ خێر هەنگاو دەنێ، فەرمان دەکات بە چاکە، قەدەغەی خراپە دەکات، ئامۆژگاری خەڵك دەکات، ڕەوش و کرداری بۆگەن و گەندەڵ ڕاست دەکاتەوە، هەرگیز ڕازی نابێت مرۆڤێکی سلبی و لارە ڕێ و کەللە ڕەق بێت، وە هەرگیز کەمتەرخەمی ناکات لەو پرسانەی پەیوەستن بە ئاین" چونکە کاروباری ئاین گاڵتە نییە، لە هیچ لادان و هەڵەیەك تیایدا نابێ بێ دەنگ بێت، ئەگەرنا دەکەوێتە بەر ئەو خەشمەی خوا کە جولەکەی بەرکەوت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((لە پێش ئێوە لە بەنی ئیسرائیل کەسانی وا هەبوون، ئەگەر بیاندیبایە کەسێك خراپە دەکات قەدەغەیان دەکرد و هەڕەشەیان لێ دەکرد، بەڵام بۆ بەیانی لەگەڵی دادەنیشت و دەیخوارد و دەیخواردەوە، وەك بڵێی دوێنێ هیچ خراپەیەکی لێ نەبینیوە، کاتێ خودا ئەمەی لێیان بینی دڵەکانیانی دابەیەکا و ناکۆکی کەوتە نێوانیان لەسەر زمانی داود و عیسای کوڕی مەریەم، بەهۆی ئەوەی سەرپێچیان کرد و ستەمیان دەکرد، سوێند بەوەی خودی منی بەدەست دەبێ فەرمان بکەن بە چاکە و، قەدەغەی خراپە بکەن، وە دەبێ لە دەستی خراپەکار بدەن، وە لەسەر حەق سزای بدەن، یان خودا دڵەکانتان دەدا بەیەکا و نەفرەتتان لێ دەکات وەك چۆن نەفرەتی لێیان کرد)) الطبراني ١٠/١٤٦.

**زرنگ و دانایە لە کاتی بانگەوازکردنیدا:**

ئافرەتی موسڵمان لەکاتی بانگەوازکردندا ژیر و دانا و وریایە، زرنگانە دەئاخافتێ لەگەڵ ئەوانەی بانگیان دەکات، ئاستی فیکری و کۆمەڵایەتی لەبەرچاو دەگرێ، بەهۆی داناییەکەی زۆر

[1] حياة الصحابة ٣/٢٣٣.

بەجوانی و چاکی دەچێتە دڵ و هۆشیان و ئامۆژگاریان دەکات، وەك خودا دەفـەرمووێ: ﴿اُدعُ إِلَـى سَبِيلِ رَبِّكَ بَالحِكمَةِ وَالَموعِظَةِ الحَسَنَةِ. واتا: بانگەواز بکە بۆ ڕێگای خوا بـە حیکمـەت و دانـایی و ئامۆژگاری چاکە﴾ النحل: ١٢٥.

خۆی دوور دەگرێ لە درێژکردنەوەی باس و قورسکردن و سەختکردنی لەسەر گوێگر، بەڵکو بـە چڕوپڕی و روونیەوە ئەوەی دەیهەوێ دەیگەیـەنێ، بـە شـێوازێکی جـوان و گەشـبینانە و دوور لـە بێزاری، وە بە چەند قۆناغێك کارەکانی دەکات نەك بە یـەکجار، تـاوەکوو بەرامبـەر بـە ئاسـانی بتوانێ فیکرەکەی وەرگرێ و پیادەی بکات و بە ڕەزامەندییەوە ملکەچـی بێـت، ئەمـە ڕەفتـاری پێغەمبەر ﷺ بووە لەو کاتەی ئامۆژگاری خەڵکی کردووە، عبداللّه بن مسعود ﷺ هـەموو پێـنج شەمانێك وتاری بۆ خەڵکی دەدا، پیاوێك پێی وت: ئەی ئەبا عبـدالرحمن: خۆزیـا هـەموو ڕۆژێـك یادت خستباینەوە و ئامۆژگاریت کردباین، وتی: (من لە ترسی ئەوەی بێزاری ڕووتان تێبکات ئەو کارە ناکەم، وە من چەند ڕۆژ جارێك ئامۆژگاریتـان دەکـەم، وەك چـۆن پێغەمبـەر ﷺ چـەند ڕۆژ جارێك ئامۆژگاری دەکردین لە ترسی وەڕەس بوون و بێزاری) متفق علیه.

نەرم و نیانی لە گرنگترین پێداویستیەکانی ئافرەتی بانگخوازی دانا و ژیرە، هـەروا ئـارامگرتن لەسەر درەنگ تێگەیشتنی هەندێکیان و، نەفامی و بێ ئاگاییان بەرامبەر زۆرێـك لـە پرسـەکانی ئەم ئاینە و، لەسەر هەڵە دوبارە بووەکانیـان، وە لەسـەر پرسـیارە وەڕەس و زۆرەکانیـان، لەمانـە هەمووی پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ دەکـات، معاویـة بـن الحکـم السُّلَمي ﷺ وتـی: ((ئێمـە لەگـەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژمان دەکرد، لەو کاتە پیاوێك لەوانەی نوێژیان دەکرد پشمی، منیش وتم: یرحمك الله، خەڵکەکە هەموو سەیریان کردم، وتم: دایکت شیوەنت بۆ بکـات، بۆچـی وا سـەیرت دەکـەن؟ ئنجا لە ڕانی خۆیان دەدا، کە بینیم دەیانەوێت بێ دەنگم بکەن تـوڕە بـووم، بـەڵام بـێ دەنگـیش بووم، کاتێ پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد، دایك و باوکم بە قوربانی بێت، کە لە پێش و لە دوای ئـەو هیچ مامۆستایەکم نەبینیوە وا بەجوانی خەڵکی فێر بکات، سوێند بەخوا نە خۆی لێ تـوڕە کـردم نە لێی دام و نە جنێوی پێدام، فەرمووی: ((ئەو نوێژانە ناشێ قسەی خـەڵکی تیـا بکـرێ، بـەڵکو سەرتاپای سبحان الله و الله اکبر و قورئان خوێندنە)) ـ أو کما قـال ﷺ ـ وتم: ئـەی پێغەمبـەری

خوا، من لەناو نەفامی هاتووم، وە خودا ئیسلامی بۆ هێناوین، جا تیاماندایە جادوگەر و فاڵگرەوەیە، فەرمووی: ((مەچووە لایان)) وتم: هەمانە ڕەشبینن! فەرمووی: ((ئەمە تەنها شتێکە لە سنگ و دڵیانە، با ڕێگەتان پێنەگرن، چونکە نە زیان نە سودی نییە)) مسلم ٥/٢٠.

یەکێ لە خوڕەوشتە دانا و سەرکەوتووەکانی و شێوازە کاریگەرەکانی بانگخواز ئەوەیە: بە خراپە وەڵامی خراپە و کەم و کورتی ناداتەوە، بەڵکو نەرم و نیان دەبێت لەکاتی ئاخاوتن لەگەڵیان، بێ ئەوەی بە ڕاشکاوانە باسی خراپە و کەم و کورتیەکانیان بکات، زۆر بە دانایی و وریاییەوە هەوڵدەدات لە خراپە و کەم و کورتیەکانیان دەربازیان بکات، بە لەبەرچاوگرتنی هەستەکانیان تا بریندار نەبێت، تاوەکوو دەروونیان لە بانگەوازەکەی نەڕەوێتەوە، ئەم شێوازە زیاتر دەچێتە ناو دەروون و کاریگەری لەسەر دڵ دەبێت، وە سەرکەوتووترە لە چارەسەرکردنی پەتا و نەخۆشیە دەروونی و خوڕەوشتی و کۆمەڵایەتیەکان، خاتوو عائشە وتی: ((ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لەبارەی کەسێکەوە شتێکی پێ گەیشتبایەوە، نەیدەفەرموو: لەبەرچی فلانە کەس وادەکات؟ بەڵام دەیفەرموو: لەبەرچی فلانە قەوم وادەکەن و وادەکەن))[1].

ئاکارێکیتری سەرکەوتووی ئافرەتی بانگخواز ئەوەیە: قسەکانی دوبارەکاتەوە و روونی کاتەوە بێ ئەوەی بەرامبەری وەڕەس بکات، بە جۆرێك هەست بکات تێی دەگەن و، دەچێتە ناو دڵیان، ئەنەس ﷺ وتی: ((پێغەمبەر ﷺ ئەگەر قسەی بکردایە سێ جار دوبارەی دەکردەوە، تاوەکوو تێی بگەن، وە ئەگەر بەلای کۆمەڵێك تێپەڕیبوایە سێ جار سەلامی لێدەکردن)) فتح الباری ١/١٨٨.

خاتوو عائشە وتی: ((گوفتار و قسەی پێغەمبەر ﷺ روون و ئاشکرا بوو، هەر کێ بیبیستایە تێی دەگەیشت)) ابو داود ٤/٣٦٠.

## لەگەڵ ئافرەتانی چاکەخواز هاوڕێیەتی دەکات و تێکەڵ دەبێت

ئافرەتی موسڵمان لە هاوڕێیەتی کردنی لەگەڵ ئافرەتانا بەدوای ئافرەتی چاکەخواز دەگەڕێت، تا ببنە خوشك و هاوڕێی، بە تێکەڵبوون لەگەڵیان دڵخۆش دەبێت، هاریکاریان دەکات لەسەر

---

[1] حیاة الصحابة ٣/١٢٩.

کاری خێر و چاکە و پارێزکاری، هەروا ڕێنمایی ئەو ئافرەتانە دەکات و ڕۆشنبیریان دەکات لەو ژینگانەی ڕۆشنبیری ئیسلامی لێ کەمە" چونکە تێکەڵبوون لەگەڵ ئافرەتانی چاکەخواز و دانیشتن لەگەڵیان، هەمیشە بە خێر و سوود و پاداشتی گشتگیر دەگەڕێتەوە، وە وا دەکات ئافرەتانی ئەو کۆمەڵگەیە زیاتر لە ئاین تێبگەن و ڕوو لە حەق بکەن، بۆیە خودا دەفەرمووێ: ﴿وَاصبِر نَفسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدعُونَ رَبَّهُم بالغَدَاةِ وَالعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجهَهُ وَلاَ تَعدُ عَينَاكَ عَنهُم تَرِيدُ زِينَةَ الحَيَاةِ الدُّنيَا وَلاَ تُطِع مَن أغفَلنَا قَلبَهُ عَن ذِكرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أمرُهُ فُرُطًا. واتا: ئەی محمد ئارامبگرە لەگەڵ ئەوانەی هەژار و کەمدەرامەتن و بەیانیان و ئێواران خوا دەپەرستن بە ئومێدی دەستکەوتنی ڕەزامەندی خوا، وە ڕووت لێیان وەرمەگێرە و ڕوو لە پیاوی دیار و دەوڵەمەند مەککە، ئایا نیازت بە خۆشی و ڕازاوەیی دونیایە، وە بە گوێی ئەوانە مەککە کە مۆری بێ ئاگاییمان لەسەر دڵی داوە لە بەرامبەر یادکرنەوەی ئێمە و بێ باوەڕە و شوێنی ئارەزووی دەروون کەوتووە و بێ باوەڕی زیادەڕۆیی کردووە﴾ الكهف: ٢٨.

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر وشك و توند نابێ لە کاتی تێکەڵبوونی لەگەڵ ئافرەتانی چاکەخواز، ئەگەرچی بە ڕواڵەت ئاستی کۆمەڵایەتی و مادیان لەو نزمتر بن" پەند و حیکمەت لە مرۆڤ لە کرۆکی و ناوەوەی کەسایەتیە نەك لە ڕواڵەت و شێوە و دەوڵەمەندی" چونکە موسى ﷺ لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەریش بوو کەچی بەدوای ئەو بەندە چاکە کەوت تا لێی فێر ببێت، زۆر تەوازوعەوە پێی فەرمووو: ﴿هَل أتَّبِعُكَ عَلَى أن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمتَ رُشدًا. واتا: دەکرێ پەیڕەوت بکەم تا لەو زانستەی لەلاتە شتی ڕاست و دروستم فێر بکەی؟﴾ الكهف: ٦٦.

کاتێ بەندە چاکەکە وەڵامی دایەوە: ﴿إنَّكَ لَن تَستَطِيعَ مَعِيَ صَبرًا. واتا: تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا ئارامبگری!﴾ الكهف: ٦٧.

موسى ﷺ بەوپەڕی خۆشەویستی و ئەدەبەوە فەرموووی: ﴿قَالَ سَتَجِدُنِي إنشَاءَ اللهُ صَابِرًا وَلاَ أعصِي لَكَ أمرًا. واتا: بە پشتیوانی خوا دەمبینی ئارام دەگرم لەگەڵت وە سەرپێچی هیچ فەرمانێکت ناکەم﴾ الكهف: ٦٩.

ئافرەتی موسڵمانی رووناکبیر کاتێ تێکەڵی ئافرەتانی چاك دەبێت، پەی بردووە بەوەی مرۆڤەکان وەك کانزاکان وان، هەیانە گرانبەها و هەشیانە کەم نرخن، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (( خەڵکی کانزان وەك کانزای زێڕ و زیو، باشترینیان لەسەردەمی نەفامی باشترینیانە لە ئیسلام ئەگەر تێبگەن لە ئاین، وە ڕۆح و گیانەکان وەك پۆلی باڵندە وان، ئەوانەی ئاشنای یەکترن لەگەڵ یەکتر دەسازێن، وە ئەوانەی نائاشنان لەگەڵ یەکتر ناکۆك و جیاواز دەبن)) مسلم ١٨٥/١٦.

وە لە ڕێگەی ڕێنمایی ئاینەکەی فێربووە ئەوانەی لەگەڵیان تێکەڵی دەبێت دوو جۆرن: هاوڕێی چاکە، یان هاوڕێی خراپە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((نمونەی هاوڕێی چاك و هاوڕێی خراپ وەك میسك فرۆش و کورەچی وایە، میسك فرۆش، یان گولاوت پێ دەبەخشێ، یان لێی دەکڕی، یان بۆنی خۆشی لێدەکەی. وە کورەچی یان ئەوەتا جلەکەت دەسوتێنێ، یانیش بۆنی ناخۆشی لێدەکەی)) متفق علیه.

لەم ڕوانگەیەوە بوو هاوەڵانی ڕێزدار بایەخیان دەدا بە سەردانی کردنی خەڵکی چاکەکار لە ئافرەتان و پیاوان لەوانەی خوا و ڕۆژی دواییان دەخستنەوە یاد، دڵانیان نەرم دەکرد، ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: (پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ ابوبکر ﷺ بە عومەر ﷺ وت: هەڵسە با بچینە سەردانی أم ئەیمەن[1] سەردانی بکەین وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ سەردانی دەکرد، کاتێ چوونە لای گریا، ابوبکر و عومەر وتیان: بۆچی دەگریت؟ ئەوەی لەلای خوایە چاکتر و خێرترە بۆ پێغەمبەری خوا، وتی: لەبەرئەوە ناگریم، بەڵکو دەگریم چونکە نیگا لە ئاسمان بڕاوە، ئەوانیش دایانە پڕمەی گریان و لەگەڵ أم ئەیمەن دەگریان) مسلم ٩/١٦.

کۆڕی ئافرەتانی چاك کە یادی خوای تیا دەکرێت، قسە و باسی سوودبەخشی تیا دەکرێت، فریشتەکان دەورەی دەدەن و، خوداش لەژێر ڕەحمەتی خۆی سێبەریان بۆ دەکات، لەو جۆرە کۆڕ و دانیشتنانە دەروون خاوێن دەبێتەوە، بیروهۆش گەشەی تێدەکەوێ، ڕۆحەکان پوخت و پاك دەبنەوە،

---

[1] ام ئەیمەن دایەنی پێغەمبەر ﷺ و خزمەتکاری بووە لە منداڵی، کاتێ گەورە بووە پێغەمبەر ﷺ ئازادی کردووە، پاشان زید بن حاریە خواستی، وە پێغەمبەر ﷺ ڕێزی لێدەنا و چاك بووە لەگەڵی و دەیفەرموو: ((أم ئەیمەن دایکی منە)).

ئنجا لە دونیادا بەروبوومە پێگەیشتوو و سوودەکەیان دەست دەکەوێت، وە لە ڕۆژی دوایش شوێن و پلەوپایەی ڕێزدار و سوپاسکراویان بۆ ئامادەکراوە.

## هەوڵی چاککردنی نێوانی ئافرەتان دەدات

کۆمەڵگەی ئیسلامی بەوە لە کۆمەڵگەکانیتر جیادەکرێتەوە تیایدا برایەتی بڵاوبۆتەوە، بە دۆستایەتی ئاوەدانە، لە نێوانیاندا پەیوەندی گەرم و لەیەك تێگەیشتن و لێبوردەیی و سینە سافی هەیە، وێڕای ئەمانەش کۆمەڵگەیەکی ئادەمیە و بەدەر نییە لەوەی هەندێ جار ناکۆکی و ناخۆشی بکەوێتە نێوان تاکەکانی، بەمەش لەیەك دابڕان و دەنگ دابڕان و پچڕان دروست دەبێت.

بەڵام ئەم ناخۆشیانە بەهۆی ڕێنمایی ئاسمانی هەر زوو نامێنێ، لە شوێنیدا برایەتی و دۆستایەتی و نزیکایەتی دەگەڕێتەوە، دواتر ڕەگی دوژمنایەتی و ڕق و دابڕان دەردەکێشرێ، ئنجا هەر کاتێك فتنەیەك کەوتە نێوان دۆستەکان و، شەیتان کەلێنی خستە نێوانی توندوتۆڵی پەیوەندیەکان و، دابڕان و ناکۆکی لە نێوانیان بەرپابوو، ئەوا نەوەکانی ئیسلام هەوڵی چاکە و خێری خۆیان دەدەن بۆ چاککردنی نێوانی موسڵمانان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((دروست نییە بۆ پیاوێك زیاتر لە سێ ڕۆژ دەنگ دابڕێ لە باوەڕدارێك، ئەگەر سێ ڕۆژەکە تێپەڕی با هەوڵ بدات بیبینێ و سەلامی لێ بکات، ئەگەر وەڵامی سەلامەککەی دایەوە ئەوا بەشدار دەبن لە پاداشتەکە، وە ئەگەر وەڵامی نەدایەوە ئەوا ئەو موسڵمانە بێ تاوان دەبێ لە گوناهی دەنگ دابڕینەکە)) البخاری ١/٥٠٥.

خوداش فەرمانی بە موسڵمانان کردووە نێوانی دوو کۆمەڵی ناکۆك چاك بکەنەوە، کە دەفەرمووێ: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُواْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَت إِحدَاهُمَا عَلَى الأخرَى فَقَاتِلُواْ الَّتِي تَبغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أمرِ اللهِ فَإِن فَاءَت فَأَصلِحَواْ بَينَهُمَا بِالعَدلِ وَأَقسِطُواْ إِنَّ اللهَ يُحِبُّ المُقسِطِين. واتا: ئەگەر دوو کۆمەڵی باوەڕدار جەنگان لە دژی یەکتر ئەوا نێوانیان چاك بکەنەوە، ئەگەر کۆمەڵێکیان ستەم و دەستدرێژی کردە سەر ئەوەیتر ئەوا بجەنگن لە دژی ئەوەی ستەم و دەستدرێژی دەکات تا ملکەچی فەرمانی خوا دەبێت، ئەگەر ملکەچی فەرمانی خوا بوو

ئـەوا بـە دادپەروەرانـە نێوانیـان چـاك بكەنـەوە و ئاشـتیان كەنـەوە" چـونكە بەڕاسـتی خـودا دادپەروەرانی خۆش دەوێت﴾ الحجرات: ٩.

چونكە كۆمەڵگەی باوەڕداران پێویستە بە دادپەروەری و خۆشەویستی و گـەرم و گـوڕی ئـاوەدان بێت و، گوڵاوی دۆستایەتی تێدا پڕژا بێ، خوا دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ. واتا: بەڵكو باوەڕداران برای یەكترن كـەوابوو نێـوانی براكانتـان چاك بكەنەوە و ئاشتیان بكەنەوە، وە لە خوا بترسن تا ڕەحمتنان پێ بكات﴾ الحجرات: ١٠.

لە ڕوانگەی ئەم ڕێنماییانەوە ئافرەتی موسڵمان داوای لێكراوە نێوانی خوشـكانی نـاكۆك چـاك بكاتەوە، تەنانەت ام كلثوم بنت عقبة بن معیط وتـی: لـە پێغەمبـەر ﷺ بیـست دەیفـەرمووو: ((ئەو كەسە درۆزن نییە نێوانی خەڵكی چاك دەكات، جا هەواڵێكی چاك دەگەیەنێ، یان قسەیەكی خێر دەكات)) مسلم ١٥٧/١٦ لە گێڕانەوەیەكی‌تری مسلم ئەمەی زیـاد كـردووە: ((نەمبیـستووە پێغەمبەر ﷺ لە هیچ شتێك ڕێگە بە قسەی زیاد بدات لەو قسانەی خەڵكی دەیكەن تەنها لە سێ حاڵەتدا نەبێ: لـەكاتی جـەنگ، وە لـەكاتی ئاشـتكردنەوەی خـەڵك، كـاتێكیش پیـاو قـسە بـۆ خێزانەكەی دەكات و ئافرەتیش قسە بۆ مێردەكەی دەكات)) مسلم ١٥٧/١٦.

### تێكەڵی ئافرەتان دەبێت و ئارام دەگرێ لەسەر ئەزیەت و ئازاریان

ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆی خزمەتگوزار خاوەنی پرسـێكە، هـەڵگری پەیامێكـە، پێـشڕەوی بانگەوازێكە، ئەوەشی ئەو ئەركە بەرزانـەی لـە ئەسـتۆ گرتبـێ، پێویـستە خـۆی ڕابێنـێ لەسـەر ئارامگرتن و خۆڕاگری و فیداكاری لەپێناویدا.

ئافرەتی موسڵمانی خزمەتگوزار پێویستە ئارامبگرێ لەسەر هەڵوێستی هەنـدێ لـە ئافرەتـان، وەك كاردانەوەی خراپ و، خراپ هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەركە پیرۆزەكەی، وە گاڵتەكردنی هەندێكیان بە پابەندیوونی بە ئادابە ئیسلامیەكان و ئەحكامەكانی و، تێكەڵ و پێكەڵی ڕاكانیـان و سـادەیی بیركرنەوەیان و، سستی بەدەنگەوە هاتنیـان بـە پیـل حـەق و، خولانـەوەیان لـە دەوری خۆیـان و بەرژەوەندیەكانیان و، گرنگی دانە بێ نرخەكانیان و، ڕووكردنە دونیا و خۆشی و بەزمـەكانی، بـێ

ئەوەی حیسابێك بۆ دوارۆژیان بکەن، یا لەلای فەرمانەکانی ئاین بوەستن، وە چەندین کرداریتر کە لێیان ڕوودەدات و سنگی بانگخوازی پێ تەنگ دەبێ، تەنانەت هەندێ کات دەروونیان وا فشاریان دەخەنە سەر تا وازبێنن و کاری لەپێناوی خوا جێ بێڵن، ئەمانە هەمووی ڕووبەڕووی ئافرەتان و پیاوانی بانگخواز دەبێتەوە لە هەموو کات و شوێنێکدا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەو باوەڕدارەی تێکەڵی خەڵکی دەبێت و ئارام دەگرێ لەسەر ئەزیەت و ئازارەکانیان خێرتر و چاکترە لەوەی تێکەڵی خەڵکی نابێت و ئارام ناگرێ لەسەر ئەزیەت و ئازارەکانیان)) البخاری ٤٧٨/١.

پێغەمبەر محمد ﷺ و پێغەمبەرانی پێشی نمونەی ئارامگرتن بوون لەسەر ئەزیەتی خەڵکی، لە نمونەی ئەو ئارامگرتنە گەورەیە: مسلم و بخاری دەگێڕنەوە: پێغەمبەر ﷺ هەندێ دەستکەوتی جەنگی دابەشکرد وەکوو هەموو جارێك، پیاوێك لە یاریدەدەران وتی: سوێند بەخوا ئەوە دابەشکردنێك بوو ڕەزامەندی خوای تێدا ڕەچاو نەکراوە! ئەم قسەیە گەیشتەوە پێغەمبەر ﷺ و پێی دڵگران بوو، ڕەنگی گۆڕا و تووڕە بوو، پاشان وتی: ((بەڕاستی موسی لەوە زیاتر ئەزیەتی درا کەچی ئارامی گرت)).

بەم چەند وشە کەمە تووڕەیی پێغەمبەر ﷺ دامرکایەوە و دەروونی کپ بوویەوە، ئەمە خوڕەوشتی پێغەمبەرانی بانگخوازی ڕاستگۆ بووە لە هەموو کات و زەمانێکدا، بێ ئەم ئارامگرتنەش بانگەوازکردن بەردەوام نابێت و بانگخوازیش چەسپاو دامەزراو نابێت.

ئافرەتی موسڵمانی بانگواخوازی تێگەیشتووش ژیر و زیرەکە لە هەڵسەنگاندنی دەروونی ئەوانەی بانگیان دەکات لەگەڵ ئاستی فیکری و کۆمەڵایەتیان، هەروا قسەکردن لەگەڵیان بەو شێوازەی دەگونجێ و کاریگەری دەبێ بۆ سەرنج ڕاکێشانیان بۆ لای خۆی.

### چاکەی لەبەرچاوە و سوپاسی لەسەر دەکات

یەکێ لە خوڕەوشتەکانی ئافرەتی موسڵمانی ڕاستگۆ ئەوەیە ئەمەکدارە و چاکەی لەبەرچاوە و سوپاسی کەسی چاکەکار دەکات و، هانی چاکەکاریش دەدات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەر

کەسێ چاکەیەکی لەگەڵ کرا، پاشان بە چاکەکاری وت (خوا پاداشتی بە خێرت بداتـەوە) ئـەوا بـە تەواوی سوپاس و ستایشی چاکەکەی کردووە)) الترمذي ٤/٣٨٠.

وە دەفەرمووێ: ((ئەوەی بەخوا پەنای گرت پەنای بـدەن....وە ئـەوەی چـاکەی لەگـەڵ کـردن پاداشتی بدەنەوە)) ابو داود ٢/١٧٢ واحمد ٢/٦٨.

سوپاسکردنی چاکە لە دیدی ئافرەتی موسڵمانی بێدار ئاینێکـە و ڕێنمـایی پێغەمبـەر ﷺ هـانی لەسەر داوە، وە خوڕەوشتێکی کۆمەڵایەتی باو نییە بەپێی هەوا و ئـارەزووو و بەرژەوەنـدی پیـادە بکرێ.

خاوەنی چاکە لە دیدی ئافرەتی موسڵمان شایەنی سوپاسکردنە، ئەگەرچی لەسـەر دەسـتی ئـەو سوود و بەرژەوەندیش نەهاتبێتە دی" چونکە بەسە بۆی بەدەم بانگەوازی خێر و چاکە و جـوامێری هاتووە و ڕووی کردۆتە خێر و چـاکە، بـەهۆی ئـەم هەڵوێـستەی شایـستەی سوپاسـی نـاخی دڵ دەبێت، هەر ئەوەشە ئیسلام لە موسڵمانانی دەوێـت: سوپاسـکردن لەسـەر هەڵوێـستی مەردانـە، بەدەمەوە هاتن و جوامێری، دەست پێشخەری بۆ چاکە، بە چاوپۆشی کردن لـە ئاکامـەکانی و لـە ڕادەی بە دیهاتنی بەرژەوەندی و سود و حەز و ویست.

گرنگی دانی ئیسلام بە خوڕەوشتی سوپاسکردنی چاکە گەیشتە ڕادەیەك کە سوپاسـکردنی خـوا تەواو نابێ مەگەر بە سوپاسی خـەڵك بێـت لەسـەر چـاکە، ئـەو دەروونـەی ڕانـەهاتووە لەسـەر سوپاسکردنی کەسێك چاکەی لەگەڵ کردووە، دەروونێکی بێ ئەمـەك و ناسوپاسـگوزارە، چـاکە و خێری لەبەرچاو نییە و سوپاسی لەسەر ناکات، بۆیـە ئامـادە و سـازیش نییـە تـا سوپاسـی خـوا بکات، کە هەموو نیعمـەت و خێـر و چـاکەیەکی پـێ بەخـشیووە، پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((سوپاسی خوای نەکردووە ئەوەی سوپاسی خەڵك نەکات)) البخاری ١/٣١٠.

ئافرەتی موسڵمانی بێدار پەی بردووە بەوەی لە سوپاسکردنی چاکە بڵاوکرنـەوەی خێـر و چـاکە هەیە و، هاندانە لەسـەری و خۆشەویـستکردنیەتی، هـەروا ڕاهاتنـە لەسـەر پاراسـتنی دەسـت و

هاندانی چاكه و دان نانه به چاكه. ئەمانەش هـەمووی لەلایەنـە چـاكەكانی كەسـایەتی ئـافرەتی موسڵمانی بەرزە كه بایەخی داوه به دارشتنی و دروستكردنی له كۆمەڵگەی ئیسلامی.

## سەردانی نەخۆش دەكات

سەردانی نەخۆش له داب و نەریته كۆمەڵایەتیه ئیسلامیه چاكەكانه پێغەمبەر ﷺ بنـەماكانی چەسپاندووه و كردویەتیه واجب لەسـەر موسـڵمان، ئەگـەر كەمتەرخـەمی تیـا بكـات گوناهبـار دەبێت، دەفەرمووێ: ((مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان پێنجن: وەڵامدانـەوەی سـەلام، سـەردانی نەخۆش، شوێنكەوتنی جەنازە، وەڵامدانەوی داوەت، نزاكردن بۆ كەسێ دەپشمێ)) متفق علیه.

هەروا دەفـەرمووێ: ((مـافی موسـڵمان لەسـەر موسـڵمان شەشـن: وتمـان: ئەوانـە چـین ئـەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموووی: ((كاتێ پێی دەگەی سەلامی لێ بكەی، ئەگەر داوەتـی كـردی بـچی بەدەمیەوە، ئەگەر ئامۆژگاری كردی گوێڕایەڵی بە، ئەگەر پشمی و سوپاسی خوای كـرد نـزای بـۆ بكەی، ئەگەر نەخۆش كەوت سەردانی بكەی، وه ئەگەر مرد شوێنی جەنازەكـەی بكـەوە)) مـسلم ١٤/١٤٣.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كردووە و دەفەرمووێ: ((برسی تێر بكەن، سەردانی نـەخۆش بكـەن، دیـل ئازاد بكەن)) فتح الباری ٩/٥١٧.

براء بن عازب ﷺ وتی: ((پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی پێكـردوین بـە سـەردانی نـەخۆش، شوێنكەوتنی جـەنازە، نزاكـردن بـۆ پـشمیوو، سـوێند بردنـە سـەر، سەرخـستنی سـتەملێكراو، وەڵامدانەوەی بانگەشە و داوەت، سەلامكردن)) متفق علیه.

ئافرەتی موسڵمانی رووناكبیر بە ڕێنمایی ئاینەكەی لـە سـەردانی كردنـی نـەخۆش بـاڵگرانی و بێزاری نابینێ، بەهۆی خەم و پەژارەی نەخۆش، بەڵكو لـە سـەردانی كردنـی نـەخۆش هەڵـمژینی هەناسەیەكی ڕۆحی بەدی دەكات، هەستێكی دەروونی ناوازەی بـۆ دروسـت دەبێـت، كـە هـەموو كەس تێـی ناگـات مەگـەر كەسـێك لـە واتـای گـشتگیر و خێـر و پاداشـتی سـەردانی نـەخۆش تێگەیشتبێ كه لەم فەرموودەیە هاتووە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خودا له ڕۆژی قیامـەت

دەفەرمووێ: ئەی نەوەی ئادەم نەخۆش کەوتم نەهاتیە سەردانم! دەڵێ: پەروەردگارم چۆن سەردانت بکەم لەکاتێکا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟! فەرمووی: ئایا نەتدەزانی کە فلانە بەندەم نەخۆش کەوت و سەردانت نەکرد؟ نەتدەزانی ئەگەر سەردانت بکردایە منت لەلا دەدۆزیەوە؟! ئەی نەوەی ئادەم برسی بووم تێرت نەکردم! دەڵێ: خودایە چۆن تێرت بکەم کە تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟! فەرمووی: نەتدەزانی فلانە بەندەم داوای لێکردی تێری بکەی؟ نەتدەزانی ئەگەر تێرت بکردایە منت لەلای دەدۆزیەوە؟ ئەی نەوەی ئادەم داوای ئاوم لێکردی ئاوت پێنەدام! دەڵێ: خودایە چۆن تێراوت بکەم لەکاتێکا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟! فەرمووی: فلانە بەندەم داوای ئاوی لێکردی پێت نەدا، نەتدەزانی ئەگەر ئاوت پێدابووایە منت لەلای دەدۆزیەوە؟)) مسلم ١٦/١٢٥.

چ سەردانێکی بەرەکەتدارە! چ کارێکی مەزنە! کە ئافرەتی موسڵمان بەرامبەر خوشکان و لاوازان پێی هەڵدەستێ لەکاتێکا لە خزمەتی خوا دەبێت و، خودا کارە گەورەکەی دەبینێ و پاداشتی نەبڕاوەی لەسەر دەداتەوە، ئایا پیرۆزتر و گەورەتر هەیە لەو سەردانەی خودا پیرۆز و بەرێزی بکات و هانی لەسەر بدات؟.

ئنجا لە رۆژی قیامەت خەیاڵی پەشیمانی و شەرمەزاری ئەو کەسە بێنە بەرچاوت کە تەمبەڵی کردووە و کەمتەرخەمی کردووە لەسەردانی نەخۆش، ئەو کاتەش پەشیمانی داد نادات.

نەخۆش لە کۆمەڵگەی ئیسلامی لەکاتی ئازار و ناخۆشیدا هەست بە تەنیایی ناکات، سۆز و نزای ئەوانەی سەردانی دەکەن لە خەم و ئازاری کەم دەکەنەوە، ئەمەش لوتکەی پایە بڵندی مرۆڤایەتیە و، ئەوپەڕی بەرزی هەستی مرۆڤایەتیە، بێجگە لە ئیسلام لە هیچ مێژوو و کۆمەڵگەیەکیتر نەزانراوە.

مرۆڤی نەخۆش لە ڕۆژئاوا ڕەنگە نەخۆشخانەیەك بدۆزێتەوە لە خۆی بگرێ و، پزیشکێك چارەسەری بکات، بەڵام زۆر بەدەگمەن دەستی سۆز، وشەیەکی سارێژکار، خەندەیەکی بوژێنەر، نزایەکی دڵسۆزانە، بەشداریکردنێکی ڕاستگۆی ویژدانی دەست دەکەوێت" چونکە فەلسەفەی مادی کە ژیانی ڕۆژئاوای داپۆشیوە، ڕووناکی سۆزی مرۆڤایەتی کوژاندۆتەوە، وە ڕوونی و

سادەیی هەستی برایەتی داپۆشیووە، مرۆڤی پەناگیرکردووە لە پاڵنەری نامادی بۆ هەڵسان بە کاری خێر.

مرۆڤی ڕۆژئاوایی هیچ پاڵنەرێك نابینێ بۆ سەردانی کردنی نەخۆش ئەگەر بەرژەوەندیەکی مادی نەبێ بە سوود بگەڕێتەوە بۆی بۆ ئێستای یا داهاتووی، لەکاتێکا مرۆڤی موسڵمان پاداشتی خوایی پاڵی دەنێ بۆ سەردانی کردنی نەخۆش.

دەقەکان لەم بارەیەوە زۆرن، سەرچاوەی هەستی برایەتی لە دەروون دەتەقێنێتەوە و، پاڵدەنێن بۆ سەردانی کردنی نەخۆش کە لە قوڵایی ویژدانەوە بێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((موسڵمان کاتێ سەردانی برای نەخۆشی دەکات، لەناو باخی بەهەشتدایە تا دەگەڕێتەوە)) مسلم ١٦/١٢٥.

هەروا دەفەرمووێ: ((هەر موسڵمانێك بەیانیەك سەردانی موسڵمانێکی نەخۆش بکات ئەوا حەفتا هەزار فریشتە نزای بۆ دەکەن تا شەو دادێت، وە ئەگەر بەشەو سەردانی بکات ئەوا تا بەیانی حەفتا هەزار فریشتە نزای بۆ دەکەن، وە لە پاداشتیدا بەروبومی پێگەیشتووی بەهەشتی بۆ هەیە)) الترمذي ٣/٢٩٢.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەهۆی داناییەکەی و شارەزاییەکەی بە دەروونی مرۆڤایەتی و کاریگەری باشی سەردانی کردنی نەخۆش لەسەر دەروونی نەخۆش و کەس و کاری، بۆیە هەرگیز دوانەدەکەوت لەسەردانی کردنی نەخۆش و، دڵنەوایی کردنی و نزاکردن بۆیان، تەنانەت دەروونی هێندە بەرزبوو تا سەردانی منداڵێکی نەخۆشی جولەکەی کردووە کە خزمەتی دەکرد، ئەنەس ﷺ وتی: ((کوڕێکی جولەکەیی خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ی دەکرد، نەخۆش کەوت، پێغەمبەریش ﷺ سەردانی کرد، لەلای سەری دانیشت، فەرمووی پێی: موسڵمان بە، منداڵەکە سەیرێکی باوکی کرد کە لەلای بوو، باوکی وتی: بە گوێی باوکی قاسم بکە، ئنجا موسڵمان بوو، کاتێ پێغەمبەر ﷺ لەلای هاتە دەرەوە فەرمووی: سوپاس بۆ خوا کە لە ئاگر ڕزگاری کرد)) فتح الباري ٣/٢١٩.

ئنجا سەردانی کردنی نەخۆش چەند ئاداب و سونەت و بنەمایەکی هەیە، کە هاوەڵە بەڕێزەکان لەبەریان کردبوو و پیادەیان کردبوو، وە سونەتی پیرۆزیش بۆمانی تۆمارکردووە، لەوانە:

دانیشتن لەلای سەری نەخۆش، ابن عباس ﷺ وتی: ((کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشی بکردایە لەلای سەری دادەنیشت، پاشان حەوت جار دەیفەرمووو: ((أسأل الله العَظِيم رَبَّ العَرشِ العَظِيم أن يَشفِيَك)) واتا: ((داوا لە خودای مەزن دەکەم، خاوەنی عەرشی مەزن، شیفات بۆ بنێرێ)) البخاری ٦٣٣/١.

هێنانی دەستی ڕاست بەسەر جەستەی نەخۆش و نزاکردن بۆی، خاتوو عائشە وتی: ((پێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشی هەندێ لە کەس و کاری دەکرد، بە دەستی ڕاستی دەستی دەهینا بەسەر جەستەی و دەیفەرمووو: ((اللهم رَبَّ النَّاسِ أذهِبِ البَأس، إشفِ، أنتَ الشَافِي ، لاَ شِفَاءَ إلاَّ شِفَاؤكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا. واتا: پەروەردگاری هەمو خەڵك، ئەزیەت و ئازار لادە، شیفای بدە، خۆت شیفا دەنێری، بێجگە لە شیفای تۆ شیفایتر نییە، شیفایەك هیچ نەخۆشیەك تێنەپەڕێنێ)) متفق علیه.

ابن عباس ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ سەردانی دەشت نشینێکی کرد، جا ئەگەر بچوبایە سەردانی نەخۆشێك دەیفەرمووو: ((لاَ بَأسَ طَهُورٌ إنشَاءَالله. واتا: هیچ نییە، بە پشتیوانی خوا مایەی پاککەرەوەی گوناهەکانە)) فتح الباری ١١٨/١٠.

ئافرەتی موسڵمانیش پەلە دەکات لە سەردانی کردنی نەخۆش، تەمبەڵی و سستی ناکات“ چونکە لە ناخیدا هەست بە گەورەیی واتای ئەو سەردانە دەکات، لە مێژووی ئافرەتانی چاکەخوازی سەرەتای ئیسلام، نمونەی کرداری زۆرمان هەیە بۆ ئافرەتانێك تەنانەت سەردانی پیاوانیشیان کردووە تا ئافرەتان، لە چوارچێوەی ئابڕووداری و حەیا و شەرمەوە.

لە صحیحی بخاری هاتووە: قووتەیبە بۆمان دەگێڕێتەوە، لە مالك، لە هشام بن عوروە، لە باوکیەوە، وتی: خاتوو عائشە وتویەتی: ((کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە ابوبکر ﷺ و بلال ﷺ نەخۆش کەوتن، وتی: منیش چوومە سەردانیان، وتم: باوکە ئێستا چۆنی؟ بلال ئێستا چۆنی؟)) فتح الباري ١١٧/١٠.

ئافرەتی موسڵمان لە سەرەتای ئیسلام پەی بردبوو بە واتای سەردانی کردنی نەخۆش، دەرکی ئەو خۆشەویستی و دۆستایەتی و سۆزەی دەکرد کە لە خۆی دەگرێ، بۆیە خێرا بەو ئەرکە پیرۆزە هەڵدەستا، دڵنەوایی نەخۆشی خەمباری دەکرد، ئازار و پەژارەی لەسەر سووک دەکرد، بەمەش پەیوەندی دۆستایەتی پتەوتر دەکرد، سەرچاوەی خۆشەویستی دەتەقاندەوە، ئنجا ئافرەتی موسڵمانی ئێستاش زۆر لەپێشترە تا پەیڕەوی ئەو کەڵە ئافرەتانە بکات لە زیندووکردنەوەی ئەو سونەتە پیرۆزە.

## شیوەن ناگێڕێ بۆ مردوو

ئافرەتی موسڵمانی ڕۆناکبیر بە ئەحکامی ئاینەکەی، دانا و سەنگین و خۆگرە، کاتێ دوچاری کارەساتێك، یا غەم و پەژارەیەك دەبێتەوە هۆش و ویستی لە دەست نادات وەکوو حاڵی ئافرەتانی نەفام و ترسنۆك، بەڵکو ئارام دەگرێت بە ئومێدی پاداشتی خوایی، لەکاتی تەنگانە دەست دەگرێ بە ڕێنمایی ئیسلام لە هەڵس و کەوتەکانی.

هەرگیز شیوەن ناگێڕێ و سەردولکە بۆ مردوو ناڵێ" چونکە ئەو کارە لە کرداری موسڵمان نییە، بەڵکو لە کرداری بێ باوەڕ و خوڕەوشتی نەفامییە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((دوو خوڕەوشت لە خەڵکیدا هەن کە کوفر و بێبڕوایین: تەعنەدان لە نەژاد و ڕەچەڵەك، وە شیوەن گێڕان بۆ مردوو)) مسلم ٢/٥٧.

وە دەفەرمووێ: ((لە ئێمە نییە ئەوەی لە ڕومەتی خۆی دەدا و، یەخەی دادەدڕێ، یان سەردولکەی سەردەمی نەفامی بڵێتەوە)) متفق علیە.

ئافرەتی موسڵمانی هۆشیار بە ئەحکامی ئاینەکەی باوەڕی وایە کە مردن حەقە، وە هەر کەسێ لەسەر ئەو زەوییە بێت ڕوو لە نەمانە، وە ژیان پردی پەڕینەوەیە بۆ ئاخیرە، لەوێ ژیانی جاویدانی لەتەك پەروەردگار هەیە. بۆیە ئەو ترس و تۆقینە کە هاوسەنگیت لە دەست دەدات، هۆشت دەبا و، وا دەکات لە روخسارت بدەی، جلت دادڕێنی، هاوار و قیژە قیژ بکەی هیچ واتایەکی نییە.

أبي بردة بن أبي موسى وتی: باوکی موسی دوچاری ئازارێکی وابوو، لە هۆشی خۆی چوو، سەری لە کۆشی یەکێ لە ئافرەتانی کەس و کاری بوو، یەکێ لە ئافرەتانی کەس و کاری هاواری کرد، ابو موسی نەیتوانی هیچ وەڵامێکی بداتەوە، کاتێ هاتەوە هۆش خۆی وتی: ((من بەریمە لەوەی پێغەمبەر ﷺ لێی بەری بووە“ چونکە پێغەمبەر ﷺ بەری بووە لەوەی لەکاتی ناخۆشی و کارەساتا هاوار دەکات و دەنگ بەرزدەکاتەوە، وە لەوەی قژی دەرنێتەوە، وە لەوەی جلی دادەڕنێ)) مسلم ٢/١١٠.

لەگەڵ ئەوەی ئیسلام ئەو کارانەی حەرامکردووە، بەڵام ڕێگای داوە بە خەمباری دڵ و گریان بۆ مردووی خۆشەویست“ چونکە ئەوانە سەرچاوەیان لە سۆزی مرۆڤایەتی مەشروع و حەڵالە، ئەو ڕەحمەتە خواییە کە لە دڵان چێنراوە، ئوسامە بن زەید ﷺ وتی: ئێمە لەلای پێغەمبەر ﷺ بووین، یەکێ لە کچەکانی ناردی بە شوێنی و پێی ڕاگەیاند کە کوڕی کچێکی خەریکە دەمرێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بگەڕێوە لای و پێی بڵێ: ئەوی خودا دەیباتەوە هی خۆیەتی و ئەوەشی دەیبەخشێ هەر هی خۆیەتی، هەموو شتێك لەلای خوا ئەجەل و کاتێکی دیاریکراوی هەیە، پێی بڵێ با ئارام بگرێ و چاوەڕوانی پاداشتی خوا بێت. بەڵام نێردراوەکە چوو و گەڕایەوە و وتی: سوێندی خواردووە هەر دەبێ بێی، وتی: ئنجا پێغەمبەر ﷺ هەڵسا و سعد بن عبادة و معاذ بن جبل لەگەڵی هەڵسان، منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم، منداڵەکەی بۆ بەرزکرایەوە، لەو کاتەی لە گیانەڵڵا بوو و مرخە مرخی دەهات، جا پێغەمبەر ﷺ فرمێسك بە هەردوو چاوانی هاتە خوارەوە، سعد پێی وت: ئەوە چیيە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((ئەوە ڕەحمەت و میهرە خودا لە دڵی بەندەکانی داناوە، وە خوداش ڕەحم و بەزەیی دێتەوە بە بەندە بەڕەحم و بەزەییەکانی)) مسلم ٦/٢٢٤، ٢٢٥.

عبدالله بن عمر ﷺ وتی: سعدی کوڕی عوبادە نەخۆش بوو، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عبدالرحمن بن عوف و سعد بن أبی وقاص و عبدالله بن مسعود سەردانیان کرد، کاتێ چوونە لای بینیان وا لەسەرە مەرگە و لە هۆشی خۆی چووە، فەرمووی: ((ئایا گیانی دەرچووە؟)) وتیان: نا ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر ﷺ گریا، کاتێ خەڵکەکە گریانی پێغەمبەر ﷺ یان بینی ئەوانیش

گریان، فەرمووی: ((ئەرێ نابینن؟ خودا بەهۆی گریانی چاو و خەمباری دڵ کەس سزا نادات، بەڵام بەمە سزا دەدات ـ ئاماژەی بە زمانی کرد ـ، یان ڕەحم دەکات)) متفق علیه.

ئەنەس ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ چووە لای ابراهیمی کوڕی، لەو کاتەی لەسەرە مەرگ بوو، هەردوو چاوەکانی پێغەمبەر ﷺ هۆن هۆن فرمێسکی دەباراند، عبدالرحمن بن عوف وتی: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((ئەی کوڕی عوف، ئەوە ڕەحم و میهرە، پاشان قسەیەکی‌تری کرد و فەرمووی: ((چاو دەگری و، دڵ پەژارە دەیگرێ، بەڵام شتێك نالێین لە ڕەزامەندی پەروەردگارمان نەبێت، بەڕاستی ئەی ئیبراهیم ئێمە بە مردنی تۆ غەمبارین)) متفق علیه.

ئیسلام ڕێگەیداوە بە گریان وەکوو دەربڕینی پەژارە و غەمباری" چونکە مرۆڤ ناتوانێ گریانی بگرێتەوە لەکاتی تەنگانە و کارەساتا، بەڵام فەدەغەی هەر کارێکی کردووە ئاگری غەم و پەژارە خۆش بکات، ڕژاندنی فرمێسك بەگوڕ و بەشێوەیەکی مام ناوەندی یارمەتی کوژاندنەوەی پشکۆی غەم دەدات، پاڵپشتی سووك کردنی ئازار دەکات، لە قوڕسایی غەم کەم دەکاتەوە. هەرچی شیوەن و واوەیلا و سەردولکە و لەخۆدانە هەر هەمووی غەم و پەژارە زیاد دەکات، ئاگری ئازار خۆش دەکات، ترس و تۆقین پەژارە و هەراسان لە دڵ زیاتر دەکات.

ئەمانە هەمووی لە شەرعی ئیسلام حەرامکراوە" چونکە وزەی مرۆڤ بەهەدەر دەدات، پێچەوانەی ملکەچبوونە بۆ قەدەری خوا، هەروا کرنەوەی دەرگایەکە بۆ شەیتان بۆ فریودانی مرۆڤ، ام سەلەمە وتی: کاتێ باوکی سەلەمە مرد وتم: خۆی غەریب بوو، لە خاکی غەریبی مرد، دەبێ شیوەنێکی وای بۆ بکەم خەڵکی بیگێڕێتەوە، ئنجا خۆم ئامادەکرد بۆ شیوەن لەسەری، ئافرەتێك لە دەوروبەری مەدینە هات، دەیویست لە شیوەن و گریانەکەم یارمەتیم بدات، پێغەمبەر ﷺ پێشوازی لێکرد و فەرمووی: دەتەوێ شەیتان بێنیتە ماڵێك کە خودا دووجار لێی وەدەرناوە؟[١] ئنجا وازم لە شیوەن و گریان هێنا و ئەو کارەم نەکرد)) مسلم ٦/٢٢٤.

---

[١] یەکەجار: کاتێ ابو سەلەمە گیانی سپارد، هەندێ لە کەس و کاری کردیانە هەڵلا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێیان: نزا لە خۆتان مەککەن مەگەر بە خێر بێ" چونکە فریشتەکان ئامین دەکەن لەسەر نزاکانتان، پاشان بۆ ئەبو سەلەمە پاڕایەوە، جاری دووەمیش، کاتێ ام سەلەمە وتی: دەبێ شیوەن بگێڕم، پاشان نەیکرد و شیوەنی نەگێڕا.

بخاری و مسلم دەگێڕنەوە، أم عطیة وتی: ((پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو پەیمان و بەیعەتەی پێماندا بەڵێنی لێ وەرگرتین سەردولکە و شیوەن نەگێڕین لەسەر مردوو)) فتح الباری ۱۷٦/۳ ومسلم ۲۳۷/٦.هەرەشەیەکی ترسناکتر هەیە بۆ ئەوانەی تەوبە ناکەن لە شیوەن گێڕان و سەردولکە وتن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((شیوەنگێڕ و سەردولکە بێژ ئەگەر پێش مردنی تەوبە نەکات، لە ڕۆژی قیامەت جلێکی لە قەتران لەگەڵ قەڵغانێك لە گەڕ و گولی لەبەر دەکرێت)) مسلم ۲۳٥/٦.

هەروا دەفەرمووێ: ((فریشتەکان نزای خێر ناکەن بۆ ئافرەتێکی شیوەنگێر و سەردولکە بێژ)) احمد ۳٦۲/۲.

ئافرەتی موسڵمانی پارێزکار لەبەردەم ئەو حەرامکرنەی شیوەن و سەردولکە ملکەچ دەبێ بۆ فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی، وە دووردەکەوێتەوە لە هەرچی جوانی ئیسلامیەکەی و پاکی باوەڕبوونی لەکەدار دەکات بە قەزا و قەدەری خوا، تەنها بەوەش ناوەستێ بەڵکو بانگی ئافرەتە نەفامەکان دەکات بۆ پابەند بوون بە شەرعی خوا و فەرمانەکانی لە دوورکەوتنەوە لە شیوەنگێڕان و سەردولکە وتن، پاش ئەوەی حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەیان بۆ روونبوویەوە.

### شوێنی جەنازە ناکەوێت:

ئافرەتی موسڵمانی رووناکبیر وەکوو ملکەچبوونێك بۆ فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی شوێنی جەنازە ناکەوێت،أم عطیة وتی: ((قەدەغە کراوین لە شوێنکەوتنی جەنازە بەڵام لەسەرمان حەرام نەکراوە و توند نەکراوە)) فتح الباری ٤٦٦/۲ ومسلم ۱۷٤/٦.

لەم پرسەدا ئافرەت پێچەوانەی پیاوە" چونکە ئیسلام پیاوی هانداوە لەسەر ئامادەبوون لەسەر جەنازە و کفن و ناشتنی مردوو، لەکاتێکا بۆ ئافرەت ئەمەی پێ خۆش نییە، بەهۆی ڕودانی هەندێ ڕەوشی باو کە شایستەی بەرزی و بڵندی مردووەکە نییە، هەروا لە شوێنکەوتنی مردوو و ناشتنی پێویستە پەند و ئامۆژگاری هەبێت بۆ دەوروبەر و داوای لێخۆشبون بکرێت بۆ مردوو، هەروا پەی بردنە بە واتای مردن کە هەموو گیانلەبەرێك دەبێ بیچێژێ، خودا دەفەرمووێ: ﴿أَيْنَمَا

تَكُونُواْ يَدرِككُمُ المَوتُ وَلَو كُنتُم فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدة. واتا: لـه هـەر كـویّ بـن مـردن پیّتـان دەگـات ئەگەرچی لەناو حەشارگەی بەرز و قاییمیش بن﴾ النساو: ٧٨.

وە ئەگەرچی پیّغەمبەر ﷺ تەنها وەكوو كەراهەت قەدەغەی كردوون نەك وەكـوو حـەرامكردن، ئەوا ئەو قەدەغە كردنە بەسە بۆ ئافرەتی موسڵمانی ژیر و تیّگەیشتوو تا پابەندی بیّت و ملكەچی بیّت و لەسەری بڕوات، تا بەڵگـە بـە دەسـت بـدات لەسـەر جـوانی و چـاكی ئیـسلامەتیەكەی و ڕاستگۆییەكەی لە گوێڕایەڵی بوونی بۆ خوا و پیّغەمبەرەكەی.

## دوماهی و بەدواداچوون

لە لاپەڕەکانی پێشوو کەسایەتی ئافرەتی موسڵمان بەرجەستە بوو وەك چۆن ئیسلام پێی ڕازییە، بەپێی ئاڕاستەکانی بۆی لە سەرجەم لایەنەکانی ژیان و، بەپێی ڕێنماییە حەکیمانەکەی لە دارشتنەوەی بیروبۆچوون و گیان و دەروونی و خوڕەوشتی و هەڵس و کەوتەکانی. ئەمانەش هەمووی لەسەر زاری ئایەتە ڕۆشن و فەرمووودە ڕاستەکان دوپات بوویەوە، بۆ بەدیهێنانی هاوسەنگیەکی توندوتۆڵ و ورد لە کەسایەتیەکەی، بەشێوەیەك لایەنێکی لەسەر لایەنێکیتری زاڵ نەبێت، هەروا ڕەفتاری نمونەیی کێشاوە لە هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ دایك و باوك و خزمانی و هاوسەری و منداڵەکانی و دراوسێکان و خوشکان و هاوڕێیانی، هەروا ئافرەتانیتر لەوانەی لە کۆمەڵگە پێیان دەگات و لەگەڵیان دەژی.

بەشەکانی پێشوو دەریانخست ئافرەتی موسڵمان تەنها لە ماڵ دانانیشێ و تەنها منداڵ پەروەردە ناکات و ماڵ بەڕێوە نابات، بەڵکو وێڕای ئەمانەش نەوەکان پەروەردە دەکات، پاڵەوانان دروست دەکات، پێشڕەوی بانگخوازیە، تاکێکی ڕۆشنبیر و ڕابونێکی بنیاتنەرە لە سەرجەم کاروبارەکانی ژیان، لەتەك پیاو دەوەستێ بۆ ئاوەدانکردنەوەی گەردون، دەوڵەمەندکردنی ژیان، بەختەوەرکردنی بوونەوەر، هەروا شێدارکردنی وشکی ژیان.

وە بۆمان دەرکەوت ئافرەتی موسڵمان ئافرەتێکی پایە بڵند و پەروەردەکراو و ڕۆشنبیر و بێدار و بەرهەمهێن و بنیاتنەر و پاك و بەرزە، بە ڕووناکبیری و داناییەوە ئەرکی خۆی دەزانێ بەرامبەر پەروەردگاری، بەرامبەر خودی خۆی، بەرامبەر دایك و باوکی، بەرامبەر مێرد و منداڵەکانی، بەرامبەر خزم و نزیکانی ، بەرامبەر دراوسێکانی، بەرامبەر خوشکان و هاوڕێیانی، وە بەرامبەر هەموو کۆمەڵگا، هەموو ئەوەی تیایەتی لە خەڵکی جۆراوجۆر و ڕوداو و ڕەفتار.

ئەو ئافرەتەی باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دواییە ئاگادار و چاوکراوەیە لە فتنەی دونیا و داوەکانی شەیتان، پەروەردگاری دەپەرستێ، گوێڕایەڵی فەرمانیەتی، دوورە لە نەهیەکانی، ڕازییە بە قەزا و قەدەری، گەڕاوەیە بۆ ژێر سایەی پەروەردگاری، داوای لێخۆشبوونی لێ دەکات، لەو کاتانەی پێی دەخلیسکێ، یان دوچاری بێ ئاگایی و سستی و کەمتەرخەمی دەبێت. هەست بە

بەرپرسیاریەتیەکەی دەکات بەرامبەر پەروەردگاری سەبارەت بە ئەندامانی خێزانەکەی، گرنگی دەدات بە وەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا لە هەموو کارێکی، خۆی دەنوێنێ لە واتای پەرستش بۆ خوا و سەرخستی ئاینە ڕاستەقینەکەی. فەرمان دەکات بە چاکە و قەدەغەی خراپە دەکات لە سنوری توانا و دەسەڵاتی خۆی.

هەروا تێگەیشتووە لە ئەرکی بەرامبەر خودی خۆی، دەزانێ ئەو مرۆڤێکە و پێکهاتووە لە جەستە و عەقڵ و ڕۆح، وە جەستە پێکهاتە و داواکاری خۆی هەیە، هەروەك عەقڵ و ڕۆحیش پێکهاتە و داواکاریان هەیە، بۆیە بایەخ دەدات بە ڕاگرتنی هاوسەنگی ورد لە نێوان جەستە و عەقڵ و ڕۆحی، لایەنێکی لەسەر حیسابی لایەنەکەیتر فەرامۆش ناکات، بەڵکو گرنگی بەهەموو لایەنەکان دەدات وەك پێویستە بۆ بەدیهێنانی کەسایەتیەکی مرۆیی هاوسەنگ، لە هەموو ئەمانە ڕێنمایی لە ژیاننامەی پێشینەی چاکەخواز وەردەگرێ ئەوانەی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بە چاکە ڕۆیشتوون.

هەروا گرنگی دەدات بە ڕواڵەت و دیمەنی بێ زیادەڕۆیی و فیز و لووت بەرزی، بەهەمان شێوەش گرنگی دەدات بە کرۆك و ناوەڕۆکی بەو شێوەیەی شایستەیە بەو مرۆڤەی خودا ڕێزی لێناوە و، فریشتەکانی بۆ خستونەتە کڕنوش بردن و، هەرچی لە ئاسمان و زەوییە بۆی ڕامکردووە، بەجۆرێك کەسایەتیەکەی هاوسەنگ و میانڕەو و خۆشەویست و باش بێت لە دیمەن و شێوە و عەقڵ و بیرکرنەوە و ڕەفتار و هەڵس و کەوت و کاردانەوەی.

وە گرنگی دانی بە جەستە و عەقڵی بێ ئاگای ناکات لە بیرکردنەوە لە تایبەتمەندیە ڕۆحیەکانی، بەڵکو وەکوو چۆن پەروەردەی جەستە و عەقڵی دەکات ئاوەهاش پەروەردەی ڕۆحی دەکات، ئنجا ڕۆحەکەی بە خواپەرستی و یاد و قورئان خوێندن بێگەرد دەکات، لە هەموو ئەمانەش دەست بە هاوسەنگی دەگرێ لە سەرجەم لایەنەکانی کەسایەتیەکەی.

هەروا لەگەڵ دایك و باوکی چاکەکارە، ڕێزیان دەزانێ، ئەرك و واجبی بەرامبەریان دەزانێ، زۆر هەستیارە و دەترسێ لە خراپەکردن لە بەرامبەریان، باشترین و بەرزترین شێواز و ڕێگا هەڵدەبژێرێ

له چاکەکردن لەگەڵیان، بە هەموو شێوەیەك هەوڵی چاودێری و ڕێز لێگرتن و بە گەورەگرتنیان دەدات. وە لەگەڵ مێردی نمونەی ئافرەتی ژیر و تێگەیشتوو و چاکەکارە و گوێڕایەڵ و لێبوردە و بەسۆزە، بایەخ دەدات بە ڕەزامەندی و ڕێزگرتن لە کەس و کاری، نهێنی دەپارێزێ، کۆمەکی دەکات لەسەر چاکە و تەقوا و کرداری چاك، دەروون و دڵی پڕ دەکات، بەختەوەری و دڵنیایی و هێمنی دەخاتە هەستی.

وە لەگەڵ منداڵەکانی دایکێکی بەسۆز و بەزەییە، ڕۆشنبیر و دانایە، هەست بە مەزنی پەیامە پەروەردەییەکەی دەکات، پەی دەبات بە بەرپرسیاریەتی دایکایەتی، وا دەکات منداڵەکانی هەست بەسۆز و خۆشەویستی و میهری بکەن، هەمیشە ئاڕاستەیان دەکات، بێ ئاگا نییە لە ڕاستکردنەوەیان ئەگەر پێویستیان پێبوو، تاوەکوو پەروەردەیەکی ئیسلامیانەی نمونەیی هەڵکەون کە لە دەروونیاندا بەهارەوشتیەکان بچێنێ لەگەڵ خۆشویستنی کاری بەرز و بڵند.

هەروا لەگەڵ بوك و زاواکانی چاکەکار و دادپەروەر و دانا و ئامۆژگاریارە، تێکەڵی تایبەتمەندیەکانیان نابێت، بەجوانی ڕەفتاریان لەگەڵ دەکات، کاردەکات لەسەر بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی خۆشەویستی و ڕیشەکێش کردنی هەستی شەڕ و ناکۆکی.

هەروا لەگەڵ خزمان و نزیکانی پەیوەندی خۆشەویستی و دۆستایەتی دەبەستێ، هەمیشە سەردانیان دەکات و چاکەیان لەگەڵ دەکات ئەگەرچی ئەوان پەیوەندی لەگەڵ بپچڕێنن، وەکوو ملکەچبوونێك بۆ فەرمانەکانی ئیسلامە بێگەردەکەی لە تۆکمە کردنی پەیوەندی خزمایەتی و تەقاندنەوەی کانیاوی خۆشەویستی و دۆستایەتی.

وە لەگەڵ دراوسێکانی چاکەکارە، گرنگی دەدات بە کاروباریان، مافە گەورەکەیان دەزانێ کە جبریل ـ ع ـ ڕیشەی داکوتا بۆ پێغەمبەر ﷺ تا وا گومانی برد میراتی لێ دەگرێ، بۆیە ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆش بێت بۆ ئەوانیشی پێ خۆشە، بەجوانی مامەڵەیان لەگەڵ دەکات، ڕەچاوی هەستیان دەکات، بەرگەی ئەزیەت و ئازاریان دەگرێ، چاوپۆشی دەکات لە هەڵە و کەم و کورتیان،

خۆی دەپارێزێ لە خراپەکردن لەگەڵیان، یان کەمتەرخەمی کردن لە چاك مامەڵە کردن و چاکەکردن لەگەڵیان.

هەروا لەگەل خوشکان و هاوڕێیانی پەیوەندی دادەمەزرێنێ لەسەر بنەمای خۆشەویستی لەپێناوی خوا، کە بەرزترین و پاکترین و بێگەردترین خۆشەویستییە لە ژیانی مرۆڤ" چونکە ئەو جۆرە خۆشەویستییە داماڵراوە لەهەرچی بەرژەوەندی و سود و مەبەستە، پاکە لە هەرچی پەڵە و لەکەیەك، سەرچاوەی بێگەردی و روونی و خاوێنییەکەی لە چرای ڕۆشنی وەحی و ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ گرتووە، لێرەوە ئافرەتی موسڵمان ڕاستگۆ و دڵسۆز و لێبوردە دەبێ لە خۆشەویستی و هاوڕێتی کردنی بۆ خوشکانی، سورە لەسەر مانەوەی پەتی برایەتی و دۆستایەتی، لێیان دانابڕێ، دەنگیان لێ نابڕێ، غەیبەتیان ناکات، هەستیان بریندار ناکات بەهۆی دەمەقاڵێ و مشت و مڕ و قسەی زیاد، کینەی بەرامبەریان نییە، دەستی ناگێڕێتەوە لە هەر چاکەیەك بۆیان، هەمیشە بە ڕوویەکی خۆش و گەشەوە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

وە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی ئافرەتێکی کۆمەڵایەتی بەرزی پلە یەکە، بەهۆی پیادەکرنی ڕێنمایی ئاینەکەی لە فقهی مامەڵە کردن و بەرزی پەیوەندییەکان و خوڕەوشتی بڵند، ئنجا لەم سەرچاوە بێگەردەی ئیسلام هەرچی داب و نەریت و ڕەفتار و هەڵس و کەوت هەیە وەردەگرێ، هەر لەم سەرچاوە بێگەردەش بنەما و خوڕەوشتەکان هەڵدەنجێ کە دەروونی خاوێن دەکاتەوە و کەسایەتیە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکەی پێك دێنێ.

لەگەڵ هەموو خەڵکی خوڕەوشت جوان و ڕاستگۆ و دامەزراوە، ناپاکی و فێڵ و ستەم و دووڕوویی ناکات و گەواهی درۆ نادات، دڵسۆزانە ڕێگای خێر بە خەڵکی نیشان دەدات، بەڵێنی دەباتە سەر، بە شەرم و حەیا و پاکی دەروون ڕازاوەتەوە، تێکەڵی کارێك نابێت پەیوەندی بەوەوە نەبێت، دووردەکەوێتەوە لە باسکردنی ئابڕوی خەڵك و شوێنکەوتنی عەیبەکانیان، دوورە لە ڕیا، دادپەروەرە لەکاتی بڕیاردان، ستەم ناکات، دادپەروەرە بەرامبەر کەسێك خۆشی ناوێت، بە غەم و پەژارەی خەڵك دڵخۆش نابێت، خۆی دوور دەگرێ لە گومانی خراپ، زمانی دەگرێ لە غەیبەت و دووزمانی، دوورە لە جنێودان قسەی ناشیرین و ناڕێك، گاڵتە بە کەس ناکات، نەرم و نیانە لەگەڵ

خەڵك، بەزەیی و میهرەبانە، کاردەکات لەسەر سودگەیاندن بە خەڵك و لادانی زیان لێیان، قەرز لەسەر قەرزاری کەمدەرامەت سووك دەکات، بەخشندە و سەخیە، ناز و منەت ناکات بەسەر ئەوانەی یارمەتیان دەدات، هێمنە، لێبوردەیە و ڕق و کینە لە دڵی هەڵناگرێ، ئاسانکارە و ئاڵۆزکار نییە، ئیرەیی نابات، دوورە لە شانازی و حەزی خۆدەرخستن، دوورە لە خۆسەپاندن، کەسایەتیەکەی لەلای خەڵك خۆشەویستە، لەگەڵ خەڵکی دەگونجێ و لەگەڵی دەگونجێن، نهێنی دەپارێزێ، ڕوو گەشە، ئێسك سوکە، بەختەوەری دەخاتە دلان، توندڕەو نییە، خۆ بە زل ناگرێ، خۆبەکەم زانە، میانڕەوە لە جل و بەرگ و دیمەنی، گرنگی دەدات بە کاروباری بەرز و پایەدار و کاروباری موسڵمانان، ڕێز لە میوان دەگرێ، بەرژەوەندی خۆی فەرامۆش دەکات لەبەر پێویستی خەڵکی، داب و نەریتەکانی ملکەچی پێوەری ئیسلام دەکات، پابەندە بە سلاوی ئیسلام، ناچێتە ماڵێك بێجگە لە ماڵی خۆی بێ مۆڵەت وەرگرتن، لەو شوێنە دادەنیشێ کە کۆتایی کۆڕ و دانیشتنە، ئەگەر سێ ئافرەت بوون دووانیان بەیەکەوە بە نهێنی قسە ناکەن، ڕێز لە ئافرەتی گەورە و خاوەن چاکە دەگرێ، چاو ناگێڕێ بە ماڵی خەڵکی، کارێك هەڵدەبژێرێ بگونجێ لەگەڵ سروشتە مێیانەکەی، لاسایی پیاوان ناکاتەوە،بانگەواز دەکات بۆ حەق، فەرمان دەکات بە چاکە و قەدەغەی خراپە دەکات، دانا و ژیرە لە بانگەوازکرنەکەیدا، لەگەڵ ئافرەتانی چاکەکار ژیان بەسەر دەبات و هاوڕێتی دەکات، هەوڵی چاککردنی نێوانی موسڵمانان دەدات، لەگەڵ ئافرەتانا تێکەڵ دەبێت و ئارام دەگرێ لەسەر ئازار و ئەزیەتیان، چاکەی لەبەرچاوە و سوپاسی لەسەر دەکات، سەردانی نەخۆش دەکات و شوێنی جەنازە ناکەوێت.

ئەمەیە کەسایەتی ئافرەتی موسڵمان کە ئیسلام بەهۆی ڕێنماییە حەکیمانەکەی دایڕشتووە و دڵ و چاوی بە رووناکیەکەی رۆشن کردووە.

بەڕاستی ئەوە ئەو کەسایەتیە نموونەییە هەرە بەرزەیە بۆ هەر ئافرەتێك کە هەر کۆمەڵگەیەك ناسیبێ" چونکە لەپاڵ ئەو هەموو بەهارەوشتیانەی باسکران، بیروهۆشێکی فراوان و دەروونێکی بێگەرد و گیانێکی بەرز و تێڕوانینێکی ساغی هەیە سەبارەت بە گەردون و ژیان و مرۆڤ، لەگەڵ قووڵی تێگەیشتن بۆ پەیامە ترسناکەکەی لە ژیان.

بێگومان گەیاندنی ئافرەت بۆ ئەو ئاستە بەرزە لە پێکهاتنی خوڕەوشتی و گیانی و دەروونی و فیکری نیعمەتێکی مرۆڤایەتی گەورەیە، هیچ نیعمەتێکیتر هاوشانی نابێت، هەروا داهێنانێکی ژیاری گەورەترە لە هەر داهێنانێکیتر کە مرۆڤایەتی بە درێژایی تەمەنی پێیگەیشتبێ" چونکە گەیشتنی ئافرەت بەم ئاستە بەرزە لە پێکهاتن واتای گەشەسەندنی مرۆڤایەتیەکەی و، پێگەیشتنی کەسایەتیەکەی دەگەیەنێ، ئامادەباشی تەواویەتی بۆ گەیاندنی پەیامە گەورەکەی لە ژیان.

ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین لە دواکەوتوویی ئافرەتی موسڵمان لەو ئاستە بەرزەی ئیسلام بۆی ویستووە لە زۆربەی خاکی جیهانی ئیسلام، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ دووری موسڵمانان بەگشتی لە سەرچاوە سازگارەکەی ئاینەکەی و، ونبوونیان لە نەفامی و پاشکۆبوونی فیکری و دەروونی بۆ کەسانیتر، ئەو دواکەوتەییەش هیچ کامی ڕووی نەدەدا لە ژیانی موسڵمانان بەگشتی و، ئافرەتی موسڵمان بەتایبەتی، ئەگەر ملکەچی سەرچاوە فیکری و ڕۆحیەکان بوونایە و، پیاوان و ئافرەتان ڕوویان لێکردبوایە و زاد و توێشویەکیان لێهەڵگرتبوایە کە بەرگری و ڕەسەنایەتی پێبەخشیبان.

وە ئەگەر ئەو هەڵمەتەی کراوەتە سەر جیهانی موسڵمانان ئامانج لێی کەسایەتی موسڵمان بێ بەگشتی چ پیاو چ ئافرەت، ئەوا لە ڕەگەوە دەری دەکێشا و سەرچاوە فیکریەکەی پیس و بۆگەن دەکرد، بەڵام ئەوەی گومانی تیا نییە ئامانج لە زۆربەی ئەو هەڵمەتانە کەسایەتی ئافرەتی موسڵمانە، تا لەو پۆشاکە بەرز و شکۆدارەی داماڵێ کە بە درێژایی مێژوو پێی ناسراوە، لە بری جلێکی هێنراوی تەسکی ساختەی لەبەر بکەن تا وێنەیەك بێ لە ئافرەتی بێگانە لە دیمەن و بیرکردنەوە و هەڵس و کەوتی.

لەم پێناوەشدا هەوڵی زۆر مەزن دراوە، کە چەندین کۆمەڵە و دەستە و بزوتنەوە ئەم بانگەوازەی نامۆکردنی ئافرەتی موسڵمانی لە ئەستۆ گرتووە، هەمووشیان سوپاس بۆ خوا هەرەسیان هێناوە لە بەرامبەر ڕابوونی ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر و تێگەیشتوو لە ڕێنمایی ئاینەکەی، ئنجا زۆر لە پاڵپشتانی هەوڵی نامۆکردنی ئافرەتی موسڵمان لە پیاوان و ئافرەتان پەشیمان بوونەوە لە بڕیار و ڕاکانیان و، دانیان ناوە بە قووڵی بیروباوەڕی ئافرەتی موسڵمان و، ڕەسەنایەتی ئیسلام لە بیرکردنەوەی و دەروونی و هەست و نەستی.

ئنجا ئەو ئومێدەی بەستراوە بە ئافرەتی موسڵمانی ڕۆشنبیر بۆ گەیاندنی پەیامە بەرزەکەی، زیاتر چەسپاوی لە کەسایەتیەکەی دەخوازێ لە هەر شوێن و کات و ڕەوشێك بژیێت" چونکە لە چەسپاوی کەسایەتیەکەی بەڵگەیەکی ڕۆشن هەیە لەسەر تێگەیشتنی و پایەداری و ڕاستی هاتنە ڕیزی بۆ ئیسلامی هەمیشە زیندوو و ژیاریە مرۆییە ناوازەکەی، لەمەش بەڵگەیەکی ڕۆشن هەیە لەسەر گەرم و گوڕی و توندوتۆڵیەکەی لە هەڵساندنەوەی ئۆمەتەکەی کە ئەم ئەندامێکە تێیدا، هەروا پێشخستنی ئەو وڵاتەی لێی دەژی.

## دوماهی وەرگێڕ

پاش سوپاس و ستایشی خوای گەورە لەسەر بەخششە بێ پایـان و لـە دوانـەهاتووەکانی، وە درود و سڵاویش بۆ سەر گیانی پێغەمبەری ئازیزمان محمد ﷺ و سەرجەم هاوەڵان و یار و یاوەرانی و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی....

سوپاس بۆ خوا تەواوبووم لە وەرگێڕشانی ئەو پەرتوکە پڕ فەڕ و بەرەکەتە، تێیدا تـا لـە توانـام دابووە ڕەچاوی کورتی و پـوختیم کـردوە لـە دەربڕینـی واتـا و چـەمکەکان بـە مەبەسـتی زیـاتر نزیککردنەوەی لە هزری خوێنەر و وەرس نـەبوونی لـە خوێندنـەوەی، تـاوەکو ئـافرەتی موسـڵمان بتوانێ لە ژیانی ڕۆژانەی پیادەی بکات و پێی بەختەوەر بێت.

ئنجا زۆر جار ئافرەتی موسڵمان کەلێنێك دەکەوێتە ژیانی و دەرون و نـاخی بـە هـۆی ڕووداو و کارەساتی ناخۆش کۆنترۆڵی هۆشی لە دەست دەدات و هاوسەنگی دەلەقێ، لەو کاتنانەدا شـەیتان هەلی خۆی وەردەگرێ و ڕۆڵی خۆی دەبینێ و هەوڵ دەدات بە ئارەزووی خۆی ئەو کەلێنەی بـۆ پـڕ بکاتەوە بە شتی پڕوپوچ و بێ مانا و پیس و بۆگەن، کە لەوانەیە بە ڕواڵەت جـوان و ڕازاوە بێـت، ئەمە لە کاتێك ڕوودەدات ئەگەر ئافرەتی موسڵمان خۆی پڕ چەك نەکردبێ بە باوەڕی قووڵ بە خـوا و بە قەدەری خوا و، دڵی خۆی بە چرای بـاوەڕ و ئیمـان ڕونـاك نەکردبێتـەوە و، بەرچـاوی ڕۆشـن نەکردبێتەوە بە ڕێنماییەکانی ئیسلامی پیرۆز، بۆیە خۆ پڕ چەك کردن بە باوەڕ لە گرنگترین ئـەرك و کارەکانی ئـافرەتی موسـڵمانە بـۆ بـەرەنگاری بوونـەوەی تـاڵایی و سـەختیەکانی ژیـان و ئـەو ناخۆشیانەی دووچاری دەبنەوە تا ڕێگە بە شەیتانی جنۆکە و ئادەمی نەدات بـە ئـارەزووی خۆیـان بچنە ناو ناخی بۆ خۆیان شوێنی مانـەوە دروسـت بکـەن و بـە ئـارەزووی خۆیـان هەڵیـسوڕێنن و گومڕای بکەن، دواتریش دونیا و دوارۆژی لە دەسـت بـچێت، پێویـستە ئـافرەتی موسـڵمان یـەك ڕاسـتی بزانێـت و لـە مێـشکی بیـچەسپێنێ، ئـەویش: بەختـەوەری ڕاسـتەقینە و سـەربەرزی و سەرفرازی هەموو مرۆڤێك بەگشتی و ئافرەتی موسڵمان بەتایبەتی لە بە چاك پیادەکردنی شەرعی خوایە لەسەر زەوی، هەر ئەو دڵنەواییە، پاڵپـشتە، پـارێزەرە، هـەموو ئـاوات و هیوایـەکیش لـە

سایەی ئەو شەرعە دێتە دی، دەی با لە باوەشی بگرین و پابەندی یاسا و ڕێساکانی بین، تا ڕەزامەندی خوا و خۆشی دونیا و دوارۆژ ببەینەوە.

بەو هیوایەم خودا کارەکانم وەرگرێ و جێی ڕەزامەندی ئەو بێت و نورێکی زۆر هەمیشە بێ بۆم لە دونیا و دوارۆژ، وە ببێتە مایەی پایە بڵندی و پلە بەرزی لەو ڕۆژەی پلە و پایەکان نامێنێ و دەسەڵاتەکان لە کار دەخرێن، مەگەر ئەوەی خودا بە میهر و بەزەیی خۆی پایە و پلەی بەرز و شکۆدار بکات، خودایە دامەزراو و پارێزراو و سەرفراز و سەربەرزی دونیا و دوارۆژمان بکەی...ئامین.

## گرنگترین سەرچاوەکانی دانەر


١ـ الإحسان في تقريب صحيح ابن حبان. مؤسسة الرسالة، بيروت ١٤١٢.

٢ـ أحكام النساء لابن الجوزي. المكتبة العصرية، صيدا بيروت ١٤٠٥.

٣ـ الأدب المفرد :فضل الله الصمد في توضيح الأدب المفرد للبخاري.

٤ـ الأذكار للنووي. دار القبلة، جدة ١٤١٣.

٥ـ الاستيعاب في معرفة الأصحاب لابن عبدالبر. دار بهضة مصر، بدون تاريخ.

٦ـ أسد الغابة في معرفة الصحابة لابن الأثير الجزريّ. مصر، بدون تاريخ.

٧ـ الإصابة في تميز الصاحبة. دار نهضة مصر، بدون تاريخ.

٨ـ الأغاني لأبي الفرج الأصبهاني. المصورة عن دار الكتب بمصر، بدون تاريخ.

٩ـ أنساب الأشراف للبلاذري. دار المعارف بمصر بدون تاريخ.

١٠ـ البداية والنهاية لابن كثير. دار الكتب العلمية، بيروت ١٤٠٩.

١١ـ تاريخ الإسلام للذهبي. دار الكتاب العربي، بيروت ١٤٠٧.

١٢ـ تاريخ الطبري. دار الكتب العلمية، بيروت ١٤٠٧.

١٣ـ تحفة الفقهاء لعلاء الدين السمرقندي. إدارة إحياء التراث الإسلامي بقطر بدون تاريخ.

١٤ـ تراجم سيدات بيت النبوة للدكتورة بنت الشاطئ. دار الكتاب العربي، بيروت بدون تاريخ.

١٥ـ الترغيب والترهيب للمنذري. قطر، بدون تاريخ.

١٦ـ جمهرة خطب العرب لاحمد زكي صفوت. المكتبة العلمية، بيروت بدون تاريخ.

١٧ـ الحماسة لأبي تمام. جامعة الإمام محمد بن مسعود الإسلامية، الرياض ١٤٠١.

١٨ـ حياة الصحابة للكاندهلوي. دار القلم ١٤٠٣.

١٩ـ دلائل النبوة للبيهقي. دار الكتب العلمية بيروت ١٤٠٥.

٢٠- رياض الصالحين من كلام سيد المرسلين. بيروت، بدون تاريخ.

٢١-زاد المعاد في هدي خير العباد لابن قيم الجوزية. مؤسسة الرسالة ومكتبة المنار الإسلامية ١٤٠١.

٢٢- سنن أبي داود. مطبعة السعادة، مصر ١٣٦٩، ودار الحديث، سورية ١٣٨٨.

٢٣- سنن ابن ماجه. دار إحياء الكتب العربية، مصر، بدون تاريخ.

٢٤- سنن الترمذي، وهو الجامع الصحيح. دار الفكر، بيروت، بدون تاريخ.

٢٥- السن الكبرى للنسائي. دار الكتب العلمية، بيروت ١٤١١.

٢٦- سنن النسائي. دار البشائر الإسلامية، بيروت ١٤٠٦، والبابي الحلبي مصر ١٣٩٨.

٢٧- سير أعلام النبلاء للذهبي. مؤسسة الرسالة، بيروت ١٤٠١.

٢٨- السيرة النبوية لابن هشام. دار القلم، بيروت، بدون تاريخ.

٢٩- شرح السنة للبغوي. المكتب الإسلامي ١٣٩٠.

٣٠- الشمائل المحمدية للترمذي. دار الحديث، بيروت ١٤٠٥.

٣١- صحيح مسلم بشرح النووي. دار الفكر، بيروت١٤٠١.

٣٢- صفة الصفوة لابن الجوزي. دار الوعي بحلب ١٣٨٩.

٣٣- الطبقات الكبرى لابن سعد. دار بيروت ١٣٩٨.

٣٤- طرفة بن العبد: حياته وشعره للدكتور الهاشمي. دار البشائر الإسلامية ١٤٠٠.

٣٥- عشرة النساء للنسائي. مكتبة السنة بمصر ١٤٠٨.

٣٦- العقد الفريد لابن عبد ربه. دار الكتاب العربي، بيروت ١٣٨٤.

٣٧- فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر. دار المعرفة، بدون تاريخ.

٣٨ـ فضل الله الصمد في توضيح الأدب المفرد للبخاري، فضل الله الجيلاني، المكتبة السلفية ١٤٠٧.

٣٩ـ كشف الأستار للهيثمي. مؤسسة الرسالة ١٤٠٤.

٤٠ـ كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال لحسام الدين الهندي. مؤسسة الرسالة ١٣٩٩.

٤١ـ مجمع الزوائد ومنبع الفوائد للهيثمي. دار الكتاب العربي، بيروت ١٩٦٧م.

٤٢ـ مختصر تفسير ابن كثير. دار القرآن الكريم ١٤٠٢.

٤٣ـ المرأة بين الفقه والقانون للدكتور مصطفى السباعي. المكتب الإسلامي ١٤٠٤.

٤٤ـ المرأة في الإسلام للدكتور معروف الدواليبي. دار النفائس ١٤٠٩.

٤٥ـ المستدرك للحاكم النيسابوري. مكتبة النصر الحديثة، الرياض بدون تاريخ.

٤٦ـ مسند الإمام أحمد بن حنبل. دار صادر، بيروت بدون تاريخ.

٤٧ـ المعجم الكبير للطبراني. مطبعة الزهرء، الموصل ١٤٠٦.

٤٨ـ المغازي للواقدي. عالم الكتب، بيروت، بدون تاريخ.

٤٩ـ المغني لابن قدامة. مكتبة الرياض الحديثة ١٤٠١.

٥٠ـ المقاصد الحسنة للسخاوي. مكتبة الخانجي بمصر ١٣٧٥.

٥١ـ من الرق إلى السيادة تأليف سامحة آي ويردي. نشر DAMLA.

٥٢ـ الموطّأ للإمام مالك. دار إحياء الكتب العربية بمصر، بدون تاريخ.

٥٣ـ ميزان الاعتدال للذهبي. دار إحياء الكتب العربية بمصر ١٣٨٢.

***

## سەرچاوەكانی وەرگێڕ

١) تەفسیری قورئانی پیرۆز.

٢)فەرهەنگی عەرەبی (منجد الطالب).

٣)فەرهەنگی دەریا.

# ناواخنی پەرتوک



## ١ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ پەروەردگاری

**٢ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ خودی خۆی**

**٣- ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ دایک و باوکی**

**٤ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ هاوسەرەکەی**

## ٥ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ منداڵەکانی



## ٦ـ ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ بووك و زاواکانی

(أ) لەگەڵ بووکەکانی

**٩- ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ خوشکان و هاوڕێیانی**

## ١٠- ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ کۆمەڵگاکەی

**سوپاس و پێزانین**

سەرەتا سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە یارمەتی دام لە وەرگێڕانی ئەو پەرتووکە، دواتر سوپاسی سەرجەم ئەو خوشك و برایانە دەکەم ئەوانەی چ بە مادی چ بە مەعنەوی کۆمەکیان کردووم لە وەرگێڕانیدا، ئنجا حەز ناکەم ناوی هیچ کام لەو بەڕێزانە ببەم" چونکە لە ژمارە زۆرن و نامەوێ دڵی هیچیان گەرد بگرێ، هەموویان لەلای من جێگای ڕێزن و خۆشەویستن و بەدڵ نزای خێریان بۆ دەکەم بە پەنهانی یەکە یەکە ناویان دەبەم و لەلای خوای گەورە داوا دەکەم سەرکەوتوو و سەرفراز و بەختەوەری دونیا و دوارۆژیان بکات، لە سەرجەم گوناه و کەم و کورتیەکانیان خۆش بێت و، بە چاوی بەزەیی و ڕەحم سەیریان بکات، وە مراز و راز و نیازیان بێنێتە دی و، لە ڕۆژی دوایی لە بەهەشتەکەی فیردەوەس هەر هەموومان بەیەکەوە کۆبکاتەوە و بە دەستی پێغەمبەری نازدار ئاوی کەوسەر بنۆشین و تینوێتی دونیامان لەبیر بباتەوە و، لە خۆشیەکانی بەهەشت و ڕەزابوونی خوا ژیانی هەمیشەییمان بگوزەرێنین و هەرچی شەکەتی و ناخۆشی و نەخۆشی دونیایە لەبیرمان بچێتەوە....، خودایە تەنها بۆ ڕەزامەنی ڕووخساری پاکت بەو پەڕی دڵسۆزی ئەو کارەم لێ وەرگرە و بیکە مایەی سوود بۆ خوشکانم بە تایبەتی و براکانم بە گشتی بۆ خاتری ناوە جوان و سیفاتە بەرز و پیرۆزەکانت ... ئامین.. ئامین وصلی الله وسلم علی سیدنا محمد والحمد لله رب العالمین...

سندس علي عباس

**هەولێر**

